زنجیرەی
هزری
هاوچەرخی
ئیسلامی
٢٥




# چەمکانێک
# دەبێ ڕاست بکرێنەوە

وەرگێڕانی
ژوانی گەلالی

تفسیر
هەولێر / چاپی یەکەم - ٢٠٠٣

بسم الله الرحمن الرحيم

# چەمکانێک

## دەبێ ڕاست بکرێنەوە

# مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

◆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرریێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

◆ ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامییو سازێنەری بێداریو رابونی ئیسلامیی پیرۆزن.

◆ شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت و بەند و بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەویو رەوتگەرایی.

◆ بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆرانکاریانەی هەبێ کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت:

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سُورَةُ الزُّمَر

نوسینگەی تەفسیر

# چەمکانێک

## دەبێ ڕاست بکرێنەوە

نوسینی

## محمد قطب

وەرگێڕانی

ژیوانی گەلالی

تفسیر

هەولێر

ناوی کتێب بە عارەبی: مفاهيم ينبغي أن تصحح
ناوی نوسەر: محمد قطب
ناوی کتێب بەکوردی: چەمکانێک دەبێ راست بکرێنەوە
ناوی وەرگێڕ: ژیوانی گەلاڵی
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
کۆمپیوتەر: نوسینگەی تەفسیر
خەت: نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٣ك ٢٠٠٣ز
چاپکردن: چاپخانەی پەروەردەی هەولێر
تیراژ: ١٥٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٦ ساڵی ٢٠٠٣

تفسير
هەولێر- شەقامی دادگا
ت: ٢٢٢١٦٩٥-٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# پێشەکی وەرگێڕ

لەم سەردەمە تەمتومانە، کە دنیا تەژی خەمانە و، وا بە موسڵمانان کراوە هەر بە حاڵی خۆ خەریك بن، لەنێو هەنگامەی دنیادا بێئاگا و تەرەوتەریك بن، لە جیهانی ئیسلامیدا، بە تایبەتیش لەم هەوارە تەنگوتارە، هەر لە روالآن تا کالآن، هەمو بێناز و دەسخەڕۆ، تەسلیمی هزری غەوارە، یا هزری چەوتی ناوەخۆ. لەوپەڕی هونەرنواندن، کاتێ تەواو تەنگاو دەبن، مەیدان دەکەنە مەیدانی ململانێ و شەڕە پەڕۆ-تەنیا پەڕۆ و هیچی تر نا؟! گەورە و ردێن سپیش زۆربە، یان خاپینۆك، یا خاپون، سەرومڕ تێیان بڕوانە یاخود و روبین و پەلیکن، یا بە باخەڵ ئاخنین و بە مفتەخۆری خەریکن، ئەوانی کە دەشمێننەوە زۆربەی لاگر و تەریکن، ئەو کەشتیەی کە لەسەر پشتی گەشت دەکەین، با چۆنی بوێ ئاوای داژوا.

بەڵام خودا-لە میهری خۆی- ناوەناوە بەندەیەکی خۆی هەڵدەخا بەڕاشکاوی و مەردانە و، بێپەروا لە لۆمەی خەڵکی حەقیقەتان بخاتە رو، شوشەی ئابڕوی گزیکاران وردوخاشکا و لە بەردیدا، پشتی زۆران هزری نامۆ و چەمکی لاڕێ لە هەردیدا، حەقیقەت وەك خۆی دەربخا و وەك پێویستە دینی خوا ئاوا سەر بخا.

لەنێو گەلانی موسڵمان گەلی کوردیش وەکو ئەوان، هۆکارگەلێکی مێژویی، زۆر ئەنگێزەی سەقەت و گۆج، هەروەکو هزری هاوردە و، سۆفیزم و هزری ئیرجائی، بون بە مایەی سەرگەردانی و لەڕێ دەرچون، چەمکەکان تێك شێوێنراون، راستینە و راستەقینەکان، یان کز بون، یا هەر نەماون. لەنێو ئەو هەزارەزیلەی بیرۆچکان و ئەو هزرگەلە گەند و نامۆ و شپرزانەی ئەمڕۆ لەنێو موسڵمانان

ـ ـ ـ و هەنبەز و دابەزینیانە، هزری ئیسلامی شێواوە وتەرەی لاڕێ و هەڵەت و بەـتـن کراوە، بە هەر لایەکدا دەڕوانی لاڕێبوونە و چەمکەکان بە دەردێك چوونە، ..گە هەر نەناسرێنەوە، لاڕێبون لە زۆر چەمکاندا وا چەسپاوە بابـــای لاڕێ تـەواو نیـن دابڕاوە و راستەڕێگەی بەدی ناکا.

ئەم کتێبە ناوازەیە کە زادەی بیرو ئەندێشەی نوسەرێکە، مێژوی خۆی و خانەوادەی لە سایەی خوداوە رونە و کامیان دەگری سوارچاکێکی زۆر چاپوکە لەم رابونە. بەو شێوازە رەسەن و سەبکە پتەوەی زۆر مامۆستا و وەستایانە رێچکە و مێژوی لاڕێکردن و نامۆکردن و خاڵیکردنی چەمکە بنەڕەتیەکانی ئیسلامی تۆژیوەتەوە، کە چەند چەرخ و سەدەی درێژە واعیزان-مەگەر مەردانی خوا نەبێ- لەسەر مینبەر و سۆفیان لە خەلوەتگادا، بە ئاگا یا بێئاگایی، بەیاریی هزری هاوردە لێشێواون و دەشێوێنن؛ جا تەرازی ئەو تەرازو و ئەو پێوانەی کە خوا ئەم چەمکە جوانانەی پێدابەزاندون و ناردون، کێشاونی و چۆنیەتی و روی راستەقانی پێشانداون. کە هەقیقەتیش دەرکەوێ، هزرە نامۆکان دەبەزن. هەروەکو گەماڵی پاشدز قاچی ماخۆی خۆ دەگەزن.

هەر بۆیەش بو ئەم کتێبەم بۆ وەرگێڕانێ هەڵبژارد، لەپاڵ ئەمەش لەسەر ئاستی تاکەکەسی ئەو هیوایەی تـێر دەکـردم و ئـەو ئـارەزوەی دەشـکاندم، کـە هـەر لـە سەرەتای ئاشنابون و چاوکرانەوەم بە نوسینی ئەو خانـەوادە گەورەیـە و ئـەو کەڵـە نوسەر و بیریارە بەتوانا و سەرڕاستانەدا بە ئاوات بوم چەند کارێکیان لێ وەرگێڕمە سەر زمانە شیرینەکەم، ئەوەی لای خۆم بۆتە تـەما و بۆتـە مایـەی کردنـەوەی زۆر دەروازەی مەزنی ئاسۆی هزر و بیرم، برایانی کوردی موسڵمانیشمی لێ بێبـــەهرە و بێبەش نەبێ.

شایسته به ئاماژەیه و جێگەی سوپاسێکی زۆره که ئامۆزای خۆشەویستم کاکه ئارامی گەلاڵی کەڵـه وەرگـێڕ بـۆ وەرگـێڕانی ئـەم کتێبـه بـەپێزه زۆری هـاندام و تەنانەت گەلێك جـارانیش بـۆ تـاوتوێی وەرگـێڕانی زاراوەکـان ئەزیـەتی لەگـەڵدا کێشام. لەپاش ئەمەش پاشبەندێکی بۆ وەرگێڕانەکەم نوسی که هـەر لـەدوای ئـەم کتێبه دابەزیوه و بریتیه له خوێندنەوەیـەکی کتێبەکـه و، بەراسـتی خوێنـەری لێ بەهرەمەند دەبێ و مایەی تێگەیشتنێکی چاکتر و پوختەتره. خودا هەر بـەرخوردار و پایەداری کا.

نابێ ماندوبون و ئەرکی دەزگای تەفسیر لەبیر بکرێ، لەگەڵ رێـز و سوپاسـێکی زۆر و تایبەت بۆ مامۆستا (مخلـص یونـس)ی خـاوەنی، کـه زۆر رەنـد و بێپاکانـه ئەرکی چاپ و پەخشی ئەم پـەڕاوەیان لەئەسـتۆگرت. هـەروەها هـەردو سـەربازی نەناسـراوی ئـەم دەزگایـه؛ کـاك نـەوزاد کۆیـی ئـازیز کـه بـه پەڕەموچـه هونەرمەندانەکەی و به سـەرنجه ڕەندانەکـەی کتێبەکـەی رازانـدەوه و کـاك جمعـه صدیقـی خۆشەویسـت کـه لـه ئـەنجامدانی کاروبـاری کۆمپیوتـەردا وەسـتایی و شارەزایی نواند و زۆر تێبینی جوانی گەیاند، بەراستی جێپەنجـەی ئـەو دو بـەڕێزه بەسەر ئەو کتێبانەوه ئاشکرایه که لەم دەزگایه دەردەچن.

سوپاس و رێزی زۆریشم بۆ برای زۆر ئازیز و ژیـر کـاك سـەنگەری مـەلا نـەزیر لەگەڵ شەوبۆخانی خێزانی که ماندوبون و شەونخونیان کێشا و هەڵەچنیەکەیان کـرد و دەسنوسەکەمیان لەگەڵ تایپەکه پێکگـرت و لەبـەر یـەك رانـا، خـوا هـەمویان تەمەندرێژ کا و پاداشتی ئەرکیان داتەوه.

ژیوانی گەلاڵی

لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ
ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ
وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ
وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ
ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ
وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ

# پێشەکی

ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی (هەروەك لە کتێبێکی دیکەدا ئاماژەم پێکردوە)[1] لـە یەکێك لە قۆناغە مێژوییە هەرە ناهەموارەکانیدا دەژی، ئەگەر خراپـترین قۆنـاغی نەبێ کە بە درێژایی مێژووەکەی پێیدا تێپەڕیوە، چونکە تـەنگژەکانی پێشـو وەکـو حالەتی ئێستا لە یەك کاتدا توشی هەمو موسـڵمانانی سـەر ڕوی زەوی نـەدەبۆوە. زەلیلی و سوکبون و سەرگەردانیش تێکڕای ئوممەتی ئیسلامی نەدەگرتەوە هـەروەك ئەمجارە دایگرتوە.

بۆ نمونە ئەگەر نسکۆی ئەندەلوس بە خراپترین قۆناغ دابنرێ کە موسڵمانان لـە سەدەکانی پێشوودا پێیدا تێپەڕیون، ئەوا نسکۆی فەلەستین خراپترە، چونکە کاتێك سـێبەری موسـڵمانان لـە ئـەندەلوس دادەکشـا، دەوڵـەتی تـازە لاوی عوسمـانی قوستەنتینیەی فەتح دەکرد و دەیکردە پێتەختی خیلافـەتی ئیسـلامی، پاشـان بـە ئەورووپادا ڕۆدەچوو تا دەگەیشتە ڤیێنا و پەترۆسبۆرگ. هەرچی نسکۆی فەلەسـتینە لە کاتێکدا رودەدات کە سێبەری موسڵمانان لە گۆی زەوی داکشـاوەو، لـە گشـت لاوە کوشتارگە و قەسابخانەیان بۆ ساز و ئامادە کـراوەو لـە کۆڵیـان نابێتـەوە: لـە

---

[1] لەکتێبی (واقعنا المعاصر)دا باسمان کردوە، دەبوایە کتێبی (چەمکـەکان) پێـش (واقعنـا المعـاصر) چاپ بکرێ، چونکە چەند ساڵێك پێشتر نوسراوە، بەڵام خودا وای ویسـت کتێبـی چەمکـەکان ئـەم هەمو ساڵە دوابکەوێت، کە کتێبی دیکەی تێدا دەربچن ساڵانێك دواتر نوسراون! هەموو شـتێکیش لای خوا بە پێوانەیە.

فلیپین، له حەبەشه، له ئەریتیریا، له چاد، له نێجیریا، له هیند، له ئەفغانستان لـه تێکڕای جیهانی شوعی، که لەنێوان کوفر و مـردن موسـڵمان سەرپشـك دەکرێـن، پیلانیش بۆ ئیسـلام و موسـڵمانان لـه چوارچێـوەی سـەرجەم هـێزە دەوڵەتیـەکان دادەڕێژرێ، جیهانی ئیسلامیش بۆ چەندین جار پارچەپارچه و دابڕدەکرێ. هـەوڵ و کۆشش یەك لەدوای یەك له ئارادان تـا دەوڵـەتێك لەسـەر خـاکی موسـڵمانان بـۆ هیدیکه دامەزرێنن. هـەرجارەو بەشـێك لـه خـاکی ئیسـلام دابـڕ دەکـەن و، ئـەو موسڵمانانەی که تیاشیدا دەمێننەوە یـا دەکوژرێـن یـا بـه نارێکـترین شـێواز لـه مێژودا ئازار و ئەشکەنجه دەدرێن، ئەمەش هەموی لەسـەر دەسـتی حکومـەتانێك که بەرەنگاری بانگەوازی ئیسلامەتین و، ناڕازین لەوەی موسڵمانان به شەرعی خوا حوکم بکرێن.

ئەمه ئەو باره خراپەیه که ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی تێـدا دەژی و لـه مێـژوودا هاوشێوەی نەبووە.

هیچ کاتێك شتێکیش لەم باره ناهەموارەدا لەخۆڕا ڕونادا، ناکرێ تەنانەت یـەك شتیش له ژیانی مرۆڤ له خۆڕا روبدا، بەڵکو هەمو شتێك له ژیانی مرۆڤدا بەپێی سوننەتی خودایه که نه پاش دەکەوێ و نه خاتری ئافەریدەیەك دەگرێ:

﴿فَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَحْوِيـلاً: قـەت نـابینی رێ و شوێنی خوا بگۆڕدرێ و ئاڵوگۆڕ بکرێ﴾فاطر/٤٣.

یەکێك له سـوننەتەکانی خـوداش ئەوەیـه کـه ئـەو بـەهره و نیعمەتانـەی بـه قەومێکی داون نایانگۆڕێ تا قەومەکه زادەی دەرونیان نـەگۆڕن، واتـه لەسـەر ڕێ لانەدەن، ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَـيِّرُوا مَـا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيـمٌ: چونکـه خـودا دەرگـەی چاکـەی لـه هـەر گـەلێ

کردبێتەوە، هەتا ئەوان بیری خۆیان نەگۆڕیبێ، قــەت خــودا لێــی نــەگۆڕیون، خــوا بیسەر و زانایە. ﴾الأنفال/٥٣.

سونەتێکی دیکەی خوداش ئەوەیە کە خاتری کەسێك نــاگرێ لەبــەر ئــەوەی لــە رەچەڵەك و پشتی قەومێکی چاکەکارە: ﴿وَإِذْ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّــهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَــــهْدِي الظَّــالِمِينَ: ئەوسا خودا بەچەند وشــە ئــەزمونی ئیــبراهیمی کــرد، پێکــی هێنــان. فــەرمووی: دەتکــەم بــە رێبــەری خــەڵکی دونیــــا. گوتــی: ئــەدی تۆرەمەکــەم[1]؟ گوتــی: ناهەقیکارەکان وەبەر بەڵێنم ناکەون. ﴾البقرة/١٢٤.

بەڵام کە بەخۆیان بڕواداری چاکەکار بون ئەوکاتە بالاْدەستیان دەکات: ﴿وَعَــــدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَــاتِ لَيَسْــتَخْلِفَنَّهُم فِــي الأَرْضِ كَمَــا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِــنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَــيْئًا: ئــەو کەســانەی لــەئێوە بڕوایــان هەیە و ئاکار چاکن، خــودا بــەڵێنی پێــدان: لــەم زەمینــە دەیانکاتــە جێگەنشــین، هەروەکو چۆن ئەوانەی پێش ئەوانی کردە جێنشین، دینەکەشیان-کە خۆی پەســەندی کردوە- هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی، تا تــەنیا مــن بپەرستن، هیچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن. ﴾النور/٥٥.

کەچی ئەوانی هەر بە میرات کتێبیان بــۆ بــەجێماوەو، وادانــانێن کــە تایبەتــە بەخۆیان و مولزەمیان دەکا، بەڵکو پێیان وایە تەنیا شتێکە لــە بــاب و باپیرانــەوە جێماوە، ئەو کەسانە ئەو پاشچینە خراپەن کە لە کتێبی خوا ئاماژەیان بۆ کراوە لە

---

[1] تۆرەمە: ذرية

میانەی باسی بەنی ئیسرائیل تا موسڵمانان لـە چارەنوسـی وان ئاگـادار بکاتـەوە: ﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَذَا الأَدْنَى وَيَقُولُـــونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِنْ يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِثْلُهُ يَأْخُذُوهُ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِمْ مِيثَاقُ الْكِتَـــابِ أَنْ لاَ يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلاَّ الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ وَالدَّارُ الآخِرَةُ خَيْرٌ لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَـــلاَ تَعْقِلُونَ: ئەوسا جێنشینانێکی بەدفەڕ هاتنە جێگایان و، کتێبەکـە لای ئـەوان بـە کەلەپور ما، کە هەر بۆ تەماحی دنیا تێدەکۆشان. دەشیانگوت: ئێمە هــەر زۆر زو عافو دەکرێین. ئەگەر دیسانیش دەستیان لە شتێك گیربـا، وەریـان دەگـرت. ئـەدی لەو کتێبەدا پەیمانیان لیٚ وەرنەگیرا، کە لەراستی بەولاوە دەربارەی خوا نەدوێن؟ کە هەرچی تێشیدا هەبو خوێندبویان. ماڵی ئەولا(قیامەت) بۆ ئەوانەی خۆپـارێزن زۆر باشترە، هێشتا کە ئێوە تیٚناگەن؟﴾الأعراف/١٦٩.

هەر ئەوانیشن کە خودای گەورە لەبارەیان دەفەرمویٚ: ﴿فَخَلَفَ مِـــنْ بَعْدِهِـــمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلاَةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَـــوْنَ غَيًّـــا: لـەدوای ئـەوان کەسانیٚ بوونە جێگریان، بەلای نوێژاندا نەدەچون و شوێن ئارەزوی خۆیـــان کـەوتن، ئەوانە زوو توشی ئازار و ئەشکەنجە دەبن.﴾مریم/٥٩.

ئەمانە هەموی سوننەتگەلی پەروەردگارن کە لە ژیانی مرۆڤدا کاروباریـــان پـیٚ هەڵدەسوڕیٚ، نە خاتری کەس دەگرن و، نە بە ئارەزوی کەسێك دەگۆڕێن.

خودا ئوممەتی ئیسلامی بە باڵادەستبون و جێنشینکردن و ئاسـایش بەهرەمـەند کردبو و، ڕێژەنی[1] ئاسمانەکان و زەوی بۆ ئاوەلاّ کردبون: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ: نیشتەجێی ئەو بازێڕانە ئەگـەر

---

١ ڕێژەن: بەرەکەت

خوایان بناسیبا و خۆپارێزبان، دەروازەی بەرەکەتمان لە ئاسمان و زەمینەوە بـەڕویاندا دەکردەوە. ﴾الأعراف/٩٦.

پاشان دۆخەکە لە جێنشینکردن و باڵادەستی و ئاسایشەوە گـۆڕا بـۆ زەلیلـی و لاوازی و سوکبوون و، دەربەدەرکردن و سوکایەتی پێکردن و کوشتن تا گەیشتە ئـەو ئاست و وێنەیەی کە پێغەمبەرﷺ ئاماژەی پێفەرموبو: ((يُوشِـــكُ أَنْ تَدَاعَـــى عَلَيْكُمُ الأُمَمُ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ عَلَى قَصْعَتِهَا. قَالوا: أَمِنْ قِلَّةٍ نحن يَوْمَئِـــذٍ يَـــا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُم غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ: هێنـدەی نـەماوە کە ئومەتەکانی دیکـە بێنـە سـەرتان وەکـو ئـەو بخۆرانـەی دەچنـە سـەر لەگـەنی ناخواردن.. گوتیان: ئایا لەبەر کەمی ژمارەمان لەو رۆژیدا، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: نەخێر ئەو رۆژی ئێوە زۆرن، بەڵام وەکو ئاومالکی سێلاوێ وان)) [1].

جا ئەوەی گۆڕا چی بو؟... گۆڕانکاریەکەش چۆن ڕویدا؟

گەلێك لاڕێبون [2] لە مێژودا لە کاروانی دورو درێژی ژیانی موسڵمانان رویداوە.

هەمو لاڕێبونێکیش لـە بەرنامـەی پـەروەردگار، کـە لـە ژیـانی موسـڵماناندا رویداوە بێگومان چارەنوسێکی خاو [3] یان خێرای هەبوە بەپێی جـۆری لاڕێبونەکـە و رادەی بڵاوبونەوەو، هەڵوێستی ئومەت لە ئاستیدا بە فەرمانڕەوا و زانا و خـەڵکی ڕەشۆکیەوە.. تا ئەو کاتەی لاڕێبون گەیشتە ئەوپەڕی و چارەنوسەکەشی ئەم لاوازی و زەلیلی و ترسەیە کە ئـەمرۆ دەیبینـین، لـەجیاتی جێنشـینبون و باڵادەسـتبون و ئاسایش.

ئێمە بە تەما نین لەم کتێبەدا باسی تێکـڕای هێڵـی درێـژی لاڕێبـون بکـەین. [4]

---

١ أخرجه أحمد وأبوداود　٢ لاڕێبون: انحراف.　٣ خاو: هێواش

٤ لە کتێبی (واقعنا المعاصر) بە درێژی باسمان کردوە.

بەڵکو لێرەدا باسی جۆرە لاڕێبونێکی دیاریکراو دەکەین، کە ڕەنگە بۆ ژیـانی ئـەم سـەردەمەی موسـڵمانان لـە هـەموی ترسـناکتربێ، یـاخود بریتیـە لـە پوختـەی دەرەنجامی سەرجەم لاڕێبونەکانی مێژو.

زۆربەی بانگخوازە دڵڕاستەکان[1] بەخۆیان وا گومـان دەبـەن کـە ئـەوەی بەسـەر موسڵمانان داهاتوە، بەهۆی لاڕێبونی هەڵسوکەوتیانەوە بـوە لـە وێنـە ئیسـلامیە ڕاستودروستەکە. لەڕێ دەرچونی موسڵمانانیش لە هەڵسـوکەوتدا زۆر لـەوە رونـترە کـە ئاماژەی پێویسـت بـێ.. چونکـە ئـەو دزی و گـزی و دوڕویـی و، لاوازی و ترسنۆکی و چاو لەژێریی و.. بیدعە و گوناحەی بڵاوبۆتەوەو، ئەو لـە دەسـتدەرچون و خاووخلیچکیەی گەنجان تێی کەوتون و.. ئـەو خراپـەکاری و ناڕێکیانـەی خـەڵك تێی کەوتون و، دەیان سیفەت و کرداری دیکە، هـەموی فـڕی بەسـەر ئیسـلامەوە نیە، بەڵکو بریتیە لەو واقیعەی (موسڵمانان) تێیدا دەژین!

لەگەڵ هەندێش لاڕێبونی ڕەفتار، تاکە لاڕێبون نیە لە ژیانی ئەو (موسـڵمانان)ە و، ترسناکترین لاڕێبونیش نیە لە ژیانیاندا، ئەگەر مەسەلەکەش تەنیا لە لاڕێبونـی ڕەفتارەکان کورت هەڵاتبا -لەگەڵ خراپیەکەی- هێشتا زۆر سوکتر بو!

بەڵام مەسەلەکە لـەوە تێپـەڕی و گەیشـتە لاڕێبونـی (چەمکـەکان)[2].. هـەمو چەمکە سەرەکیەکانی ئیسلام هەر لە (لا إله إلاّ الله)وە!

کاتێك مرۆڤێکیش دەبینی لە ڕەفتاریدا لاڕێیە، بەڵام تێڕوانینی بـۆ حەقیقـەتی ئاین دروستە، هەوڵێك دەدەی تا لە لاڕێبونی ڕەفتاری بیگێڕیەوە، بەڵام پێویسـتت بەوە نابێ کە هەوڵدەی بۆ ڕاستکردنەوەی چەمکەکانی، چونکە هەر بەخۆیان لەلای وی دروست و ڕاستن، ئەگەرچی ڕەفتاریشی لەو چەمکانـە لایدابـێ، بـەڵام کـاتێك

---

١ دڵڕاست: مخلص.    ٢ چەمك: مفهوم.

لارێبون له خودی چەمکەکاندا دەبێ، ئایا چەندت هەوڵدان پێویستە تا یەکەجار چەمکەکان راستدەکەیەوەو، پاشانیش رەفتارەکان؟

ئەوە ئەمڕۆ حەقیقەتی بارودۆخی جیهانی ئیسلامیە.

لارێبون له ناوچەی رەفتار تێپەڕیوەو، گەیشتۆتە چەمکە سەرەکیەکانی ئەم ئاینە.

هەر بۆیە ئەمڕۆ ئیسلام بە دەست ئەو نامۆبونە دەناڵێنێ کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردوە: ((بَدَأَ الإِسْلَامُ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ: ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد و، نامۆش دەبێتەوە، هەروەکو دەستی پێکرد.))[1].

بەراستیش نامۆ و غەریبە.. لەنێو ئەهلەکەی نامۆیە، وەك حەقیقەتی خۆی تێی ناڕوانن-سەرەڕای ئەوەی کە رەفتاریان لێی لارێ بوە- بە غەریبی تێدەگەن کاتێك بە وێنەی راستەقینەی خۆی بۆیان دەخرێتە رو، هەروەك لە کتێبی خوا و سونەتی پێغەمبەری خواﷺدا هاتوەو لە ژیانی پێشنە صالحەکانداﷺ بواری پیادەکردنی تەواوی بۆ رەخساوە.

ئێمەش پێویستە روبەڕوی حەقیقەتی مەسەلەکە ببینەوە..

هەر هەوڵێك تەنیا بۆ راستکردنەوەی رەفتار بدرێ-لەگەڵ مانەوەی چەمکەکان بە لارێیی- بەرهەمی تەواو نابەخشێ و، ئومەت لەو نسکۆیە دەرناهێنێ کە لەم سەردەمەدا تێیکەوتوە، بەڵکو پێویستە هەوڵێکی دوقات بدەین تا دوەم نامۆبون نەهێڵین وەك ئەو هەوڵی یەکەمین کۆمەڵی موسڵمانان دایان بۆ لابردنی یەکەمین نامۆیی ئیسلام.

---

١ أخرجه مسلم

جا ئەو هەوڵە دوچەندانەیە بریتیە لەو ئەرکەی کە ئـەمڕۆ لـە ئەسـتۆی رابونـی ئیسلامیدایە.

یەکەم شتیش ئەم هەوڵەی پێ دەستپێبکەین راستکردنەوەی پێڕەوی وەرگرتنە.. تێگەیشـتنمان بـۆ ئـەم ئاینـە لـەکوێ وەربگریـن؟ لـە کتێبـی خـوا و سـونەتی پێغەمبەرەکـەی ﷺ و ژینامـەی سـەلەفی صـالحﷺ؟ یـا لـەوەی تێکـەڵی ئـەم تێگەیشتنە رون و ئاشکرا و راستەڕێیە بوە لە فیکرە غەوارە و خواروخێچەکان، بـە کاریگەری فاکتەری جیاجیـا لـە میانـەی کـاروانی درێـژی ئوممـەتی ئیسـلامی و، بەهۆی لێکسوانی بەردەوامی لەگەڵ تێکەڵەی راڕەو و تێکەڵەی هزری جیاجیا؟!

جا ئەگەر پەیڕەوی وەرگرتنمـان[1] ڕاسـتکردەوەو، بـەپێی ئـەوەش ئـەو چەمکـە سەرەکیانەی ئیسلاممان لـە هەسـتی موسـڵمانانی پاشـینە[2] راسـتکردەوە، هێشـتا ئەرکێکی دیکەمان دەمێنێ کـە بێـترس تـر نیـە لەمـەیان و، بریتیـە لـە ئـەرکی پەروەردەکردن لەسەر چەمکە راستەکانی ئەم ئاینە.

پەروەردەش ئەو هەوڵە راستەقینەیە کە چاوەڕوانی بـەروبومی لێدەکـرێ، بـەڵام بەروبومەکەی نابەخشێ هەتا لەسەر بنچینەیەکی راستودروست دانەمەزرێ.

ئـەم کتێبـەش هـەوڵێکی بچوکـە بـۆ راسـتکردنەوەی هـەندێك لـە چەمکـە ئیسلامییەکان، بە گێڕانەوەیان بۆ وێنەی یەکەم، کـە لـە کتێبـی خـوا و سـونەتی پێغەمبەرەکەیﷺ هەڵێنجراوە، لەگەڵ لابردنی ئەو لاڕێبونانەی لەمیانەی کاروانی مێژویی ئوممەتی ئیسلامی پێیەوە لکاون.

---

[1] پەیڕەوی وەرگرتن: منهج التلقي

[2] پاشینە: خلف.

لەم کتێبەدا باسم لە پێنج چەمکی سەرەکی لــە چەمکــەکانی ئیســلام کــردوە: چەمکی (لا إله إلاّ الله)، چەمکی پەرستن، چەمکی قەزاوقەدەر، چــەمکی دنیــا و ئاخیرەت، چەمکی ژیار و ئاوەدانکردنەوەی زەوی.

خوێنەریش دەبینێ کــە باســی چــەمکی (لا إلــه إلاّ الله) بەشــی هەرەگــەورەی کتێبەکەی داگرتوە، پاشان چەمکی پەرستن دێ، ئەمەش شتێکی سەیر نیە، چونکە (لا إلــه إلاّ الله) پایــەی یەکەمــە و گــەورەترین پایــەکانی ئیســـلامە، لارێبونـــی هەرەگەورەو-هەرە ترسناکیش- لە ژیانی موسڵمانانـدا ئەوەیە کە لـــە چــەمکی (لا إله إلاّ الله) رویداوە! هــەروەها چــەمکی پەرســتنیش، پێشــتر لــەو واتــا فــراوان و گشتگیرەی کە هەیبو، دەنگدانەوە و سەدای لە مەزنێتی ئــەم ئومەتــە و مــەزنێتی دەسکەوتەکانیدا هەبو، هەروەك لە واتا بەرتەسك و لاوازەکەی کــە پێــی گەیشــت، سەدایەکی هەبو لەو واقیعە تەسکەی کە ئەمڕۆ موسڵمانان لەدەستی دەناڵێنن..

کــاتێك ئــەم چەمکانــەش راســتدەکرێنەوەو، لــە دەرونــی موســڵماناندا وێنـــە راستەقینە و زیندو و کاریگەرەکەی بـــۆ دەگەڕێتـــەوە، رێگاکــە-بــەیاریدەی خــوا- ئاسان دەبــێ بــۆ راســتکردنەوەی هــەمو ئــەو خواروخێچــی و لارێبونانــەی توشــی موسڵمانان هاتون و، هەمو ئەو کاریگەریانـــەی لــە ژیــانی موســڵماناندا پــەیدایان کردوە.

جا ئەگەر خوا ســەرکەوتنێکی لــەم هەوڵــە بچوکــە دەســت خســتبم ئــەوا مــن سوپاسگوزاری نیعمەتەکانیم و، سەرکەوتنیشم هەموی هەر لە خواوەیە.

محمد قطب

# بەندی یەکەم

# چەمکی لا إلٰهَ إلاّ اللّٰه

# چەمکی لا إله إلا الله

(لا إله إلاّ الله) یەکەمین و گەورەترین پایەیە لــە ئیســلامدا.. دەکەوێتــە پێــش نوێژ و ڕۆژی و زەکات و حەج و.. هەمو شتێکی دیکە لەم دینەدا.

هەرکەسێکی لە قورئانیش رابمێنێ بێگومان تێبینی ئەو بایەخە مەزنە دەکا کە کتێبی خوا بەدۆزی[1] یەکتاپەرستی داوە کە دۆزی (لا إلــە إلاّ الله)یــە، بەشــێوەیەك کە کەلێنێکی هەرە گەورەی لــە ســەرتاپای قورئــاندا داگــیرکردوە، هەرچــەندە لــە سورەتە مەککەییەکاندا توندتر جەختی لەسەر دەکا.

ڕەنگە لە سەرەتادا وا بەبــەر زەینــدا ڕەت بــێ-هــەروەك لــە کتێبــی (دراســات قرآنیة)دا ئاماژەمان بۆ کردوە- ئەو بایەخە بێرادەیەی کــە لــە کتێبــی خــوادا بــە دۆزی (لا إلــە إلاّ الله) دراوە لەبــەر ئەوەیــە کــە ئەوانــەی لــە ســەرەتادا قورئــان لەگەڵیاندا دواوە خەڵکێکی هاوبەشپەرست بون، بۆیە وا ڕێکبوە کــە پــتر لــە دۆزی یەکتاپەرستی بیــاندوێنی بــۆ راســتکردنەوەی بیروبــاوەڕە پوچــەڵ و بیروبۆچونــە گەندەڵەکانیان لە ئاست دۆزی پەرستراوێتیدا[2].

بەڵام بەردەوامبونی باس و خواســی ئــەم دۆزە لــە ســورەتە مەدینەییــەکانیش، لەپاش دامەزرانی باوەڕ و، بەرپابونی کۆمەڵگەی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیســلامی و پابەندبونی ئــەو کۆمــەڵگەیــە بــە ئــەرك و پێداویســتیەکانی ئیســلام و، لەســەروی

---

١ چەمك: مفهوم　　　دۆز: قضية　　　٢ پەرستراوێتی: الالوهية

هەمووشی جیهاد کردن لەپێناو خوادا.. ئەمانە هەموی بەڵگەی رون و ئاشکران بۆ گرنگێتی خودی ئەم دۆزە، تەنانەت بەگوێرەی ئەو بڕوادارانەش کە خوای گەورە لــە دەسپێکی[1] ئایەتە مەدینەییەکان بە (یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا: ئەی گەلی بــاوەڕداران..) دەیاندوێنێ.

جا دۆزی یەکتاپەرستی-دۆزی (لا إله إلاّ الله)- گوفتارێك نیە بۆ مــاوە کــاتێك بێتە بەرباسان و دواتر لەویەوە بگوازێتەوە بۆ باسـێکی دی، بـەڵکو فەرمایشـتەکە لەگەڵ هەمو باسەکاندا جێگۆڕکێ دەکات و.. هیچ کاتێك نابڕێتەوە.

رەنگە ئەم ئایەتە پیرۆزەیش بەڵگەیەك بێ، بۆچونەکەمان یەکلا بکاتەوە:

﴿یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْکِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَـــى رَسُــولِهِ وَالْکِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِنْ قَبْلُ وَمَنْ یَکْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلاَئِکَتِهِ وَکُتُبِهِ وَرُسُـــلِهِ وَالْیَــوْمِ الآخِرِ وَالْیَوْمِ الآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِیدًا: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بــڕوا بێنــن بە خودا و بە پێغەمبەرەکەی و بڕواتان بەو قورئانە هەبێ کــە بــۆ پێغەمبەرەکـەی ناردوەو بڕواتان بەو کتێبەش بێ کە بەر لە قورئان ناردویە، هەرکەسێکیش بە خودا و فریشــتەکانی و کتێبــانی و پێغەمبــەرەکانی خــودا و ڕۆژی دوایـــی بێبڕوابـــێ، لەرادەبەدەر گومڕایە.﴾النساء/١٣٦.

لێرەدا ئەوانەی بۆ بڕواهێنان بانگ دەکرێن هەر خودی بڕوادارانن: ﴿یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان!﴾ ئەو شـــتانەش کـە بـۆ بـڕوا پێـهێنانیان بـانگ دەکرێن پێشتر تەواو باوەڕیان پێهێنابو! ئەوان بۆ ئەوە بانگ دەکرێـن کـە بـڕوا بـە خودا و پێغەمبەرەکەی و ئەو قورئانــە بێنــن کـە بــۆ پێغەمبەرەکـەی دابــەزاندوە،

---

١ دەسپێك: سەرەتا

لەگەڵ ئەو کتێبانەی کــە پێشــتر هــەناردونی. هــەروەها خــوا لــەدوادوای ســورەتی بەقەرەدا دەربارەیان دەفەرموێ:

﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّــــهِ وَمَلاَئِكَتِــهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ: ئەم پێغەمبەرە و بڕوادارانیــش هــەموو بڕوایان بەو شتە هێناوە کە لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوار و بڕوا دەکەن بە خودا و فریشتەکانی و کتێبانی و سەرلەبەر پێغەمبەران و، دەڵێــن: ئێمــە لــەنێوان پێغەمبەرانی خوا هیچ جیاوازیەك دانانێین.﴾البقرة/٢٨٥.

کەواتە دۆزی (لا إله إلاّ الله) دۆزێکی هەمیشەییە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا. تەنیا بێبڕوایانی بۆ بانگ ناکرێ تا باوەڕی پێ بێنن، تــەنیا (هاوبەشپەرســت)انیشــی بــۆ بانگ ناکرێ تاکو بیروباوەڕیان راستکەنەوە. بەڵکو موسڵمانانیشی بۆ بانگ دەکرێ و وەبیریان دەهێنرێتەوە، تاکو بە زیندویی لە دڵیــاندا بمێنێتــەوەو، لــە ویژدانیــاندا بچەسپێ و، لە ژیانی رۆژانەیاندا کاریگەر بێ و لێی سارد نەبن و لە داخوازیــەکانی غافڵ نەبن:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بڕوا بێنن.﴾

جا سەیر نیە کە هەر دۆزی (لا إله إلاّ الله) دۆز بێ!

هۆی گرنگی پێدانی قورئانیش بەم دۆزە ئەوە نیــە کــە قورئــان کتێبــی ئاینــە! بەڵکو هۆیەکەی ئەوەیە کە قورئان ئەو کتێبەیە کە بەرنامەی ژیان بۆ مرۆڤ دیاری دەکا.[1]

---

١ لە کتێبی (دراسات قرانية) ناماژەم بەم واتایە کردوە.

چونکە ژیانی مرۆڤ راستەڕێ نابێ هەتا ئەو حەقە دەناسێ کە ئاسمانەکان و زەوی پێ وەدیهێنراوەو، تا ژیانیشی لەگەڵ ئەو حەقەدا دەسازێ، ئەوجا لێی لانادا و لە داخوازیەکانی ریزپەڕ نابێ.

حەقیش ئەوەیە کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی دیکە نین.. هەر خوا تەنیا وەدیهێنەرە و.. هەر ئەو تاکە بژێویدەرەو، هەر بەخۆی بەتەنیا زاڵە و بۆ خۆی تاکە مشورگێڕە و هەر بە تەنێ بەسەر هەموو شت ڕادەگا و.. لەخودای مەزن بترازێ کەسێك نیە وەدیهێنەر یا بژێویدەر یا مشورگێڕی کاران بێ.

داخوازی گشت ئەمانەش ئەوەیە کە بە تەنیا بپەرسترێ و کەسی بۆ نەکرێتە هاوەڵ و پەرستن[1] لەو بترازێ ئاراستەی کەسی دی نەکرێ.

سەرەڕای ئەوەی ئەمانە مافی خودایە لە سەر بەندەکانی، چونکە مافی وەدیهێنەری بژێویدەری بەهرەبەخشی خاوەن فەزڵە کە پەرستن بێجگە لەوی ئاراستەی کەسانێك نەکرێ کە هیچیان وەدی نەهێناوەو بژێوی کەسیان نەداوەو فەزڵیان بەسەر کەسدا نەبوە..

سەرەڕای ئەمانەش ئەمە دۆزی خودی مرۆڤە..

چونکە خودای وەدیهێنەری بژێویدەری بەهرەبەخشی خاوەن فەزڵ شایستەیە تەنیا و تەنیا پەرستن بەو تایبەت بکرێ و چونکە هەر خوا تاکە پەرستراو و تاکە پەروەردگارە، بەڵام خودای پاك و بەرز لە بەندان و پەرستنیان بێنیازە و، مولکی وی چی لێناگۆڕێ ئەگەر بەندەکانی خۆی بیپەرستن، یاخود بڕوای پێ نەهێنن!

لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموێ: ((**يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ مُؤمِنَكُمْ وَكَافِرَكُمْ وَبِرَّكُمْ وَفاجِرَكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي**

---

١ پەرستن: عیبادەت.

شَيْئًا، وَلَوْ أَنَّ أَنَّ مُؤْمِنَكُمْ وَكافِرَكُمْ وَبِرَّكُمْ وَفاجِرَكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ مِنْكُمْ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا: ئەی بەندەکانم! ئەگەر بڕوادار و بێبڕواتان، چاك و خراپتان وەکو دڵی پارێزکارترین پیاو بان لەناو خۆتان، ئەمە هیچی لە موڵکی من زیاد نەدەکرد و، ئەگەر بڕوادار و بێبڕواتان، چاك و خراپتان، وەکو دڵی خراپەکارترین پیاوی نێو خۆتان بان هیچ شتێکی لە موڵکی من کەم نەدەکردەوە.))[1].

هەروەها خوای بەرز لە قورئانی پیرۆزدا لەسەر زمانی موسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى إِنْ تَكْفُرُوا أَنْتُمْ وَمَنْ فِي الأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ: موسا گوتی: جا ئەگەر ئێوە و هەرکەسێکی لەسەر ئەم زەویەیە بێبڕوابن، خوا دەوڵەمەندە و نیازی بە هیچ کەس نیە و هەر شیاوی ستایش کردنە.﴾ابراهیم/٨.

کەچی باری مرۆڤ جیایە..

لەلایەکەوە بۆ یەك چرکە لە ژیانیدا لە فەزڵی خوا بێنیاز نابێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ: ئەی خەڵکینە! لەبیرتان بێ خودا چەندی چاکە لەسەر ئێوە هەیە، ئاخۆ غەیری خودا، وەدیهێنێك هەیە کە لە ئاسمان و زەویدا بژێوی ئێوە دابین کا؟ غەیری خۆی هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ، جا چۆن لەڕێگە دەردەکرێن.﴾فاطر/٣.

لەلایەکی دیکەوە مرۆڤ هەر بە سروشت و فرچکی خۆی پەرستیارە. هیچ چرکەیەك لە تەمەنی تێناپەڕێ کە شتێکی تیا نەپەرستێ، جا ئاگای لێبێ یا لێی

---

[1] أخرجه مسلم.

بێئاگا بێ.[1]

بانگەوازی شەیتانە:

﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَابَنِي آدَمَ أَنْ لاَ تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ، وَأَن اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ: ئەی تورەمەی ئادەم! من لە پێشدا پەیمانم دەگەڵ نەبەستن کە شەیتان نەپەرستن، ئەو بە ئاشکرا دوژمنتانە. هەر تەنیا خۆم بپەرستن، کە ڕێگەی ڕاست هەر ئەمەیە.﴾یس/٦٠-٦١.

هەروەها لە پێکهاتەی مرۆڤدا -لەو فرچکەی خودا پێوە وەدیهێناوە- خۆشویستنێکی قوڵی ئارەزوەکان هەیە کە خودای بەرز بەم شێوەیە وەسفی دەکا:

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأنعام وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا..: ئارەزوی ژنان کردن و کوڕێ زۆر پەیداکردن و دەسکەوتنی کۆمەڵە زێڕ و زیوی گەورە و ڕەوە ئەسپی بە درۆشم و وڵسات و زەوی کێڵانی، بۆ مەردم ڕازاوەتەوە لە ژیانی دنیایەدا مایەی خۆشین..﴾آل عمران/١٤.

هەرچەندە ئەم ئارەزوانەش لەبەر حیکمەتێکی خوای گەورەیە کە لە پێکهاتەی فرچکی مرۆڤدان،[2] بەڵام هەر ئەمانە ئەو دەروازانەن کە شەیتان مرۆڤیان لێوە

---

١ تەنانەت ئەوانەی بەخۆیان دەڵێن -بێدین- و خۆیان بە فەرمەسۆنیش تێدەگەن و بروایان بەهیچ نیە و هیچ ناپەرستن. لە ڕاستیدا بەندە و پەرستیاری هەوەس و ئارەزوەکانی خۆیانن، هەروەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتَ مَنْ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ: ئاخۆ تۆ ئەو کەسەت دیوە کە ئارەزوی خۆی دەپەرست؟﴾الجاثية/٢٣.

٢ ئەمانە بریتین لەو پاڵنەرانەی کە خودا دەزانێ بۆ مرۆڤ پێویستن یاکو ڕۆحی جێنشینی لەسەر زەویدا بگێڕێ، بەڵام لەو سنورانەی کە خودا ڕێگەی پێداوە، لە هەمان کات بریتین لە خاڵی تاقیکردنەوە لە ژیانی مرۆڤ.. سەیری بەندی داهاتوو (چەمکی پەرستن) بکە.

دانەخۆرە[1] دەكات، تاكو بەشـێوەیەكی كـاتی لـە پەرسـتنی خـودا دوری خاتـەوە، هەروەكو لە ئەنجامدانی گوناهان دێتە دی: ((**لا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ**..: زیناكەر زینا ناكا كاتێ بڕوادار بـێ و دز دزی ناكا كاتێ بڕوادار بێ.))[2]

یاخود بە تەواوی دوری دەخاتەوەو پەیوەندی لەگەڵ خوادا دەپچڕێ جا یا توشـی هاوبەشدانان یا بێبڕوایی یا نكوڵی كردن دەبێت:

﴿**قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ، ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّـــنْ بَيْـــنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَمَآئِلِهِمْ وَلاَ تَجِدُ أَكْـــثَرَهُمْ شَـــاكِرِينَ**: گوتی: چونكە لەڕێت لادام، منیش بۆیان ڕۆدەنیشـم، ڕاسـتەڕێی تۆیـان لێدەگـرم، ئەوسا لە پێش و پاشەوە بۆیان دەچم، ڕاسـت و چەپیشـیان لێدەگـرم، جـا دەبینـی زۆرینەیان شوكور ناكەن.﴾الأعراف/١٦-١٧.

دیارە ژیانی مرۆڤ كە بەندەی خودابێ یەكسان نیە بەوەی كە بـەندەی شـەیتان بێ:

﴿**أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبًّا عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيًّا عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ**: ئاخۆ كەسێ دەمەوڕو بە عەردا دەخشێ چاكتر ڕێنوێن بـوە، یـان ئـەو كەسـەی بـە ئاسانی بەسەر ڕاستەڕێدا دەڕوا؟﴾الملك/٢٢.

﴿**قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ قُلِ اللَّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَـــاءَ لاَ يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْـتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ**: بڵێ: كێیە پەروەردگاری ئەم ئاسمانان و زەمینە؟ بڵێ: خودا. بڵێ:

---

١ دانەخۆرە: استدراج.

٢ أخرجه البخاري ومسلم.

ئاخۆ گەورەگەلێکتان بۆ لە خودا هەڵبژاردووە، کە قازانج و زیانی خۆشیان بەدەست نیە؟ بڵێ: ئاخۆ کوێر و بینا بەرانبەرن؟ ئاخۆ تاریکی و روناکی سەربەسەرن؟﴾الرعد/١٦.

لە چاکە و بەخشندەیی خوایە، کاتێك بەندەکان مافی سەرشانیان بەرامبەر خودا جێبەجێ دەکەن کە بە تاکە پەرستراو و تاکە پەروەردگاری دادەنێن و، دڵڕاستانە پەرستنی ئاراستە دەکەن، دەکەونە سەر چاکترین بار هەروەك خوا وەدیهێناون و، ژیانیشیان لە دنیادا دەبێتە چاکترین و پاکترین و جوانترین ژیان. لە ئاخیرەتیش ئەو پاداشانە وەردەگرن کە خوا بەڵێنی پێداون. لەکاتێکدا گەر کافر بن رابواردنی دنیایان وەك ئاژەڵ دەبێ و لە ئاخیرەتیش دوچاری ئەو سزایە دێن کە خوا بەڵێنی پێدابون.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الأنعام وَالنَّارُ مَثْوًى لَهُمْ: ئەوانەی خوداشیان نەناسیوە، لەدنیادا ڕایدەبوێرن و دەلەوەڕێن، وەك لەوەڕانی ئاژەڵ و جێگەیان لە ئاگردایە.﴾محمد/١٢.

﴿وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَى فَبَشِّرْ عِبَادِ: ئەو کەسانەی لە پەرستنی بتەکان تەکیونەوەو، بەرەو خوا گەڕاونەوە، خۆشی لەوان، سا تۆش مژدە بە عەبدەکانی من بدە.﴾الزمر/١٧.

هەر بۆیە مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە (لا إله إلاّ الله)یە.

بێبڕوا بێ یاخود هاوبەشپەرست پێویستیەتی تا بنچینەی بیروباوەڕی پێ ڕاستکاتەوە. ئەگەر بڕواداریش بێ هەر پێویستیەتی تا هۆشیار و وەئاگابێ و دەروازەکانی شەیتان لە دەرونی خۆی تەسك بکاتەوە، تاوەکو لە ئەرکی پەرستنی رەواو راستی خودا گومڕای نەکا.

له هەمو بارێکیشدا (لا إله إلاّ الله) ئەرکێکی دیاریکراوی لە ژیانی مرۆڤدا هەیە و، هەرگیز نابێتە تەنیا (واژەیەك)[1] کە بەبادا هەڵدرێ و چ پێداویستی نەبێ و کاریگەری لە ژیاندا نەبێ.

* * *

ئێستا با بڕوانینە ئەو رۆڵەی (لا إله إلاّ الله) لەژیانی نەوەی یەکەمینەوە ﷺ گێڕاویەتی، با پێشتریش تەماشاکەین بۆچی عەرەبە هاوبەشپەرستەکان رەتیان کردەوەو ئەو ململانێیە توندو تاڵەی بانگەوازەکەیان کرد کە مێژوو پێی ئاشنایە و شایەدی بۆ دەدات.

(لا إله إلاّ الله) بانگەوازی سەرجەم پێغەمبەرەکانە، سەلامی خوایان لێبێ، هەر لە ئادەم و نوحەوە تا موحەممەد ﷺ، هەڵوێستی جاهیلیەتیش لە بەرامبەریدا یەك هەڵوێستە و بەدرێژایی مێژو نەگۆڕاوە و، بریتی بوە لە هەڵوێستی رەتکردنەوەو بەرانگژبونەوەو پشت تێکردن و لالێگرتن.

جا دەبێ ئەو شتە چ بێ کە وا دەکا جاهیلیەت بە درێژایی مێژو ئەو هەڵوێستە یەکانگیرەی هەبێ بەتایبەتی لەلایەن خۆ بەزل زانانی هەمو جاهیلیەتێك.

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ، أَنْ لاَ تَعْبُدُوا إِلاَّ اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ، فَقَالَ الْمَلاَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَرًا مِثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِنْ فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ: نوحمان ناردە لای هۆزەکەی، کە: من بۆتان ترسێنەرێکی ئاشکرام، جگە لەخوا مەپەرستن، نیگەرانم نەوەك رۆژێ ئازاری بە ژانتان توش بێ.. خۆ بە زل زانانی هۆزەکەی -کە خوانەناس بون- گوتیان: وەك

---

١ واژە: کلمة (عبارة).

ئێمە دەتبینین تۆش مرۆڤێکی وەك خۆمان، ئەمانەش کە شوێن تۆ کەوتون، روتە و پوتەی بێئاوەزن، نەشمان دیوە شتێکتان لەمە زیاتر بێ، بەڵکو ئێمە پێمان وایە درۆ دەکەن.﴾هود/٢٥-٢٧.

﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ مُفْتَرُونَ، ....، قَالُوا يَاهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا عَنْ قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ: بۆ لای عادیش هودمان نارد-کە برایان بو- گوتی: گەلۆ! هەر خودای تاك بپەرستن، بە غەیری ئەو ئێوە خودایەکتان نیە، ئێوە تەنیا هەر درۆیان دەنەخشێنن.... گوتیان: ئەی هود! تۆ هیچ بەڵگەت لە خوداوە بۆ نەهێناین، هەر بە قسەی تۆش، ئێمە لە پەرستراوەکانمان دەست بەرنادەین، بڕوایەش بەتۆ ناهێنین.﴾هود/٥٠، ٥٣.

﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنْ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ، قَالُوا يَاصَالِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَذَا أَتَنْهَانَا أَنْ نَعْبُدَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ: بۆ لای ثەمودیش صالحی برایانمان نارد. گوتی: گەلۆ هەر خودای تاك بپەرستن، ئێوە غەیری ئەو خودایەکتان نیە، ئەو لەم خاکەی وەدیهێنان و ویستی ئاوەدانی بکەن، لێبوردنی لێبخوازن، پاشان بەرەو خوا بگەڕێنەوە. پەروەردگاری من نزیکە و بەفریاتان دێ.. گوتیان: ساڵح! بەر لە ئێستێ جێگەی هومێدی ئێمە بوی، ئاخۆ رێ نادەی ئەوانەی باوانمان دەیانپەرست، بیانپەرستین؟ ئێمە لەوەی کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، بە گومانین و دودڵین.﴾هود/٦١-٦٢.

﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ وَلاَ تَنقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ إِنِّي أَرَاكُمْ بِخَيْرٍ وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُحِيطٍ.... قَالُوا يَاشُعَيْبُ أَصَلاَتُكَ تَأْمُرُكَ أَنْ نَتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ إِنَّكَ لَأَنْتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ: بۆ مەدیەنیش شوعەیبی برایانمان نارد. گوتی: گەلۆ! خودای تەنیا بپەرستن! بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکتان نیە. لە کێشان و پێوانەدا گزی مەکەن. خۆشگوزەرانتان دەبینم و من لەو رۆژە ترسم هەیە ئازاری سەرتاپاگرتان بۆبێ..... گوتیان: شوعەیب! ئایا نوێژەکەت فەرمانت دەدا ئێمە واز لەو شتە بێنین کە باب و باپیرانی ئێمە دەیانپەرست، یان وەك حەزمان دەمانەوێ لە دارایی خۆماندا دەسکاری نەکەین؟ بەڕاستی کە تۆ پیاوێکی سەردخۆ و بەسەلیقەی.﴾هود/٨٤، ٨٧.

جا جاهیلیەتی عەرەبان تازە داهێنراوێك نەبو لەو جاهیلیەتانە جودابێ کە هەرانگژ بانگەوازی پێغەمبەرەکانی پێشو دەبونەوە، ئەی بۆچی جاهیلیەتی عەرەبان ئەم هەڵوێستە ملهوڕانەی وەرگرت، کە هەمان هەڵوێستی جاهیلیەتەکانی پێشو بو؟

ئایا هەر لەبەر واژەکە بو؟ یا لەبەر مەدلول و داخوازیەکانی؟ ئایا مەدلولی ئەم واژەیە لە هەستی ئەواندا چیبو؟ بەپێی مەدلولی واژەکەش، جیاوازی چی بو لەنێوان ئەو شێوە ژیانەی تێیدابون لەگەڵ ئەو شێوە ژیانەی کە بۆی بانگەواز دەکران، یان پێیان وابو لە ژیانی نێو (لا إله إلاّ الله)دا هەیە؟

هەرچی خودی واژەکەیە، دور لە داخوازی و مەدلولەکانی، وا لە قوڕەیش ڕەچاو نەدەکرا کە ئەمجۆرە هەڵوێستە توندە لاملانەی لە ئاست وەرگرن کە وەریانگرت و ئەو هەمو کێشە و ململانێیەی لەپێناودا ئەنجام بدەن کە ئەنجامیان دا، تا

وایلێهات کاروباریان لەدەست دەرچو و، چەندین سوارچاکیان لیٚ کوژران.. هەروەها لە عارەبەکانی دیکەش رەچاو نەدەکرا تەنیا لەبەر واژەیەك ئەو ململانێ گەورەیە بکەن، ئەگەر ئەو واژەیە هیچی لە ژیانیاندا نەگۆڕیبا و، هیچی بەرەوپێش نەبردبا و هیچیشی وە دوا نەخستبا.

بە گوێرەی قورەیش، خۆ ئەگەر هەر هۆزێك شاعیرێکی تێدا هەلکەوتبا ئەوا شانازی بەسەر هۆزەکانی دیکەدا دەکرد و خۆی پێ هەلدەکێشا، چ جای ئەوەی کە پێغەمبەرێکی تێدا دەرکەوێ! بەتایبەتی قورەیشیش کە سەرکردایەتیەکی (ئاینی) هەبو، ئەمەش لە هەمانکاتدا پلەو پایەیەکی سیاسی و ئابوری بەرچاوی پێدەبەخشی، کە پێغەمبەرێکیشی تێدا لەدایکبو پتر سەرکردایەتیە ئاینیەکەی بەرجەستە دەکرد و باشتریش جەختی[1] لەسەر پلەو پایە سیاسی و ئابوریەکەی دەکرد و پتەوتری دەکردن.

ئەدی بۆچی قورەیش رەتی کردەوە واژەکە بلێ.. ئەگەر تەنیا واژەیەکی سەرزارەکی بو؟

پێغەمبەرﷺیش کاتێ تکای موسلمان بونی لە ئەبوتالیبی مامی دەکرد پێی فەرمو: ((**قُلْها يَا عَمِّ! كَلِمَةٌ أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّـهِ**: دەبیلێ مامە! واژەیەکە شەفاعەتت لەلای خوا بۆ پێدەکەم)). ئایا لە ئەبوتالیب رەچاو دەکرا کە یەك واژە رەت کاتەوە ئەگەر تەنیا واژە با و بەس، واتە ئەگەر هیچ پێداویستیەکی نەبان و، هیچ گۆڕانکاریەك وابەستەی گوتنەکەی نەبا؟ یا بۆیە رەتی کردەوە چونکە گۆڕانکاریەکی تەواوی لە سەرتاپا بەرنامەی ژیان دەهێنا ئارا لەگەل هەمو ئەو لایەنانەی بە ژیانەوە پەیوەست بون؟

---

١ جەخت: تاکید

ئەوە بەڵگەنەویستێکە پێمان وانیە چ مشتومڕێك هەڵگرێ.

جیاوازی نێوان ئەو شێوە ژیانەی لەسەری بون لەگەڵ ئەو شێوە ژیانەی کە بۆی بانگەواز دەکران گەلێك گەورەبو، بەرهەڵستیکردنیشیان لەم بانگەوازە گەلێك شێوە و هۆکاری هەبو.

دۆزی سروشیان بەدرۆ دانا و..

زندوبونەوەو حەشر و لێپرسینەوەو پاداش و سزایان بەدرۆ دانا و.. رازی نەبون پەرستراوەکانی خۆیان بە یەك پەرستراو بگۆڕنەوە..

ئەوەشیان رەت دەکردەوە کە دابی باب و باپیرانیان جێبێڵن و بکەونە دوای ئەوەی خودا دایبەزاندوەو.. حەڵاڵ و حەرامیشیان بەپێی فەرمانەکانی خوا بێ..

• ئەمانە سەرباری مەسەلە (ئاکاریەکان)ی دیکەی وەکو شەراب و قومار و زینا و کوشتن و دزی و تالان و زیندەبەچاڵ کردنی کچان و خواردنی ماڵی هەتیو و زوڵم و زۆرداری و دەستدرێژی کردنی بەناحەق، کە لە نێوانیاندا بلاو بو..

بەکورتی.. رازی نەبون (ئاین) لە خواوە وەرگرن، بە واتا فراوان و گشتگیرەکەی کە بیروباوەڕ و دروشمەکان[١] و حەڵاڵ کردن و حەرامکردن و ئاکار و تێڕوانینەکان دەگرێتەوە. هەروەك ئەوەشیان رەتدەکردەوە پابەندی ئەو ئەرکانە بن کە ئاینی خوا پێیان رادەسپێرێ.

گرنگترینی ئەو دۆزانەش کە قورئانی پیرۆز جەختی لەسەر کردون، بریتین لە دو دۆزی سەرەکی، کە هەمو دۆزەکانی دیکە لە دو توێیاندا کۆدەبنەوە: دۆزی روکردنە خودای تاك و تەنیا بۆ پەرستن و، دۆزی شوێنکەوتی ئەو فەرمایشتانەی خودا لەبابەت حەڵاڵ و حەرامەوە دایبەزاندون:

---

١ گشتگیر: شامل          دروشمەکان: شعائر

﴿وَعَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ، أَجَعَلَ الآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ: ئەمەیان پێ سەیر بوە کە پێغەمبەرێکیان لەخۆیان بۆ هاتوە و ترسی خوایان وەبەر دەنێ، خودا نەناسەکان گوتیان: ئەم کابرایە جادوگەری درۆزنە، چۆن دەیەوێ لەجێی ئەو هەمو بتانەی دەتانپەرست، هەر خودایەك بپەرستن؟ ئەمە زۆر شتێکی سەیرە.﴾ص/٤-٥.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ: ئەگەر بەوانە بگوترێ: ئەوەی خودا ناردیە خوارێ ئێوە پەیڕەوی لێبکەن، دەڵێن: ئێمە هەر پەیڕەوی ئەو شتانەین کە باوانمان لەسەری بون.. با شەیتانیش بانگیان بکا بۆ ئەشکەنجەی ئاگری دۆزەخ.﴾لقمان/٢١.

قورئان هەڵوێستی هاوبەشپەرستی لە ئاست ئەم دو دۆزە زۆر بە وردی لە سورەتی (ئەنعام) و سورەتی (نەحل)دا کورتدەکاتەوە:

﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِنْ شَيْءٍ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ حَتَّى ذَاقُوا بَأْسَنَا: ئەوکەسانەی شەریك بۆ خودا دەناسن، دەڵێن: خودا مەیلی لێبا، ئێمە و باب و باپیرانمان، بتپەرستیمان نەدەکرد، هیچ شتیشمان لەخۆمان حەرام نەدەکرد، ئەوەی بەر لەوانیش هەبون، هەر بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێنا تا ئەوکاتەی کە جەزرەبەی ئێمەیان چەشت..﴾الأنعام/١٤٨.

﴿وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ نَحْنُ وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ كَذَلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ: ئەوکەسانەی شەریکیان بۆ خوا پەیدا کرد، گوتیان:

ئەگەر خوا مەیلی لێبا، نە ئێمە و نـە بـاب و باپیرانمـان، غـەیری خـۆی هیچمـان نەدەپەرست، هیچمان بێ فەرمانی ئەو بە ناڕەوا نەدەزانی.. ئەوەی پێش ئـەوانیش هەبون هەر وایانکرد. پێغەمبەران جگە لە راگەیاندنی بە ئاشـکرا، چـی دیکـەیان لەسەر هەیە؟﴾النحل/٣٥.

هاوبەشپەرستی-لە وێنە بیروباوەڕیەکـەیدا- لـە بیروبـاوەڕ بـەبونی پەرسـتراوی دیکە بێجگە لە خودا رەنگدەداتەوە، وێنە کرداریەکەشی لە روکردنە غەیری خوا بۆ پەرستن و حەرامکردن و حەڵاڵکردن بێجگە لە خودا رەنگ دەداتەوە.

هەر لەبەر ئەمەش بو هاوبەشپەرستانی عـەرەب رازی نـەبون واژەی (لا إلـه إلاّ الله) بلێن.

* * *

پێشتر ئاماژەمان[1] پێکرد کە ئەم هەڵوێستە-هەڵوێستی رەتکردنەوەو بەربەسـت کردن- تەنیا تایبەت نەبو بە جاهیلیەتی عارەبی، بەڵکو مەسەلەیەك بو لە هـەمو نەفامیەکانی پێشوتریش دا هەبو هەردو ئایەتەکەی سـورەتی (ئـەنعام) و سـورەتی (نەحل) کە پێشتر یادمان کردن ئاماژە بە هەندێ دەکەن:

﴿كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾

﴿كَذَلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾

هەروەها تێکڕای بەسەرهاتەکانی پێغەمبەران ئاماژە بەو حەقیقەتـە مێژووییـە دەکـەن. لـە هـەر جاهیلیـەتێکی کـە پێغەمبـەرێکی بـۆ رەوان کرابـێ دەبینـین پایەدارەکان[2] خێرا تەگەرە لەبەردەم پێغەمبەرەکە دادەنێـن و بـە درۆی دادەنێـن و

---

[1] ئاماژە: اشارة

[2] پایەداران: ملأ

هەوڵ دەدەن لە بانگەوازەکەی پەژیوانی کەنەوەو، (جەماوەر)ی بێتینکراویش[1] دەبینین بەدوای گەورەکانی خۆیان دەکەون-بڕێکی کەمیان نەبێ- و بەربەست دەخەنە ڕێگەکە.

جاری واش دەبێ جەماوەر رازی نابێ واز لەو چەند خواپەرستنە بێنێ کە پێی راهاتوە، چونکە جەماوەر-لە جاهیلیەتەکەیاندا- پتر بە جیهانی هەستەوە نوساون، جا ئەم پەرستراوە هەستپێکراوە نێزیکانە لاڕێبونە نەفامانەکانیان تێر دەکا و، هەرکاتێك بینیان یا دەستیان لێدا یان قوربانی ، یان دروشمەکانی پەرستنیان پێشکەش کردن، ئەمە وایانلێدەکا هەست بکەن بەشێوەیەکی ماددی بەرهەست لە خواوەندەکانیان نێزیکن!

پایەدارانیش-کە خۆیان لە جەماوەر بە ڕۆشنبیرتر و بەرزتر دادەنێن- هێندە مەسەلەی خواوەندە داهێنراوەکان نایانجولێنێ بۆ شەری ئەو پێغەمبەرەی بۆیان رەوانکراوە، هێندەی مەسەلەی (دەسەلات) دەیانجولێنێ!

ملکەچییان بۆ ئەم پەرستراوانە زیاتر شێوەیی‌یە لەوەی راستەقینە بێ! داکۆکیشیان[2] لەو پەرستراوانە-هەرچەند گەرمیش بێ- لە بیروباوەڕبون بە خواوەندایەتیان هەڵناقولێ هێندەی لەوە هەڵدەقولێ کە ئەو پەرستراوانە ئامرازێکن بەناوی ئەوانەوە جەماوەر دەکرێنە کۆیلە و، دەسەلاتێکی پیرۆزی هەڵێنجراو لە پیرۆزی ئەو پەرستراوانە لە دڵی جەماوەردا بۆ خۆیان دروست دەکەن!

بەلام دۆزە راستەقینەکە بەگوێرەی ئەوان دۆزی حاکمیەتە: کێ حوکمی ئەم جەماوەرە دەکا؟ ئەوان؟ یا خودا-پاکی و بەرزی بۆ وی- لە ڕێگەی فەرمانڕەوایی شەریعەتەوە؟

---

١ بێتینکراو: مستضعف.

٢ داکۆکی: دفاع

ئەمە ئەو دۆزە راستەقینەیە کە لە هەمو جاهیلیەتێکدا دەماری (پایەداران) دەگرێ[1] تا دژی بانگەوازی (لا إله إلاّ الله) بجەنگێن.

دەسەلات لەدەستی ئەواندا نیە، دەسەلاتی یاسادانان کە جەماوەری پێ بەرێوەدەبەن-وپێ زەبونیان[2] دەکەن- لە بنچینەدا دەسەلاتی ئەوان نیە، بەلکو مافی خودای وەدیهێنەری بژێویدەری بەهرەبەخشی خاوەن فەزڵە، کە ئافەریدانی[3] وەدیهێناوە، پاشان بژێوی داوەو بەهرە و فەزلی بەخشیوە، بۆیە هەر تەنیا مافی خۆیەتی کە حەلاڵ و حەرام دانێ و، رێگەبدا و قەدەغەبکا و، لەو بترازێ کەسێکی دی مافی یاسادانانی-حەلاڵ و حەرامکردن- نیە، تەنیا ئەگەر وەکو خوا وەدیهێنەربێ و وەکو خوا بژێویدەر بێ و، وەکو خوا بەهرەبەخش و خاوەن فەزڵ بێ، خوداش: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ: هیچ شتێ وێنەی خوا نیە.﴾الشوری/١١.

﴿أَفَمَنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لاَ يَخْلُقُ أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ: ئاخۆ خودای وەدیهێنەر، چۆن وەکو ئەو کەسە وایە، کە ناتوانێ هیچ وەدی بهێنێ؟ ئاخۆ ئێوە پەند ناگرن؟﴾النحل/١٧.

﴿هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ: ئاخۆ غەیری خودا، وەدیهێنێك هەیە کە لە ئاسمان و زەمیندا بژێوی ئێوە دابین کا؟ بە غەیری خۆی هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ، جا چۆن لەرێگە دەردەکرێن.﴾فاطر/٣.

بەلام (پایەداران) خۆیان لەئاست ئەم راستیە نەفام دەکەن و، لە بەرامبەر بنچینە (بیروباوەریەکان) و داخوازیە کرداریەکان خۆ گێل دەکەن، کاتێك لە دەسەلاتدا دەبنە کەڵەگا[4]-جا بە دیکتاتۆریەتێکی راشکاو حوکم بکەن، یا لە

---

١ دەمارگرتن: استفزاز ٢ زەبون: ذلیل ٣ ئافەریدە: مخلوق.

٤ کەڵەگا: مستبد .

پەناپەردەیەکەوە وەکو حاڵــەتی (دیموکراســی)[1]، هــەروەها چ حــەز و ئارەزووەکــانی جەماوەر تێرکەن یا تــەنیا بــە حــەز و ئــارەزووە تایبەتیــەکانی خۆیــان وازبێنن[2] و، بەردەوام رەگی دەسەڵاتیان بە (سیستەمەکانی) حوکـم و (دەسـتور)ە عورفیـیەکان یــان نوســراوەکان دادەکوتــن، کــە مــافی حــەڵاڵ و حــەرامکردن و، رێگــەپێدان و قەدەغەکردنیان دەداتە دەست..

جا ئەگەر پێغەمبەرێك لەلایەن خوداوە هات و گوتی (لا إله إلاّ الله)، ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ: خوا بپەرستن چونکە غەیری ئەو چ خواوەندێکی دیکەتان نیە﴾ سەرتاپای هەڵوێستەکە دەگۆڕێ!

رەنگە پایەداران لەنێو خۆیاندا لەســەر ئــەوە نــاکۆك بــن کــە کــێ (دەســەڵات) بگرێتە دەست و جەماوەر بکاتە کۆیلە. یــا رەنگــە لــەنێوان خۆیــان و جــەماوەردا ناکۆك بن-هەوەك لە دیموکراسیدا رویدا- لەسەر ئەوەی چ برە دەسەڵاتێك لەدەســت خۆیان دەهێڵنەوەو چ برێك یــا کــەل و پارچەیــەك بەردەدەنــەوە تــا جــەماوەر پێــی بخافڵێ، بەڵام کاتێك پێغەمبــەرێك دێ کــە دەڵــێ: (لا إلـه إلاّ الله) خــوا بپەرســتن چونکە غەیری ئەو چ خواوەندێکی دیکەتان نیە، ئەوا کرۆکی[3] مەسەلەکە دەگــۆڕێ و.. دەبێتە مەسەلەیەك هــەر لــە بنــەڕەتدا دەســەڵات لــەنێو دەســتی پایــەداران و

---

١ ئەگەر دەتەوێ بڕوانە بەشــی (دیموکراسی) لــە کتێبــی (مذاهب فكرية معاصرة)، لــەوێ روونمــان کردۆتــەوە چــۆن ســەرمایەداری بــەناوی دیموکراســی حوکــم دەکــا و بــە چ شــێوەیەك هــەمو بەرژەوەندیەکانی خۆی وەدیدێنێ و گەلیش وا تێدەگا هەر بەخۆی سەرچاوەی دەسەڵاتە.

٢ بەتایبەتی لە دیموکراسیدا گەلێك ئارەزوی دابەزیوی جەماوەر، وەکــو بەشــێك لــە گەمــە گەورەکــە تێردەکرێ، بۆ رەتکردنی بەرژەوەندیەکانی سەرمایەداری فەرمانڕەواو خەڵــەتاندنی جــەماوەر بــەوەی کە بەخۆی خاوەن دەسەڵاتە!

٣ کرۆك: جوهر

تەنانەت لە دەست هـەمو مرۆڤـانیش دەردێنـێ و، بـۆ خـودای خـاوەن دەسـەڵات دەیگێڕێتـەوە، کـە خـاوەنی مـافی قەدەغـەکردن و ڕێپێـدان و، حـەڵاڵکردن و حەرامکردنە!

هەربۆیە (پایەداران) چەندین قاتی راچڵەکانیان لـە رکابـەرانی دەسـەڵاتی سـەر زەوی، لە بانگەوازی (لا إله إلاّ الله) دەترسێن و دادەچڵەکێن و، هەمو هێز و وزەی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ جەنگی ئەم بانگەوازە و، هەمان جەماوەریش دەکەنە یەکێك لەو کەرەستانەی کە بۆ ئەم جەنگە بەکاریان دێنـن، هـەندێ جـار بـە سـاختەکاری حەقیقەتەکان و، جارجارێکیش بە تیرۆر و تۆقاندن!

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُبَدِّلَ دِينَكُـمْ أَوْ أَنْ يُظْهِرَ فِي الأَرْضِ الْفَسَادَ: فیرعەون وتی: لێم گەڕێن موسا بکوژم، با ئەو هـاوار بۆ پەروەردگاری خۆی بـەرێ، مـن دەترسـم دینەکـەتان بگۆڕێـت و پەشـێوی لـەم زەمینەدا بنێتەوە.﴾غافر/٢٦.

﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ مُوسَى وَهَارُونَ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ بِآيَاتِنَـا فَاسْـتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُجْرِمِينَ، فَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ مِنْ عِنْدِنَا قَالُوا إِنَّ هَذَا لَسِحْرٌ مُبِـينٌ، قَالَ مُوسَى أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَكُمْ أَسِحْرٌ هَذَا وَلاَ يُفْلِحُ السَّاحِرُونَ، قَـالُوا أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا الْكِبْرِيَاءُ فِي الأَرْضِ وَمَا نَحْـنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ: ئنجا ئەوە موسا و هارونمان بـە نیشـانەکانی خۆمانـەوە نـاردە لای فیرعەون و سەرزلەکانی دیوانی. خۆیان گەلێك بە زل زانی و تاوانکـار بـون، کاتـێ راستیان لەلای ئێمەوە پێگەیشت، گوتیان: ئەمە هەر بە ئاشـکرا جـادوە.. موسـا گوتی: وەختێ ئەم راستیەتان پێگەیوە، پێـی دەڵێـن جـادو؟ کـە جادوگـەر رزگـار نابن.. گوتیان: ئاخۆ هەر بۆ ئەوە هاتیە لامان، کە لەوانەی باب و کاڵمان لەسـەری

بون، وەرمان گێڕی و ئاغایەتی ئەم زەمینە بۆ ئێوە بێ؟ بەڵام ئێمە باوەڕمان پێتان نیە.﴾یونس/٧٥-٧٨.

﴿فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ: زانی کاری ژێردەستەکانی سوکە، گشت بە فەرمانی ئەویان کرد، ئەوان هۆزێکی لارێ بون.﴾الزخرف/٥٤.

* * *

لە مەککەشدا دۆزەکە هەمان ئەم دۆزە بو.. قورەیشیش ئەو (پایەدارانە) بون کە بە بەرهەڵستی و جەنگ بەرەنگاری بانگەوازەکە دەبونەوەو، لەراستیدا شەڕەکە شەڕی نێوان قورەیش و موحەممەدﷺ نەبو، بەڵکو شەڕی نێوان ئەوان و ئەو (بانگەواز)ە بو کە موحەممەدﷺ هەڵی گرتبو:

﴿فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ: خۆ ئەوانە تۆ وەدرۆ ناخەنەوە، لەراستیدا ئەو ناهەقیکارانە لە نیشانەکانی خودایە حاشا دەکەن.﴾الأنعام/٣٣.

لە ترۆپکی[١] کێشەکەدا قورەیش پەیکێکی[٢] نارده لای پێغەمبەری خواﷺ تا سەرپشکی کەن لە موڵك و ماڵ و هەمو خۆشیەکانی دنیا بە مەرجێك واز لەو بانگەوازەی بێنێ! چونکە دژایەتیەکە لەنێوان ئەوان و کەسێتی پێغەمبەرﷺدا نەبو، بەڵکو دژایەتیەکە لەوەوە سەریهەڵدا کە پێغەمبەر دەستی بە بانگەوازەیەوە گرت و وازی لێنەهێنا و، ئەوانیش نەیاندەتوانی و ئارامیان لەسەر نەدەگرت! پاشان هەردەبو لە کۆتایدا بگۆڕێ و ببێتە جەنگی نێوان ئەوان و نوێنەری بانگەوازەکەﷺ.

* * *

---

١ ترۆپك: ذروة

١ پەیك: رسول

لەدواییدا ویستی خودا وابو بڕواداران بڕوا بە (لا إله إلاّ الله) بێنن، ئنجا ئەو نەوەیە ناوازە و بێوێنەی مێژویان لیّ پێکهات.. جا دەبێ (لا إله إلاّ الله) لە ژیانی ئەواندا چۆن بێ و مەدلولەکەی لەلای ئەوان چی بێ؟!

ئایا هەر تەنیا ئەوەندە بو باوەڕ بکەن خودا-ی پاك و بەرز- یەکە و بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی دیکە لە تێکڕای ئەو گەردونە پانوپۆڕەدا نیە؟ یان تەنیا بەڕاستدانان بو لە دڵ و دان پێداهێنان بو بە زمان؟!

یا شتێکی زۆر لەوە گەورەتر و قوڵتر و سەرتاپاگیرتر لە دەرون و واقیعی ژیانیاندا هەبو؟!

با بڕوانینە راستەقینەی ئەو واقیعە..

عەرەب-هەروەك لە کتێبی (واقعنا المعاصر)[1] ئاماژەمان پێکردوە- پارچەپارچە و پەرتەوازە بون و رێك نەدەکەوتن و کۆنەدەبونەوە، سەرەڕای ئەوەی هەمو فاکتەرەکانی کۆبونەوە لەگۆڕێدا بون، وەك یەکێتی خاك و، یەکێتی ژینگە و، یەکێتی زمان و، یەکێتی بیروباوەڕ و، یەکێتی رۆشنبیری و، یەکێتی مێژو و.. لەوێوە ئیسلام چنینیەوە[2] و چاکترین نەتەوەی مرۆڤایەتی لیّ دەرخستن ﴿خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾.

لە جەزیرەی عەرەبیدا بتەکان تاکە پەرستراو نەبون هەروەك هەندێك کتێبی مێژو پێی لەسەر دادەگرن، کە دۆزی (لا إله إلاّ الله) تەنیا لە لابردنی ئەو رەنگە بەرهەست و ملەستورەی هاوبەشپەرستی کۆدەکەنەوە. گەندەڵیش هەر لەو چەند گەندەڵیە ئاکاریانەی وەك شەراب و قومار و زینا و زیندەبەچاڵکردنی کچان و تاڵان

---

١ بەندی (نظرة الى الجيل الفريد)

٢ چنینیەوە: ألتقطهم.

و برۆ و جەور و ستەمی کۆمەڵایەتی کورت هەڵتەهاتبو، هەروەك کتێبی مێژویی دیکە رکەی[1] لەسەر دەکەن!

بەڵکو (لا إلـه إلاّ الله) دەرونەکانی لە هەمو هاوبەشپەرستییێك دەپاڵاوت، هاوبەشپەرستیش هەر رەنگێك نەبو بەڵکو چەندین رەنگی جیاجیای هەبو کە لە کۆتادا لەژێر ئەم دو دۆزە سەرەکیە پەنهان دەبون: زۆر پەرستراوی و شوێنکەوتنی غەیری ئەوەی خوا دایبەزاندوە.

هۆز پەروەردگارێکی پەرستراو بو، هەروەکو شاعیر دەڵێ:

**وهل انا من غزية، إن غوت غويت، وإن ترشد غزية أرشد !**

دابی بابوباپیرانیش کرابوە پەروەردگارێکی پەرستراو:

**﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا:** ئەگەر بەوانە بگوترێ: ئەوی خودا ناردیە خوارێ ئێوە پەیڕەوی لێبکەن، دەڵێن: ئێمە هەر پەیڕەوی ئەو شتانەین کە باوانمانی لەسەر بون..﴾لقمان/٢١.

هەروەك حەز و ئارەزوش کرابونە پەروەردگاری پەرستراو:

**ألا أيهذا الزاجرى أحضر الوغى وأن أشهد اللذات هل أنت مخلدى؟!**

هەروەها قورەیش و هۆزە گەورەکانی دیکە کرابونە پەروەردگار و چیان بویستبا بۆ عارەبان حەلاڵیان دەکرد و چشیان بویستبا لێیان حەرام دەکردن. هەروەك بتەوانەکانیش[2] وابون:

**﴿إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ يُضَلُّ بِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا يُحِلُّونَهُ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُ عَامًا لِيُوَاطِئُوا عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ فَيُحِلُّوا مَا حَرَّمَ اللَّهُ زُيِّنَ لَهُمْ سُوءُ أَعْمَالِهِمْ وَاللَّهُ**

---

١ رکە: الحاج

١ بتەوان: کاهن الاصنام.

لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَــافِرِينَ: راگوێـزان و ئـاڵوگۆڕی ئـەو مانگانـە، دەبێتـە هـۆی زیـادبونی خوانەناسی و خودانەناسەکانی پێ گومڕا دەبن. لە ساڵێکا شـەڕ بـە ڕەوا دەزانن و لە ساڵێکا بە ناڕەوا، تا ژمارەی مانگە ڕەوا و ناڕەواکان ئەوسـا بەرانبـەر بێتەوە و لە ئاکاما، ئەوەی خودا ڕەوای نەدیوە، ڕەوای کـەن. دیـارە شـەیتان ئـەو کردەوە نالەبارەی بۆ جوان کردون. خـوا ئەوانـەی دژی دینـن، شـارەزای ڕاسـتەڕێ ناکا. ﴿التوبة/٣٧.

﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالأنعام نَصِيبًا فَقَالُوا هَذَا لِلَّـــهِ بِزَعْمِـــهِمْ وَهَذَا لِشُرَكَائِنَا فَمَا كَانَ لِشُرَكَائِهِمْ فَلاَ يَصِلُ إِلَى اللَّهِ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِـــلُ إِلَى شُرَكَائِهِمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ، وَكَذَلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلاَدِهِمْ شُرَكَاؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَـــا يَفْتَرُونَ، وَقَالُوا هَذِهِ أَنْعَامٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لاَ يَطْعَمُهَا إِلاَّ مَنْ نَشَاءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَـــامٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَامٌ لاَ يَذْكُرُونَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا افْتِرَاءً عَلَيْهِ سَيَجْزِيهِمْ بِمَـــا كَانُوا يَفْتَرُونَ، وَقَالُوا مَا فِي بُطُونِ هَذِهِ الأنعام خَالِصَةٌ لِذُكُورِنَا وَمُحَـــرَّمٌ عَلَـــى أَزْوَاجِنَا وَإِنْ يَكُنْ مَيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَاءُ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ إِنَّهُ حَكِيمٌ عَلِيمٌ، قَـــدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلاَدَهُمْ سَفَهًا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمْ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَـــى اللَّهِ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ: لە بەروبوی ئەو کێڵگە و وڵـاتەی کە خوا بـەدی هێناوە، بەشێکیان بۆ خۆی دانا. جـا بـە خـەیاڵ گوتیـان: ئەمـە بەشـی خوایـە و

---

عـەرەب لە جاهیلیەتەکەیاندا بڕوایان بە هـەرچوار مانگـە حەرامـەکان هـەبو، کـە خـودا حـەرامی کردون، بەڵام ئەگەر حەزیان لێبا بە ئارەزوی خۆیان لێیان حەڵاڵ دەکـردن و، لـەباتی ئـەوان مـانگی دیکەیان حەرام دەکرد بەشێوەیەك کە ژمارەی مانگە حەرامەکانی ساڵێك چوار بمابایـەوە، جـا ئـەم نەریتە پیرۆزە ئاماژە بەوە دەکا.

ئەمەش هی بتەکانمانە. خۆ بەهرەی بتەکانیشـیان، نەدەکەوتـە لای بـەهرەی خـوا، بەڵام بـەهرەی خـوا دەچـوە لای بتـەکانیان! ناشـیرین داوەری دەکـەن.. بتـەوانانی شەریك دانەر بۆ خودا، وایانکرد کە زۆرێـك لـە هاوبیرەکانیـان کوشـتنی منداڵـی خۆیان بەلاوە جوان و ڕەوابێ، تاکو لە بەینیان ببەنو دینەکەیان لیٚ تێکەڵ و پێکـەڵ بکەن. ئەگەر خودا بیویستبا، ئەوان ئاوایان نەدەکرد. لێیان گـەڕێ هـەر بوختانـێ دەیکەن بیکەن. هەر بە خەیاڵ دەیانگۆت کە: ئەم ماڵات و کێڵگە قەدەغـەن. بـێ ئیزنی ئێمە هیچ کەس نابێ تامیان بکاو ئەم ماڵاتەش کەس نابێ سـواری پشـتیان بێ. هێندێك ماڵاتیان هەیە، لە وەختی سەربڕیندا ناوی خوای لەسەر ناهێنن و درۆ بەدەم خواوە دەکەن. خودا لەسەر ئەو درۆ هەڵبەستنەیان توشی جەزرەبەیان دەکـا.. دەیانگوت کە: چی لە پزدانی[1] ئەو ئاژەڵانەدایە، بۆ نێرینەی منداڵی ئێمە ڕەوایـە و بۆ ژنانمان نارەوایە! ئەگەر مردارەوەبوش بێ، هەموان تێدا شەریك دەبن. بەم زوانـە خوا سزای ئەم قسانەیان دەداتەوە. خودا هەر خۆی لـە کـارزان و زۆردانایـە.. ئـەو کەسانە-وا لەبەر گەوجی و نەزانی- منداڵانی خۆیانیان کوشـت، زیانبـاربون و بـە بوختانکردن بۆ خوا، ئەو بژێوەی کە پێدابون، حەرامیان کرد، دیارە ڕێیان لیٚ تێـك چوەو شارەزا نین.﴾الأنعام/١٣٦-١٤١

جا قورئان بانگەواز بە (لا إله إلاّ الله) دەکات بۆ پاڵاوتنی دەرون و دڵ و هەست و ڕەفتاران لەم هەمو ڕەنگە هاوبەشپەرستیە-لەپاڵ بت پەرسـتی- بـە یـەك پلـەی بایەخ و گرنگی پێدان، جیهادی پێغەمبەریشﷺ لە مەککە روبـەروی هـەمو ئـەو جۆرانە بو بە فەرمانی خودا و ئاراستەکردنی بۆ پێغەمبەرەکەیﷺ.

---

[1] پزدان: بطن، رحم.

ئەگەرچی دۆزی زیندوکردنەوەو لێپرسینەوەش کەلێنێکی گەورەی لە وتاری قورئان بۆ هاوبەشپەرستانی مەککە داگرتبو، لەبەر ئەوە بو کە خوای گەورە دەیزانی بڕوابون بە ڕۆژی دوایی چ کاریگەریەکی لە بنەبڕکردنی هەمو جۆرەکانی هاوبەشپەرستی و هەمو شونەکانی[1] لە دلاَندا هەیە، چونکە ئەگەر ئەوان بڕوایەکی بڕەڕیان[2] بەوە نەبوایە کە پاش مردن زیندو دەکرێنەوەو، لەسەر هاوبەشپەرستیەکەیان موحاسەبە دەکرێن، وازیان لە هاوبەشپەرستیەکەیان نەدەهێنا و دەسبەردار نەدەبون، جا هاوبەشپەرستیەکە لە پەرستن بایە یا لە شوێنکەوتن...

* * *

کاتێکیش دەرونی بڕواداران بە (لا إله إلاّ الله) لەو ڕەنگە هاوبەشپەرستیانە پاك بۆوە، گۆڕانکاریەکی مەزن لە دەرونیاندا بەرپابو.. کە بە لەدایك بونێکی تازە دەچو. تەنیا بەڕاستدانان نەبو، تەنیا دان پێداهێنانیش نەبو..

بەڵکو -هەروەکو لە کتێبی دیکەشدا باسمان کردوە- بە دوبارە ڕێکخستنەوەی گەردیلەکانی دەرونیان بە بارێکی نوێ، هەروەك گەردیلەکانی پارچەئاسنێك دوبارە ڕێکدەخرێتەوەو دەبێتە وزەیەکی کارۆموگناتیسی.

ڕێنوێن بون بۆ (حەق) کاریگەریەکی زۆ مەزنی لە هەمو لایەنەکانی ژیانیاندا هەبوە.. هەر تازە هەمو ئەو پەروەردگارە ساختانە لاچوبون کە دڵ و گیان و ڕەفتاری داگرتبون[3] و لە یەك پەرستن بترازێ کە بۆ خودای تەنیا و بێهاوەڵە چیدی دڵ و گیانیان بەشتی دیکە خەریك نەبو..

---

١ شون: أثر. ٢ بڕەڕ: قاطع. ٣ داگرتن: احتلال

لەگەڵ گلانی پەروەردگارە ساختەکان هـەمو ئـەو دابانەش[1] کەوتنـە خـوار کـە پێیانەوە پەیوەست بون، لەگەڵ هەمو ئەو بایەخ پێدانانەی کە دەوریان دابون..

چیدی نە هۆز و، نەدابی بابوباپیران[2] و، نە نەریتـە کەلەپوریـەکان لـە هەسـتی ئەوان بارستایی باڵی پێشولەیەکی نەما و چیدی فشاری[3] نەخسـتە سـەر رەفتـار و هەستیان.. چیدیکەش پەیوەندیەکانی خوێن و پەیوەندیەکانی (بەرژەوەندی) نەبونـە هۆکاری کۆکردنەوە یا لێك جوداکردنەوەیان..

بەڵکو دنیا سەرتاپای-بەهەمو تێکئاڵان و پێوەندەکانی- چیدی نەبوە تاکە خەم و خافڵێنەریان هەروەك پێش بڕواهێنانیان بە (لا إله إلاّ الله) وابو، (بەهاکان)[4]یـش ئەو بەهایانە نەمان کە دونیا بە دابڕاوی لە رۆژی دوایی بڕیاری لەسەر دەدان!

(لا إله إلاّ الله) بوە کلیلی کۆبونەوەو لێکدابڕان.. بوە پێوەنـدی لێـك گرێدانـی ئەو دڵانەی کە باوەڕیان پێهێنابو و، لەگەڵ دڵانی دیکە جیای دەکردنەوە، هـەروەها بو بەو کۆبونەوە نوێیەی کە لەناخی دەرونیاندا جێگای هەمو کۆبونەوەکانی دیکەی گرتبۆوە، ئەمەش هەموی لە (لا إله إلاّ الله) هـەڵدەقوڵا و، بـە دەوری (لا إلـه إلاّ الله) دەخولایەوە و ، تێکڕای هەبونی تازەی خۆی لە (لا إله إلاّ الله) هەڵدەهێنجا:

ئینجا ئەو پێغەمبەرەیﷺ کـە بـۆ (لا إلـه إلاّ الله) رێنوێنـی کردبـون و، ئـەو پەیامەی لە خواوە بۆیان هاتبو لە زاتی وی رەنگی دبۆوە-لەماڵی ئەرقـەم دەیدیـتن تا مەزنترین کارێك ئەنجام بدا بە درێژایی هەمو مێژوی مرۆڤایەتی تاکـە مرۆڤێـك

---

١ گلان: سقوط داب: عرف

٢ ئەو دابە لە سەردەمی ئێستاماندا بە (رای گشتی) ناودەبرێ.

٣ نەریت: تقلید فشار: ضغط ٤ بەهاکان: قیم

ئەنجامی دابێ، ئەویش بریتی‌یە لە پەروەردەکردنی ئەو نەوە ناوازەیە[1] بەپێی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) و، ئاکارەکانی (لا إله إلاّ الله)..

جا لە میانەی ئەم پەروەردە بێوێنەیەی کە بەپێی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) و ئاکارەکانی (لا إله إلاّ الله) و، لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بو، چاکترین ئومەتی مێژو دەرکەوت.

* * *

خەڵکێکی زۆر وا خەیاڵ دەکەن کە (لا إله إلاّ الله) بە هەمو داخوازیەکانیەوە داواکراو بو و، بە هەمو کاریگەریەکانی کاری لەو نەوە ناوازەیە کردبو چونکە ئەوان-پێشتر- هاوبەشپەرست بون!! بەڵام ئەگەر لە بارێکی تردا بونا ئەوا تەنیا بەڕاستدانان و دان پێداهێنانیان لێ داوا دەکرا!!

ئەوە ئەو تاوانە هەرە گەورەیە بو کە هزری ئیرجائی لە دژ ئومەتی ئیسلامی ئەنجامی دا، هەر ئەویش بو-لەگەڵ هەندێك فاکتەری[2] تر- وردەوردە خەریکی خاڵی‌کردنی (لا إله إلاّ الله) بو لە ناوەڕۆکە راستەقینەکەی و لەدواییدا کردیانە واژەیەکی[3] بەتاڵی بێگیان.

بەر لەوەی گفتوگۆی ئەم خەیاڵە بکەین، دەمانەوێ-کەمێك- وێنەی (لا إله إلاّ الله) لەگەڵ بڕوادارانی مەدینە بخەینە ڕو.

باسوخواسی (لا إله إلاّ الله)-هەروەك لە پێشتر باسمان کرد- لە مەدینەش نەبڕایەوە، چونکە ئەمە باسێك نەبو لەسەرەتای ڕێگەکەدا بێتە بەرباس و پاشان بۆ بابەتێکی دیکە بگوازێتەوە، بەڵکو لەسەرەتا دای ڕێگەکەدا باسدەکرا و ئەوجا لەگەڵیدا بۆ هەمو بابەتێکی دیکە دەیگواستەوە.

---

١ ناوازە: فريد. ٢ فاكتەر: عامل ٣ واژە: كلمة، عبارة.

با چەند نمونەیەك لە سورەتە مەدینەییەكان وەربگرین كــە ئــەم مەســەلەیە رون دەكەنەوە.

سورەتی بەقــەرە كـە گـەلێك بابـەتی جیاجیـای لـەخۆگرت كـە دەسـتی پـێ بـە رێكخستنی ژیانی بڕواداران كرد لە كۆمەڵگەی نوێ پاش دامەزرانی دەوڵــەت، لــە سەرەتادا بە وەسفی ئەو بڕوادارانە دەست پێ دەكــات كـە بیروبـاوەڕێكی راسـتیان وەرگرت و بە وێنەیەكی راستودروست لـەلایان چەسـپا، پاشـان ئـەو پەرسـتنانەی لەسەریان فەرزكرابو ئەنجامیان دا:

﴿الم، ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِــينَ، الَّذِيــنَ يُؤْمِنُــونَ بِــالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ ومِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ، وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ، أُوْلَئِكَ عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّــــهِمْ وأُوْلَئِــكَ هُــمُ الْمُفْلِحُونَ: ئەلیف، لام، میم.. ئەم كتێبە هیچ گومــانی تێـدا نیــە، بـۆ ئەوانــەی پارێزكارن، رێپیشاندەرە.. ئەو كەسانەی بڕوایان بە غەیب هەیە و نوێژ دەكەن و لەو بژێوەش كە پێمان داون دەبەخشن.. ئەوانەش كە بەو كتێبەی لەئێمەوە بۆ تۆ هاتوە و بەوانەش بۆ پێغەمبەرانی بەر لەتۆ رەوانكراوە، بە بڕوان و لەهاتنی رۆژی دوایـــی گومانێكیــان نیــە.. ئەوانــە پــەروەردگاریان رێبەریانــە و دیــارە كۆمــــەڵی رزگارانن.﴾البقرة/١-٥.

جا چ بەو (بڕوادارە) (پارێزكارە) (رزگارانە) دەگوترێ كــە نـەك تـەنیا مــەرجی بەراستدانان و دان پێدانانیان لێهاتبوە دی، بەڵكو نوێژكردن و زەكات دانیشـیان بــۆ زێدەكرد كە بریتی بون لەو دو پەرستنەی لەوكاتی لەسەریان فەرز كرابون؟

ئایا پێیان دەگوترا: بەستانە! ئــەوەندەتان وەدەسـتهێنا كـە لێتـان داواكرابــو و بەهەشتتان بۆ خۆتان دابینكرد.. یا پێیان دەگوترا: خودا لەسەرتانی فــەرزركردوەو،

لەسەرتانی فەرز کردوەو لەسەرتانی فەرزکردوە.. ئەمەش بەشێوازی ئــەرکبارکردن[1] نەك بە شێوازی سەرپشك[2] کردن؟

هەروەها پێیان دەگوترا، تا بە یەقینەوە بزانــن کـە حەقیقـەتی بـڕوا تـەنیا بـە بەڕاستدانان و دان پێداهێنان نایەتە ئارا، بەڵکو بە کار و کردەوەی وا وەدی دێ کە بەڵگەی برواهێنان بن.

﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَـــنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَـــى حُبِّـــهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّـــلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَـــاءِ وَالضَّـــرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ: کاری چاك هەر ئەوە نیــە رو دە رۆژهەڵاتێ بکەن یان رۆژاوا، چاك ئەمەیە باوەڕیتان بە خوا و بەرۆژی دوایــی و بە فریشتان و کتێب و پێغەمبەرانی خــودا هــەبێ و لــەو سـامانەی-هــەر چـەند زۆریشو خۆش دەوێ- بەشێ بدەن بە خزمـــان و هــەتیوان و هــەژاران و ڕێبــواران و سوالکەران و عەبدانی پێ بکڕنەوەو نوێژیکەن و زەکات بـــدەن، هــەرکات پــەیمانێك دەبەستن نەیشکێنن، لــە نــەداری و گرفتـاری و تەنگانــەدا خۆڕاگــر بــن. ئەوانــەن بەڕاستی باوەڕدار و دیارە لەخودا دەترسن.﴾البقرة/١٧٧.

سورەتی (ئالی عیمران)یش کە سەرتاپای بە دۆزی (لا إله إلاّ الله) خەریکــە[3] و، بەم ئایەتانە دەست پێدەکات کە باوەڕەوە پەیوەستن:

---

١ ئەرکبارکردن: وجوب . ٢ سەرپشك: التخيير.

٣ ئەگەر ویستت بە وردی بڕوانە کتێبی (دراسات قرآنية).

﴿الم، اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ، نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنْزَلَ التَّوْرَاةَ وَالإِنْجِيلَ، مِنْ قَبْلُ هُدًى لِلنَّاسِ وَأَنْزَلَ الْفُرْقَانَ: ئەلیف. لام، میم.. غەیری خودا هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ، هەر زیندوەو بەسەر هەمو شت ڕا دەگا. ئەم کتێبەی-بەڕاست- کە بۆ تۆ ناردوە، باوەڕ بەو کتێبانەش دەکا کە بەر لەوی لە خواوە ڕەوانکراون، تەورات و ئینجیلیشی پێشتر هەنارد.. تا ڕێنیشاندەر بن بۆ خەڵك. فورقانیشی-لەوەودوا- نارد...﴾آل عمران/١-٤.

ئەم سورەتە بەشێوازێکی رون و یەکلاکەرەوە بنچینەکانی باوەڕ بڕیاردەدا، لەپاڵ ئەویشدا بڕیاری داخوازیەکانی دەدا، لەنێوان داخوازیەکانیش مەسەلەی کوشتار بەرجەستە دەبێ بۆ بڕیاردانی ئەم حەقە لەسەر زەویدا، بەتایبەتیش باس لەو وانە پەروەردەییە مەزنە دەکات:

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لأُولِي الأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ، رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الأَبْرَارِ، رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلاَ تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ، فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَابًا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ: لە وەدیهێنانی ئاسمانان و لە زەمیندا و ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژان، زۆر نیشانەی پتەو هەیە بۆ ئەوانەی کە خاوەن

دڵی وشیارن.. ئەوانەی-چ بە راوەستاوی و چ لە جێوە، بە دانیشتن، چ لەسەر تەنیشت- هەر یادی خوا دەکەن و لە سازدانی ئەم ئاسمانان و زەمینە رادەمێنن، دەڵێن ئەی پەروەردگارمان! تۆ ئەم دەزگایەت بە فیڕۆ سازنەداوە، پاکی و بێعەیبی بۆ تۆیە، هەر بۆ خۆشت لە ئازاری بەئاگرمان بپارێزە.. پەروەردگارمان! هەرکەس تۆ بیخەیتە ئاگر، توشی شورەییت کردوە. ئەوانەی ناهەقیارن، هیچ کەس نایەتە هانایان.. پەروەردگارمان! ئێمە بیستمان بانگ رایەڵێك بانگی دەکرد کە باوەڕی بە پەروەردگارتان بێنن، ئێمەش باوەڕمان هێنا، سا بۆ خۆت ئەی پەروەردگارمان! لە گوناهانمان خۆش ببە و هەر خراپەی کردومانە، بیکوژێنەوەو لەگەڵ ئەوانەی پیاوچاکان بمان مرێنە.. پەروەردگارمان! ئەو شتانەش بەئێمە رەوا ببینە کە لە زمان پێغەمبەرانتەوە بەڵێنت پێمان داوین، شەرمەزاری رۆژی قیامەتمان مەکە. تۆ لە هەربەڵێنێ بیدەیت لاریت نیە.. پەروەردگاریان ئاوا بە دەنگیانەوە هات، کە: من کردەی هیچ مرۆڤێك-لەنێر و مێ- بەبێ پاداش ناهێڵمەوە، هەموتان لای من وەك یەکن. ئەو کەسانەی لە زێدی[1] خۆیان دەرکراون و لەڕای من ئازاریان دیوە و چونە جیهاد و دژی منیان کوشتبێ یان بە کوشت چوبن، بێگومانە گوناهیان دەکوژێنمەوە و لە پاداشتی کردەوەیان دەیانخەمە ناو باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕوا، کە ئەمە چاکەی خودایە دەربارەیان، کە پاداشی هەرە باشیش وا لای خوایە.﴾آل عمران/۱۹۰-۱۹۵.

جا ئەو بڕواداره راستگۆیانەی کە بە پێوەو بە دانیشتویی و بە پاڵکەوتویی یادی خودا دەکەن و-یادی خوداش کردەوەی ئەندامەکانە لە پاڵ ئەوەی کە کردەوەی دڵە- بیر لە وەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوەو، ئەوجا بۆ ئەوە

---

۱ زێد: نیشتمان.

ڕێنوێن دەبن کە بە ناڕەوا وەدینەهێنراون، بەڵکو بـە حـەق خوڵقێـنراون. حـەقیش ئەوە دەخوازێ کە خەڵك لەبارەی ئەو کردەوانە لێپێچانەوەیان لەگەڵدا بکرێ کە لـە ژیانی دنیادا ئەنجامیانداوە، بۆیە هەر دەبێ زیندوبونـەوەو لێپرسـینەوەو پـاداش و سزا هەبێ، جا لە خوا دەپاڕێنەوە کە لە ئـاگر بیانپـارێزێ و بیانباتـە بەهەشـت و، پاکانەی داخوازیەکەشیان دەخەنە ڕو کە: تەنیا بە بیستنی بانگی ئەو بـانگخوازەی بۆ بڕواهێنان بانگەوازی دەکردﷺ بڕوایـان هێنـاوە.. ئـەو بڕوادارانـەی کـە ئەمـە حاڵەت و ئەمانەش سیفەتیان بێ هەواڵیان پێدەدرێ کە خودا وەڵامـی داونەتـەوە.. جا دەبێ خودای پاك وەڵامی چـی دابنـەوە؟ وەڵامـی بەڕاسـتدانان و دان پێدانـان؟ وەڵامی بیرلێکردنەوەو تێڕامان؟ وەڵامی یـاداوەری بـەردەوامی نـەپچڕاو؟ وەڵامـی جۆشی گەرمی دڵ بۆ پارێزران لە ئاگر و چونە بەهەشـت؟ یـا هـی شـتێکی دیکـە لەپاش ئەم هەموە، کە لە (داخوازیەکانی)[1] هەمو ئەو شتانەیە؟!

﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ: پەروەردگاریان ئـاوا بـە دەنگیانەوە هات، کە: مـن کـردەی هیـچ مرۆڤێـك-لـەنێر و مـێ- بـەبێ پـاداش ناهێڵمەوە﴾.

ئاراستەکردنە پەروەردەییەکەش ئاشکرایە.. داواکراو ئەوەیە کـە بیرلێکردنـەوەو تێڕامان و یاداوەری ببنە کردەوە، خودای بەرزیش هـەر وەڵامـی ئەمـە دەداتـەوە، کاتێك سورەتەکەش هەر بە مەسەلەی جیهاد خەریکە بۆ چەسپاندنی حەق لـەروی زەویـدا، ئایەتەکـە چـەند جـۆرە کردەوەیـەك بەرجەسـتە دەکـات کـە لەگـەڵ ئاهەنگەکەدا[2] ڕێکدەکەون، باسی ئەوانەی فـەرموە کـە لـە پێنـاو خـوادا کۆچیـان کردوەو، ئەوانەی لەپێناو خوادا لە وڵاتی خۆیان دەرکراون و، ئەوانەی لـەپێناو خـوا

---

[1] داخوازیەکانی: مقتضیات.

[2] ئاهەنگ: سیاق.

ئازار و ئەشكەنجە دراون و، ئەوانەی لەپێناو خوادا کوژراون، بۆیـە نـا کـە ئەمانـە تاکە کردەوەی داواکراون، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئاهەنگەکەدا کۆك و گونجاون.[1]

هەروەها سورەتی (نیساء) ئەو ئایەتەی تێدا هاتوە کە بڕواداران (الذين آمنـوا) دەدوێنێ و داوایان لێدەکا کە بڕوا بێنن، تەنانەت داوایان لێدەکـا بـڕوا بـە هـەمان ئەو شتانە بێنن کە بەخۆیان باوەڕیان پێ هەیە-هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد-بەگەلی بڕواداران نالێ ئێوە ئەگەر ئەو بڕوایە داواکراوەتان هێنا و تەنانـەت لـەدڵدا چەسپاندتان و پارێزگاریتان لێکرد و چاوتان لێبـو و، دڵ و ویژدانـەکانتانی پـێ پـڕ بۆوەو، بەڕاستتان دانا و دانتان پێدا هێنا، لەپاش ئـەوە چیدیکـەتان لەسـەر نیـە، ئەگەر رەفتاری واقیعی و هەڵسوکەوتی کرداریتان بەپێی حەز و ئارەزوەکانتان بـێ، یا بەو جۆرەی کـە دابونەریتـەکانتان بڕیارتـان بـۆ دەدەن.. بـەڵکو تـەنیا هـەندێ فەرزیان بەسەردا فەرز دەکا و رونکردنەوەکەی بەوە کۆتایی پێدێنێ کە دەفەرموێ:

﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِـنْ تَحْتِـهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ.. وَمَنْ يَعْصِ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ وَيَتَعَـدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُـهِينٌ: ئـەو دەسـتورانە سنورن خـوا دایناوە، هەرکەسێکی بە فـەرمانی خـودا و پێغەمبەرەکـەی بـێ، دەینێرێتـە نـاو باغـاتێك جۆباریـان بـە بـەردا دەڕوا و هـەتا سـەر هـەر تیـادەبن و لەوپـەڕی بەختەوەریدان.. هەرکەسێکیش لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی دەرچێ و سنوری خوا ببـەزێنێ، دەیخاتـە دوڕ ئـاگرەوەو هـەتا سـەر هـەر لـەوێ دەبـێ و بەوپـەڕی سوکایەتیەوە ئازار دەدرێ.﴾النساء/١٣-١٤.

---

١ لە کتێبی (دراسات قرآنية)دا لە رانواندنی سورەتی (ال عمران)دا ئاماژەم بەم مانایە کردوە.

هـەروەها بـەرەو هـەندێك ئاراسـتەكردنی دیاریكراویـان دەبـا تـا پەیوەندیـــە خێزانیەكان و پەیوەندیە كۆمەڵایەتیەكانیان لەسەر بنیات بنێت و، ئەو سەرچاوەیان بۆ دەستنیشاندەكا كە لەم هەمو مەسەلانەدا بگەڕێنەوە سەریان:

﴿یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا أَطِیعُوا اللَّهَ وَأَطِیعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُـــمْ فَـإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْیَوْمِ الآخِـرِ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بەرفەرمانی خودا و پێغەمبەری خـودا و كاربەدەسـتانی خۆتان بن، هەركاتێكیش لەسەر شتێك لەنێوخۆدا پێك نەهاتن، ئەگەر بڕواتـان بـە خودا و بە رۆژێ قیامەتێ هەیە، كێشەی خۆتان حەواڵەی خـوا و پێغەمبـەری خـوا بكەن.﴾النساء/٥٩.

بەم شێوەیە گێڕانەوەی كاروبارەكان بۆ لای خودا و پێغەمبەر و، ژیان برندە سەر بەپێی فەرمانەكانی خودا و پێغەمبەرەكەیﷺ بە بڕواهێنان بە خودا و رۆژی دوایی دەبەستێتەوە دەیانكاتە مەرجی بڕوا: ﴿إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْیَوْمِ الآخِرِ: ئەگەر بڕواتان بە خودا و بە رۆژێ قیامەتێ هەیە.﴾

پاشـان پێیـان رادەگەیـەنێ كـە پێغەمبـەرەكانی خـۆی تـەنیا بـۆ بانگــەواز و پێڕاگەیاندن نەناردوە، تاكو كەسانێك هەڵكەون بڵێن: وا پەیامەكـەم پێڕاگەیشـت و زانیم و، بەڕاستم دانا و دانم پێداهێنا.. بەڵكو بۆ ئەوەی هــەناردون تـا گوێڕایـەڵی بكرێن:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ لِیُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ: هەركەسـێكمان بـە پێغەمبـەری هەناردوە، بۆیە بوە كە بە ئیزنی خوا فەرمانی قبوڵ كەن.﴾النساء/٦٤.

ئەوجا فێریان دەكـات-پـاش رونكردنـەوەی حوكـم و فـەرمان و بەرهەڵسـتی و ئاراستەكردنەكانی كە لەسەر (خاوەن باوەڕان)ی‌دا فەرزكردوە- كە بـڕوا بـە خۆزگـە

نیه، بەڵکو بریتیە لە بەڕاستدانانێکی واقیعـی بـۆ ئیمـان لەشـێوەی کردەوەیـەکی هەستپێکراودا:

﴿لَيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلاَ أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ وَلاَ يَجِدْ لَـهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا، وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُـوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا: نە بـە ئـاواتی ئێوەیـە و نـە بـە هەوا و ئارەزوی ئەو کەسانەیە بە ئەهلی کتێب حەسـێبن، هـەر مرۆڤێـك کـارێکی ناڵەبار بکا، بەو کارەی خۆی سزا دەدرێ و جگە لەخوا هیچ کەسی بۆ پـەیدا نابـێ دۆستی بێ و بێتە هاواری. هەر مرۆڤێك-نێر بێ یان مێ- هەر هێندە خاوەن باوەڕ و ناکار چـاك بـێ، دەچنـە بەهەشـتەوە و بـە ئـەندازەی تلێشـی وردیلـەی ناوکـە خورمایەکیش ناهەقیان لیّ ناکرێ.﴾النساء/١٢٣-١٢٤.

هەروەها سورەتی (مائیدە) کە بانگـەوازی کـامڵ بونـی (ئـاین) و تـەواوبونی نیعمەت کراوە:

﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْـلاَمَ دِينًا: وا لەمڕۆوە دینەکەتانم تەواو کرد و بەبێ کورتی و کەمایەتی چاکەم دەربارەی ئێوە کرد، ئیسلامیشم بە دینی ئێوە هەڵبژارد.﴾المائدة/٣.

ئەم سورەتە سەرتاپای رونکردنەوەی ئەو شتانەیە کە خوا حەڵاڵی کردون لەگـەڵ ئەوانەی حەرامی کردون، جا چ خـواردن چ خواردنـەوە چ ئـاڵوێری[١] و چ ئـەحکام بێت، هەمو سورەتەکەش ئاراستەی (بڕواداران) کراوە هەر لە یەکەم ئایەتیەوە:

---

١ ئالوویری: معاملة.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، هەر بەڵێنێکی کە دەیدەن پێکی بێنن. ﴾.

هەروەها بریتیە لەو سورەتەی کە بەراشکاوی دەقی واجب بونی گەڕانەوەی بۆ شەرعی خوا تێدا هاتوە بێجگە لە هەمو یاسایەکی دیکە، ئەوەشی رونکردۆتەوە کە حوکم تەنیا دو جۆرە و سێیەمی نیە و هیچ نێوەندێکیش لە نێوانیاندا نیە: یان حوکمی خودا یان حوکمی جاهیلیەت:

﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ: ئایا ئەوان حوکمی جاهیلیەتیان دەوێ! دەوجا لەلای ئەو کەسانەی وا لە بڕوای خۆیانا هیچ شك و گومانێکیان نیە، کامە فەرمان لە فەرمانی خوا چاترە. ﴾المائدة/٥٠.

هەر کەسێکیش حوکمی بەو شەرعە نەکرد کە خودا دایبەزاندوە، ئەوا لەلای خوا دەکەوێتە خانەی بێبڕوا و لەدیندەرچو و ستەمکاران:

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکا کە خودا دایبەزاندوە، ئەوانە کافر و بێبڕوان. ﴾المائدة/٤٤.

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکا کە خودا دایبەزاندوە، ئەوانە ستەمکار و زۆردارن. ﴾المائدة/٤٥.

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکا کە خودا دایبەزاندوە، ئەوانە لاڕێ و لەدین دەرچون. ﴾المائدة/٤٧.

تێکڕای سورەتە مەدینەییەکانی دیکەش بەم شێوەیەن.. هەمو وتارن بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، واتە دانیان پێدا هێناوەو بەڕاستیان داناوە، ئەو ئایەتانە پێیان دەڵێن: ئەو بەڕاستدانان و دانپێداهێنانەی کە لە مەککەڕا بە کۆچکردن لەپێناو خوا هێناویانە-کۆچیش بەخۆی(کردەوەیەکە) کە پێیان راسپێردراو ئەوانیش

جێبەجێیان کرد- یان لە مەدینە لەسەری بون(ئەگەر لە پشتیوانان بوبن)، ئـەوەیان نیێ دەخوازێ کە پابەندی حوکم و ئەرك و فەرمان و بەرهەڵسـتیە تازەکـانی شـاری مەدینە بن، بڕواکەشیان-ئێستا- بەهـەمو ئـەو شـتانەوە پەیوەسـت بـوە کـە لای خوداوە هاتون، ئەم پەیوەست بونەش سەنگی مەحەکە بۆ راستی بڕواهێنان، ئەگینا دەبێتە ئەو دوڕوییەی[1] کە خودا قبوڵی ناکا و، تاکە سزای شایستەشی نەمرییە لـە چینی هەرە ژێرەوەی دۆزەخ..

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِنْ قَبْلِـــكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾... ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْـــلِيمًا: ئـەدی ئەوانـەت نەدیوە، کە خۆیان وا نیشان دەدەن، بەو قورئانەی بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە و بـــەوەش کە پێش تۆ دابەزێنراوە، بڕوا دەکـــەن، دەشـیانەوێ کێشـەیان بەرنـە لای تـاغوت، فەرمانیشیان پێدراوە حاشای لێکـەن، دیـارە شـەیتان وای گەرەکـە بـە یـەکجاری لەڕێگەیان هەڵە بکا... بەڵام نەخێر، سوێندەکە بە پەروەرگاری تـــۆ ئەمانـە نابنـە خاوەنی بڕوا مەگین وەختێ کە لە کێشە و هەرای نێوان خۆیانا حوکم بێننە لای تـــۆ و لە دڵەوەبە هەر فەرمانێکی تـــۆ بیـدەی پێـی رازی بـن و بـە تـەواوی ملکـەچی بن.﴾النساء/ ٦٠، ٦٥.

﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ، وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيـــقٌ مِنـــهُمْ

---

١ دوڕویی: نفاق.

مُعْرِضُونَ، وَإِنْ يَكُنْ لَهُمْ الْحَقُّ يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ، أَفِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ أَمْ ارْتَابُوا أَمْ يَخَافُونَ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ بَلْ أُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ، إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ، وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقِيهِ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَائِزُونَ: ئەشلێن: ئێمە باوەڕمان بە خوا و پێغەمبەر هێناوەو بەرفەرمانین. لەدوای ئەمەش بڕێکیان رو وەردەگێڕن، ئەوانە هەر بڕوادار نین.. هەرکاتێکیش بەرەو خودا و پێغەمبەرەکەی بانگیان دەکەن، کە حوکمیان لە نێواندا بکا، کەچی دەستەیەکیان پشتی تێدەکەن. ئەگەر لە قازانجی وان بێ دێنە لای و دەیسەلمێنن.. ئاخۆ ئەمانە دەغەزیان لە دڵدایە، یان دودڵن، یان دەترسن خودا و پێغەمبەری خودا ناهەقیەکیان لێبکەن؟ نا، ئەوان خۆیان ناهەقن.. بەلام ئەوی باوەڕدارن، هەرکاتێ بانگ دەکرێن کە بێن بەرەو خودا و پێغەمبەرەکەی، تا حوکمیان لە نێواندا بکا، یەکسەر دەڵێن: بیستمان و بەرفەرمانین، ئەوانە دیارە رزگارن.. هەرکەسێکی بەرفەرمانی خودا و پێغەمبەرەکەی بێ و ترس و شەرمی لە خودا هەبێ، ئەوان بردویانەتەوە.﴾النور/٤٧-٥٢.

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا: دیارە ئەوکەسانەی دوڕون، وان لە قاتی هەرە بەرەژێرەوەی دۆژەخ. تۆ ناتوانی یاریدەیان بۆ پەیداکەی.﴾النساء/١٤٥.

جا ئەگەر ئەمانە لە داخوازیەکانی (لا إلـه إلاّ الله) بن کە سورەتە مەدینەییەکان هێناویانە، ئەوەیان بۆمان رونکردۆتەوە کە کاتێك ئاین کامڵ بو.. لەو رۆژەی کە خودای بەرز ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمْ الإِسْلاَمَ دِينًا: وا لەمڕۆوە

دینەکەتانم تەواو کرد و بەبێ کورتـــی و کەمایـەتی چاکـەم دەربـارەی ئێـوە کـرد، ئیسلامیشم بە دینی ئێوە هەڵبژارد.﴾المائدة/٣.

(لا إله إلاّ الله) پەیڕەو و بەرنامەیەکی تەواوی ژیان بوە و، لایەنی بیروبـاوەڕ و، لایەنی پەرستن و، لایەنی رەفتار و کردەی گرتۆتەوە. بیروباوەڕبونی بە تاکێتی خـوا (واتە یەکتاپەرستی لە خود[1] و لە سیفەتەکانی و لە ناوەکانی و لە کردەوەکـانی) و ئاراستەکردنی دروشمەکانی پەرستن بـۆ خـودای بێهـاوەڵ و هاوتـا و، بەرفـەرمانی شەریعەتەکەی وی بە تەنیا بێجگە لە هەمو یاسایەکی دیکـە و، خۆڕازاندنـەوە بـە ئاکارەکانی (لا إله إلاّ الله)، لەپاڵ هەمو ئەو ئەرکە جۆراوجۆرانەی کە خـودا پێـی راسپاردبون..

ئەگەر سورەتە مەککەییـەکانیش جـەختیان لەسـەر لایـەنی بیروبـاوەڕ کردبـێ: بڕوابون بە خودا و رۆژی دوایی و فریشتەکان و کتێب و پێغەمبـەران و، قـەدەر بـە چاك و خراپەوە، لەپاڵ لایەنە ئاکاریەکاندا و، ئەو دروشمانـەی پەرسـتنیش کـە لـە مەککە فەرز کرابون، ئەوا سورەتە مەدینەییەکان زۆر بە خەستی جـەختیان لەسـەر دۆزی حاکمیەت و، پەیوەست بـون بـە حوکمـەکانی شـەرعی خـودا و کردنـی بـە سەنگی مەکی بڕواداری، لـەپاڵ دوپاتکردنـەوەی لایـەنی ئاکـاری و پەرسـتنەکانی دیکە کە لە مەدینەدا فەرز کران.

بەڵام هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر وا گومـان ببـەین کـە دۆزی حاکمیـەت، واتـە بڕیاردانی ئـەوەی کـە حاکمیـەت تـەنیا بـۆ خودایـە و، مـافی یاسـادانانیش لـە حەڵاڵکردن و حەرامکردن و رێپێدان و قەدەغەکردن مافێکە بە پاکی هی خودایـە و

---

[1] خود: ذات .

هیچ مرۆڤێك تێیدا نابێته هاوەڵ، یاسادانانیش بە غەیری شەرعی خوا-تێکەڵ بە شەرعی خودابێ یا بە تەنیا- هاوبەشپەرستیە..

هەڵەیە وا گومان ببرێ کە ئەم دۆزە-بەو وردەکاریانەیەوە- لە مەدینە بڕیار دراوە لەو کاتەی کە یاساکان دادەبەزین تا موسڵمان ژیانی خۆیانی لەسەر بنیات بنێت. چونکە لە راستیدا ئەو دۆزە زۆر بە رونی و بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە لە مەککەدا بڕیاریدرا،، ئەمەش لە پتر لە سورەتێکی مەککەییدا هاتوە وەك یەکێك لە بنچینەکانی بیروباوەڕ بە (لا إلـه إلاّ الله) هاتۆتە پێش نەك هەر تەنیا وەك پابەندبونێکی رەفتاری.

هەر بە نمونە ئەم ئایەتە لە سورەتی (ئەعراف)ی مەککەیی وەرگیراوە:

﴿اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ وَلاَ تَتَّبِعُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ: هەرچی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان ناردراوەتە خوارەوە، شوێنی کەون و بە غەیری ئەو مەکەونە شوێنی سەرپەرشتانی دیکە. ئێوە زۆر کەم عیبرەت دەگرن.﴾الأعراف/٣.

ئایا ئەم ئایەتە چی دەگەیەنێ؟

ئەوە دەگەیەنێ کە خەڵکی لە تەنیا دو حاڵەتدان: یەکێکیان فەرمانی پێکراوەو ئەوی دیکە نەهی لێکراوە، یەکەمیان بڕوایە و، دوەمیان هاوبەشپەرستیە.

بڕوا لەوێدا پوخت بۆتەوە کە خودا دەفەرمویێ: ﴿اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ: هەرچی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان ناردراوەتە خوارەوە، شوێنی کەون.﴾

لە بەرامبەریشدا-واتە شوێنکەوتنی بێجگە لەوەی خوا دایبەزاندوە- شوێنکەوتنی گەورەکانە-کە بە هاوبەش دانراون- و ئەمەش هاوبەشپەرستیێکی راشکاوە.

هەروەها بڕوانە ئەم ئایەتە لە سورەتی (ئەعراف):

﴿أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ: وەدیهێنان و فەرمان هەر بۆ ئەوە.﴾الأعراف/٥٤.

ئەمە بڕیاری دو مەسەلەی جودا دەدا لە یەك کاتدا کە: فەرمان تەنیا بۆ خودایە، بەشێوازێکی کورتبڕ، فەرمان بە رەهایی[1] و بەبێ سنوردارکردن بە چوارچێوەیەکی دیاریکراو یا بوارێکی[2] دیاریکراو، فەرمان لە ئاسمانەکان و لە زەوی و لە ژیانی مرۆڤانیش، هەرچی ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویە، لەمە دەفامرێتەوە کە خودای بەرز هەر لە هەمان ئایەتدا پێش ئەم دەستەواژەیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ: پەروەردگارتان خودایەکە ئاسمان و زەمینی لە شەش رۆژاندا دروست کرد، ئەوجارە کە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دامەزرا،رۆژی بە شەوێ داپۆشێ و رۆژیش خێرا دەکەوێتە شوێنی شەوێ. خۆر و مانگ و ئەستێرانی بەدی هێنا و هەر لەژێر فەرمانی ئەودان.﴾الأعراف/٥٤.

بەگوێرەی ژیانی مرۆڤیش لەوێ دەفامرێتەوە کە خودای بەرز هەر یەکسەر لەپاش ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ:

﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ، وَلاَ تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا: بەنهێنی و بەسەرکزی هەر پەروەردگارتان لەبیر بێ و لەبەری بپارێنەوە. خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە لەرێگەی ئەو لادەدەن.. خراپەش مەکەن لەم زەمینەدا دوای باش بونی.﴾الأعراف/٥٥-٥٦.

---

[1] رەها: مطلق

[2] بوار: مجال

واتە: بە دەرچون لە فەرمانەکانی خودا دەسدرێژی مەکەن و، گەندەڵیش مەخەنە سەرزەوی بەهۆی شوێنکەوتنی بێجگە لە شەرع و بەرنامەی خودا، پاشئەوەی چاکی تێدا سازا بەوەی لەلای خوداوە دابەزی.

مەسەلەیەکی دیکەش کە هەمان ئایەتەکەی سەرەوە بڕیاری دەدا ئەوەیە کە مافی حاکمیەت لە ئاسمانەکان و لە زەوی و لە ژیانی مرۆڤدا لە وەدیهێنەرێتیەوە هەڵدەقوڵێ، بە واتا لە توانای وەدیهێنانەوە، چونکە ئەوەی توانای وەدیهێنانی هەبێ، هەر ئەو بە تەنیا خاوەن فەرمانە، کە تەنیا خودای پاك و بەرز-تاکە وەدیهێنەرە، هەر ئەویش بەتەنێ خاوەن فەرمانە، تێکڕا لە ئاسمانەکان و لە زەوی و لە ژیانی مرۆڤیشدا پێکەوە.

هەروەها بڕوانە ئەم ئایەتە پیرۆزەی سورەتی (شوری)ی مەککەیی:

﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ: لەسەر هەرشتێك پێك نەهاتن، حوکمەکەی بۆ لای خودایە. ئەو خودایە پەروەردگاری منە، من خۆم هەر بەو سپاردوەو هەر رو دەکەمەوە لای ئەو.﴾الشوری/١٠.

ئەمیش هەمان بنەما بڕیار دەدا: کە گێڕانەوەی حاکمیەتە بۆ خودا لە هەمو ئەو شتانەی کە لە ژیاندا رێگە بە مرۆڤ دەگرن، کاتێ خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿مِنْ شَيْءٍ: لە هەرشتێك﴾ مەبەستی رەگەزی شت و شتەکانە بەگشتی، واتە هەمو شتێك بە ڕەهایی. هەمو شتێکیش بە رەهایی حوکمی بۆ لای خودایە، ئاخۆ حەڵاڵە یا حەرامە یا موباحە یا مەکروهە یا مەندوب، ئایەتی پێشتریش هەمان واتا بڕیار دەدا کە ئایەتەکەی سورەتی ئەعراف بڕیاریدا:

﴿أَمْ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ فَاللَّهُ هُوَ الْوَلِيُّ وَهُوَ يُحْيِ الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: ئاخۆ کەسیان غەیری خودا دیوەتەوە کە پشتیوان و دۆستیان بێ؟ پشتیوانی راستەقینە هەر خودایە و ئەو دەتوانێ مردوان زیندو بکاتەوە و توانای هەمو شتی هەیە.﴾الشوری/٩.

جا ئیمان بریتیە لە گێڕانەوەی حاکمیەت بۆ خوا لە هەمو شتێکدا و، پێچەوانەی ئەوەش بریتیە لە گرتنی دۆست و پشتیوانان بێجگە لە خوا-واتە هاوبەشپەرستی- کردەوەیەکی پوچە، چونکە خودا تەنیا تاکە پشتیوانەو، هەر بەخۆی دەژیێنێ و دەمرێنێ و، توانای بەسەر هەمو شتێکدا زاڵە.

هەروەها ئەم ئایەتە پیرۆزەش کە خوای گەورە لە سورەتی (شورا)دا دەفەرموێ:

﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ: ئاخۆ ئەوان شتانێ وا بە شەریکی خوا دەزانن، کە دینێکی وەهایان بۆ داهێنابن و خودا ئیجازەی نەدابن..﴾الشوری/٢١.

بەڵام ئایەتەکانی سورەتی (ئەنعام) رەنگە وردتر لەو دۆزە بدوێت:

﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلاً وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِنْ رَبِّكَ بِالْحَقِّ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ، وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً لاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ، وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ، إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَنْ يَضِلُّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ، فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كُنتُمْ بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ، وَمَا لَكُمْ أَلاَّ تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلاَّ مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ وَإِنَّ كَثِيرًا لَيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ، وَذَرُوا ظَاهِرَ الإِثْمِ

وَبَاطِنَهُ إِنَّ الَّذِينَ يَكْسِبُونَ الإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا يَقْتَرِفُونَ، وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ: ئاخۆ رەوایە غەیری خوا داوەرێکی پەیدا بکەم؟ هەر ئەویشە ئەم کتێبەی دور لە هەمو کەمایەتی بۆ ئێوە ناردە خوارەوە. ئەوانەی کتێبمان پێدان، سور دەزانن کە خەلاَتە و لە پەروەردگاری تۆوەیە و گشتی راستە. کەوایە تۆ هەرگیز لە دودلاَن مەبە.. قسەکانی پەروەردگارت-لەبێ دادگەری و راستیدا- تەواو و بێکەم و کورپن، کەس ناتوانێ بیانگۆڕێ. زۆر بیسەر و هەرەزاناش هەر خودایە.. ئەرگەر کەوتیە شوێنی قسەی زۆربەی ئەوانە وا لەم سەرزەمینەدان، لەرێگەی خودا لات دەدەن، چونکە هەمو بەشوێن خەیاڵدا دەڕۆن و هەر لە پڕوپوچ خەریکن.. پەروەردگارت زۆر لەخۆت باشتر دەزانێ کێن ئەوانەی لەرێی خوادا لایاندا و باشتریش لەتۆ دەزانێ کێ رێگەی راستی لەبەرە.. دەسا ئێوە ئەگەر بڕواتان بەخودا هەیە و نیشانەکانی خوداتان لەلا راستە، لە گۆشتی ئاژەڵێ بخۆن کە دەمی سەربڕینێ، ناوی خوای لەسەر هاتوە.. بۆچی ئێوە خۆتان لە گۆشتی ئەوانە دەپارێزن کە ناوی خوایان لەسەر دێ؟ کە هەر خوداش بە تەواوی باسی ئەمانەی بۆ کردون کە خواردنیان نارەوایە،-مەگەر لەروی ناچاریەوە- زۆر لەوانە هەر بە ئارەزوی خۆیان و لە نەزانی، مەردم لەرێگە لادەدەن. خودا خۆی ئاگادارترە لەو کەسانەی لە ئەندازە دەردەچن.. لە تاوانی بە ئاشکرا و نهێنی خۆتان بپارێزن، ئەوانەی وا خۆیان توشی تاوان دەکەن، سزای تاوانیان دەبینن.. هەر ئاژەڵێ لەکاتی سەربڕینێدا ناوی خودای لەسەر نەیە، نابێ لە گۆشتەکەی بخۆن، ئەمە لەرێگە لادانە. شەیتانەکان دنەی دۆستانی خۆیان دەدەن، تا کێشەتان لەگەڵ بکەن. جا ئەگەر بەگوێتان کردن، بێگومان شەریکتان بۆ خودا داناوە.﴾الأنعام/١١٤-١٢١.

ئەم ئایەتە بەم پرسیارە بەرەواژە دەست پیّدەکات:

﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا: ئاخۆ ڕەوایە غەیری خوا داوەرێکی پەیدا بکەم؟﴾.

کە ئەوە دەگەیەنێ حاکمیەت تەنیا بۆ خودایە، کە هەر ئەو دەبێ بە داوەر هەڵبژێردرێ و نابێ هیچ کەسێکی دیکە لە هیچ کاروبارێکدا حوکمی بۆ بڕێتە بەر. پاشان ئەوە دەگەیەنێ کە خودا قورئانی (بێکەمایەتی و بە وردەکاری و درێژەپێدانەوە) ناردۆتە خوار، جا کەس هەنجەتی نەماوە تا جگە لە خوا حەکەمێکی دی لە یەکێك لە کاروبارەکاندا هەڵبژێرێ.. ئەوەش تێبینی دەکرێ کە ئەم ئایەتە مەککەییە و لە سورەتێکی مەککەییە و، لە مەککەشدا هێشتا هەمو ئەو یاسایانە دانەبەزیبون کە مرۆڤ لە ژیانیاندا پێویستیان پێی دەبێ. بەڵکو ئەوە لە مەدینە بو، ئەو درێژەپێدانەی کە ئایەتەکە ئاماژەی پێدەکات، (درێژەپێدانی ئەحکام-واتە وردکردنەوەی لقەکان- بەڵکو وردکردنەوەی دۆزە هەرەگەورەکەیە- دۆزی حاکمیەت- و لە پنچینەی بیروباوەڕدایە و، بیروباوەڕیش تەواو نابێ و ڕاست نابێ مەگەر واتا و مەبەستەکەی بریتی نەبێ لە پابەندبون-لەروی ڕێبیرەوە[1] - بەوەی لەلایەن خوداوە هاتوە، جا ئەوەی لەلای خودا هاتوە چ زۆربێ چ کەم، بە بیروباوەڕ تایبەت بێ یا بە ئاکار یا بە حوکمەکان..[2] پاشان ئایەتەکان بەردەوام دەبن و بڕیاردەدەن کە واژەی خودا بریتیە لە جیاکەرەوەی نێوان حەق و ناحەق و، بریتیە لە ڕاستی و دادگەری و، ئەوانی شوێنیشی ناکەون ئەو گومڕایانەن کە شوێن

---

١ ڕێبیر: مبدأ .

٢ بە وردی و سەرتاپاگیری لەبارەی ئەم بابەتە، پێشەکی سورەتی ئەنعام لە (في ظلال القرآن)دا بەرگی/٧، لاپەڕە/١٠٠٤-١٠٢٩ بخوێنەوە، لەگەڵ بەشی (پەرستراوی و بەندایەتی) لە کتێبی (مقومات التصور الاسلامي).

گومانان دەکەون و، پاشان ڕێنوێنیش نابن، خوداش چاك دەزانێ کێ لـە شـاڕێگای وی گومڕا دەبێ و کێش ڕێگاکەی دەدۆزێتەوە.

ئینجـا نـۆرەی ئـەو دۆزە دێ کـە ئـەم هـەمو پێشـەکیانە بـۆ دوپاتکردنـەوەو ڕەگاژۆکردنی هاتون، ئەویش دۆزی حەلاڵکردن و حەرامکردنە. داخـوا کـێ بڕیـاری تێدا دەدا و، هەڵوێستی بڕواداران و هەڵوێستی هاوبەشپەرستان لە ئاسـتیدا چیـە و هەر شتێکی لـەم بابەتانـەوەش کـە مـرۆڤ دەکاتـە بـڕوادار یـا هاوبەشپەرسـت، خولگەکەشی بریتیە لەوەی کە هاوبەشپەرستەکانی مەککـە نـاوی خوایـان لەسـەر شتی مردار نەدەهێنا و پاشان خواردنیشیان حەلاڵ دەکرد. هەر لەلایەن خۆشـیانەوە شەرعیەتیان بەم مەسەلەیە دەدا بێ ئیزنی خـودا و بـێ بەڵگـە، جـا خـوا ڕێ لـە بڕواداران دەگرێ کە شتێك بخۆن نێوی خودای لەسـەر نـەهاتبێ و-کـە بریتیـە لـەو مردارەی خودا حەرامی کـردوە- ئاگاداریـان دەکاتـەوە لـەوەی ئەگـەر گوێڕایـەڵی هاوبەشپەرستان بن وەکو ئەوان دەبنە هاوبەشپەرست. چونکە بەم کارەیان پابـەندی یاسایەکی جاهیلی و دور لە ڕێگەی خودا دەبن.

لەوەدا روندەبێتەوە کە دۆزی حاکمیەت لە مەدینە و پـاش دابـەزینی یاسـاکان دەستی پێنەکردوە، بەڵکو لە مەککـەدا کـاتی ڕەگـاژۆبونی[1] بنـەماکانی بـاوەڕ و رونکردنەوەی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) دەستی پێکرد، بەلاّم دواتـر ئەحکامـە بڕەڕەکان[2] لە مەدینەدا هاتن بڕیاری ئـەوەیاندا کـە هەرکەسـانێکی حوکـم نەکـەن بەوەی کە خودا دایبەزاندوە کافر دەبن و، کەسێکیش نابتە ئیمـاندار هـەتا حوکـم دەباتـە لای خـودا و لای پێغەمبەرەکـەی، وەك پیـادەکردن و جـەختکردنێك[3] بـۆ

[1] ڕەگاژۆ: تأصيل

[2] بڕەڕ: قاطع

[3] پیادەکردن: تطبيق جەختکرن: تأكيد

بڕیارەکانی کاتی ڕەگاژۆکردنی باوەڕ لە مەککە.

❊ ❊ ❊

جا ئەگەر ئەمە لەلایەنی ئەرکبارکردنی[1] پەروەردگارەوە بێ، با تەماشای لایەنی پیادەکردن بکەین لە ژیانی بڕواداران لە مەدینەدا.. چۆن فەرمانی پەروەردگاریان وەرگرت و چۆن جێبەجێیان کرد..

هیچ یەکێك لەو نەوە تاکو تەرایە زۆر نەدەوەستا و زو دەیپرسی: ئایا ئەو فەرمانانەی پەروەردگار -جا لە کتێبی خوادا هاتبن یا لە سوننەتی پاکژدا- پابەندکارن؟! ئایا دەکەونە ناو چوارچێوەی ناوی بڕوا یا لێیەوە زیادە؟!! ئایا مرۆڤیش دەبێتە بڕوادار ئەگەر هاتو هەرگیز کاری بە هیچ یەکیان نەکرد؟!!

• هیچ یەکێك ئەوەی نەدەکرد، جا ئەگەر لەو بڕوادارانە با کە خودا و پێغەمبەرەکەیﷺ شایەدی بڕوایان بۆ دابو، یا تەنانەت لە دوڕوەکانیش بوانایە، کە لە ڕودا بڕوادار و لە ناخی دەرون کافر بون.

چونکە هەردولا (بڕوادار یا دوڕو) دەیانزانی کە (لا إله إلاّ الله) تەنیا وشەیەك نیە بەزمان بگوترێ و کۆتایی پێبێ، بەڵکو واژەیەکە و کۆمەڵێك داخوازی هەیە، بەراستیش ئەم داخوازیانەیان بەجێ دەهێنا، لەگەڵ جیاوازیەکی بناغەیی لەنێوان بڕوادار و مونافیقان. ئەوانی یەکەم بۆیە جێبەجێیان دەکرد چونکە بڕوایان پێهەبو و گوێڕایەڵی خوداش بو کە فەرمانی پێکردبون و داییەزاندبون، هەروەها لەخۆشی و تەمای بەهەشت و ڕەزامەندیەکەی خوا، ئەوانەی دیکەش بە دوڕویی و بێبڕوایی ئەنجامیان دەدا و بە سارد و سڕیەکی دیار یا بزر جێبەجێیان دەکرد، یا بە فڕوفێڵ خۆیان لێدەدزیەوە:

---

١ ئەرکبارکردن: تکليف.

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلاَةِ قَامُوا كُسَالَى يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلاَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلاَّ قَلِيلاً: بەدڵ دەغەڵانی دوڕو دەیانەوێ خوا فریودەن، کەچی خوا دەیانخەڵەتێنێ. ئەگەر دەچن نوێژ دابەستن، بە تەوەزەلی هەڵدەستن، روبینی لەخەڵك دەکەن، کەمیان نەبێ کەمتر ناوی خوداش دێنن.﴾النساء/١٤٢.

﴿وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُنْ مَعَهُمْ شَهِيدًا، وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِنَ اللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَنْ لَمْ تَكُنْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ يَالَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا: هەندێکی واتان لەناودان کە لە ئانقەست خۆی بەپاش دەدا و ناتانگاتێ. ئەگەر ئەوسا ئێوە توشی چورتمێك[1] بن، دەڵێ: خودا بەهرەی بەمن بەخشی کە من دەگەڵیاندا نەبوم.. ئەگەر ئێوە لە سایەی چاکەی خوداوە دەسکەوتێکی باشتان دەسکەوت، وەك کەسێکی کە لەپێشدا هەر یەکترتان نەناسیبێ و دۆستایەتیتان نەبوبێ، دەڵێ: خۆزگە منیش بەگەڵیان کەوتبام، ئەوسا منیش لەو خێر و بێرە گەورەیە بەشدار دەبوم.﴾النساء/٧٢-٧٣.

هیچ یەکێکیش لەو دوڕوانە -چ جای بڕوادارەکان!- وای بۆ نەدەچو کە بتوانێ تەنیا بە گوتنی (لا إله إلاّ الله) روکەشێتی[2] ئیسلام لە ژیانی دنیادا وەدەست بێنێ، بە بێئەوەی تەنها یەکێك لە داخوازیەکانی جێبەجێ بکات.. مەحاڵ بو ئەمە -لە کۆمەڵگەی موسڵماندا- روبدا!!!

تەنها بۆچونی هەبونی تاکەکەسێك لە کۆمەڵگەی موسڵماندا -واتە ئەو

---

١ چورتم: مصيبة.

٢ روکەشێتی: مظهرية .

کۆمەڵگەیەی حوکمی بە شەرعی خودایە- کە پێی بگوترێ (موسڵمان) و پارێزگاریش لەم ناوەی بکات-جا لە راستیدا بڕوادار بێ یا دووڕو- بەبێ ئەنجامدانی یەکێك لە کردەوەکانی ئیسلام.. بۆچوونێکی مەحاڵە!

چونکە هەر بەلای کەمی مەسەلەی نوێژ لە گۆڕێیە!

هیچ تاکەکەسێك ناتوانێ لە کۆمەڵگەی موسڵماندا-واتە ئەو کۆمەڵگەیەی کە حوکمی بە شەرعی خودایە- کە سێ ڕۆژان لەسەریەك نوێژێ نەکا بەبێ ئەوەی دووچاری سزای کوشتن بێ! یەکسانیشە چ وەك حەددێك بکوژرێ یان بەکافر دابنرێ و بکوژرێ. چونکە عیبرەت لێرە نیە! بەڵکو عیبرەت-هەروەکو ئیبنی تەیمیەی پێشەوا فەرمویەتی- لەوەدایە کە لە واقیعی کرداریدا ناکرێ مرۆڤێك هەبێ یەك گەردیلە بڕوای لە دڵیدا هەبێ و بەهۆی نوێژکردنێ ڕووبەڕوی کوشتن بێتەوەو هێشتا هەر ڕکە بگرێ و نوێژ نەکا تا بەراستی دەکوژرێ!! ئەمە مەحاڵە!!

هەروەها دانپێدانانێکی واقیعی کرداری بە حاکمێتی شەرعی خودا لە گۆڕێدایە، کە بە تەنیا حوکم ببرێتە بەر ئەو شەرعە و حوکم نەبرێتە بەر هیچ یاسایەکی دیکە.. ئەگینا، ئەگەر لە سایەی ئەم حوکمە دەرچو- لە کۆمەڵگەی موسڵماندا- یان نکوڵی بەشێکی کرد، ئایا بە (موسڵمانی) دەمێنێتەوە؟ و ئایا بە زندویی دەمێنێتەوە؟ یاخود دەبێتە هەڵگەڕاوەو حەددی هەڵگەڕانەوەی دەکەوێتە سەر؟!

بەمشێوەیە دەردەکەوێ کە مەحاڵە-لە کۆمەڵگەی موسڵماندا- یەك تاکەکەس هەبێ تەنیا یەکێك لە کردەوەکانی ئیسلام جێبەجێ نەکا، ئەوجا هەر بە موسڵمانەتی بمێنێتەوەو پارێزگاریی لەم ناوە بکات، سەرەڕای ئەوەی کە ژیانیشی لەو کۆمەڵگایەدا بمێنێ!! بەڵکو ئەم شێوە بانگەوازە بۆش و بەتاڵە تەنیا لە

کۆمەڵگە جاهیلیەکان بانگەشەیان بۆ دەکرێ کە خۆ بە موسڵمان پیشـان دەدەن و، پاڵ دەدەنە بەر هزری ئیرجائی، کە تەواو بەرۆحی ئەم ئاینە نامۆیە.

* * *

بـا ئێستا لـە سێ پێگـەی[1] جیاوازەوە بڕوانینـە ئـەم دۆزە ترسـناکە-دۆزی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله)- کە هەرسێکیان لە کۆتاییدا دەگەنە یەك ئەنجام:

یەکەم: ئایا ئەم ئاینە دەتوانێ بگاتە ئەو ئامانجانەی کە بۆیان دابەزیوە، ئەگـەر هـەمو داخوازیـەکان تـەنیا هـەر بەڕاسـتدانان و دانپێداهێنـان بـن، یـا ئەگـەر بەڕاستدانان و دانپێداهێنانیان-بەتەنیا- بەسبن بـۆ پێدانـی سـیفەتی ئیسـلامەتی، نەك تەنیا لە دنیادا، بەڵکو لە رۆژی دوایش هەروەتر[2] ؟!.

دوەم: ئایا ئەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و هاوەڵـە بـەڕێزەکانی لـە پیـادەکردنی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) ئـەنجامیان دەدا، لـەخۆڕا بەخشـینێك بـو و ئـەرکی سەرشانیان نەبو؟!.

سێیەم: ئایا لە واقیعی دەرونی مرۆڤدا دەگونجێ کە مرۆڤ بڕوا بە شتێك بێنـێ پاشان سەرپاکی رەفتارە واقیعییەکەشی لە داخوازیەکانی ئەم بڕوایە جودابێ؟!

* * *

جـا لـە پێگـەی یەکەمـەوە دەسـتپێدەکەین و یەکـەجار دەپرسـین: خـودا بـۆ پێغەمبەران بۆ مرۆڤایەتی دەنێرێ و بۆ پەیامیان بۆ دادەبەزێنێ؟

هەر لەلایەن خۆشمانەوە وەڵامی مەسەلەیەکی وا ترکزە نادەینەوە، چونکـە هیـچ کەسێك بۆی نیە لەخۆڕا وەڵامی ئەم مەسەلەیە بداتەوە. چونکـە خـودای بـەرز لـە

---

[1] پێگە: منطلق.

[2] هەروەتر: کذلك .

کتێبی دابەزێنراوی خۆی کە نە لە پێشڕا و نە لە دواوە ناحەقی روی تێناکا، ئەم بەڵامەی دابینکردوە:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ: هەرکەسێکمان بە پێغەمبەری هەناردبێ، بۆیە بوە کە بە ئیزنی خوا فەرمانی قبوڵ کەن و گوێڕایەڵی بن. ﴾النساء/٦٤.

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ: ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بە چەند بەڵگەی ئاشکراوەو وێڕای ئەوان، کتێب و هۆی هەڵسەنگاندنمان ناردەخوار، هەتا خەڵك بێ جیاوازی لەناو یەکا رەفتار بکەن. ئاسنیشمان ناردۆتە خوار، کە هێزی بڕشتی زۆردو زۆر بەهرەی بۆ خەڵك تێدایە و، تا خودا بۆ خۆی بزانێ کێ لە غەیبەوە خۆی و پێغەمبەرەکانی سەردەخا. دیارە خودا خاوەن هێز و دەستەڵاتە. ﴾الحدید/٢٥.

پێش ئەوەی باسی دوایین پەیام بکەین-کە بارێکی تایبەت و کۆمەڵە ئامانجێکی تایبەتی هەن- لەم دو ئایەتە رادەمێنین کە باسی پەیامەکان بەگشتی دەکەن هەر لە ئادەم و نوحەوە تا موحەممەدﷺ.

یەکێك لە ئایەتەکان بڕیاردەدا کە ناردنی پەیامبەران لەلایەن خواوە تەنیا بۆ پێڕاگەیاندن و ئاگادارکردنەوە نیە، بەشێوەیەك کە هەر مرۆڤێکی پەیامبەرێکی بۆ رەوان کرا دەتوانێ بڵێ: ئەوا مەسەلەکەت پێت ڕاگەیاندم و زانیم،[1] بەڵکو پێویستە

---

١ زانست(علم) لە زماندا مانای یەقین دەدا، کە ئەو (بەڕاستدانان)ەش دەگرێتەوە کە مورجیئەکان باسی دەکەن و دەڵێن واتای بڕوا ئەوە دەگەیەنێ.

لەسەری بلّێ: فەرمانەکەم پێڕاگەیشت و زانیم و گوێڕایەڵ و پابەندیم. ئا بەمشێوە وەڵامی ئەو پەیامبەرەی داوەتەوە کە بۆی رەوانکراوەو، ئەو ئامانجەشی وەدیهێناوە کە پەیامبەرەکەی بۆ رەوانە کراوە.

ئایەتەکەی دیکە ئەو ئامانجە روندەکاتەوە و سنورەکانی دیاریدەکا، کە بەرپاکردنی ژیانی خەڵکە بەدادگەری و بێ‌جیاوازی، کە ئەمەش واژەیەکی کورتی گشتگیری کۆکەرەوەیە، ئایەتەکانی دیکەی قورئان بەشێوەیەکی سنوردار و وردی دەکەنەوەو درێژەی پێدەدەن(لەگەڵ سوننەتی پاکی پێغەمبەر) کە بۆ ئارەزوی مرۆڤ جێ‌نەهێڵراوە. چونکە ئەگەر دیاریکردنی دادگەری و یەکسانی بۆ ئارەزوی مرۆڤ وازی لێ‌هێنرا هەمو شتێك گەندەڵ دەبێ:

﴿وَلَو اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَت السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ: ئەگەر راستی شوێن ئەوان کەوتبا، بێگومان ئاسمانەکان و زەمین و هەرچی دەناو ئەواندایە، خرادەبون.﴾المؤمنون/٧١.

داخوازی ئەم ئایەتە ئاماژەپێکراوەی پێشو ئەوەیە کە ناردرنی پەیامبەران و دابەزاندنی کتێب تەنیا بۆ پێڕاگەیاندن و ئاگادارکردنەوە نیە، بەڵکو بۆ وەدیهێنانی ئامانجێکی **کرداری واقیعیە** لە ژیانی خەڵکیدا کە بەرپاکردنی شەریعەت و بەرنامەی خودایە. لەگەڵ ملکەچکردنی خەڵکی بۆ ئەم شەریعەت و بەرنامەیە، چونکە ئەمە تاکە رێگەیە تا خەڵك دادوەری بەرپاکەن، بەواتا **کردەوەیەك** هەیە کە دەبێ لە واقیعی زەویدا بێتەدی پاش **بەراستدانان و دانپێداهێنان**. ئەگەر ئەو کردەوەیەش نەبێ ئامانجی هەناردنی پەیامبەران و دابەزاندی ئاین وەدی نایێ، بەڵکو ئاین دەبێتە کۆمەڵە دروشمێکی بەرزکراوەو بنەمایەکی واقیعی نابێ، یا دەبتە کۆمەڵە خۆزگەیەك لە ویژداناندا، نە چ بەرەوپێشدەبا و نە چ دوادەخا و، نە

هیچ شتێك له ژیانی خه‌ڵكیدا ده‌گۆڕێ. ئاماژه‌كردنیش -له ئایه‌ته‌كه‌دا- به‌ئاسن و هێز و، سه‌ركه‌وتنی خوا و پێغه‌مبه‌ره‌كانی، به‌ڵگه‌ی ئاشكران كه له‌نێوان كرده‌وه داواكراوه‌كان جیهادیش هه‌یه له‌پێناو خوا تا خه‌ڵك دادوه‌ری ئه‌نجام بده‌ن و بێ‌جیاوازی له‌ناو یه‌كا ره‌فتار بكه‌ن.

جا ئه‌گه‌ر ئه‌م مانایه له هه‌مو په‌یامه‌كان وه‌دیهاتبێ هه‌ر له ئاده‌م و نوحه‌وه تا موحه‌مه‌دﷺ، ئه‌وا په‌یامی دوایین بارێكی تایبه‌تی هه‌یه له‌گه‌ڵ كۆمه‌ڵه ئه‌ركێكی تایبه‌ت، كه زیاتر و جیاوازن له سه‌رجه‌م په‌یامه‌كانی پێشتر.

خودای -به‌رز و پاك- له‌باره‌ی په‌یامه‌كانی پێشو و ئه‌هلی ئه‌و په‌یامانه ده‌فه‌رموێ:

﴿وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ: فه‌رمانیشیان هه‌ر ئه‌وه‌نده پێدرابو كه ده‌بێ خواپه‌رست بن و له دینی ئه‌ودا دڵپاك بن و به‌ره‌و هه‌قانه‌ت بڕۆن و نوێژ بكه‌ن و زه‌كات بده‌ن، كه ئه‌مه دینی دروسته.﴾البينة/٥.

جا ئه‌گه‌ر ئه‌م فه‌رمانه هه‌مو په‌یامه‌كان بگرێته‌وه تاكو په‌یامی موحه‌مه‌دﷺ، ئه‌وا دواپه‌یامیش -كه‌په‌یامی كۆتاییه- كه پێغه‌مبه‌ری دوایینیﷺ پێ ره‌وانه‌كراوه گرنگیه‌كی دیكه‌ی هه‌یه جیا له په‌یامه‌كانی دی و، ئه‌ركباری زیاتری تێدا سه‌رباری په‌یامه‌كانی دی.

له قه‌ده‌ر و ویستی خودا دابو كه پاش موحه‌مه‌دﷺ په‌یامبه‌رێكی دیكه نه‌نێرێ:

﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ: موحه‌مه‌د بابی هیچ پیاوێك له پیاوانی ئێوه نیه، به‌ڵام پێغه‌مبه‌ری خوایه و ئاخری

پێغەمبەرانە..﴾الأحزاب/٤٠.

((أَلاَ إِنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعدِي: هیچ پێغەمبەرێك لەپاش من نیە.)).[1]

هەروەها لە قەدەر و ویستی خوادا بو کە ئاین بەم پەیامە کۆتاییە تەواو بکا و، بۆ هەمو مرۆڤایەتی بێ:

﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا: وا لەمڕۆوە دینەکەتانم تەواو کرد و بەبێ کورتی و کەمایەتی چاکەم دەربارەی ئێوە کرد، ئیسلامیشم بە دینی ئێوە هەڵبژارد.﴾المائدة/٣.

﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا: ئێمە تۆمان هەر بۆیە نارد کە بۆ گشت خەڵکی سەر زەمین مژدەدەر و ترسێنەر بی!﴾سبأ/٢٨.

﴿قُلْ يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا: بڵێ: خەڵکینە! بزانن ئەمن خودا بۆ لای سەرجەم ئێوەی هەناردومە.﴾الأعراف/١٥٨.

((...وَبُعِثْتُ إِلَى الأُمَمِ كَافَة: هەروەها بۆ هەمو نەتەوەکان رەوانەکراوم.)).[2]

جا سەرجەم ئەمانە ئەوە دەخوازێ کە ئەم ئوممەتە دوایینە کە پەیامی دواییني هەیە، دو ئەرکی پێ رابسپێردرێ نەك تەنیا ئەرکێك وەکو ئوممەتەکانی پێشو.

ئەگەر ئوممەتەکانی پێشو هەمویان بەمە راسپێردرابن کە خودا بەدڵپاکی ﴿مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ: لە دین ئەودا دڵپاك بن.﴾ بپەرستن و، تەنیا لە چوارچێوەی خۆیاندا لەسەر ئاین و ئەرکەکانی سەقامگیر بن، ئەوا ئوممەتی موسڵمان هەمان ئەم ئەرکەی پێ‌راسپێردراوە، ئەوجا سەرەڕای ئەمەش پێی راسپێردراوە کە ئەم ئاینە لە هەمو پارچەکانی زەویدا بڵاوبکاتەوە بەجێنشینی

---

[1] أخرجه الشيخان.

[2] أخرجه الشيخان.

پێغەمبەرﷺ و درێژکردنەوەی ڕێبازەکەی و، تێبکۆشی تا ئاین هەمووی بۆ خودا دەبێ.

﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنْكَرِ: دەبێ لەنێو ئێوەدا کۆمەڵێك بن، فەرمان بەچاکە بدەن و ڕێ لە خراپە ببەستن.﴾آل عمران/١٠٤.

﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ: شەڕیان لەگەڵدا بکەن هەتا ئاژاوە نامێنێ و دین گشتی دینی خوا دەبێ.﴾الأنفال/٣٩.

داخوازی ئەمەش ئەوەیە کە ئەو(کردەوە)ی لەم ئوممەتە داواکراوە لەپاش **بەڕاستدانان و دانپێداهێنان، گەلێك گەورەترە و، زۆر ترسناکترە لە هەر** کردەوەیەکی کە لە ئوممەتێکی پێشو لەمێژودا داواکرابێ.

ئەگەر بەڕاستدانان و دان پێداهێنان بەتەنێ و، بەبێ کردەوە حەقی ئەرکبارکردنە پەروەردگاریەکەی هیچ ئوممەتێك لە ئوممەتەکانی پێشو نەدات، چونکە خودا هەریەکەی کۆمەڵە ئەرکێکی لەسەر شان داناون و، پێغەمبەرێکی بۆ ناردون تا بە ئیزنی خودا گوێڕایەڵیی بکرێ، نەك تەنها بۆ پێڕاگەیاندن، ئەوا ئەم ئوممەتە-بە سیفەتێکی تایبەتی- ناکرێ تەنیا بەڕاستدانان و دانپێداهێنان مافی ئەو ئەرکە پەروەردگاریەی سەرشانی پڕکاتەوە، لەکاتێکدا کە دو ئەرکیشی پێکەوە پێ ڕاسپێردراوە: کە لە خودی خۆیدا بۆ خودا سەقامگیر بێ، پاشان ڕێنوێنی پەروەردگار بە هەمو زەویدا بڵاوبکاتەوە.

ئایا بە چ خەیاڵێك دادێ-ئەگەر داواکراو هەمووی هەر بەڕاستدانان و دان پێداهێنان بوایە و چیتر نەبا- تەنانەت تەنیا کەعبەش لە بتەکان پاك بکرابا‌وە، ناشڵێین مەککە بەتەنێ، یا دورگەی عەرەبی، چ جای بەشەکانی دیکەی جیهانی

ئیسلامی كه به جیهادی موجاهیدانی ڕێی خوا روناكیان گەیشتۆتێ.

ئایا دەهاتــە بــەر چ بۆچونێــك-ئەگــەر تــەواوی داواكــراو هــەر بەڕاســتدانان و دانپیێدانان با-كە ئیسلام دەوڵەتێكی لە مەدینە بۆ دامەزرابا،[1] چ جای ئەوەی ئــەو دەوڵەتە تەواوی دورگەی عەرەبی بگرێتەوە، یا رابكشێ و، لەنیو سەدە نێوان زەریـا لە رۆژاوا تاكو هیند لە رۆژهەلاّت دابگرێ هەروەكو رویدا.

ئایا بەبیری كەسیشــدا دەهــات-ئەگــەر تــەواوی داواكــراو هــەر بەڕاســتدانان و دانپیێدانان با، یا ئەگــەر موســڵمانان وا تێگەیشــتبان كــە داواكــراو هــەموی هــەر بەڕاستدانان و دانپیێداهێنانە- كە كۆڵەگەكانی[2] دەوڵــەت لــە مەدینــەدا چەســپابا، لەوكاتەی كە جولەكەش لە ناوەوەڕا تەڵەو داویان بۆ دەناوەو، لە دەرەوەش قوڕەیش چاڵیان بۆ هەڵدەكەند، چ جای ئەوەی كە كۆڵەگەكانی لە تەواوی دورگەدا بچەسپێ، یا یەكێك لە دو دەوڵەتە مەزنەكەی هاوبەشپەرســتی لــە رەگــەوە هەڵتــەكێنێ كــە (فارس) و ئەی دیكەش (رۆم) لە بنەوەڕا بهەژێنێ سایەی عــەرش و دەســەلاّتی لــە زەویدا وێك بێتەوەو[3] دابكشێ.. چ جای ئەوەی ئەو دەوڵەتە-لەپاشاندا- ببێتە چەق و تەوەری دنیا، كە زانستی تێدابێ و، ژیاری[4] تێدابێ و، هێز و بالاّدەســتی لــەروی زەویدا هەبێ؟!

* *

---

١ دەوڵەت لە مەدینەدا پاش كۆچ دامــەزرا، ئەمــەش-هــەروەك پێشــتر باسمــانكرد- كردەوەیــەك بــو موسڵمانان بە ئەركباركردنێك لەلایەن خوداوە ئەنجامیاندا، كردەوەیەك بــو زێــتر لــە بەڕاســتدانان و دانپیێداهێنان.

٢ كۆڵەگەكان: دعائم        ٣ وێك هاتنەوە: تقلص.        ٤ ژیار: حضارة

لەو پێگەی کە باسمان کرد دەچینە پێگەی دوەم، لێشی نێزیك کەوتوینـەوە، جـا دەپرسـین: ئایـا ئـەو کردەوانـەی پێغەمبـەری خـواﷺ و هاوەڵـە بـەڕێزەکانی لـە پیادەکردنی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) ئەنجامیان دەدا، لەخۆڕا خـۆ بەخشـینێك بو و ئەرکێکی سەرشانیان نەبو؟

لێرە خالێك بەدیدەکرێ کـە ڕەنگـە لـەنێو زەینـەکاندا تێکـەڵ بـێ، لـە نێـوان خۆبەخشین و ئەرکباری[1] بەگوێرەی نەوەی هاوەڵانﷺ.

لەکتێبی (واقعنا المعاصر) ئەوەم ڕونکرۆتەوە کە ئەو نەوە ناوازەیە لەوەدا تـاك و جیا نیە کە بە ئەرکە پەروەردگاریەکی هەڵسـتاوە، چونکـە ئەمـە فەرمانێکـە و بەسەر هەمو نەوەکاندا فەرزکراوەو، لە هەمو نەوەکان داواکراوە، بەڵکو تـاکێتی و جودایی ئەو نەوەیە لە پلەی بەرز و سەرسوڕهێنی جێبەجێ‌کردنی ئەو ئەرکانەدایە.

چونکە خودا جەنگی فەرزکردوە، بەڵام ئەوکەسەی کە لەماڵی خۆی بـۆ جـەنگ هاتەدەرێ و چەند دەنکە خورمایەکی لەدەستبو دەیخواردن و خۆی زۆر هێدی هاتـە بەرچاو لەڕێی بەهەشت، جا گوتی: ئەگەر من تا لە خواردنی ئەم قەسـپانە دەبمـەوە بمێنم زۆر درێژ دەخایەنێ! قەسـپەکانی فڕێـدا و خـۆی هاویشـتە کـۆڕی جـەنگ و شـەهید بـو.. ئەمـە پلەیـەکی زۆر باڵایـە لـە جێبـەجێکردنی ئـەرك و فـەرمانی پەروەردگاری، کە ئەمە و زۆری هاوشێوەش لەو نەوە ناوازەیـەدا هـەبون، هـەرچی خودی جەنگیشـە وەك وەرامدانـەوەی ئـەرکێکی پـەروەردگاری، مەسـەلەیەکە لـە هەمو نەوەکان داواکراوەو تەنیا بەو نەوەیە تایبەت نیە.

هەروەها خودا فەرمانی داوە کە کۆمەڵگەی ئیسلامی هەموی لەو خێر و بـێرە گشتیەدا هاوبەش بێ کە خودا بەسەر ئەو کۆمەڵگەیـەیدا هـەڵدەڕێژێ و، ئـامرازی

---

[1] خۆبەخشین: تطوع ئەرکباری: تکلیف .

بۆ جێبەجێکردنی ئەو هاوبەشیەش زەکاتە کـــە دەوڵەمــەندەکان لــە زێــدەی مــاڵی خۆیان(ئەوەی لە نیصاب زیاد دەبێ) دەیبەخشــن و، دەوڵــەت بەســەر موحتاجــانی دابەش دەکا، کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەستنیشانی کردون:

﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِـــي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ: زەکات هەردەبێ بدرێتــە هــەژاران و کەم دەســتان و ئەوکەســانەی کاروبارەکــە هەڵدەســوڕێنن و، بەخشــین بکــرێ بــۆ هۆگــری نــــەیاران و رزگــــارکردنی کۆیـــــلان و قــــەرزداران لـــــەرای خـــودا و لەرێگابەجێماواندا. ﴾التوبة/٦٠.

ئامرازێکی دیکەش بریتیە لە ماڵ بەخشین لەرێی خودا بەبێ دیاریکردنی رێژەی وەکو نیصابەکانی زەکات، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: ((فِي الْمَـــالِ حَـــقٌّ سِوىَ الزَّكَاة: ماڵ بێجگە لە زەکات حەقی دیکەشی تێدایە.))[1].

ئەم ماڵبەخشینەش لەپێناو خــودا مەســەلەیەك نیــە تــەنیا بــە نــەوەی یەکــەم تایبەت بێ، چونکە ئەرکێکە بۆ هەمو نەوەکان، بەڵام ئەو کەسەی لەهــەمو مــاڵی خۆی هاتەدەرێ و.. ئەو کەسی کە میوانی هات و ئەمیش نــان و خۆراکــی مــاڵ و منداڵی شك نەدەبرد، جا بەخێزانەکەی گوت: چراکەی بکوژێنــەوەو منــداڵان بێخــە ناوجێ، پاشان وای پیشاندا کە خۆی و خێزانەکەی لە خواردن بەشدارن تا میوانەکە دڵی ببێتەوەو بخوا، تا وایلێهات هەرچی هــەبو بــە تــەنێی خــوارد، خــودا لــەبارەی ئەوانە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَـــــةٌ: ئــەوان لەپێشــتر دەزانــن، هەرچەند دەست تەنگیشیان هەیە. ﴾الحشر/٩.

---

١ أخرجه ابن ماجه.

جا خۆ خودا -ی بەرز و پاك- ئەم دو لەخۆڕا بەخشینە بالاَیەی فەرز نەکردبو، کەچی ئەمانە و هیدیکەش بونە جیاکەرەوەی تاکێتی ئەو نەوەیە ناوازەیە.

پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمویەتی: ((**الحَلاَلُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُتَشَابِهَات، فَمَن إتَّقَى الْشُبُهَاتَ فَقَدْ إسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ، وَمَنْ حَامَ حَوْلَ الحِمَى أَوْشَكَ أنْ يَقَعَ فِيهِ**: حەلالّ ئاشکرایە و حەرام ئاشکرایە، شتیشیان لەنێواندا هەیە کە لێکدەچن، جا ئەوکەسی خۆی لەو شتانە خۆ بپارێزێ کە لێکدەچن، ئەوا پاکیخوازی بۆ ئاینەکەی کردوەو، ئەوی بە دەوری پاوانیشدا[1] بسوڕێتەوە، هێندەی نامێنێ بکەوێتە ناوی.))[2]

بەم شێوەیە داوای لە بڕواداران کردوە کە خۆیان لە شتی جێگومان بپارێزن تا ئاینەکەیان بەپاکی ڕابگرن و، لە سنوری رون و ئاشکرای حەلالّ راوەستن و لەشتی دیکە دوربکەونەوە، ئەمەش ئەرکێکە خراوەتە ئەستۆی هەمو موسڵمانان لە هەمو سەردەمێکدا، هەرچی ئەوانەشبون کە گوتیان: (نۆ لە دەی حەلاڵمان جێدەهێشت لەترسی ئەوەی بکەوینە نێو حەرام)، ئەمە خۆبەخشینێکی بالاَیە و خودا فەرزی نەکردوەو، ئەو نەوەیەش لەمەدا تاکە و پێی دەناسرێتەوە...

بەم شێوەیە جیاوازیەکی گردەبڕ[3] ئەنجامدەدەین لەنێوان دو مەسەلە کە لە مێشکی خەڵکانێکدا تێکەڵ دەبن. لەنێوان ئەوەی کە نەوەی ناوازە وەکو ئەرکبارکردنێك ئەنجامی داوەو کە لەلایەن خوداوە خراوەتە ئەستۆی و، بەتەنیا بەوان تایبەت نیە و، بەڵکو بۆ هەمو نەوەکانە و، ئەگەر وازی لێبێنن گوناهبار دەبن، لەگەڵ ئەو خۆبەخشینەی نواندیان لە دەستپێوەگرتنی مەندوبەکان وەك فەرز، کە ئەمەش لە قوڵی و چەسپیوی بڕوایاندا و لە هەستیاری ویژدانە پاکەکانیان

---

١ پاوان: حمى    ٢ متفق عليه.    ٣ گردەبڕ: حاسم، قاطع، فاصل.

بەرامبەر ئەو ئەرکانەی خودا پێی راسپاردبون، هەڵدەقوڵان...

با ئێستاش تەماشای ئەو ئەرکانە بکەین کە لەبەر ئەوەی ئەرکن بۆیە ئەنجامیان داون، نەك ئەو مەندوبانەی کە پێیانەوە پابەند بون و وەکو فەرز بەسەر خۆیاندا فەرز کردبو..

ئایا پابەندبون بەوەی لە کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺدا هاتبو و، گەڕانەوە بۆ لای خودا و پێغەمبەرەکەی لە هەمو کاروبارێکدا، خۆبەخشینێك بو لەلایەن نەوەی یەکەمەوەو پێی ئەرکبار نەکرابون؟

ئایا راستگۆیی جیهاد لەپێناو خودا خۆبەخشین بو و پێی ئەرکبار نەکرابون؟

ئایا وەدیهێنانی مانای ئوممەت بە وێنە راستەقینەکەی، کە سەرتاپاگیر بو بۆ دەستەبەری[1] نێوان چینەکانی کۆمەڵگە و، برایەتی راستەقینەی نێوان بڕواداران و ئاریکاریی لەسەر چاکە و خۆپارێزی و، حەرامی ماڵ و خوێن و ناموس و پارازتنیان.. ئایا ئەمە هەموی خۆبەخشین بو و پێیان ئەرکبار نەکرابون؟

ئایا دابینکردنی دادگەری پەروەردگاری لە واقیعی زەویدا خۆبەخشین بو و پێی ئەرکبار نەکرابون؟

ئایا خۆ ڕازاندنەوە بە ئاکارەکانی (لا إله إلاّ الله) خۆبەخشین بو و پێی ئەرکبار نەکرابون؟

ئایا سەرڕاستی و وەفاداری لە پەیماننامەکان خۆبەخشین بو و پێی ئەرکبار نەکرابون؟[2]

---

١ دەستەبەرە: تکافل ئاریکاری: تعاون          خۆپارێزی: تقوی

٢ ئەمانە دیارترین سیماکانی ئوممەتی موسڵمانن کە لە کتێبی (واقعنا المعاصر) باسمانکردوە، بە زیادەی بزاڤی زانستی ئیسلامی و بزاڤی ژیاری ئیسلامی کە ئەو دوە-بە سروشتی خۆیان- درەنگتر هاتن، بەڵام تۆوی سەرەتایان لە لۆی ئەو راپسکانە هەرە مەزنە بو کە نەوەی یەکەم وەدیهێنا.

هەروەها ئایا ئەوەیان لەبەر هەستدابو کە ئەو هەمو کارەیان ئەنجامدەدا کە خۆبەخشینێك بو زیاد لە ئەسڵی ئیمان، لەکاتێکدا ئیمانیش لە دەرونیان و واقیعی ژیانیان تەنیا بە بەڕاستدانان و دانپێداهێنان هاتۆتەدی ئەگەرچی هیچ لەو هەمو کردەوانەش ئەنجام نەدەن؟

یاخود دەرونیان پڕ بو بەوەی-هەروەك لە کتێبی خوا و لە پێغەمبەری خوا ﷺ فێری بون- کە ئەنجامدانی ئەو ئەرکانە داخوازی ئیمانن بەوەی کە بێجگە لە خودا هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە و موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە.. ئەوجا پاشان- لەجێبەجێکردندا- بۆ لوتکە هەرە بەرزەکان هەڵدەکشان تا لە خوا نزیك ببنەوە؟!

ئایا دەچێتە عەقڵ کە واقیعی کرداریی ئیسلام هەموی زێدەکردن بێ لە بنچینەکە و نەچێتە ناو ئەو بنچینەیە؟!

ئەگەر وابێ بەهای ئەم ئاینە چیە؟ ئەو ئەرکە چیە کە لە ژیانی خەڵکیدا ئەنجامی دەدا؟!

وە ئایا خودا کتێبان دادەبەزێنێ و، پێغەمبەران دەنێرێ و، داوای ئارام و خۆڕاگری و، جیهادێکی پتەویان لێدەکا، تەنیا بۆ ئەو دەسکەوتە سلبیەی کە بە داپۆشراوی لە دلاندا دەمێنێتەوەو، لە ویژدانانداا پەنا دەدرێ، هیچ شتێك لە واقیعی خەڵکیدا ناگۆڕێ و، حەقێك سەر ناخا و ناحەقێك لەناو نابا و، چاکەیەك بەرپا ناکا و خراپەیەك پوچناکاتەوە؟!

ئایا ئەو ئوممەتە بۆ هەندێ هاتۆتە وجود؟!

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ: ئێوە چاکترین ئوممەتن کە لەناو خەڵکی دنیادا سەرتان هەڵدا،

فەرمان بە چاکـە دەدەن و ڕێ لـە نـاڕەوا دەبەسـتن، باوەڕیشـتان بـەخوا هەیـە﴾آل عمران/١١٠.

ئایا دەچێتە عەقڵ کە ئامانجی سەرەکی سەرهەڵدان و دەرخستنی ئـەم ئوممەتـە مەسەلەیەکی زیادبێ، بەو واتایەی کە وەدیهاتن و وەدینەهاتنی کاریگەریان بەسەر بنچینەکەدا نابێ؟!

یـان دەڵێـن پـەیوەندی نێـوان (لا إلـه إلاّ الله) و داخوازیـەکانی بـە نـەوەی هاوەڵانەوە ﷺ تایبەتە و، هـەرچی ئەوانەشـن کـە لـە دواتـر هـاتون چ کاریـان بـە کردەواندا نیە ئەگەر بەڕاستدانان و دانپێداهێنانیان لیّ وەدیهات؟!

جا ئایا ئەم قسەیە هیچ پاڵپشتێکی ڕاستەقینەی لە قورئان یا لـە سـوننەت یـا لە مەنتیقێکی ژیرانەدا هەیە؟!

ئایا هیچ دەقێك-یا مەنتیقێك- هەیە بڵێ: کە تەنیا نەوەیـەکی دیـاریکراو یـا چەند کەسێکی دەسنیشانکراو دەبێ پابەستی داخوازیـەکانی (لا إلـه إلاّ الله) بـن، خەڵکانی دیکەش هەر ئەوەندەیان لەسەرە لە دڵ بەڕاستی دابنێـن و، بـە زمانیـان بڵێن (لا إله إلاّ الله، محمد رسول الله)، خۆ ئەگەر بەزار گوتیان-بەڕاستیشیان دانـا-هەمو ئەوەی لێیان داواکراوە، وەدیهاتوە و تەواو بـوە، کەسـی دیکـەش بـۆی نیـە لەپاش ئەمە هیچ شتێکیان لیّ داوا بکا! جا ئەگەر بەخۆیان (لەچاکـەی خۆیـان) و لەخۆڕا کردەوەیەکیان لـە داخوازیـەکانی (لا إلـه إلاّ الله) ئـەنجامدا ئـەوە لـەچاکی خۆیانـە و، ئەگـەر نەشـیکەن سەرزەنشـتیان لەسـەر نیـە و.. ئیمانیـان وەدەسـت هێناوە!!

بە حەقیقەت نەوەی یەکەم بەشێوازێکی بێوێنە داخوازیەکانی (لا إلـه إلاّ الله)ی لە خودی خۆی و واقیعی ژیـانیدا وەدیـهێنابو کـە لـە مێـژودا دوبـارە نەبۆتـەوە،

لەکاتێکدا کە نەوەکانی دواتر بەدرێژایی ئەو سەدە دورودرێژانــە یەکبەیــەك خۆیــان لەو داخوازیانە دەدزیەوە تا وایلێهات هێندەی نەما کــە لەبــەر هــەموی دەربچــن. بەڵام ئەمە لەبەر ئەوە نەبو کە نەوەی یەکەم بە خودی خــۆی ئــەرکی تایبــەتی لــە ئەستۆی دابو کە لە نەوەکانی دیکە جیاواز بو، لەبەر ئــەوەش نــەبو کــە نــەوەکانی دواتر لەو ئەرکانە عەفوکرابون کە بەسەر نەوەی یەکەمدا فەرزکرابو.

بەڵکو ئەو باروزروفەی کە دەوری گەشەکردنی نەوەی یەکەمی دابو کردیــە ئــەو نەوەیە تــاکو تەرایــە لــە مێــژودا، چونکــە پێشــتر جاهیلیــەتی دیتبــو، پاشــانیش ئیسلامی دیت، جا هەستی بەو نیعمەتەی پەروەردگار کرد و تەواو قــەدری زانــی و چاوی لێبو، پێغەمبەریشﷺ لەنێوانیاندا دەژیا و، راســتەوخۆ لێیــان وەردەگــرت و لەبەر چاوانی ویﷺ پەروەردە دەبون، جا تا ئەوپەڕی توانــای بەرزبونــەوەی مــرۆڤ بەرز دەبونەوە، لەپاڵ ئەوەی کە گەشەی نوێی بە دەرونان دەکــرد لــە تیژکردنــەوەی وره و وزەکان تا ئەوپەڕی، بەپێچەوانەی ئەو نەوانەی لــەپاش تــەواوبونی بنیاتەکــە لەدایکبون، هەروەها ئەو نەوەیــەی بەدەســتانی خــۆی بنیاتەکــە دادەمــەزرێنێ و، لەقیتکردنــەوەی مــاندو دەبــێ، پــتر چــاوی لێدەبــێ نــەوەك بڕوشــێ و جوانــــی و رەونەقەکەی تێکچێ..[1]

ئەو باروزروفانە پێکەوە وایــان لــەو نــەوە ناوازەیــە کــرد کــە لــە پیــادەکردنی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) بگاتە ئەو ترۆپکە بەرز و باڵایەی کە هەر خۆی پێــی گەیشتو نەوەکانی دیکە نەیگەیشتنێ. هەرچی ئەرکەکانیشن ئەوا هەروەکو خۆیانن چۆن لە دوتوێی کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺدان، ئەنجامدانیشیان وەك

---

١ ئەو باروزروفە و کاریگەری لە پێکهاتەی نەوەی یەکــەم بەشــێوازە ناوازەکــەی لــە کتێبــی (واقعنــا المعاصر) بەندی (نظرة الى الجيل الفريد) باسکراوە.

داخوازی بڕوا هەبون بە (لا إله إلاّ الله)، ئەوە حەقیقەتێکە پەیوەندی بەوەوە نیە کامە نەوە یەکەمینە یا ناوەڕاستە یان ئەوەی دواییە![1]

* * *

ئێستا دێینە دواهەمین پێگە و دەپرسین: ئایا لە واقیعی دەرونی مرۆڤایەتیدا دەکرێ مرۆڤ بڕوای بە شتێك هەبێ، پاشان سەرجەم ڕەفتارە واقیعیەکانی جودا، یا پێچەوانەی داخوازیەکانی ئەو بڕوایە بن؟!

تەنیا یەك حاڵەت هەیە ئەو کەسانە دەیزانن کە بە چارەسەری نەخۆشیە دەرونیەکانەوە خەریکن و بریتیە لە حاڵەتی (لەتبونی کەسێتی= انفصام الشخصية) کە نەخۆش تیایدا دو کەسێتی تەواو لێك جیاوازی دەبێ-وەکو ئەوەی هیچ پەیوەندیەکیان لەنێواندا نەبێت- یەکێکیان-بۆنمونە- چاکەکارە و ئەی دیکە خراپەکارە، نەخۆش لە نێوانیاندا دێ و دەچێ لەکاتی نۆرەی دەمارەهەڵچونی وا کە خۆی دەسەڵاتی بەسەردا نەبێ، ئەمەش حاڵەتێکی نەخۆشیە و ئەرك لەسەر شانی خاوەنەکەی لادەبا.. لەگەڵ هەندێشدا خودی ئەم حاڵەتە بەهۆی ئەو ڕەفتارانەوە ئاشکرا دەبێ کە لەگەڵیدان و بۆی دەبنە بەڵگە! واتە لە ڕەفتارێکی کرداری کە لەپاڵ حاڵەتە دەرونیەکەدا هەیە!

هەرچی حاڵەتە گریمان کراوەکەیە[2]، کە بریتیە لە بونی مرۆڤێك لە حاڵەتێکی سروشتیدا-واتە بە هۆشیاری ئیرادەوە- لەناخی دەرونیەوە بڕوای بە شتێکی دیاریکراو هەبێ و، پاشان لەسەرجەم هەمو ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانیدا تەنیا شتێك نەبێ کە بەڵگەی هەبونی ئەو بڕوا داپۆشراوەی نێو ویژدان بێ (ئەمە جگە لە

---

[1] لە هەمان بەندی ئاماژەبۆکراو لە کتێبی (واقعنا المعاصر) باسی ئەم خاڵەشم کردوە.

[2] گریمان: افتراض.

حاڵەتی زۆرلێکردن و ناچاری کە شاردنەوەی تەواو لە چاوی ئەو دوژمنانەی چاویـان تێبڕیوە دەبێتە نەرك) ئەم حاڵەتــە لــە واقیعــی دەرونــی مرۆڤـدا مەحاڵــە و، بــە درێژایی مێژو کەس باسی حاڵەتێکی وای نەکردوە.

بەڵام هەرچی ئەوەیە کە دەشێ بەراستی وجودی هەبێ، بونی بڕوایە بە شـــتێکی دیاریکراو، لەپاڵ هەبونی هەندێك هەڵسوکەوتی پێچەوانە بە داخوازیـــەکانی ئـەو بڕوایە. ئەمە حاڵەتێکی سروشتیە.. بەڵکو ئەمە حاڵەتی زاڵە لە رەفتاری مرۆڤـدا! بەڵام ئەمە لە خۆڕا و بەبێ هۆ رونادات! هەروەك لە بەڵگە و ئاماژەش خاڵی نیە.

هەرچی هۆیەکانیشە بریتیە لەو روتێکردنەی لە دەرونـــی مرۆڤـدا هەیـە بـەرەو خۆدزینەوە لە ئەرکەکان بۆ وەرامدانەوەی ئـەو هاندەرانـەی[1] لـە نـاوەوەی دەرونـدا لەکارن، چونکەئەرکەکان-هەروەك لە روکەشدا[2] دیارە- کۆت و بەندی ئارەزوەکانن، جا بۆ سنورداركردنی بڕی ئارەزوەکان بێ یا بۆ سنورداركردنی ئاراستەکەیان. ئنجـا دەرون رودەکاتە خۆدزینەوە لەو ئەرکانــە کـاتێك پاڵدەداتـە لای وەرامدانەوەیـەکی بەرەڵای ئارەزوەکان، کەچی شتێك دەمێنێ-لــە تۆژینــەوە دەرونیەکانــەوە تێبینــی دەکرێ- ئەوەیە کە (بڕوا)-کە بۆخــۆی فریشــکە[3]، چونکــە لــە فریشــکی دەرونــی مرۆڤدا هەیە کە بڕوای بە شتێکی دیاریکراو هەبێ- بـــەخۆی کۆتــی ئارەزوەکانـە، بڕی ئارەزوەکان دیاردەکا یان ئاراستەکەیان دیاری دەکا. بەو شێوەیە ئارەزوەکان بە هەمان ئەو بڕ و هەمان ئەو ئاراستەیە نارۆن کـە لەحالـەتی نـەبونی ئـەو بڕوایـەدا رودەدەن، هەڵسوکەوتی واقیعیانەی مرۆڤیش دەرەنجامی ئــەو هــێز و رێکخەرانەیــە کە لەنێو دەرونیدا لەکارن. جا پتر بە پڕ داخوازیـــەکانی بـڕواوە دەچــێ یــان زیـاتر

---

١ هاندەر: دافع　　٢ روکەش: ظاهر　　٣ فریشك: فطرة

خۆیان لیٚ دەدزێتەوە بەپێی بڕی ئەم هێز و ئەو ڕێکخەرانە پێکەوە لە هەمان کاتدا. بارەکانی مرۆڤی تاکیش لەنێوان ساتێك و ساتێکی تردا دەگۆڕێ بەپێی گۆڕانی بڕ و ڕێژەی نێوان ئەم و ئەو، بەڵام هەرگیز لەهیچ بارێکدا دەرەنجامی بڕوا نابێتە سفر، بەشێوەیەك بون و نەبونی یەکسان بن..

ئەمە سروشتی دەرونی مرۆڤە.. بۆیە ئەو زانایانەی بە نوری خوا شت دەبینن گوتویانە بڕوا زیاد دەبێ و کەم دەبێ.. بە یاخیبون کەمدەبێتەوەو بە گوێڕایەڵی زێدەدەبێ..

گومانیش لەوەدا نیە کە ئاین کۆتە.. جا بۆ بڕی ڕێگەپێدراوی وەرامدانەوەی ئارەزوەکان بێ، یا لە دیاریکردنی ئاراستەکەیان.

خودای پاکو بەرز دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا: ئەمانەن سنوری خوا، لە سنوری خوا دەرمەچن.﴾البقرة/٢٢٩.

﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا: ئەمانە سنوری خودان نەچن توخونیان بکەون.﴾البقرة/١٨٧.

بەمشێوەیە ئەم سنور دیاردەکا کە مرۆڤ دەتوانێ تیایدا وەرامی ئەو ئارەزوانە بداتەوە کە لە قەوارەکەیدا[1] لەکارن و، لەم ئایەتە پیرۆزەشدا پوختکراوەنەتەوە: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأنعام وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا: ئارەزوی ژنان کردن و کوڕی زۆر پەیداکردن و دەسکەوتنی کۆمای زلی زێو و زێڕان و ڕەوەئەسپی بەدروشم و وڵسات و زەوی کێڵانێ، بۆ مەردم رازاوەتەوە و لە ژیانی دنیایەدا مایەی خۆشین.﴾آل عمران/١٤.

[1] قەوارە: کیان

هەروەها خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الأَرْضِ حَـــلالاً طَيِّبًا وَلاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ: ئەی خەڵکینە! لەو بەروبوی سەرزەمینە، **کامی ڕەوا و پاکە بخۆن**، بەشوێن شەیتانیشا مەڕۆن، کــە ئــەو بۆتــان دوژمنێکی ئاشکرایە.﴾البقرة/١٦٨.

دیسان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَنكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلاَمَةٌ مُؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ: خواستنی بت پەرستان بــۆ پیــاوی بــاوەڕدار ڕەوا نیــە، بــا **زۆریشیان حەز لیٚبکەن**، هــەتا نەبنــە خــاوەن بــاوەڕ ناشــێ بیکەنــە هاوســەرتان. کەنیزی باوەڕدار بۆ هاوجوتی، لە ژنی ئازادی خودانەناس هێژاترن.﴾البقرة/٢٢١.

وە دەفەرموێ: ﴿وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ مُحْصِنِينَ غَــيْرَ مُسَافِحِينَ: جیا لەمە ڕێگەتان دراوە بەدراوی خۆتان ژن بهێنن، **بەڵام بە پاکی بــێ نە بە داوێن پیسی**.﴾النساء/٢٤.

بەمشێوەیە ئاراستەی ئارەزوەکانیش دیاردەکا.

حەڵاڵ و حەرامیش هەموی کۆتن، ئاین لەسەر ڕێی ئــارەزوان دەیاندەنــێ تــاکو بڕەکەیان دیاربکا یا ئاراستەیان.

سەرەڕای ئەمانەش ئەرکی دیکە هەن جۆرە کۆتێکی دیکــە لەڕێگــەی خولیــا و ئارەزوەکان دادەنێن کە بڕ و ئاراستەیان دیاریدەکەن، وەك نوێژ و زەکــات و ڕۆژی و حەج و، ئاکارەکانی (لا إله إلاّ الله) و، لەسەر ترۆپکــی هــەمو ئەوانــەش جیــهادە لەپێناو خودا.

خودا ئارەزووەکان-یا هاندەرەکان-ی بێهودە[1] لە قەوارەی مرۆڤ دانەناون، پـاکی و بەرزی بۆ خودا لە بێهودەیی، هەروەها کۆتەکانیشی بەبێ مەبەست لەسـەر ڕێـی هاندەرەکان دانەناون..

چونکە خودای پاکو بەرز زانیویەتی کە ئەو ئـەرکی جێنشـینیەی لەسـەر زەوی مرۆڤی بۆ وەدیهێناوە پێویستی بە کۆمەڵە هاندەرێك هەیـە کـە مـرۆڤ بـۆ کـارو بزاڤ و بەرهەمهێنان هانبدا، بـۆ ئاواکردنـەوەی زەوی. کـە ئەمـەش یەکێکـە لـە ئامانجە داواکراوەکان لە مرۆڤ و، لە نیشتەجێبونی سەرزەویدا بۆی تەقدیر کراوە:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّـي جَـاعِلٌ فِـي الأَرْضِ خَلِيفَـةً: ئـەو کاتـەی پەروەردگاری تۆ بە فریشتانی ڕاگەیاند: من دەمەوێ جێنشنێك لەسەرزەمین دیـاری بکەم. ﴾البقرة/٣٠.

﴿هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيـهَا: ئـەو لـەم خاکـەی وەدیـهێنان و ویستی ئاوەدانی بکەن. ﴾هود/٦١.

هەروەك ئەوانە لە ئامرازەکانی (ڕابواردنن) کە خودا لەسەر زەویـدا بـۆ مرۆڤـی خەملاندوە:

﴿وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ: تا ماوەیێ دیاریکراو لەسەر زەمین ڕای ببوێرن. ﴾البقرة/٣٦.

لە هەمانکات خاڵی تاقیکردنەوەیە کە خودا مرۆڤی بۆ وەدیهێناوە:

﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَـلاً: هـەرچی لـەم سەر زەمینەیە ئێمە بۆمان کرد بە ئارایشت تا تاقیان بکەینەوە کامەیان کارچاکـتر دەبن. ﴾الکهف/٧.

---

١ بێهودە: عَبث

هەرچی کۆت و ڕێکخەرەکانیشن ئەوا خودا زانیویەتی کە ئەوانیش پێویستن بـۆ قەوارەی مرۆڤ تاکو ئەرکی جێنشینی راستەڕێ[1] ئەنجام بدا کە لێی داواکراوە. جـا وەرامدانەوەی تەواوی هاندەرەکان، کە سـنورە ئارامـەکان دەبـەزێنێ، لـەناوچون و گەندەڵ بوونی مرۆڤە و، لەو بەرزیەی دەترازێنێ کە خودا بۆ مرۆڤی چـاکی تـەقدیر کـردوەو بـە باشـترین شـێوە وەدیـهێناوەو، بەشـێوەیەکی گردەبـــڕ لـــە ئـــاژەڵی جیاکردۆتەوەو، بـەم بەرزیـەش بـۆ هـەڵگرتنی ئـەو راسـپاردەیە ئامـادەکراوە کـە ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان قایل نەبون هەڵیگرن و ترسیان لە هــەڵگرتنی نوانـد چونکە بۆی ئامادە نەکرابون و، مرۆڤ هەڵیگرت..

کۆتەکانیش دو ئەرك لە ژیانی مرۆڤ ئەنجام دەدەن.

ئەو بڕە دیاریدەکەن کە مرۆڤ پێـی وەرامـی هـاندەر و ئارەزوەکـانی بداتـەوە، بەمشێوەیە بڕە وزەیەك دەگێڕێتەوە لەوەی کە هەمو لە بـواری بەرهەسـتدا بـەفیڕو بڕوا. پاشان ئاراستەی ئەو وزەیە دیاریدەکا و لە کایەیەکی بەرهەستی پەتی بـەرزی دەکاتەوە بۆ کایەی (بەها)کان،[2] کە بونی هەرەبەرز و باڵا بۆ مرۆڤ وێنە دەکێشێ، ئەمەش هەمان ئەو راسپاردەیەیە کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە..

جا بەم شێوەیە.. لەنێوان هاندەرەکان و ڕێکخەرەکان قەوارەی مرۆڤ هاوسەنگ دەبێ و، مەبەستی بونی وەدیدێ کاتێ لەباشترین شێوەدایە.[3]

بەڵام مرۆڤ لە هەمو حاڵەتێکدا تـەواو ڕێکناکـەوێ و، لەهـەمو حاڵـەتێکیش لەسەر هاوسەنگیەکەی بەردەوام نابێ:

---

[1] راستەڕێ: راشد.　　[2] پەتی: خالص　　بەهاکان: قیم.

[3] ئەگەر دەتەوێ لەمبارەوە بەشی یەکەمی (منهج التربیـة الإسـلامیة) بخوێنـەوە لەگـەڵ (دراسـات في النفس الإنسانیة) بەشی (الدوافع والضوابط).

﴿عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِنْ قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا: بــەر لــە ئێســتاش دەگــەڵ ئادەم پەیمانن بەست، لەبیری کرد و پێی نەکرا پێکی بێنێ.﴾طه/١١٥.

((كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الخَطَّائِينَ التَّوَّابــون: هــەمو ئــادەمیزادێك هەڵــە دەکات و، چاکترین هەڵەکارانیش ئەوانەن کە تۆبە دەکەن.))[1]

جا لێرەدا گوناح روودەدا..

بەهۆی یەکێك لە هۆیەکان، یا بەهەردوکیان لە یەك کاتدا رودەدا.. یــا بــەهۆی توندبونی فشاری هاندەرەکان بۆ سەر مــرۆڤ-یــا بــەهۆی لاوازی رێکخــەرەکان لــە ساتێکی دیاریکراودا، یاخود بە کۆبونەوەی هەردو هۆیەکان لە یەك کــاتدا: تونــدی هاندەرەکان و، لاوازی ئەو ویستە[2] رێکخەرەی کە برِ و ئاراستە دیاریدەکا.

ئەوجا ئەنجامەکەشی لەقەدەر بەشداربونی هۆکارەکان دەبێ.. خۆ کاتێك هــاندەر لاواز بێ ئەوا بە ئاسانی رێکدەخرێ، بەڵام کاتێك توندونیژ بــێ ئــەوا رادەوەســتێتە سەر هێزی ئیرادە. ئەگەر بەهێز بو بۆی هەیە تەواو بەرپەرچی هاندەرەکە بداتــەوەو گوناحەکە رونەدا، یان بە سوکی روبدا و تێپەرێ کە قورئانی پیرۆز بە (لمم: گونــاحی چکۆلە) ناوی بردون. بەڵام کە لاواز بو ئەوا لەبەردەم فشارەکە دادەرِوخێ.

برِواش بە خودا و بە رۆژی دوایی بەهێزترین کەرەستە یارمەتیدەرەکانی مرۆڤــە بۆ بەرگریکردن بەرامبەر فشاری ئارەزوەکان و، بەقەد ئەوەی برِوا بەهێز و چەســپیو بێ توانای مرۆڤ هێندە دەبێ بۆ رێکخستن لەناو ئەو سنورەی خودا بــۆی کێشــاوە، واتە گوێرِایەڵی بۆ فەرمانەکانی خودا دەبێ و، ئەو ئەرکانە ئــەنجامدەدا کــە خــودا لەسەری فەرزکردون و، ئەمەش مانای ئەوە نیە کــە مــرۆڤ لــە مرۆڤایــەتی خــۆی

---

١ أخرجه أحمد وأبوداود وابن ماجه والدارمي.

٢ فشار: ضغط ویست: إرادة.

دابشۆریَ و ببیّتە فریشتە و هەرگیز گوناهان نەکا! بەڵکو مانای ئەوەیە کە گوێڕایەڵی و ڕێکخستن و ئەنجامدانی ئەرکەکان لە ژیانیدا دەبنە بنەڕەت و، لەوانیش بترازیَ ریزپەڕن و تیّدەپەڕن کە نە تیّیدا دەمیّنتەوەو نە تیّیدا نقوم دەبیَ.
ئنجا ئەم وەسفەی پەروەردگار دەیگریّتەوە:

﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ، أُوْلَئِكَ جَزَاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ: ئەوکەسانەی هەرساتیَ کاری خراپ دەکەن، یان ناحەقی لەخۆ دەکەن، خودا لەبیر نابەنەوەو لەبەری دەپاڕێنەوە لە خەتاکانیان ببوریَ، جگە لە خوداش کیَ لە گوناهان دەبوریَ؟ جا ئەوانە لەسەر کاریَ کە زانیویانە هەڵەیە، پیَداگر نین.. ئەوانە پاداشیان لەلای پەروەردگاریان لیّبوردنە و باغاتیّکە کە جۆباران بە بەریاندا دەڕۆن و تاسەر لەنیّو باغاتە دەمیّننەوە، چەندە جوانە پاداشتی ئاکار چاکان.﴾آل عمران/١٣٥-١٣٦.

بەڵام کاتیّك بڕوا بە خودا و بەڕۆژی دوایی لاواز بو-بەبڕی لاوازبونیشی- پیّچەوانەی ئەوە دەبیّتە بنەڕەت و، سەقامگیربون لەسەر فەرمانی خودا دەبیّتە حاڵەتیّکی تیّپەڕ کە پاشان بەرەو گوناح و تاوان و گەندەڵی سەرەوژیّر دەبیّتەوە.

لە هەمو حاڵەتیّکیشدا دەرەنجامی بڕوا قەت نابیّتە سفر و، هەرگیز بون و نەبونی یەکسان نابن، بەشیّوەیەك مرۆڤ تاکە کردەوەیەك لە کردەوەکانی ئیسلام ئەنجام نەدا!!

گوناهیش-بەکۆڕایی[1] زانایان- مرۆڤ لە ئیسلام وەدەرنانێ[2].. بەڵکو ئــەوە لــە ئیسلام دەیباتە دەرەوە کە گوناهێك بە حەڵاڵ دانێ-ئەگەرچی ئەنجامیشی نــەدابێ- بەحەڵاڵ دانانیش[3] کردەوەیەکی تەواو جیاوازە لە کەوتنە ناو گوناهان.

کەوتنە ناو گوناح ســاتێکی لاوازیــە کــە بەســەر مــرۆڤ دادێ و لــەبیر دەکــا، هەروەکو ئادەم پێشتر لەبیری چو، ورەشی دەڕوخێ، جــا بــڕوا ناکەوێتــە بــەر بــیر و هەستی، هەرچەندە هێشتا لە دڵیشــیدا مابــێ. پێدەچــێ ئاماژەکــەی پێغەمبــەری خواشﷺ هەر بۆ ئەمە بێ کە دەفەرموێ: ((لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِــينَ يَزنِــي وَهُــوَ مُؤمِنٌ، وَلاَ يَسرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسرِق وَهُوَ مُؤمِنٌ: زیناکەر کە زینا دەکا بــڕوادار نیە و، دزیش کاتی دزیکردنەکەی بڕوادار نیە.))[4] پاشان مرۆڤ لــە ســاتی لاوازی وەئاگادێ و دێتەوە یادی و، داوای لێخۆشبون دەکا و، خوداش لێیخۆشدەبێ.

هەرچی بەحەڵاڵدانانە ئەوە خۆ بــە گەورەزانینــە لــە ئاسـت پەرسـتنی خـودا و ملکەچ بون بۆ فەرمانی، وەك ئەوەیە خاوەنەکەی بڵێ: خودا ئاوها دەڵێ، بەڵام من لەو مەسەلەیەدا بۆچونێکــی دیکــەم هەیــە، هــەوەکو شــەیتان کــاتێك بانگــەوازی یاخیبونی لە فەرمانی خودای-بەرز و بەتوانا- ڕاگەیاند کە پێی فەرمو ســوژدە بــۆ ئادەم ببا، بەڵام شەیتان گوتی: ﴿أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِــنْ طِــينٍ: گوتــی: دیــارە مــن خــۆم لــەو چاکــتر دەزانم، منـت لــە ئــاگر، ئــەوت لـــە قــوڕ وەدیهێنا.﴾ص/٧٦. یان گوتی: ﴿لَمْ أَكُنْ لأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُ مِنْ صَلْصَالٍ مِــنْ

---

١ کۆڕایی: إجماع

٢ تەنیا خەواریج لەگەڵ ئەمەدا نین، بەخۆشیان تاخمێکی لەئیسلام بەدەرن.

٣ یەکێکە لە کردەوەکانی دڵ و دەبتە مایەی کافربون.

٤ أخرجه الشيخان.

حَمَإٍ مَسْنُونٍ: من چۆن سوژده دەبەم بۆ مرۆڤێـك، لـە قورەڕەشـەی بۆگـەنیوی رەق هەڵاتوت چێکردوە؟﴾الحجر/٣٣. ئەمەیە کە خـودای پـاك لێـی خۆشـنابێ چونکـە هاوبەشپەرستیە:

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَـاءُ: خـودا لەوانـە نابورێ کە شەریکی بۆ بناسن، لەوەخوارتر هەرکەسێکی بۆ خـۆی حـەزکا، عـافوی دەکا.﴾النساء/١١٦.

بەڵام ئایا سنوری گوناح لە کۆمەڵگەی موسڵماندا چیە؟

ئایا دەکرێ ئەم سنورە رابکشێ و هەمو کۆمەڵگە بگرێتەوە. پاشان رابکشـێ و هەمو کردەوەیەك لە کردەوەکانی ئیسلام بگرێتەوە؟!

ئایا لەپاش ئـەوە تـەنیا بـە بەڕاسـتدانان و دانپێداهێنـان وەك کۆمەڵگەیـەکی (موسڵمان) دەمێنێ؟!

ئێمە ئەگەر ئەوەمان پێ دروستبو کە مـەبدەئی (بەڕاسـتدانان و دانپێداهێنـان) (بڕوا) بێ و... واماندانا کە بڕوا بەمانە وەدیدێ ئەگەرچی مرۆڤ یـەك کـردەوەی ئیسلامیشی جێبەجێ نەکرد، بە بانگەشەی ئـەوەی گوایـە کـردەوە ناکەوێتـە بـەر ناوەڕۆکی بڕوا و، بڕیارماندا-بەپێی ئەم بۆچونە- کە ئەم هێندە بەسە بۆ بەخشـینی سیفەتی ئیسلام لە دونیا و چونە بەهەشت لە رۆژی دواییدا.. ئەگـەر ئـەوەمان بـۆ تاکەکەسێك بە ڕەوا دانا، ئایا بۆمـان هەیـە لـە هیـچ تـاکێکی دیکـەی قەدەغـە بکەین؟ یا لە هەمو تاکەکان ئەگەر بەخۆیان بیانەوێ؟!

ئەی حاڵەتەکە چۆن دەبێ ئەگەر کۆمەڵگەیـەکمان هـەبو هـەموی بەمشـێوەیە (موسڵمان)ی (بڕوادار) بن؟!

ئایا هیچ شتێکی لەوانە لیۆەدی دێ کە خودا بەناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی کتێبان مەبەستی بو؟

هەر بۆ وەبیرهێناوە دەگەڕێینەوە بۆ ئەو ئایەتەی کە ئامانج لە ناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی کتێبان دیاردەکا:

﴿**لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ**: ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بە چەند بەڵگەی ئاشکراوە و وێڕای ئەوان، کتێب و هۆی هەڵسەنگاندنمان نارده خوار، هەتا **خەڵك بە دادگەری و بێجیاوازی لەناو یەکا رەفتار بکەن.**﴾الحدید/٢٥.

ئایا خەڵك بەمشێوەیە دادگەری بەرپا دەکەن؟!

دیسان هەر بۆ وەبیرهێناوە دەگەڕێینەوە بۆ ئەو ئایەتانەی ئامانجی سەرهەڵدان و دەرخستنی خودی ئەم ئومەتە دیاردەکەن.

﴿**كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ**: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرتان هەڵدا، **فەرمان بە چاکە دەدەن و رێ لە ناڕەوا دەبەستن**، باوەڕیشتان بەخوا هەیە.﴾آل عمران/١١٠.

﴿**وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا**: بەو شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئۆمەتێکی هەڵبژاردە، **تا شایەد بن و ئاگاتان لە خەڵکی هەبێ** و پێغەمبەریش شایەدتان بێ و چاوەدێریتان لیبکا.﴾البقرة/١٤٣.

﴿**وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ وَفِي هَذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ**

شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ فَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلاَكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ: بە دڵ و دا و-وەك پێویستە- لەڕای خودا جیهاد بکەن. ئەو هەر خۆی ئێوەی هەڵبژارد، لەم دینەشدا توشی زەحمەتی نەکردون، هەر ئایینی ئیبراهیمی باوکتانە، لەپێشدا و لەم قورئانەشدا، هەر ئەو ناوی نان موسڵمان، تا پێغەمبەر بە شایەت بێ لەسەر ئێوە و ئێوەش شایەت بن لەسەر خەڵك. جا نوێژ بکەن و زەکات بدەن و پشتتان هەر بە خوا ببەستن، ئای چەن گەورە و یاریدەرێکی هێژایە.﴾الحج/٧٨.

جا ئایە بەمشێوەیە هیچ شتێك لەم ئامانجانە دێنە دی؟! ئایا خودا-ی بەرز و تەوانا- لەمجۆرە خەیاڵەی-یا ئەم رەفتارە هەڵەی- ئاگادار نەکردوینەوە کە باسی بەنی ئیسرائیلمان بۆ دەکا، تا ئێمەش دوچاری نەبین:

﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَذَا الأَدْنَى وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِنْ يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِثْلُهُ يَأْخُذُوهُ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِمْ مِيثَاقُ الْكِتَابِ أَنْ لاَ يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلاَّ الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ وَالدَّارُ الآخِرَةُ خَيْرٌ لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ: ئەوسا جێنشینانێکی بەدفەڕ هاتنە جێگایان و، کتێبەکە لای ئەوان بە کەلەپور ما، کە هەر بۆ تەماحی دنیا تێدەکۆشان. دەشیانگوت: ئێمە هەر زۆر زو عافو دەکرێین. ئەگەر دیسانیش لە شتێك دەستیان گیربا، وەریان دەگرت. مەگەر لەو کتێبەدا پەیمانیان لیٚ وەرنەگیرا، لەراستی بەولاوە دەربارەی خوا نەدوێین؟ کە هەرچی تێشیدا هەبو خوێندبویان. خانەی قیامەت بۆ ئەوانەی خۆپارێزن زۆر باشترە، هێشتا ئێوە تێناگەن؟﴾الأعراف/١٦٩.

یان ئەمە ئەرکێکە تەنیا لە ئەستۆی بەنی ئیسرائیل دایە و (ئوممەتی موسڵمان)یشی لیٚ عەفو کراوە؟!

بۆ دورخستنەوەی ئەم خەیاڵە حوزەیفەﷺ گوتی: بەنی ئیسرائیل باشترین برای ئێوەن ئەگەر هەرچی شتی خۆش و شیرینە بۆ ئێوە بێ و هەرچی ناخۆش و تاڵیشە بۆ ئەوان بێ.[1] !!

گومان لەوەدا نیە ئەو (کۆمەڵگە)یەی ئەمجۆرە بیرە گەندەڵانەی دەربارەی (بڕوا) و دەربارەی (داخوازیەکانی لا إله إلاّ الله) تێدا بڵاوبێتەوە دەبێتە ئەو ئاومالکەی پێغەمبەرﷺ بۆ لێئاگادارکرنەوە باسی فەرموە: ((یُوشِكُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمُ الأُمَمُ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ عَلَى قَصْعَتِهَا. قَالوا: أَمِنْ قِلَّةٍ نحن يَوْمَئِذٍ يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ: أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُم غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ: هێندەی نەماوە کە ئوممەتەکانی دیکە بێنە سەرتان وەکو ئەو بخۆرانەی دەچنە سەر لەگەنی نانخواردن.. گوتیان: ئایا لەبەر کەمی ژمارەمان لەو رۆژیدا، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: نەخێر ئەو رۆژی ئێوە زۆرن، بەڵام وەکو ئاومالکی سێڵاوێ وان))[2].

بەراستیش ئوممەتەکان پڕ دەدەنە ئەو ئاومالکەی کە هەر بە بەڕاستدانان و دانپێداهێنان رازیە و، وا خەیاڵ دەکا کە بڕوای وەدەست هێناوە.!!

هەرچی کۆمەڵگەی موسڵمانیشە -کە بە شەرعی خوا حوکم دەکا- ئەو گوناهانەی تێدا رودەدا کە خودا قەدەری لەسەرە، بەڵام لە هەمو بارێکدا بەلای کەمی دو کردەوە هەر دەمێنن کە هیچ مرۆڤێك وازیان لێناهێنێ تا لە کۆمەڵگە موسڵمانەکەدا وەکو موسڵمان مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و، لێپێچانەوەشی لەسەر خوا دەبێ و، هەتاکو لە سزای فەوتێنەر قوتار بێ لە ژیانی دنیا، ئەو دو کردەوەیەش بریتین لە نوێژ و حوکم بردنە بەر شەریعەتی خودا، ئەمانەش ئەو دو

---

١ رواه الطبراني عن حذيفة من أكثر من طريق، أنظر تفسير الطبري ٢٥٣/٦ الطبعة الثالثة ١٣٨٨هـ.

٢ أخرجه أحمد وأبوداود

فاکتەرە بون کە بۆ ماوەی سێزدە سەدە لە بەڵگەنەویستەکانی کاری موسڵمان بـون لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا(هەرچـەند لـە نـاخی دەرونـی کـافر یـا دوڕوش بوبـێ) سەرەڕای هەمو ئەو لاڕێبونەی[1] نەوە دوای نەوە موسڵمانان تێیکەوتن و، سـەرەڕای ئەو هەمو خۆدزینـەوەی لـە ئەرکـەکانی ئیسـلام ئـەنجامیاندا و.. لـەم سـەدەیەی دواییش دەرچێ هەرگیز بە ئاشکرایی کەسێك وازی لێیان نەهێناوە..

* * *

بەمشێوەیە ئەوە رونبۆوە کە مەحاڵە مرۆڤ دەسبەرداری هـەمو داخوازیـەکانی (لا إله إلاّ الله) بێـت، هـەر بڕواداریـش بمێنێتـەوە بـە (لا إلـه إلاّ الله).. مەحاڵـە بەگوێرەی ئەو ئامانجانەی پێغەمبەرانیان بۆ ناردراوەو کتێبیان لەگـەڵ دابـەزێنراوە. هەروەها مەحاڵە بـەگوێرەی واقیعـی ئـەو کۆمەڵگـە موسـڵمانەی کـە حوکـم بـە شەریعەتی خوا دەکا و، مەحاڵە بەگوێرەی واقیعی دەرونی مرۆڤ، جـا دەبـێ ئـەو کەسانەی پشتیان بە چ بەستابێ کە دەڵێن: هەمو داخوازیـەکانی بـڕوا بریتیـە لـە بەڕاستدانان و دانپێداهێنان. کردەوەکانیش-ئەگەر لەپاش ئەمە مرۆڤ ئـەنجامیدا- ئەوە بەرزبونەوەی پلەوپایەیە و، ئەگەر ئەنجامیشی نەدان بۆ بڕواکەی چ بـاس نیـە، ئەو بڕوایەی کە تەنیا بەهۆی بەڕاستدانان و دانپێداهێنان بەتەواوی دێتە دی؟!

بێگومان ئەمە قسەی مورجیئەکانە لەگەڵ ئەوانەی بە پیکی ئەوان لێیـانداوە و لە پێکی ئەوان هەڵیانداوە.. ساکارترین پێداچونەوەی مێژوی تاقم و گروپـەکانیش، سەرچاوەی ئەو قسەیەمان پیشاندەدا کە زۆر بە روحی ئیسلام نامۆیە. هەرچەند لە راستیدا مورجیئە کۆنەکان-لەگەڵ ئەو هەمو لاڕێبونـەی لـە تێگەیشـتنی ئیسـلام دایانهێنا- هەرگیز بۆی نەچون و-هەرگیز نەشگەیشتنە ئەوەی- کە نوێژ یـا حوکـم

---

١ لاڕێبون: انحراف

بردنە بەر شەریعەتی خودا لاببەن هەروەکو مورجیئە تازەکان لایان بردن، چونکە بە درێژایی سێزدە سەدەی یەکەم بە خەیاڵی کەس دا نەهات کە تاکە مرۆڤێك لەسەر خاکی ئیسلامی هەبێ و بکرێ بە موسڵمان ناوببرێ لە ژیانی دنیا و، بە زندوییش بمێنێ، لەکاتێکدا سێ‌ڕۆژ لەسەر یەك نوێژی پشتگوێ خستبێ، یان حوکم بباتە بەر غەیری شەریعەتی خوا.

بەڵام مورجیئە کۆنەکان-لەگەڵ ئەوەشدا- هەرئەوان بون ئەو تۆوە ژەهراویەیان چاند کە مورجیئە تازەکان لێیان چنین و، ئیسلامێکی نوێیان لیٚ‌ڕواند کە نە کتێبێکی پێ دابەزیبو و نە پێغەمبەرێکی پێ رەوانەکراو.. ئیسلامێکی بەبێ ئەرك! یا بڵێ: ئیسلامێکی بەبێ ئیسلام!!

مورجیئەکان-چ کۆن و چ تازەکانیان- ئاخۆ پشت بە چ دەبەستن لەوەی کە هەرچی داواکراوە بۆ چەسپاندنی بڕوا بریتییە لە دانپێدانانێك بەزمان بەگوێرەی ژیانی دنیا و، بەڕاستدانان و دانپێداهێنان بەگوێرەی ژیانی دوایی؟!

یەکەم شت پشتیان پێبەستابێ مەدلولی زمانەوانی وشەی بڕوا(ئیمان)ە و، گوتیان: بریتیە لە بەڕاستدانان، پاشان گوتیان: لە ئایەتەکانی قورئاندا کردەوەی چاك بە مەعتوفی لەپاش ئیمانەوە دێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾، پیتی واویش لێرەدا جیاوازی دەگەیەنێ، جا بەمجۆرە بڕوا شتێکە و کردەوەی چاکیش شتێکی ترە، لە هەمان رەگەز نیە و ناچێتە ناوی.

جا هەرچی بەڵگە هێنانەوەیە بە مەدلولی زمانەوانی ئەوە خەڵەتاندنێکی ئاشکرایە!

چونکە مەدلولی زاراوەیی-کە هەندێك بێژەی دیاریکراو لە قورئاندا وەریانگرتوە وەك: ئیمان و، نوێژ و، زەکات- دەچێتە نێو واتای زمانەوانی بە

گشتی، بەڵام کە ئیسـلام بەکاریدێنێ واتایەکی تایبەت و سیفەتێکی تایبەت وەردەگرێ، کە دروست نیە واتای زمانەوانی چیدیکە بۆ بکرێتە بیانو.

نوێژ(الصلاة) لە زماندا واتای نزا(دعاء) دەگەیەنێ، بەڵام ئایا دەکرێ بڵێین کە نوێژ-بە واتا تایبەتیەکەی لە زاراوەسازی ئیسلامیدا- تەنیا پاڕانەوە و نزایە، جۆرێك نزا-بەهەر شێوەیەك بێ- جێگەی نوێژ بگرێتەوە بە ڕکوع و سوژدە و قورئان خوێندنەوەکانی و ئەو ڕێکخەرانەی هەیەتی لە واجبێتی پاکژبون لە پێش نوێژ و، واجبێتی نوێژکردن لە کاتەکانی دیاریکراوی خۆیدا...تاد...تاد ؟!

بڕواش بە هەمان شێوە.. لە زماندا بریتیە لە بەڕاستدانان، بەڵام-بە واتا زاراوەییە ئیسلامیەکەی- شێوەیەکی دیاریکراوی بەڕاستدانانە کە کۆمەڵە داخوازیەکی دیاریکراوی هەیە، لە کردەوەی دڵ وەکو خۆشەویستی و سەرشۆڕی و ملکەچی و خۆبەدەستەوەدان و، واجببونی گەڕانەوە بۆ لای خوا لەکاتی حوکم کردن لەسەر هەر مەسەلەیەك لە مەسەلان، یا هەڵوێستێك لە هەڵوێستان، یا هەڵسوکەوتێك لە هەڵسوکەوتان، داخوا حەڵاڵە یا حەرامە یا موباحە یا مەکروهە یا مەندوبە، هەروەها کردەوەی ئەندامەکانیش کە ئەنجامدانی دروشمەکانی پەرستن دەگرێتەوە لەگەڵ دەستپێوەگرتنی ئاکارەکانی (لا إله إلاّ الله) لە ڕەفتاری کرداریدا، لەپاڵ ملکەچ بونی کرداری بۆ ئەحکامی شەریعەت لەو کێشانەی کە لە ژیانی خەڵکیدا لە هەر ساتێك لە ساتەکانی ژیانییاندا ڕودەدەن:

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ، أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَهُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ: خاوەن بڕوا ئەو کەسانەن هەر کە ناوی خودا برا، دڵیان ترسی لێ دەنیشێ و کە

ئایەتەکانی ئەویان بۆ خوێنرایەوە، بڕوایان بەهێزتر دەبێ و دەربەست خۆیان بە پەروەردگاریان دەسپێرن.. ئەوانەن کە نوێژ دەکەن و لەو بژێوەی بەشمان داون بەشی هەژارانیش دەدەن.. باوەڕداری بێکەمایەتی ئەمانەن کە لە پەروەردگاریانەوە پلەوپایە و لێخۆشبون و بژێوی پەسندیان هەیە.﴾الأنفال/٢-٤.

﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا: بەڵام نەخێر، سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەمانە نابنە خاوەنی بڕوا مەگەر کاتێك کە لە کێشە و هەرای نێوان خۆیانا حوکم بێننە لای تۆ و لە دڵەوەبە هەر فەرمانێ تۆ بیدەی پێی رازی بن و بە تەواوی ملکەچی بن.﴾النساء/٦٥.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بەرفەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا و کاربەدەستانی خۆتان بن، هەرکاتێکیش لەسەر شتێك لەنێوخۆدا پێك نەهاتن، ئەگەر بڕواتان بە خودا و بە ڕۆژێ قیامەتی هەیە، کێشەی خۆتان حەواڵەی خوا و پێغەمبەری خوا بکەن.﴾النساء/٥٩.

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاَتِهِمْ خَاشِعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ، إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ، فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ، أُوْلَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ، الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: بێگومان باوەڕداران، رزگارانن.. ئەوکەسانەی لە نوێژیاندا خۆیان بە گەورە

نازانن.. ئەوانەش کە لە قسەی پوچ دوری دەکەن.. ئەوانـەش کـە زەکـات دەدەن.. هەر ئەوانەش کە شەرمی خۆ دەپارێزن، مەگین لـە هاوسـەری خۆیـان یـان ئـەوەی ملکی خۆیانن، کە نابێ سەرکۆنە بکرێـن، هـەرکێش جیـا لەمانـەی بـوێ، ئـەوە سنوربەزێنە و لە ئەندازە لادەرە.. ئەوانەش-لە رزگارانن- کە ئەمانەت و بـەڵێنیان دەپارێزن.. ئەوانەش کە لەسەر نوێژکردنێ سورن.. ئەمانە گشتیان بەشـبەرن.. ئـەو کەسانەی کە بەشبەری بەهەشتن و تا هەتا هەر تیا دەبن.﴾المؤمنون/١-١١.

ئەمانە هەموی داخوازی (بەڕاستدانان)ن بـە واتـا زاراوەییـە تایبەتیەکـەی کـە قورئان بە وشەی (بڕوا= الإیمان) گوزارشی لێکردوە و، مـەدلولی زمانەوانیشـی لێ نابێتە بیانو، وەك چۆن نابێتە بیانو لـە واتـای نوێـژ و لـە واتـای زەکـات و زاراوە ئیسـلامیەکانی دیکـە، کـە بەکارهێنانـە زمانەوانیەکـەی سـنوردار کـراوەو، داخوازیگـەلێکی دیـاریکراوی خراوەتـە سـەر کـە مـەرج نیـە واتـای زمانـەوانی هەڵیانگرێ.

هەرچی بیانو هێنانەوەشە بـەوەی کـە کـردەوەی چـاك (عمـل الصالحـات) لـە دەربڕینی قورئانیدا بە مەعتوفی لەسەر بڕوا هاتوە، ئەمەش کردنە بەڵگەی ئـەوەی کە کردەوە ناچێتە نێو ناوەرۆکی بڕوا چونکە (واو) جیاوازی دەخوازێ، چونکە هیـچ شتێك بۆ سەر خۆی مەعتوف نابێ.. ئەمەش لە بیانوی یەکەم کـەمتر دانـەڕزاوەو خەڵەتاندنی کەمتر نیە!

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِـــهِ وَرُسُـــلِهِ وَجِـــبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ: هەرکێ دژی خودا و پێغەمبەرەکانی و فریشتانی و جوبرائیل و میکایل بێ، خوداش دژی خوانەناسانە.﴾البقرة/٩٨.

لەم ئایەتەدا ئاشکرایە کە جبریل و میکال لە هەمان ئەو فریشتانەن کە پێشتر باسیان هاتوە، ئەمەش ڕێی لەوە نەگرتوە کە جبریل و میکال بە مەعتوفی بێن لەسەر فریشتان. چونکە عەتفی بەشێك لەسەر هەمو، یان عەتفی تایبەت لەسەر گشت دروستە و لەو زمانەدا ناسراوە کە قورئانی پێ دابەزیوەو بۆ واتاگەلێکی ڕەوانبێژی ناسراو بەکارهاتوە.

هەروەها خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ: ئەوانەی تەختی خوایان هەڵگرتوە و ئەوانەی بەدەوری ئەودان، بە پاکیگاری و سوپاسی پەروەردگاریان خەریکن و بڕوایان هەر بەوی هەیە.﴾غافر/٧.

لێرەدا پاکیگاری (التسبیح) وەپێش خراوە، کەچی بۆ خۆی لە داخوازیەکانی بڕوایە، لەو کردەوانەن کە لەگەڵ بڕوادا جوتن ئەمەش نە بۆتە ڕێگر لەوەی کە ئیمان لەسەر عەتف بکرێ. چونکە عەتفی (کل)ی دواخراو لەسەر (جزء)ی پێشخراو دروستە و لە زماندا ناسراوە بۆ هەندێك واتای ڕەوانبێژی.. هیچ شتێکیش لەمەدا جیاوازی لەنێوان (معطوف) و (معطوف علیە) ناخوازێ. نە لە نمونەی یەکەم و نە لە نمونەی دوەم، بەڵکو هێند نزیك و جوتن لەگەڵ یەکتر، گەیشتۆتە لەخۆگرتن: یەکێکیان ئەوەی دیکە لەخۆ بگرێ، یا جوتبونی گشت لەگەڵ تایبەت.

هەروەك بەڵگە هێنانەوە بەو عەتفەی لە ئایەتە قورئانیەکاندا لەنێوان بڕوا و کردەوەی چاکدا هاتوە بۆ سەربەخۆیی هەریەکەیان لەوەی دیکە و نەچونە نێو ناوەڕۆکی یا نێو واتای. ئەمەشیان بە چەند ئایەتێکی دیکە پوچ دەکرێتەوە کە باسی کراوە بە جوتی لەگەڵ کردەوەی چاك نەك بە مەعتوف.

﴿وَمَنْ يَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ فَأُوْلَئِكَ لَهُم الدَّرَجَاتُ الْعُلاَ، جَنَّـــاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ جَزَاءُ مَنْ تَزَكَّـى: هەرکەسێك بە بڕواداری بچێتە لای خوا و کردەوەی چاکی ئەنجام دابێ، جێگــای ئـەوان وان لـە پلە بەرزەکانا. نشیمەنیان باغاتێکە جۆباریان بەبەردا دەڕوا و تا هەتایە تیا دەبـن. ئەمەیە پاداشی پاکان.﴾طه/٧٥-٧٦.

تێکڕای حاڵەتەکە لێرەدا ئەوەیە کە واژەی ﴿قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ: کە کـردەوەی چاکی ئەنجامدابێ.﴾ لە دو واتایان بترازێ چیدیکە هەڵناگرێ: یـا ئـەوەتا کـردەوەی چاك داخوازی و ناوەرۆکی بڕوایە، بە واتای ئەوەی هەر کەسێکی بڕواداربـێ حـاڵی وایە دەبێ کردەوەی چاکی کردبێ، یا ئەوەتا دەبێ کردەوەی چـاك-لەگـەڵ بـڕوادا- هەردوك مەرجی چونە بەهەشت بن، لەهەردو باریشدا بڕوا و کردەوەی چـاك جوتـن لەسەرەتادا بێ یا لە سەرەنجام یا لە هەردوکیان پێکەوە.

خۆ ئەگەر بگوترێ: کردەوەی چاك مەرجن بۆ گەیشـتن بـە (پلـە بـەرزەکان) بـە تەنیا نەك هەر چونە بەهەشت و تاکـە مـەرجی چونـە بەهەشـتیش بەڕاسـتدانان و دانپێدانانە، ئەوا ئەو ئایەتەی لە سورەتی نیسائدا هاتوە ئەمە دەپوکێنتەوە:

﴿وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُـــونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا: هەر مرۆیەك-نێر بێ یان مێ- هەر هێندە خاوەن باوەڕ و ئاکارچاك بێ، دەچنە بەهەشتەوەو بە ئەندازەی تلێشی وردیلـەی ناوکەخورمایـەش ناهەقیان لێناکرێ.﴾النساء/١٢٤.

لێرەدا باسی کردەوەی چاك پێشکەوتوەو مەرجەکەشی لە تێکـڕای حاڵەتەکـەدا هاتوە(کە بڕوادار بێ) سەرەنجامیش چونە بەهەشتە نەك پلەبەرز و باڵایەکانی!

هەروەها کە خودا دەفەرموێ: ﴿وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا: بە ئەو خاوەن باوەڕانەی ئاکارچاکن مژدە بدا کە پاداشی باشیان دەبێ.﴾الكهف/٢.

لێرەشدا واتایەکە لەوە دەرناچێ کە کردەوەی چاکە ئیشی بڕوادارانە، یان ئاکار و کردەوەی چاك لەگەڵ بڕوا مەرجە بۆ دەسکەوتنی پاداشتی باش.

ئایەتەکانیش تێکڕا بەڵگەی رون و ئاشکرایان لەخۆ گرتوە هەمو قسە و قسەلۆکی مورجیئان بەتاڵ و پوچ دەکاتەوە کە لەبارەی جودایی بڕوا لە کردەوە گوتویانە و، لەگەڵ ئەو لێکدانەوەیان کە گوایە ئەو بڕوایەی لەلای خودا قبوڵ دەکرێ و دەبتە مایەی چونە بەهەشت تەنیا بریتیە لە بەڕاستدانان و دانپێداهێنان!

❊ ❊ ❊

هەروەها مورجیئە گوناهیان کردۆتە بیانو..

گوناح لە کردەوەی ئەندامان بەپێی یەکدەنگی زانایانی ئیسلام مرۆڤ لە بڕوا دەرناکا، کەواتە دەبێ بڕوا شتێك بێ هەر تەنیا بەخودی خۆی بەرپابێ و، بە کردەوە پەیوەست نەبێ، ئەگینا سیفەتی ئیمان لەو کەسە دادەشۆری کە گوناهێك ئەنجامدا و بە بڕواداری نامێنێ.

بیانوگرتنیان بە گوناهیش بەمشێوەیە -وەك هەمو بیانوەکانیان- خەڵەتاندنێکی ئاشکرایە!

راستە گوناه مرۆڤ لە بڕوا دەرناکا، بەڵام بێگومان **کاری تێدەکا!**

کاریگەری گوناهیش لە حاڵی مرۆڤ حەقیقەتێکە پێویستی بە دوپاتکردنەوە نیە، چونکە شتێکی تێبینکراوی بینراوی رۆژانەیە، بەڵام ئەو راڤەکردنەی

پێغەمبەری خوا ﷺمان بەسە کە لە هەمو خەڵکی زانـاترە بـە حەقیقـەتی بـڕوا و، حەقیقەتی دڵی مرۆڤ و، حەقیقەتی کاریگەریی گوناهان لەسەری وەك دەفەرموێ:

((إنَّ العَبْدَ إذَا أَخْطَأَ خَطِيْئَةً نَكَتَت فِي قَلْبِهِ نُكْتَةً، فَإِذَا هُوَ نَـــزَعَ وَاسْــتَغْفَرَ وَتَابَ صَقَلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبُهُ، وَهُوَ الرَّانَ الَّذِي ذَكَـرَهُ اللهُ تَعَالَى: ﴿كَلاَ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ، كَلاَ إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِــذٍ لَمَحْجُوبُونَ، ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ﴾: ئەگەر بەندە گوناهێکی کرد پنتێکـی لـە دڵدا دروست دەکات، جا ئەگەر وازی هێنا و داوای لێخۆشبونی کرد و ژیوان بـۆوە، دڵی زاخاو دەدرێتــەوە، ئەگـەر گەڕایــەوە سەریشـی ئـەوا زیـاد دەکـا هـەتا دڵـی دادەگرێ، ئەمەش ئەو (ران: ژەنگ)ەیە کە خودای گەورە باسی کـردوە: ﴿کـە واش نیە، بەڵکو ئەوان ژەنگی کارەکانی خۆیان بۆتە توێژێکی سەر دڵیان.. هیچ وا نیــە! دیارە ئەوان لەو رۆژەدا لە بــەزەیی پـەروەردگاریان، زۆر دورن.. لـەئاکاما ئـەوان- بێگومان- دەچنە دۆزەخ.﴾))[1]

دڵیش جێگەی بڕوایە.. جا چۆن دڵـی رەش لەگـەڵ دڵـی سـپی لـە روی بـڕواوە یەکسان دەبێ؟!

بڕوا دەکەوێتە بەر کاریگەری تاعــەت و گوناهــان و زیــاد و کـەم دەبـێ، هیــچ بۆچونێکیش ئەوە قبوڵ ناکا کە باری بڕوا لە زیادبوندا وەکو باری بڕوا وابێ لەکاتی کەمبونەوەدا.

لەگەڵ ئەوەش-هەروەك لە پێشدا ئاماژەمان بۆ کرد- دەبێ سنورێك بۆ گوناهان دابنێین و لێی تێنەپەڕین هەرچەند چوارچێوەکەی فراوان بـێ. ئـەم سـنورەش ئێمـە لەخۆمانەوە داینــانێین، بـەڵکو لـە کتێبـی خـوا و سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی ﷺ

[1] أخرجه مسلم ومالك في الموطأ.

هەڵدەهێنجرێ.[1] چونکە گوناح لە بە حەلاڵدان جودایە و، بە حەلاڵدانان مـرۆڤ لـە بڕوا دەردەکا هەرچەندە کرداری نەهی‌لێکراویشی ئەنجام نەدابێ.

گوناهیش ئەوە ناگرێتەوە کە بنچینەی بڕوا هەڵبوەشـێنتەوە، یاسـادانانیش بـە غەیری ئەوەی خوا دایبەزاندوە(واتە حەلاڵکردن و حەرامکردن بەبێ فەرمانی خـوا) لەو شتانەیە کە بڕوا هەڵدەوەشێنێتەوە.

ناکرێ لە هەمانکاتدا یان لە هەمانکەسدا، گوناح سەرتاپای داخوازیـەکانی (لا إلـه إلاّ الله) بگرێتـەوە. هەرکەسـێکیش بـە درێژایـی ژیـانی خـۆی تـەنیا یـەك لەکردەوەکانی ئیسلامی ئەنجام نەدابێ مەحالـە کـە یـەك گـەرد بـڕوای لـە دڵیـدا هەبێ!!

❊ ❊ ❊

هەروەها بیانویان بەوە هێناوە کە بۆ ئەوەی خەڵك بێنە ناو ئیسلام تـەنیا داوای ئەوەیان لێکراوە بەزار شایەتمان بێنن، هەرکەسێکی شایەتمانیشی دەهێنـا یەکسـەر بە موسڵمان دادەنرا و، حوکمە دیارەکانی ژیانی دنیاشی بەسەردا تێپـەڕ دەکـرا و، لەرۆژی دواییشدا لێپێچانەوەی لەسەر خوا بو.

ئەمەش لە گەورەترین خلیسکانەکانی تێگەیشـتنە لـەبارەی داخوازیـەکانی (لا إله إلاّ الله)! چونکە ئەمە بەخۆی حەقیقەتە، بەلاّم دەلالەتـەکانی بەمشـێوەیە نیـە کە بۆی دەچن و.. ئەمەش بەڵگەیە!

راستە هەرکەسێکی دەهاتە لای پێغەمبەری خواﷺ دەیگوت: (أشـهد أن لا إلـه إلاّ الله وأن محمداً رسول الله-یا شتێکی بەم واتایەی دەگوت) یەکسەر بە موسـڵمان

---

١ هەڵێنجان: استنباط

حسێبدەکرا و، دەچوە ریزی کۆمەڵگەی موسڵمان، تەنانەت ئەگەر بە دوڕوییش بیگوتبا.

بەڵام بەڵگەهێنانەوە بەمە بۆ ئەوەی-تەنیا- بەزمان گوتنی (لا إله إلاّ الله) سیفەتی ئیسلامی لەژیانی دنیادا بەخشیوەو، لەوەش زیاتر چیدی لە مرۆڤ داواناکرێ تاکو ببێتە موسڵمان لە ژیانی دنیا و لێپێچانەوەشی لە رۆژی دواییدا لەسەر خوایە، ئەمە بەڵگەخوازیەکی رەتکراوەیە!

ئەوەی ئەم مەسەلەیە گردەبڕ یەکلادەکاتەوە بریتیە لە هەڵگەڕانەوە[1]..

بابای هەڵگەڕاوە کە هێشتا بە زمانی دەڵێ: (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله)، بەڵام نکوڵی شتێکی لە داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) کردوە، جا نکوڵی لە نوێژ یا لە رۆژی یا زەکات یا حەج کردبێ، یاخود بە ویست و رەزامەندی خۆی حوکمی بردۆتە بەر غەیری شەریعەتی خوا، لەژیانی دنیادا سزاکەی کوشتنە و، سزای رۆژی دواییشی بە نەمری مانەوەیە لە دۆزەخدا(ئەگەر نەگەڕێتەوەو تۆبە نەکا)..

جا ئایا رێی تێدەچێ کە دادگەری خودای بەرز وابێ، فەرمان بە کوشتنی مرۆڤێك بدا لە ژیانی دنیا و، لەرۆژی دواییشدا بە نەمری بیخاتە ئاگری دۆزەخ لەسەر مەسەلەیەك کە لێی داوانەکردوەو، پێوەی پابەند نەکردوەو، پێی رانەگەیاندوە؟!

ئەگەر روکەشی حالەتەکە وەرگرین-کە مورجیئەکان دەیکەنە بەڵگە لەگەڵ ئەوانەی بە زوڕنای ئەوان هەڵدەپەڕن- ئەوا زیاتر لەو مرۆڤە داوا نەکراوە کە بە زمانی بڵێ: (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله) .

---

١ هەڵگەڕانەوە: الردة .

بەڵام سزادانی هەڵگەڕاوە لە دنیا و قیامەتدا ڕێکوڕاست نابێ کە ئەو هێشتا بە زمان بڵێ (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله) و، تێڕوانین لە ئاست دادگەری خودای- پاك و بەرزیش- لە دنیاو قیامەتدا ڕێك و ڕاست دەرناچێ، ئەگەر ئەم بە زمان گوتنە داخوازیەکی دیاریکراوی لەخۆ نەگرتبێ. کە ئەوەی دەیڵێ زانیبێتی و تێی گەیشتبێ، هەروەها زانیبی کە پێیەوە پابەند کراوە، جا کاتێك نکوڵی لێکرد- لەگەڵ ئەوەی هێشتا بەزمانی خۆی بێژەکان دەڵێ- لە ژیانی دنیا حوکمی کوشتنی بۆ درا و، لەرۆژی دواییشدا بە نەمری مانەوە لەنێو ئاگری دۆزەخ.

ئایا مەسەلەکە هەڵدەگرێ بەجۆرێکیتر بێ؟

مەبەستم ئەوەیە ئایا دەکرێ کە هەمو داواکراو ئەوەبێ کە بە زمانی بڵێ (لا إله إلاّ الله و ان محمد رسول الله) ، بەبێ داخوازیەك کە ئەو گوتنە لەخۆی گرتبێ و بێژەرەکەی پێی پابەند بکا، پاشان ئەو سزا توندەی بدات، لەکاتێکدا کە هێشتا بەردەوام بێ لەو کارەی لێی داواکرابو؟!

نەخێر! مەسەلەکە لەسەر یەك بناغە نەبێ سەقامگیر نابێ.. ئەویش ئەوەیە کاتێك لێی داواکرا بە زمان بڵێ (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله)، لە هەمانکاتدا لە ناوەڕۆك ئەوەی لێ داواکراوە کە بە داخوازی شایەتمانەکەی پابەند بێ، کە بریتیە لە پابەندبون بەوەی لەلایەن خوداوە هاتوە لەگەڵ حوکم بردنەبەر شەریعەتی خودا.

جا ئەگەر یەکێك گوتی: ئەگەر ئەو پابەندبونە داواکراو با بۆ دەستخستنی سیفەتی ئیسلام، ئەوا پێغەمبەرﷺ لە دەقێکی فەرمودەکانیدا باسی دەفەرمو، هەروەك لە دەقێکدا پێداویستی گوتنی (لا إله إلاّ الله)ی فەرموە.. بەڵام ئێمە هیچ بەڵگەیەك بۆ پابەندنەبونەکە نابینین..

ئێمە دەڵێین: ڕاستە پێغەمبەرﷺ دەقی وای نەفەرموە، بەو کەسەی کە

هاتبێته لای و گوتبی (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله)، پێی نەفەرموە: هەروەها دەبێ بەڵێن بدەی کە نوێژان بکەی و زەکات بدەی و رەمەزانێ بەڕۆژوبی و ئەگەر پێتکرا حەجی ماڵی خوا بکەی، هەروەها دەبێ پەیمان بدەی کە حوکم ببەیە بەر شەریعەتی خوا و حوکم نەبەیە بەر یاساکانی جاهیلیەت(ئەمەش هەموی ئەو داخوازیانەن کە بە (لا إله إلاّ الله) پەیوەستن).

بەڵکو پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((**أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لا إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ فَإِنْ قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ وَأَعْرَاضَهُم إلاَّ بِحَقِّهَا**: فەرمانم پێکراوە کە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگێم هەتا دەڵێن (لا إله إلاّ الله)، ئەگەر گوتیان ئەوا خوێن و ماڵ و ناموسیان لای من پارێزراو دەبێ، مەگەر بە حەقی خۆی.))[1]

بەڵێ، پێغەمبەرﷺ لە دەقی فەرمودە پیرۆزەکانی تەنیا باسی گوتن دەکا و، دەقێکی نیە ئەو داخوازیانەی تێدا فەرموبێ کە گوتنەکە دەیانگرێتە خۆ، بێجگە لە قۆناغی فێرکردن، چونکە کاتێك مەعازیﷺ دەنارده نێو خەڵکی یەمەن، پێی فەرمو:

((**إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ أَهْلِ كِتَابٍ فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ عِبَادَةُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَإِذَاهُمْ عَرَفُوا ذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ فَإِذَا فَعَلُوا فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكَاةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ**: تۆ وا دەچیە ناو قەومێك کە ئەهلی کتێبن، با یەکەم شت کە بانگەوازیان بۆ دەکەی پەرستنی خودای بەرز و کاربەجێ بێ، جا ئەگەر ئەوەیان زانی پێیان ڕابگەیەنە کە خودا لە رۆژ و شەوێکیاندا پێنج نوێژی لەسەر

---

١ متفق عليه .

فەرز کردون، ئەگەر ئەمەیان کرد ئەوجا پێیانڕابگەیەنە کە خودا زەکاتێکی بەسەردا فەرزکردون کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەدرێتەوە هەژارەکانیان.))[1]

جا کاتێك فێرکردن تەواو بو ئەم مەسەلەیە، هەروەك زانایانی ئەم دینە دەڵێن (بوە یەکێك لە بەڵگەنەویستەکانی ئەم ئاینە)، واتە لەلای هەرکەسێکی بڵێ (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله) چاك دەیزانی کە نوێژکردن و زەکات دان و ڕۆژوگرتن و ئەگەر پێی‌کرا حەجی ماڵێ خوای لیّ داواکراوە، ئەوەشی زۆر لەلا ڕونبو کە خودا کۆمەڵە حوکمێکی دابەزاندون و بەسەر ئەوانەیدا فەرز کردون کە ئەم ئاینە هەڵدەبژێرن، ئەم حوکمانەش لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا کاریان پێدەکرێ و بێجگە لەوانەش هەمو شتێکی دی پوچ و بەتاڵە، جا بەپێی ئەو زانستە، هەرکەسێکی نکوڵی لە داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) کردبا ئەم سزا توندەی لە دونیا و لە قیامەتدا دەبو:

﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً لاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ: قسەکانی پەروەردگارت-لە بێ‌لایەنگری و راستیدا- تەواو و بێ کەم و کوڕین کەس ناتوانێ بیانگۆڕێ..﴾الأنعام/١١٥.

مەسەلەیەکی دیکەش هەیە لە واقیعی کۆمەڵگەی ئیسلامی هەڵقوڵاوە هەمان هێز و هەمان بایەخی پابەندبون بە داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله)ی هەیە. هەر لەو کاتەی کۆمەڵگەی ئیسلامی قەوارەیەکی دامەزراوی تەواوی هەبوە، ئیسلام، وێنەیەکی واقیعی زانراو و بەناودەنگی هەبوە، کە نە بە گریمان دانراوە و نە خەیاڵ دروستی کردوە، چونکە لەلای هەرکەسێکی هاتبێ بڵێ (لا إله إلاّ الله) پێشتر

---

[1] أخرجه مسلم.

زانراوه کە (موسڵمان) له ڕۆژ و شەوێدا چەند نوێژێکی دیاریکراو دەکا و، لەساڵێ ڕۆژویەکی دیاریکراو دەگرێ و، زەکاتی ماڵ و سامانی خۆی دەدا و، ئەگەر توانی حەجی ماڵی خواش دەکا و، بەو حوکمە دیاریکراوانەش پەیوەست دەبێ کە لەلای خواوە دابەزیون و حەڵاڵ و حەرامیان بۆ موسڵمانان تێدا دیاریکراوە، پێشتر ئەوەی چاك زانیوە کە موسڵمان بەم هەمو شتانەوە پابەندە، ئەمەش داخوازیەکانی موسڵمان بونیەتی، جا ئەگەر نکوڵی لە یەکێك لەو شتانە کرد ئەوا هەڵدەگەڕێتەوەو حەددی هەڵگەڕانەوەی دەکەوێتە سەر، جا عەقڵ نایبڕێ کە بێ بۆ ئەوەی شایەتمان بێنێ و لەناخی دەرونیشی نیازی ئەوەی هەبێ خۆی روبەڕوی کوشتن بکاتەوە لەلایەن دەسەڵاتی شەریعەت کە تەواو لەسەر زەویدا بەرپایە! بەڵکو ئەوە مەنتیقی و مەعقولە، کە-کاتێك دێ شایەتمان بێنێ- نیازی پابەندبونی هەبێ بە دەسەڵاتی بەرپای شەریعەت و لیّ دەرنەچونی.

دیارە ئەمەش نەرێ لەوە ناکا کە رەنگە هەر بە سروشتی بارەکە گەلێك لە نەحکامە لاوەکیەکان نەزانێ، چونکە زۆربەیان تەنیا ئەو کەسانەی فەقیهن و لە ئاین شارەزا هەر ئەوان دەیانزانن و، بەڵام ئەوەی ناکرێ نەیزانێ بریتیە لە مەبدەئی پابەندبون بەوەی لەلای خوداوە دابەزیوەو، ئەو پابەندبونەش- بەتێکڕایی- بریتیە لە داخوازی گوتنی (لا إله إلاّ الله).

هەر لەبەر ئەوەشە کە یەکێك دەهات بێتە ناو ئیسلام تەنیا داوای لێدەکرا شایەتمان بێنێ و، داوای لیّنەدەکرا بڕیاری نوێژ و ڕۆژی و زەکات و حەج بدا و، دان بە پابەندبونی بە حوکمەکانی شەرعی خوا بنێ، چونکە ئەمە هەموی بونەتە بەڵگەنەویستەکانی ئاین) پاش ئەوەی ماوەی فێرکردن لە مەبدەئی ئیسلام تەواو بو و. وایلێهات هەرکەسێ بەزمان بڵێ (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله) پاشان

نکوڵی یەکێك لە داخوازیەکانی بکا لە دنیــادا حــەددی هەڵگەڕانــەوەی دەکەوێتــە سەر و، لە قیامەتیشدا لە ئاگری دۆزەخ جاویدان[1] دەبێ.

ئەم پابەندبونەش بە داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) لــە کۆمەڵگــەی موســڵماندا تەنیا ئەرکی کەسێکی بڕوادار بەم ئاینە نیە وەك خــەڵکانێك وا تێدەگــەن، بــەڵکو ئەرکی هەمو مرۆڤێکە کە بڵێ (لا إله إلاّ الله) جا ئەگــەر بێبڕوایــەکی دوڕوش بــێ لەوانەی کە لە چینی هەرە ژێرەوەی دۆزەخن! چونکە دوڕو-کــە ڕەنگــە لــە ئــاوازی قسەکردن بناسرێ یا بە سارد و سڕی لە نوێژکردن یا نیشانەی دیکــە بناســرێ- لــە کۆمەڵی موســڵماندا ژیــانی خــۆی ناپــارێزێ و، حوکمــەکانی ئیســلامی بەســەردا ڕەتنابێ، تەنیا بە گوتنی (لا إله إلاّ الله) نەبێ، لەگەڵ پابەند بونی بە حوکم بردنــە بەر شەریعەتی خوا و،-بەلای کەم-پابەندبونی بەنوێژەکان.

بڕواداریــش بــەوە لــە دوڕو جیاناکرێتــەوە کــە پابــەندی ئــــەحکامی خــودا و نوێژکردنە(بەلای کەمی) چونکە ئەمە سنورێکە خەڵکی هەمو تێدا یەکسانن تــاکو لە کۆمەڵگەی موسڵماندا سیفەتی ئیسلام دەستبخەن و، پارێزگــاری لــەو ســیفەتە بکەن و، پارێزگاری لە خۆیان بکەن نەوەك حەددی هەڵگەڕانەوەیان بکەوێتە ســەر.. بەڵکو جیاوازیەکە ئەوەیە کە بڕوادار-لە ئیمــان بــە ڕاســتزانین و گوێڕایــەڵی و بــۆ نزیکبونەوە لە خودا هەمو ئەو کردەوانە ئەنجامدەدا، کەچی دوڕو لە دوڕویــی خــۆی و لەترسی گیانی خۆی!

کەواتە خودی ڕواڵەتی ئیسلام لە کۆمەڵگەی موسڵماندا-واتە ئەو کۆمەڵگەیەی حوکــم بــە شــەریعەتی خــوا دەکــا- تــەنیا بــە گوتنــی شــایەتمان و پابــەندبون بــە داخوازیەکانی و، بەلای کەمەوە نوێژکردن دێتە دەست، ئــەو مەســەلانەش ئەوانــەن

[1] جاویدان: خالد.

که خەڵك -بەبڕوادار و دوڕوپیانەوە- بەدرێژایی سـێزدە سـەدە لـە مێـژوی ئیسـلام دەیانزانی و پێیانەوە پابەند بون!

* * *

هەروەها بیانو بە روداوی ئوسامەی کوڕی زەید دێننـەوە کـە پیـاوێکی کوشـت گوتبـوی (لا إلـه إلاّ الله) پـاش ئـەوەی ئوسـامە شمشـێری لیٚ راسـتکردبۆوە و، پێغەمبەریشﷺ زۆر لێی توڕە بـو و بـەتوندی سـەرکۆنەی[1] کـرد و، چـەندین جـار ئەوەی لیٚ دوبارە کردەوە و دەیفەرمو: ((**قَتَلْتَهُ بَعْدَ أَنْ قَالَ لاَ إِلَـهَ إِلاّ اللهُ**؟!: پـاش ئەوەی کە گوتی (لا إله إلاّ الله) کوشتت؟!))، ئەو پاکانـەی[2] لیٚ قبـوڵ نـەکرد کـە دەیگوت کابرا لە ترسی شمشێرەکە گوتویەتی، واتە بڕوای پێنـەبوە، جـا پێغەمبـەر پێی فەرمو: ((**هَلا شَقَقتَ عَنْ قَلْبِهِ فَتَعْلَـمْ أَن كـان قَالَـها**..: بـۆ تـۆ دڵێـت لێککردۆتەوە تا بزانی لە ترسان وایگوتوە)).

بیانوی ئەو روداوەش نایانگەیەنێتە ئەوەی بەڵگەخوازی لێدەکەن.

(لا إله إلاّ الله) شمشێر لەسەر ئەو کەسە هەڵدەگریٚ کە دەیڵیٚ، واتـە: کوشـتنی ئەو کەسە قەدەغـە دەکـا، بـەڵام ئایـا سـیفەتی ئیسـلامی دەداتـیٚ؟! شـوێنی لیٚ تێکەڵبونەکەش لە بەڵگەهێنانەوە بە روداوەکەی ئوسامە لێرەدایە.

چونکە حوکمی خودا لە کێشەکەدا ئەوەیە کە هەرکەسـیٚ بڵـیٚ (لا إلـه إلاّ الله) گەر لە ترسان و بۆ خۆپـەنادانیش بـیٚ، دروسـت نیـە بکـوژریٚ، بـەڵام ئەگـەر بـە ئەحکامی ئیسلام پابەند نەبو ئایا هەر مامەڵەی موسڵمانێکی لەگەڵ دەکریٚ؟!

واتە ئەگـەر دوای شـادەهێنانەکەی یەکـەمجار کـاتی نوێـژ داهـات و بـۆ نوێـژ

---

[1] سەرکۆنە: عتاب　　[2] پاکانە: اعتذار

هەڵنەستا و غەزری[1]، ئایا حوکمەکەی چیە؟ حوکمەکەی ئەوەیە کە هەڵگەڕاوەیە و حەددی هەڵگەڕانەوەی دەکەوێتە سەر! واتە گوتنی (لا إله إلاّ الله) شمشێری لەسەر هەڵگرت، بەڵێ، بەڵام خستیە بەر چاودێری بۆ ساغ کردنەوە، جا ئەگەر ساغبۆوە کە بە داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) پابەندە-ئەگەر دوروش بێ- ئەوا لە ژیانی دنیادا موسڵمانە و لە قیامەتیش حسابی لەسەر خودایە، ئەگینا شەهادەهێنانەکەی لەسەر حسابە و، حەددی هەڵگەڕانەوەی دەکەوێتە سەر چونکە نکوڵی لە داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) کردوە کە بە زمانی خۆی گۆی کردبو[2]!

لە هەمو بارێکیشدا جێگیربونی سیفەتی ئیسلام بۆ هەر مرۆڤێك لە ژیانی دنیا وابەستەی پابەندبونە بە داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) پاش شایەتمان هێنان، جا بڕوادارێکی راستەقینە بێ یا یەکێك بێ لە دوڕوان.

پاشان گوناح لە کۆمەڵگەی موسڵماندا رودەدا و، درێژەدەکێشێ و درێژە دەکێشێ، بەڵام لە دو خاڵی بنچینەیی رادەوەستێ و لێیان تێناپەڕێ، ئەوانیش بریتین لە: حوکم بردنە بەر شەریعەتی خوا و، نوێژکردن.

* * *

هەروەها روداوی ئەو کەنیشکەیان[3] کردۆتە بیانو کە پێغەمبەری خواﷺ لێی پرسی: ((أین الله: خوا لە کوێیە؟)) ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد. جا لێی پرسی: ((من أنا: من کێم؟)) گوتی: پێغەمبەری خوا، ئەوجا پێغەمبەر بە گەورەی ئەو کەنیشکەی فەرمو: ((أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَة: ئازادی بکە ئەمە بڕوادارە.)).

جا دەڵێین ئەگەر بۆ سەلماندنی بڕوا شتێکی دیکە داواکرابا لەپاش شایەتمان

---

١ غەزری: أبى　　٢ گۆکردن: نطق　　٣ کەنیشك: جارية

هێنانی بە زار، ئەوا پێغەمبەری خواﷺ تەنیا بە گوتن (یا بە ئاماژە کە نیشانەیە بۆ گوتن) سیفەتی بڕواهێنانی نەدەدا کەس.

ئەمەش گەورەترینی ئەو دۆزانەیە کە مورجیئەکان-بە کۆن و نوێیانەوە- وروژاندویانە تاکو ئەوە بسەلمێنن کە سەرجەم داواکراوی ژیانی دنیا تەنیا بەدەم شایەتمان هێنانە، سەرجەم داواکراوی قیامەتیش بریتیە لە بەڕاستدانان و باوەڕپێکردن.

هەر لەکۆنەوە زانایان بەڵگەخوازیەکانیان ڕەتکردۆتەوەو بەسەریان دا داونەتەوە..

جا چ قسەی شاطبیی پێشەوا-بەر میهری خوابێ- وەرگرین کە دەڵێ: کێشەی تاکەتاکەی خەڵکی دەق هەڵناوەشێنێتەوە، چونکە دەق بەڵگەی بەهێزتر و پتەوترە، واتە ئەو ڕوداوانە بەخۆیان ڕاستن بەلاّم نابنە پێوەر(قیاس) بۆ شتی دیکە.[1]

---

١ شاطیبی پێشەوا (لە کتێبی الموافقات، ب٣ لا١٦٥-١٦٦، چاپخانەی محمد علی صبیح، قاهیرە) دەڵێ:

ئەگەر بنەمایەکی گشتی(عام) یا ڕەها(مطلق) چەسپا تێکگیربونی لەگەڵ دۆزی تاکتاکەی خەڵك و سەربردەی حاڵەتی تایبەت کاری تێناکا، بەڵکەش بۆ ئەم مەسەلەیە چەند شتێکە:

یەکەم: بنەما بەفەرزکردن گردەبڕ کراوە، چونکە ئێمە لە بنەڕەتە هەمەکیە گردەبڕەکان(الأصول الکلیة القطعیة) قسان دەکەین، مەسەلەی تاکتاکەی خەڵکیش جێی گومان و خەیاڵە و، جێگومانیش-بەرامبەر شتی گردەبڕ ناوەستێ و لەگەڵی تێکگیر نابێ.

دوەم: هەر بنەمایەك لەیەك لێکدانەوە پتر هەڵناگرێ و یەکڕوی هەیە، چونکە پشت بە بەڵگەی بڕەر دەبەستێ، کێشەکانی تاکتاکەی خەڵکیش لێکدانەوەی دیکە هەڵدەگرن. لەبەر ئەوەی ڕەنگە مانایان وەك ڕواڵەتیان نەبێ، یا لەسەر ڕواڵەتی خۆیەتی بەلاّم لە بنەڕەتەکەی دابڕکراوە و جیاکراوەتەوە. بۆیە ئەگەر حالەتەکە وابێ ناکرێ هەمەکی بونی بنەماکە بە شتێکی لەم شێوەیە بەتاڵ بکەینەوە.

سێیەم: مەسەلەی تاکتاکەکان بەشەکین(جزئی) و بنەما ڕەهاکان هەمەکین، بەشەکیش هەمەکی هەڵناوەشێنێتەوە..

یا ئەگەر قسەی ئیبنی تەیمیەی پێشەوا-بەر میهری خوا بێ- وەربگرین کە بەزارگوتنی شایەتمان بەسە بۆ بەسەرداتێپەڕین و چونە بەر حوکمەکان لە ژیانی دونیادا- کە ئازادکردنیش یەکێکە- بەڵام بەڵگە نیە بۆ هەبونی بڕوا.[1]

جا کامە لەو دو قسانە وەرگرین، دۆزە بنەڕەتیەکە هەر یەکە. هەرکەسێکی بڵێ (لا إله إلاّ الله)، وای بۆ گریمان دەکرێ کە بە داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) پابەندە و، هەر لە سەرەتاڕا شتێکی دیکەی لێ گریمان ناکرێ، چونکە ئەمە پابەندبونێکی

---

١ ئیبنی تەیمیەی پێشەوا لە (الفتاوی- کتاب الایمان- الجزء السابع) هەڵبژاردەیەك لە لا ٢٠٩- لا ٢١٥، چاپی دەزگای (الرسالة)، بەیروت، ١٣٩٨ك، دەڵێ:

کاتێ بیانو بەوە دەگرن کە پێغەمبەر بە کەنیزەکەی فەرمو: ((أعتقها فانها مؤمنة)) یەکێکە لە بیانوە ناودارەکانیان و، ئیبنی کەللاب هەر ئەمەی کردۆتە بیانو، دەیگوت: بڕوا بەڕاستدانان و گوتنە پێکەوە، بەمشێوەیە قسەکەی لە قسەی جوهم و شوێنکەوتەکانی نێزیك بو، کە هیچ بیانویەکی تێدا نیە چونکە ڕواڵەتی بڕوا کە ئەحکامی دونیای پێ پیادە دەکرێ پەیوەست نیە بە بڕوا لە باتیندا داخوا خاوەنەکەی لە قیامەتدا شاد و کامەران دەبێ، چونکە ئەو دوڕوانەی گوتیان: (آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ: باوەڕمان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هێناوە، کەچی باوەڕیشیان نیە)، بە ڕواڵەت بڕوادار بون، لەگەڵ خەڵکی نوێژیان دەکرد و بەڕۆژی دەبون و حەجیان دەکرد و زەکاتیان دەدا، موسڵمانەکانیش ژن و ژنخوازیان لەگەڵ دەکردن و میراتیان لێدەگرتن. هەروەك دوڕوەکانی سەردەمی پێغەمبەرﷺ.. کاتێ خودای بەرزیش لە کەفارەتدا فەرمانی بە ئازادکردنی کۆیلەیەکی موسڵمان کرد، لەسەر خەڵکی نەبو کۆیلەیەك ئازاد نەکەن هەتا لە ئیمانی نێو دڵی دڵنیا نەبن، چونکە ئەمە بەوەی دەچێ کە پێیان بگوترابا: هەمو خەڵکی بکوژن ئەوانە نەبێ کە دەزانن بڕوایان لە دڵیدایە، بەڵام ئەوان فەرمانیان پێنەکرابو کە دڵێ خەڵکی هەڵکۆڵن یا زگیان هەڵدڕێنن، بۆیە ئەگەر بیاندیبا پیاوێك ڕواڵەتیانە بڕوادارە دروستبو کە ئازادی کەن و، خاوەنی کەنیزەکەش کە لە پێغەمبەرﷺی پرسی ئایا ئەمە بڕوادارە؟ مەبەستی لە ڕواڵەتی بڕوا بوە کە موسڵمان و کافر جیادەکاتەوە، هەروەها ئەگەر کەسێکیش نەزرێکی لەسەر بێ کە بەوە پاندی بکا کە کۆیلەیەك ئازاد کا بزانێ ئیمانی لە دڵیدا هەیە، ئەوا هەرگیز ئەوە نازانێ، تەنانەت هەرگیز هیچ کەسێکیش ئەوە نازانێ... مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ هەر بە بڕوای ڕوکەش و ڕواڵەت کە ئەحکامە ڕواڵەتیەکانی پێ وابەستەیە، لە باسی ئەو کەنیزەیە دواوە.

بەڵگەنەویستە لە ئایندا و، بەم پابەندبونە گریمانەییەش سیفەتی ئیسلام وەردەگری، واتە بەو داخوازیەی کە گوتنەکە لە خۆی گرتوە نەك تەنیا بە گوتنەکە، خۆ ئەگــەر نکوڵی لە داخوازیەکە کرد لەگەڵ ئەوەی هەر لە گۆکردنەکــەش بــەردەوام بــو ئــەوا هەر هەڵگەڕاوەیە لە ئیسلام و، ئەمــەش لــە دووچــاربوونی حــەددی هەڵگەڕانــەوە رزگاری ناکا کە بڵێ: نەمدەزانی! لە مێژوی ئیسلامیش بە درێژایــی ســێزدە ســەدە شتێکی وا روینەداوە کە یەکێك لە خەڵکی بڵێ: نەمدەزانی کــە ئیســلام داخــوازی هەیــە!! ئەگــەرچی ســەرجەم حوکمــە لاوەکیەکانیشــی نــەزانیبێ و پێویســتی بــە پرسیارکردن بێ تاکو فێریان بێ!!

* * *

لە کۆتاییشدا بیانو بەوە دەهێننەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((مَــنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاّ الله دَخَــلَ الجَنَّــةَ: هەرکەســێکی گوتــی (لا إلــه إلاّ الله) دەچێتــە بەهەشت.)) یا فەرمویەتی: ((مَنْ مَاتَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّــةَ: هەرکەسێکی مردو دەیزانی کە جگــە لــە خــوا پەرســتراوێکی دیکــە نیــە دەچێتــە بەهەشت))، یان فەرمودەی دیکەی بەم واتایە.

هیچ پێویست ناکات لەبارەی ئەم فەرمودانەوە بڵێــین لــە مەککــەدا و بــەر لــە دابەزینی ئەرکەکان گوتراون و لە مەدینەدا پاش دابەزینی ئەرکەکان وەك هــەندێك زانا دەڵێن نەسخ بونەتەوە.

مونزیری حافیز دەڵێ: (کۆمەڵێك لە گەورەگەورەکانی زانایان وای بۆ دەچن کــە ئەو رەهاکردنانەی لەبارەی ئەو کەسانەوە هاتون کــە بڵێــن (لا إلــه إلاّ الله) دەچنــە بەهەشت یان لە ئاگری دۆزەخ حەرام دەبێ یا شــتی دیکــەی هاوشــێوە، ئەمــە لــە ســەرەتای ئیسلام دا بــوە، لــەو کاتــەی کــە بانگــەواز تــەنیا بــۆ دانپێداهێنــان بــە

یەکتاپەرستی بوە، جا کە فەرزەکان فەرزکراون و حەددەکان دانراون ئەوان نەسخ بونەتەوە، بەڵگەش بۆ ئەمە گەلێك زۆر و ئاشکران، زەححاك و زوهەری و سوفیانی سەوری و زانایانی دیکەش هەر هەمان ئەم بۆچونەیان هەیە، کۆمەڵێکی دیکەش دەڵێن پێویست ناکا بلێین ئەوانە نەسخ بونەتەوە، چونکە هەر شتێکی لە پایەکانی ئاین و فەرزەکانی ئیسلامە بریتیە لە پێداویستی و تەواوکەرەکانی شەهادەهێنان. جا ئەگەر شادەی هێنا و پاشان وازی لە ئەنجامدانی بەشێك لە فەرزەکان هێنا جا باوەڕی پێنەبو یا لەبەر بە کەم هەڵگرتنی ئەنجامی نەدابێ ئەوا رای جیاجیا هەڵدەگرێ، لەو کاتەدا حوکمی کوفر و نەچونە بەهەشتی بۆ دەردەکەین.)[1]

هەروەها ئیبنی قەییم دەڵێ: (یەکتاپەرستی بە تەنیا ئەوە نیە کە بەندە دان بەوەدا بنێ کە بێجگە لە خوا هیچ وەدیهێنەرێکی دیکە نیە و خودا پەروەردگاری هەمو شتێکە و خاوەن و پادشایەتی، هەروەك بتپەرستەکان لەگەڵ ئەوەی هاوبەشپەرستیش بون دانیان بەو شتانەدا دەنا. بەڵکو یەکتاپەرستی خۆشەویستنی خودا و، ملکەچ بون و زەبونی بۆ خودا و، تەواو رامبون بۆ تاعەت و دڵڕاستی لە پەرستنی و مەبەست بونی روی خودای بەرز بە هەمو قسە و کردەوە و لێگرتن و پێبەخشین و خۆشەویستی و بوغزاندنێك کە لە نێوان خاوەنەکەی و هۆکارەکانی گوناح و پێگیری لەسەر گوناحان دروست دەبێ. هەرکەسێکی ئەمەش بزانێ ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەریشﷺ دەزانێ: ((إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ: خودا ئەو کەسی لە ئاگری دۆزەخ حەرامکردوە کە گوتویەتی (لا إله إلاّ الله) و روی خودای پێ مەبەست بوە.)) وە کە دەفەرموێ: ((لاَ يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّــهُ: هەرکەسێکی گوتی (لا إله إلاّ الله)

[1] الترغيب والترهيب، ٣/٢٢٠، تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد.

ناچێته دۆزەخ))، لەگەڵ هەمو ئەو فەرمودانەی بەمجۆرە هاتون کە لـە خـەڵکانێکی زۆر تێکەڵ بوینە بە شێوەیەك هەندێکیان وایان گومان برد کـە نەسـخ بونەتـەوەو، هەندێکیشیان گومانیان وابو پێش هاتنی فـەرمان و نەهیـەکان و سـەقامگیربونی شەرع گوتراون و، هـەندێکی دیکـەش بـە دۆزەخـی هاوبەشپەرسـتی و بێبڕواییـان لێکداوەو، هەندێك وشەی چون(الدخول)یـان بەهەمیشـە تێدامانـەوە تـەئویلکرد و گوتیان: مەبەست لەو فەرمودانە ئەوەیە کە بۆ هەمیشە تێدامانەوە ناچنــە نـاوی. لەگەڵ کۆمەڵە تەئویلێکی دیکەی لەم بابەتە. پێغەمبـەریشﷺ نەیفـەرموە ئەمـە تەنیا بە قسەی زمان دێتەدی، چونکە ئەمە پێچەوانەی شتە زانراوەکانە لـە ئـاینی ئیسلام، لەبەر ئەوەی دوڕوەکان بە زمانیش دەیلێن بەڵام لەژێر ئەوانەشن کـە هـەر بێبڕوابون و لە چینی هەرە ژێرەوەی ئاگری دۆزەخن.. جا گوتنی دڵ و گوتنی زمـان هەردوك دەبێ هـەبن، گوتنـی دڵیـش زانـین و بەڕاسـتدانان و زانینـی حەقیقـەتی ڕەتکردنەوەو سەلماندن(النفي والإثبات)ەکانی دەگرێتەوە، لەگەڵ زانینی حەقیقـەتی خوداوەندی کە تایبەتە بە خوا و لە غەیری خوا نەفی کـراوەو مەحاڵـە بـۆ غـەیری خوا بسەلمێ و، بـەرپابونی ئـەم واتایـە لـەدڵدا وەك زانسـت و زانیـاری و یـەقین و حاڵەتێك کە حەرامکردنی بگۆیەکەی[1] لـە ئـاگری دۆزەخ واجـب دەکـا.. جـا لـەو حەقیقەتانەی بڕوا رامێنە کە لە دڵی بکوژی[2] سەدکەسەکە دروستبو، کە لە رۆیشتن بەرەو گوندەکە خافڵ نەبو و بەدڵ دەیویست بۆی بچێ و بەگژ ئاوزینگـاندا[3] دەچـو، ئەمە مەسەلەیەکی دیکـە و ئیمـانێکی تـرە، سـەیریش نیـە کـە بەگـەڵ گونـدی پیاوچاکان خرا و لەوان حسێب کرا...).[4]

---

[1] بگۆ: قائل . [2] بکوژ: قاتل. [3] ئاوزینگ: احتضار، سکرات الموت.

[4] مدارج السالکین ج۱ ص۳۳۰-۳۳۲ طبعة دار الکتاب العربي ۱۳۹۲هـ.

ئنجا دەڵێین: لە چاکە و فەزڵی خودا بەدەر نیە.. ئەگەر خودای بەرز بیەوێ ئـەو کەسـە لە دۆزەخ دەربێنێ کە گوتویــەتی (لا إلـه إلاّ الله) و بـە بارسـتەی گـەردێك خێری لەدڵدابوبێ.. یا هەر بە فەزڵی خۆی قـەومێك لـە دۆزەخ دەرهێنـێ هـەرگیز چاکەیان نەکردبێ.. ئەمە کاری خۆیەتی و چاکە و رەحمەتی خۆیەتی..

بەڵام پاش ئەمەش مەسەلەیەك دەمێنێ دەبێ تەماشای بکرێ.

ئەم چارەنوسەی کە هەندێك خەڵك دەیگەنێ پاشئەوەی لەپای تاوان و گوناهیـان ئازار و ئەشکەنجە دەچێـژن و، پـاش ئـەوەی خـودا دادوەری لـە مـافی بـەندەکاندا دەکات،-بەفـەزڵی خـۆی- ئەوانـە دەباتـە بەهەشـت کـە شایسـتەن و کاریـان بـە داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) کردوەو، پاشئەوەی پێغەمبەرﷺ شەفاعەت دەکا بـۆ کەسانێك لە بەندەکانی خودا.. ئەو چارەنوسەی کە خەڵکانێك دەیگەنێ و-لە چاکە و میهرەبانی خودا- لەوە رزگار دەبن کە بە نەمری لـە ئـاگری دۆزەخـدا بمێننـەوە پاش ئەوەی چەندی خودا ویستی لە دۆزەخدا مانەوە.. ئایا دەبێ ئـەوە ببێتـە ئـەو ئامانج و مەبەستەی مرۆڤ هەوڵ و کۆششی بۆ دەکا و، هــەر لـە یەکـەم سـاتەوە تێکۆشانی بەپێی ئەم پێوەرە دیاریبکا؟!

بۆ نزیکخستنەوە نمونەیەك دێنینەوە.. نمونەی بەرزیش بۆ خوایە.

لە تاقیکردنەوەکان لیژنە دادەمــەزرێن لـەژێر نـاوی (لیژنـەکانی بـەزەیی) کـە تەماشای باری ئەوانە دەکـەن کـە لـە تاقیکردنـەوەکان کـەوتون، جـا هـەوڵدەدەن کەسانێکی گونجاو لەکەوتن رزگار بکەن. ئەوجا هەر پێدا دەچنـەوەو پێیدادەچنـەوە تا لە کۆتایی وایلێدێ هەرچی بچوکترین بیانوی بۆ بدۆزنەوە لە لیستی کـەوتوەکان دەریدێنن.

جا ئەگەر فێرخوازان هەر لە سەرەتای ڕێگەوە بەخۆیان بڵێن: لیژنەی بەزەیی هەن و بەزەییان بە حاڵی ئێمەدا دێتەوەو هەر کەمترین ئەرکمان کێشابێ بەسەرکەوتومان دادەنێن، بەڵکو ڕەنگە خەڵکەکیش بە سەرکەوتو دانێن کە هەر خۆیان ماندو نەکردبێ.. ئایا ئەو کاتە کرداری خوێندن سەرلەبەری هیچ قیمەتێکی دەمێنێ؟ هیچ ئامانجێکیش لە ئامانجەکانی جێبەجێ دەکات؟ ئایا خودی تاقیکردنەوەکە هیچ ئەرکێکی دەمێنێ ئەنجامی بدا؟!

بەڵام ئەو لیژنانە دەمێنن و بە ئەرکی خۆیان هەڵدەستن و، کەسانێکی لاوازیش ڕزگار دەکەن، کە -بەڕاستی- هەوڵیان داوە، بەڵام سەرنەکەوتون، جا لەپای نیازپاکیان و هەوڵی ڕاستگۆیانەیان پاداشتیان دەداتێ هەرچەندە کەمیشیان وەدەستهێنابێ، بەڵام هەر ئەم لیژنەیە کاتێك کەسانێکی بەهێز و توانا دەبینێ -کە هێز و توانایان لێڕادەبینی- دەستیان بەخۆدا بەرداوەتەوەو، وزەی خۆیان بە گاڵتە و ئارەزوبازی بەفیڕۆ دەدەن کە دەیانتوانی لە خوێندنێ بەکاری ببەن، چونکە ئەرکەکەیان بەسوك زانیوەو، تاقیکردنەوەکەیان بەهێند هەڵنەگرتوەو، پشتیان بە لیژنەکانی بەزەیی بەستاوە کە ئەنجامەکەیان چۆن بێ هەر سەریان دەخا.. بەڵام ئایا لەو کاتە لیژنەکانی بەزەیی ڕزگاریان دەکەن؟!

جارێکی دیکە دەڵێین: گومان لە چاکە و فەزڵی خودا نیە.. میهری خودا هەمو شتێکی گرتۆتەوە.. لێی دەپاڕێینەوە تا لە گوناهمان خۆشبێ و لە خراپەکانمان ببورێ و، بەزەیی بە لاوازیمان دا بێ و، کۆسپی سەرڕێمان تەختکا و، هەنگاوی ڕاستمان پێ هەڵێنێ.

بەڵام ئێمە وا تێدەگەین کە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ مەبەستی ئەوەیە کە کەس لە میهری خوا بێهیوا نەبێ. نەك ئەوەی کە مورجیئەکان ئیسلامێکی بێئەرکی لێ

هەڵبڕن. پاشان بانگەشەی ئەوە بکەن کە خوا بەو ئاینە ئەمەی ویستوە! بەڵگـەشمان ئەوەیە کە موعازﷺ لە پێغەمبەرﷺ پرسی: ئەی پێغەمبەری خـوا مزگێنـی بـە خەڵکی نەدەم؟ فەرموی: ((لاَ تُبَشِّرْهُم فَيَتَّكِلُوا: مزگێنیان پێ مەدە، نەوەك دەست بەخۆدا بەردەنەوە)).[1]

پاشان ئەگەر خودا لەرۆژی دواییدا لەو گوناهبارانـە خۆشـبو پاشـئەوەی لـەپای گوناهەکانیانی ئەشکەنجەیان چێژا و، لە ئـاگری دۆزەخ بـە نـەمری نەیهێشـتنەوە، بەڵکو بە میهری فراوانی خۆی دایگرتن و لە نەمری نێو دۆزەخ دەریهێنان و بردنیـە بەهەشت.. ئایا باری ئەم دینە لە ژیانی دنیـا بـەوە چاکدەبـێ کـاتێك موسـڵمانان هـەمویان یـا زۆربـەیان لەوانـە بـن کـە دەکەونـە دۆزەخ، هـــەتاکو میـــهرەبانی پەروەردگاریان رزگاریان دەکا لە مانەوەی تا هەتایی لە دۆزەخدا ؟!

ئەم واقیعەی کە ئەمڕۆ تێیدا دەژین چاکترین شـایەتی ئـەم دۆزەیـە، زەبونـی و سوکی و لاوازی دایگرتوین و، دوژمنانیش زاڵن، بەردەوام دەستدرێژی دەکەنە سـەر کەرامەت و خوێن و ناموس و ماڵی موسڵمانان، حـاڵ هەروایـە کـە خـەڵك وەکـو ئاومـاڵکی سـێلاوی بـن.. واشـیان لێ بەسـەرنایێ تـەنیا کـاتێك ئیسـلامەکەیان ئیسلامی بەڕاستدانان و دانپێدانان بێ، بەبێ هیچ کردەوەیەك کە لە داخوازیـەکانی بەڕاستدانان و دانپێداناندا ئەنجام بدرێ.. جا ئایا خودا لە بەندەکانی قبوڵ دەکا کـە ئاینەکەی ون کەن و، پشت لەو ئەرکە بکەن کە خـودا لەسـەر زەویـدا ئـەوانی بـۆ ئەنجامدانی دەرخستوە، پاشان ئا ئەمەش ببێتـە ئـەو بنچینەیـەی تـەواوی ئـاینی لەسەر پێوانە دەکرێ؟!

---

[1] رواه الشيخان

کۆمەڵگەیەکی بڕوا بەهێز، کە لەنێو کارکردن بە داخوازیەکانی (لا إلـه إلاّ الله) چەسپیبێ، دەتوانێ بڕوا لاوازەکان و، تەمبەڵ و تەوەزەل و لەشگرانەکان لە تەوژمی خۆی هەڵگرێ و، بەرێدا بڕوا و ئامانجەکانی وەدیبێنێ. بەڵام کە هەموی- یا تەنانەت زۆربەی- دەبنە بڕوالاواز و تەمبەڵ و تەوەزەل و لەشگران، ئایا هیچی پێدەکرێ و ئایا دەگاتە هیچ؟! درەختی بەهێز دەتوانێ هەندێك گەڵای سیس و زەردهەڵگەڕاو یا تەنانەت هەندێك لق و پۆپی داکەوتو هەڵبگرێ، پاشان بەروبومیش بگرێ و ئەو گەڵا و لقوپۆپانە هیچ زیانێکی پێ نەگەیەنن، بەڵام ئەگەر هەمو گەلایەك لە درەختەکە داوای مافی زەردهەڵگەڕانی خۆی کرد و ویستی لەگەڵ ئەوەش بەم شێوەیە مافی وجودی هەبێ مادام هێشتا لە درەختەکە نەوەریوە، ئایا لە لەناوچون و مردن بترازێ ئەو درەختە هیچ چارەنوسێکی دیکەی هەیە؟!

جا ئەگەر خوا -لەمیهری خۆیەوە بۆ بەندەکانی- ئەو لاوازانە قبوڵ بکا، پاشئەوەی بە مانەوەیان لە دۆزەخ هێندەی خوا خواستی لەسەر بێ لە گوناه پاکیان دەکاتەوە، ئایا بۆ ئێمە دروستە بڵێین: هەر ئەوەندە لە بڕواداران داواکراوە و هیچیدیکە نا و، هەرکەسێکی بشڵێ بڕواداران لەوە زیاتریان پێ سپێردراوە ئەوا بۆ دینی خودای زیادکردوە؟!

بۆ جاری سێیەمیش دەڵێین: گومان لە چاکە و فەزڵی خوادا نیە، کێی بیەوێ دەیخاتە بەر رەحمەتی خۆی، بەڵام هەر خوا ئەم ئەرکانەی بەسەر بڕواداران دابەزاندوەو فەرزی کردون، هەر بەخۆشی فەرمویە: چونە بەهەشت لەگەڵ خۆزگەخوازتن و پاڵدانەوە وەدی نایێ:

﴿لَيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلاَ أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ وَلاَ يَجِدْ لَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا، وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا: نه بـه ئـاواتی ئێوەیـە و نـه بـه هەوا و ئارەزوی ئەو کەسانەیە بە ئەهلی کتێب حەسێبن، هەر مرۆڤێك كارێكی نالەبار بكا، بەو كارەی خۆی سزا دەدرێ و جگە لەخوا هیچ كەسی بۆ پەیدا نابێ دۆستی بێ و بێتە هاواری. هەر مرۆڤێك-نێر بێ یان مێ- هەر هێندە خاوەن باوەڕ و ئاكار چاك بێ، دەچنە بەهەشتەوە و بە ئەندازەی تلێشی وردیلەی ناوكە خورمایەكیش ناهەقیان لیٚ ناكرێ.﴾النساء/١٢٣-١٢٤.

ئینجا خودا لەپاش ئەوە چاكە و فەزلی بێسنوری خۆی بەسەر هەر بەندەیەكی كە خۆی بیەوێ دادەڕێژێ

* * *

بەلاّم گرنگترین شتێك كە جێبایەخی ئێمە بێت لەبابەت ئەم فەرمودانە ئەوەیە كە ئاخۆ مورجیئە تازەكان بۆ كوێیان بردون!

مورجیئەكانی پێشان لەگەلّ ئەو هەمو لاركردنەوەی خستبویانە چەمكی (لا إله إلاّ الله)،-وەك باسمانكرد- لە دو خالّدا راوەستا بون كە لێیان تێپەڕ نەدەبون لەگەلّ ئەو هەمو (كردەوانەی) لە داخوازیەكانی بڕوایان دەردەهاویشت، ئەوانیش بریتی بون لە نوێژ و حوكم برندنە بەر شەریعەتی خوا، ئەگەرچی دەشیانگوت كە هەمو كردەوەیەك لە دەرەوەی داخوازیەكانی بڕوایە، بەلاّم كاتێك لە فیقه قسەیان دەكرد-زۆریشیان فەقیه بون- چاك دەیانزانی هەندێك كردەوە هەن مرۆڤ هەردەبێ دەستیان پێوەبگرێ تا لە كۆمەلّگەی موسلّماندا سیفەتی ئیسلامی بۆ بمێنێتەوە، گرنگترینیان نوێژكردن و حوكم بردنە بەر شەریعەتی خوایە.

کەچی مورجئیە تازەکـــان لــەهیچ ســنورێك رانەوەســتان.. لــە کۆمـەڵگەیــەکدا لەدایکبون بە شەریعەتی خوا حوکم ناکا.. لە کۆمـەڵگەیــەك نوێــژی تێــدا نــاکرێت (لەگەڵ پەرستنەکانی دیکەش)، پاشــان ژەمەژەهراوەیەکــەی فیکـری ئیرجائیشــیان قوتدا، جا بیری خۆیان هەڵخست[1] تاکو هەمو شتێکیان لــە داخوازیــەکانی (لا إلــە إلاّ الله) خستە جوغزی ئەو هزرەوە[2]، ئەوجا گوتیان: هەرکێ گوتی (لا إلــە إلاّ الله) بڕوادارە ئەگەر یەك کردەوەشی لە کردەوەکــانی ئیســلام ئــەنجام نــەدابێ.. بــەمجۆرە دوایین دو بەربەستیشیان بڕی کە مورجیئە کۆنەکان لەلایان ڕاوەستابون: بەربەســتی نوێژ و بەربەستی شەریعەت.. جا ئەو کۆمەڵگایانــەیان بــە کۆمەڵگــەی ئیســلامی وەسفکرد کە حوکم بە شــەریعەتی خــوا ناکــەن. خەڵکیشــیان-هــەمو خــەڵك- بــە موسڵمان وەسفکردن، مادام بەزاریان دەڵێن (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله)!

پێمانخۆشە یەکەمجار بۆ ئەو فەرمودەیە بگەڕێینەوە کە پشتی پێ دەبەستن: ((مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إلاّ الله دَخَـــلَ الجَنَّـــة: هەرکەســێکی گوتــی (لا إلــە إلاّ الله) دەچێتــە بەهەشت.)).

پێشتر گوتمان پێویستمان بەوە نیە بڵێین ئەم فەرمودەیە بە دابــەزینی ئەرکــەکان لە مــەدینەدا، نەسخ بۆتەوە، بەڵام تەنیا دەڵێین بە فەرمودەی دیکەی پێغەمبــەرﷺ تەرخانکرا[3] کە خۆدابڕین لە هاوبەشپەرستی کردە مەرج.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِـــكَ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ: هەر بەندەیەك گوتــی (لا إلــە إلاّ الله) پاشــان لەســەر ئــەوە مــرد دەچێتە بەهەشت.))[4].

---

١ بیری خۆیان هەڵخست: مدوا فكرهم. ٢ هزر: فكر . ٣ تەرخانکرا: خصص

٤ أخرجه مسلم

هەروەها فەرموی: ((مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّـةَ: هەرکەسێکی مرد و هیچ هاوبەشی بۆ خودا بڕیار نەدابو دەچێتە بەهەشت.))[1]

جا بە لەبەریەك راگرتن و کۆکردنەوەی هەردو فەرمودە ئەوەمان لەبارەی (لا إله إلاّ الله) بۆ دەردەکەوێت کە خۆدابڕین لە هاوبەشپەرستی مەرجی قبـولّ بونیـەتی لەلایەن خوداوە لە رۆژی دواییدا. خودا لە قورئانی پیرۆزیشدا بەشێوەیەکی گردەبـڕ ئەمەی دەستنیشان کردوە:

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَـاءُ: خـودا لەوانـە نابورێ کە شەریکی بۆ بناسن، لەوەبترازێ هەرکەسێکی بۆ خـۆی حـەزکا، عـافوی دەکا.﴾النساء/١١٦.

هاوبەشپەرستیش چەندین جـۆرە.. وتـارخوێن و واعیزەکـان باسـی هـەندێکیان دەکەن-کە دەسەڵاتداران تورە ناکات- باسی ئەوانی دیکەش پشتگوێ دەخەن!

روکردنە غەیری خوا بە یەکێك لە جۆرەکانی پەرستن وەکو نزا و کۆمەکخوازی و فریـاخوازی[2] و نـەزر و سـەربڕین.. هاوبەشپەرسـتیە و گومـانی تێدانیـــە، وتارخوێنانیش بەزۆری باس لەمجۆرە هاوبەشپەرستیە دەکەن!

وا گومانبردنیش کە هیدیکە هەن لەگەڵ خـودا بژێـو دەدەن یـا زیـان یـا سـود دەگەیەنن.. ئەمەشیان بێگومان هاوبەشپەرستیە و وتارخوێنانیش گەلێکجار باسی دەکەن!

یاسادانانیش (واتە حـەڵاڵکردن و حـەرامکردن) بێجگـە لـەوەی خـوای گـەورە دایبەزاندوەو، رازیبون بەو یاسادانانە، هاوبەشپەرستیە و گومانی تێدا نیـە، بـەڵام

---

١ أخرجه مسلم

٢ نزا: الدعاء　　کۆمەکخوازی: استعانة　　فریاخوازی: استغاثة

خەڵكی لەم سەردەمەی دواییدا نەفام بون-یا نەفام كران- بەو راستیە ترسناكە، وایان لێهات كە گوناح و هاوبەشپەرستی لە یەكتر جودا نەكەنەوە و، وەكو گوناهێكی شایستەی لێخۆشبون دەیانڕوانیە ئەم جۆرە هاوبەشپەرستیە.. ئەگەر وەكو (پێویستی)یەكی موباحیش تەماشای نەكەن كە هیچ گوناهێكی تێدا نیە. بەڵكو ئەگەر-لەپشت ئەمانەش- لە هەستیاندا وا نەچەسپابێ كە مایەی پێشكەوتن و شارستانیەت و دەربازبونە لە كۆت و بەندان!!

* * *

ئەمە چۆن رویدا ؟!

لە سەرەتا لەشكركێشی خاچپەرستان هات و پێی چەپەڵی خستە هەر شار و ولاَتێك شەریعەتی ئیسلامی تێدا وەلا نا، پاشان بە خەڵكی گوترا: خەمتان نەبێ! مادام نوێژدەكەن و رۆژو دەگرن ئێوە موسڵمانن ئەگەر حوكمیش نەبەنە بەر شەریعەتی خودا!

ئەوجا هێرشی خاچپەرستان (و جولەكانیش لەگەڵیدا) شتی وایان بەسەر خەڵكیدا زاڵكرد كە تەنانەت لە نوێژ و رۆژویان كردن. پاشان بە خەڵكی گوترا: خەمتان نەبێ! مادام دەڵێن (لا إله إلاّ الله) هێشتا موسڵمانن!

بەمشێوەیە ئیسلام تەنیا بەو دەزوە باریكە بە هەڵواسراوی مایەوە كە بریتی بو لە گوتنی (لا إله إلاّ الله) بە زمان، بەبێ هیچ جۆرە داخوازیەك لە ژیانی خەڵكی. پاشان مورجیئە تازەكان هاتن-بەو ژەهرەی لە هزری ئیرجائی هەڵیانمشتبو- گوتیان: بۆ خەڵك هیچی تێدا نیە! چونكە بڕوا بەڕاستدانان و دانپێداهێنانە و، هەركەسێكی بڵێ (لا إله إلاّ الله) بڕواداره و، ئەگەرچی یەك كردەوەشی لە كردەوەكانی ئیسلام ئەنجام نەدابێ!

نایەوێ هەرچی پێشتر گوتمان دوبارەیکەینەوە..

بەڵام پێویستە دۆزێکی زۆر گرنگ لەبیر نەکەین.. ئەویش ئەوەیە کە (لا إله إلاّ الله) هەتا لە هاوبەشپەرستی پاك بێ لەلای خودا قبوڵە-گەر بەشێوەیەکی کاتی چاوبپۆشین لە مەسەلەی (کردەوە) و گومڕاییەکانی مورجیئە کۆنەکان لەم بابەتە-، بەڵام ئەگەر هاوبەشپەرستی تێکەوت، تەواو هەڵدەوەشێتەوەو، بەهیچ جۆرێك لەلای خودا قبوڵ نابێ..

لەو کارەساتانەی لەم سەدەیەی دوایش توشی هاتین ئەوەیە کە باس لەو شتانە دەکەین کە دەستنوێژ بەتاڵ دەکەن و لە پەیمانگا ئایینیەکان سەدان جار و لە سەدان لاپەڕە بە فێرخوازانی دەڵێینەوە.. بەڵام باسی ئەو شتانەیان بۆ ناکەین کە (لا إله إلاّ الله) بەتاڵ دەکەنەوە! ئەگەر باسیشی بکەین ئەوا تەنیا باسی هاوبەشپەرستی بیروباوەڕ و هاوبەشپەرستی پەرستن دەکەین و هاوبەشپەرستی شوێنکەوتن(الاتباع) نایەنینە بەرباس، لەسەر بنچینەیەك کە هەر لە بنچینەدا هەڵەیە و، بریتیە لەوەی کە هاوبەشپەرستی شوێنکەوتن (کوفری کرداری)یە و کەس لە دین دەرناکا!!

پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿**اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ**: لەبری خوا ڕەبەنەکانی خۆیان و مەسیحی کوڕی مەریەمیان کردە خوا، فەرمانیشیان پێدرابو بێجگە لەخوای تاك و تەنیا نەپەرستن، لە غەیری ئەو هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ. خودا بێ عەیبە و بەدورە لەو شتانەی بە هاوتای ئەوی دەزانن.﴾التوبة/٣١. کە عەدی کوڕی حاتەم چوە لای، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵام ئەوان نەیاندەپەرست! پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((**أَلَمْ يُحِلُّوا**

لَهُمُ الحَرَام وَيُحَرِّمُوا عَلَيْهِمُ الحَلاَلَ فَأَتَّبَعُوهُمْ: ئەدی حەرامیان بۆ حەڵاڵ نـەدەکردن و حەڵاڵیان لیّ حەرام نەدەکردن و ئـەوانیش شـوێنیان نەدەکـەوتن؟ گوتـی: بـەڵێ، فەرموی: ((فَذَلِكَ عِبَادَتُهُمْ إِيَّاهُمْ: جا ئەوە پەرستنەکەیانە بۆ ئەوان.))[1]

خودای بەرز وادەفەرموێ و، پێغەمبەرەکەیﷺ وا دەفەرموێ، پاشان ئەوان دێـن و دەڵێن: ئەمە لە کوفری کرداریە و، کوفری کرداریش نابێتە هۆی لەدین دەرچون!!

* * *

بەو باسەدا رەت بویـن[2] کـە دۆزی یاسـادانان یەکێکـە لـە دۆزە سـەرەکیەکانی بیروباوەڕ، سورەتە مەککەییەکانیش تەنانەت پێش دابەزینی حوکمەکان بـە درێـژی کە حوکمی کۆمەڵگەی ئیسلامی دەکـەن، باسـیان لێوەکـردوە. خـودای بـەرز لـە مەککە کە بانگەوازی خەڵکی کرد بۆ ئیسلام پێی فەرمون:

﴿اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ وَلاَ تَتَّبِعُوا مِنْ دُونِـــهِ أَوْلِيَـــاءَ: هـەرچی لـە پەروەردگارتانەوە بۆتـان ناردراوەتـە خـوارەوە، شـوێنی کـەون و بـە غـەیری ئـەو مەکەونە شوێنی سەرپەرشتانی دیکە.﴾الأعراف/٣.

﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ: ئاخۆ ئەوان شـتانێ وا بە شەریکی خوا دەزانن، کە دینێکی وەهایـان بـۆ داهێنـابن و خـودا ئیجـازەی نەدابن..﴾الشوری/٢١.

﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ: لەسـەر هـەرچی پێـك نـەهاتن، حوکمەکەی بۆ لای خودایە.﴾الشوری/١٠.

---

١ أخرجه الترمذي .

٢ رەتبوین: تێپەڕین

هەروەها بە بڕوادارانی مەککەی فەرمو:

﴿وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ: هەر ئاژەڵێ لەکاتی سەربڕینێدا ناوی خودای لەسەر نەیە، نابێ لە گۆشتەکەی بخۆن، ئەمە لەڕێگە لادانە. شەیتانەکان دنەی دۆستانی خۆیان دەدەن، تا کێشەتان لەگەڵ بکەن. جا ئەگەر بەگوێتان کردن، بێگومان شەریکتان بۆ خودا داناوە.﴾الأنعام/١١٤-١٢١.

پاشان کە حوکمەکان بە درێژی لە مەدینەدا دابەزین و، ئیسلام وێنەیەکی پیادەکردنی کرداری وەرگرت، سەرەڕای پەرستنەکان بە ئەحکامی خوداوە پابەند بو، حەڵاڵ تیایدا ئەوەبو خوا حەڵاڵی کردوە و، حەرامیش ئەوە بو کە خوا حەرامی کردوە، لێرەدا دۆزێکی دیکە لە مەدینە هاتە کایەوە کە بریتی بوو لە دۆزی ئەو دوڕوانەی کە لە سەرەوە وایان پیشاندەدا ئیسلامیان قبوڵکردوە، بەڵام دەرونەکانیان بۆ ئەحکامی خودا رام و ملکەچ نەبو، دەشیانویست حوکم ببەنە بەر تاغوت و (هەر حوکمێکیش بێجگە لە حوکمی خودا حوکمی تاغوتە)، دەیانویست حەڵاڵ و حەرام بەپێی ئارەزوەکانیان و دابونەریتەکانیان بێ نەك بەپێی فەرمانی خوا.

جا لێرەدا حوکمێکی گردەبڕی خودایان دەربارە دابەزی:

﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا: بەڵام نەخێر، سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەمانە نابنە خاوەنی بڕوا مەگەر کاتێك کە لە کێشە و هەرای نێوان خۆیانا حوکم بێننە لای تۆ و لە دڵەوەبە هەر فەرمانێ تۆ بیدەی پێی رازی بن و بە تەواوی ملکەچی بن.﴾النساء/٦٥.

﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ، وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ: ئەشڵێن: ئێمە باوەڕمان بە خوا و پێغەمبەر هێناوەو بەرفەرمانین. لەدوای ئەمەش برێکیان رو وەردەگێڕن، ئەوانە هەر بڕوادار نین.. هەرکاتێکیش بەرەو خودا و پێغەمبەرەکەی بانگیان دەکەن، کە حوکمیان لە نێواندا بکا، کەچی دەستەیەکیان پشتی تێدەکەن﴾النور/٤٧-٥٢.

بەمە دەرکەوت کە سەنگی مەحەکی بڕوا-پاش تەواوبونی ئاین- بۆتە حوکم بردنە بەر شەریعەتی خودا لەپاش دروستی باوەڕ و بەجێهێنانی پەرستنەکان. دروستی باوەڕیش ئێستا بەتەنێ بەس نیە و، دروستی باوەڕ و بەجێهێنانی پەرستنەکانیش بەس نین، چونکە (لا إله إلاّ الله) داخوازی زیاتری بۆ پەیدابوینە لەپاڵ ئەو داخوازیانەی کە لە مەککەدا هەیبون، بڕواش بە (لا إله إلاّ الله) کە پابەندبون بە هەمو داخوازیەکانی دەخوازێ (لەگەڵ رودانی گوناهێك بنەمای پابەندبونەکە هەڵناوەشێنێتەوە). کاتێك لە سەرەتای بانگەوازدا لە شاری مەککە داخوازی (لا إله إلاّ الله) بەتەواوی بریتی بو لە بڕوابون بە وەحدانیەتی خودای پاك و بەرز-و بڕوابون بەوەی کە پێغەمبەری خۆیﷺ ناردوە تا بانگەوازەکەی رابگەیەنێ، بڕواهێنان بەمانە هەمو داواکراوەکە بو لە هەرمرۆڤێکی بهاتبا نێو دینی خوا.

کاتێك هەندێك پەرستنیش فەرزکران داخوازی داواکراو بوە بڕوابون بە وەحدانیەتی خوا و ناردنی پێغەمبەرەکەیﷺ و ئەنجامدانی ئەو پەرستنانە، کاتێکیش لە مەدینەدا پەرستنەکان تەواوبون و ئەحکام دابەزی داخوازی داواکراو بوە بڕوابون بە خودا و پێغەمبەرەکەی و (لەگەڵ هەر وردەکاریەك کە سروش لەم

بڕێیەوە دیاریکربو) و ئەنجامدانی پەرستنە فەرزکراوەکان و، پابەندبون بە شەرعی خودا. هیچ یەکێکیش لەمانە جێگەی ئەویدیکەی نەدەگرتەوە و لەباتی ئەوی نەددبو.

بەڵام دوڕوەکان مشتومڕیان لەسەر دۆزی یەکتاپەرستی نەدەکرد و، لەبارەی مەسەلەی پەرستنەکانیش مشتومڕیان نەدەکرد (ئەگەرچی بە سارد و سڕی و تەمبەڵیش ئەنجامیان دەدا)، بەڵکو ساختەکاریان لەو ئەحکامانە دەکرد و رویان لیّ وەردەگێڕا کە هەڵسوکەوتی بڕوادارانی لە ژیانی دنیادا رێکدەخست، جا بەلای حوکمی تاغوت دا لاردەبونەوە (تاغوتیش بریتیە لە هەر حوکمێك جگە لە حوکمی خودا هەروەك باسمانکرد)، بۆیە ئایەتە قورئانیەکان لە مەدینە جەختیان[1] -هەر بەبۆنەی باسکردنی دوڕوان- لەسەر دۆزی حوکم بە شەرعی خوا دەکرد، چونکە ئەمە ئەو دۆزە بو کە لەو رۆژاندا[2] وروژابو.[3] جا فەرمودەی گردەبڕی خوا دابەزی:

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکا کە خودا دایبەزاندوە، ئەوانە کافر و بێبڕوان.﴾المائدة/٤٤.

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکا کە خودا دایبەزاندوە، ئەوانە ستەمکار و زۆردارن.﴾المائدة/٤٥.

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکا کە خودا دایبەزاندوە، ئەوانە لاڕێ و لەدین دەرچون.﴾المائدة/٤٧.

---

١ جەخت: تأکید: ترکیز.

٢ هەروەك لە رۆژانی ئەمڕۆشدا وروژاوە.

٣ وروژان: إثارة.

﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنْ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ: ئایا ئەوان حوکمی جاهیلیەتیان دەوێ! دەوجا لەلای ئەو کەسانەی وا لە بڕوای خۆیانا هیچ شك و گومانێکیان نیە، کامە حوکم لە حوکمی خوا چاترە.﴾المائدة/٥٠.

* * *

لە هەمو شتێکیش سەیرتر ئەوەیە گەر یەکێك پێت بڵێ: خودا بۆیە ئەم حوکمەی لەبارە دابەزاندون چونکە ئەوان دوڕو بون! بۆیە لەبارەی ئەوان فەرموی: بڕوا ناهێنن تا حوکم دەبەنە بەر شەریعەتی خوا!! بەڵام ئەگەر بڕوادار بونایە خودا ئەم مەرجەی لەسەر دانەدەنان!!!

سەیرە! ئەدی بڕواداران چۆن بونە بڕوادار؟!

دوڕوەکانیش بۆچی بونە دوڕو؟!

ئایا بڕواداران هەر بەوە نەبونە بڕوادار کە حوکمیان بردە بەر شەریعەتی خوا لەگەڵ دروستی باوەڕ و بەجێهێنانی پەرستنەکان؟!

ئایا دەیانتوانی بێجگە لەمە بە شتی دی ببنە بڕوادار؟!

﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ: بەڵام ئەوی باوەڕدارن، هەرکاتێ بانگ دەکرێن کە بێن بەرەو خودا و پێغەمبەرەکەی، تا حوکمیان لە نێواندا بکا، یەکسەر دەڵێن: بیستمان و بەرفەرمانین، ئەوانە دیارە رزگارن.﴾النور/٥١.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلاَ مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ : ئەگەر خوا و پێغەمبەروکەی فەرمانیان بە هەرکارێك دا، هیچ پیاوێك و هیچ ژنێکی خاوەن باوەڕ ناتوانن پەسندی نەکەن.﴾الأحزاب/٣٦.

بڕوادار بونه بڕوادار چونکه پابەندی ئەوە بون-هەر لەو کاتەوە کە گوتیان لا إلـە الاّ الله محمد رسول الله-دان بەوەدا بنێن کە لەلای خوداوە هات و بۆی ملکەچ بـــن، جا کاتێك بانگی کردن تا حوکم ببەنـــە بـەر شـەریعەتەکەی، گوتیـان: بیســتمان و گوێڕایەڵین، جا سیفەتی ئیمانداری و بڕوایـــان بـە بـەردەوامی بـۆ مایـەوە چونکـە بەردەوامبون لە کارکردن بە داخوازی (لا إله إلاّ الله). واجبێتی حوکـم بردنـە بـەر شەرعی خوداش تەنیا بەسەر دوڕوەکان فەرزنەکرابو لەبەر ئەوەی کە دوڕون!! بەڵکو لەسەر هەمو کەسێك فەرز بو کە دەیگوت (لا إلــه إلاّ الله محمـد رسـول الله) ، جـا ئەگەر پێی پابەند بو لەگەڵ رازیبون و تەسـلیم بونێکـی دەرونـی، ئـەوە بـڕوادارن، بـەڵام ئەگـەر بـە ئاشـکرا ملکـەچی نوانـد و لـە نـاخی دەرونیشـی رازی نـەبو و خۆینەدابوە دەست، ئەوا لەو کەسانەیە کە خــودا دەربارەیـان فەرمویـە کـە دوڕون (لەگەڵ ئەمەشدا ئەوان بە ئاشکرا سەرکێشیان[1] لێنەدەکرد چونکـە ئەگـەر وابوایـە ئەوکات دەبونە هەڵگەڕاوە نەك دوڕو، سزاکەشیان لە کۆمەڵگەی موسڵماندا دەبـوە کوشتن). پوختەی مەسەلەکەش ئەوەیە کە دۆزی یاسادانان راستەوخۆ بە (لا إله إلاّ الله) پەیوەستە و، ئەم پەیوەندیەش بەهیچ شێوە و بارێك لێك جودا نابێتەوە.

زانایان لەبارەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَـــا أَنــزَلَ اللَّـــهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ دەڵێن: ئەو کەسە کافر نابێ مەگەر حەرامێك بـــە حـەڵاڵ بزانێ. ئەگەر حەرامی بە حەڵاڵ نەزانی ئەوا کوفـری بچوکـە و.. کوفرێکـە مـرۆڤ لەدین دەرناکا.

---

١ سەرکێشی: امتناع.

جا ئەو قازیەی بە غەیری شەرعی خودا حوکم دەکا لــە کێشــەیەکی بەردەســتی چونکە بەرتیلی لەلایەنێك وەرگرتوە، بەم کارەی کافر نابێ هەرچەند تــاوانێکی وای دەکەوێتە ئەستۆ دوچاری رق و تورەیی خوای بکا.

نەو راڤەکارەی ئیجتهادێکی کردوەو هەڵەی کردوە و حوکمی بە غەیری شەرعی خوا لەبارەی کێشەکەی بەردەستی دەرکردوە، ئەوە گوناهبار نیە، بــەڵکو پاداشــتی ئیجتهادەکەشی هەیە مادام بە نیازێکی پاك کارەکەی کردبێ.

تا دوایی ئەو حاڵەتانەی کە فەقیهەکان ژماردویانە و ریزیان کردون..

بەڵێ.. بەڵام ئەمە هەموی سەرناکێشێ بۆ یاســادانان بــە غــەیری ئــەوەی خــوا دایبەزاندوە، چونکە حوکمێکە لە کێشەیەکی بەردەست بە غەیری شەرعی خوا، بــە پاڵپشتی یەکێك لەو هۆکارانەی لە کتێبەکانی فیقهدا هاتون، بەبێ بەحەڵاڵ زانینی ئەو حوکمە، ئەمە شتێکە و، یاســادانانیش بــە غــەیری ئــەوەی خــوا دایبــەزاندوە شتێکی تەواو جودایە. چونکە لە حاڵەتی یەکەم دانپێداهێنانی بەوەی کــە شــەرعی خوا بریتیە لەو سەرچاوەیەی لە حوکمدا بۆی دەگەڕێتــەوە، هەڵناوەشــێتەوەو بــەتاڵ نابێ، هەرچەند لە جێبەجێکردنیش پێچەوانــە بــێ. بــەڵام لــە حاڵــەتی دوەم ئــەوە لەلایەن خۆیەوە-بەبێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی لەلایەن خواوە پێدرابێ- شەرعێکی جیا لە شەرعی خودا دادەنێ، پاشان-بەکردەوە یان بە زمان- دەڵــێ شــەرعی خــوا جێبەجێ مەکەن، بەڵکو ئــەم یاســایە جێبــەجێ بکــەن کــە مــن دامنــاوە چونکــە هاوشێوەیە بۆ شەرعی خودا، یان چونکە لە شەرعی خودا چاکترە، یان چونکــە لــە شەرعی خوا گونجاوترە!

ئەمەشیان مەسەلەیەکە بە درێژایی هەموو مێژوی ئیسلام فەقیهەکان لەســەری یەکدەنگن کە کوفرێکە خاوەنەکەی لەدین دەباتە دەرێ.

مەسەلەیەکی دیکەش هەیە بەدرێژایی هەمو مێژوی ئیسلام فەقیهەکان جیاڕانین دەربارەی کە کوفرێکە خاوەنەکەی لەدین دەباتە دەر، ئەویش بریتیە لەوەی کە بە زانین و ویستەوە رازی بی بە شەرعێکی غەیری شەرعی خوا. دیارە زۆرلێکردن ناچێتە بەر ئەمە چونکە زۆرلێکردن رازیبونی تێدا وەدینایێ، بۆیەشە خودای بەرز فەرمویەتی:

﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ: هەرکەس بڕوای بەخوا بوبێ و لەپاشان کوفر بکا، (سزادەدرێ) مەگین کەسێ زۆری لێبکرێ و ناچارکرێ و لەباوەڕی دڵنیابێ. بەڵام کەسێ بە کوفرەکەی دڵێ خۆش بێ، بەر تورەیی خوا کەوتون و ئازاری زۆر دژوار دەدرێن.﴾النحل/١٠٦.

چونکە یاسادانان بە غەیری ئەوەی خوا دایبەزاندوەو، رازیبون بە یاسایەکی جودا لە شەرعی خوا، هەردوکیان-لە حوکمی خوادا- هەڵوەشێنەوەن بۆ (لا إلـه إلاّ الله)، هەر بۆیە حوکمێکی گردەبڕی دەربارەی دابەزی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکا کە خودا دایبەزاندوە، ئەوانە کافر و بێبڕوان.﴾المائدة/٤٤.

ئیبنی کەثیری پێشەوا لە تەفسیرەکەیدا لەبارەی ئایەتی ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ دەڵێ:

(خودا رەخنە لەو کەسە دەگرێ کە لە حوکمی خوا دەردەچێ کە هەمو چاکە و خێرێکی لەخۆگرتوە و، بەرهەڵستی لە هەمو خراپە و شەڕێك کردوە و، رو دەکاتە کۆمەڵە بۆچون و زاراوەگەلێکی دیکە کە پیاوانێك بەبێ هیچ پاڵپشتێك لە شەریعەتی خواوە دایانناوە، هەروەك ئەهلی جاهیلیەتیش بەو گومڕایی و نەفامیانە

حوكميان دەكرد كە بە ئارەزو و بۆچونی خۆیان دایاننابون، هەروەها وەكو تەتەر چۆن حوكمیان بەو سیاسەتە شاهانەی خۆیان دەكرد كە لە جەنگیزخانی پادشایانەوە وەرگیرابو كە (یاسق)ی بۆ دانابون، كە بریتی بو لە كتێبێك كۆمەڵە حوكمێكی تێدا كۆكرابۆوە كە لە شەریعەتی جۆراوجۆری جولەكە و دیانان و لە ئاینی ئیسلام و هیدیكەش وەرگیرابو، گەلێك حوكمیشی تێدابو كە هەر تەنیا بە بۆچون و ئارەزوی خۆی بڕیاریدابون، ئەمەش لەنێو كوڕ و نەوەكانیدا بوە یاسا و شەرعێك و شوێنی كەوتبون و دەیانخستە پێش حوكم كردن بە بە كتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەكەیﷺ جا هەر كەسێكی لەوان ئاوای كردبێ بێبڕوایە و دەبێ شەڕی لەدژ بكرێ تا بۆ حوكمی خوا و پێغەمبەرەكەی دەگەڕێتەوەو، لە كەم و لە زۆر بە غەیری وی حوكم ناكا).[١]

* * *

ئەم پەیوەندیە پتەوە لەنێوان (لا إلـه إلاّ الله) و حوكمڕانی شەریعەتی خوا، بەدرێژایی سێزدە سەدەی یەك لەدوای یەك ببوە بەڵگەنەویست لە هەستی موسڵماناندا، ئیسلامیان بەبێ ئەوە نەدەهاتە بەرچاو و، (موسڵمان)یشیان نەدەهاتە بەرچاو كە بەبێ ئەوە موسڵمان بێ، ئەو حوكمی شەریعەتەش كە بەڕاستی لەسەر زەوی بەرپابو قورسایی ئەمری واقیعی بە دۆزەكە دەبەخشی، جا خەڵك بیریان لە شتێكی دیكە نەدەكردەوە و، بیریان بۆ ئەوەش نەدەچو كە شتێكی دیكە دەكرێ بێتە ئارا!!

جیاوازیش-لە هەستی موسڵمان- لەنێوان ئیسلام و كوفر و، لەنێوان موسڵمانان و كافران دو مەسەلەی سەرەكی بون، كە بریتی بون لە نوێژ و شەریعەتی خوا،

---

١ بڕوانە تفسیر ابن كثیر ج٢ ص٦٨.

سەرەڕای زۆر مەسەلەی دیکە، جا موسڵمانان نوێژیان دەکرد و، حوکمیان دەبردە بەر شەریعەتی خوا و، کافرانیش نوێژیان نەدەکرد و، حوکمیان نەدەبردە بەر شەریعەتی خوا، بەڵام مەسەلەکە لە هەستی موسڵمانان پاش داگیرکردنی وڵاتیان لەلایەن خاچپەرستان و، لادانی شەریعەتی خوا لە حوکم و پاشان زاڵکردنی هەمو ئەو فاکتەرانەی کە موسڵمانان لە ئیسلام دەهێننە دەر، زۆر گۆڕانکاری بەسەردا هات.

هەرچی نەوەی یەکەم بو ئەوا حەقیقەتی (شەرعی)ی بە ئاشکرایی دەبینی..

جا وەلانانی شەریعەت-هەروەکو مەبدەء- کوفرە و، ئەوانەی ئەو کارەش ئەنجام دەدەن-لە واقیعدا- بێبڕوا خاچپەرستەکان بون کە خاکی ئیسلامیان داگیرکردبو.

بەڵام مەسەلەکە لای نەوەکانی دواتر زۆر تێکەڵ و پێکەڵ بو.

لە شوێنێکی دیکەش باسی کرداری بە ڕۆژئاوایی‌کردن(تەغریب)م کردوە، لەگەڵ باسی هێرشی فیکری و، باسی بەرنامەکانی خوێندن و، باسی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و، باسی ئەو گەندەڵیەی لە نێو جیهانی هزر و ئەدەب و، جیهانی سیاسەت و، دۆزی ژنان و، بواری ئاکار هاتنە ئارا.. تاوەکو موسڵمانان لە ئیسلام بهێننە دەرێ.[1]

پاشان کۆمەڵە حوکمڕانێك هاتن کە ناوەکانیان ئیسلامی بو، کەچی بە غەیری شەرعی خوا حوکمیان دەکرد و، وەك جێگیری داگیرکەری خاچپەرست هەمو ئامانجەکانیان بۆ جێبەجێ دەکرد و، بە خەڵکیان دەگوت کە ئەوان موسڵمانن و، (زەرورەت) وا دەخوازێ حوکم بە غەیری ئەوە بکەن کە خوا دایبەزاندوە.[2]

---

١ بڕوانە بەشی (آثار الأنحراف) لە کتێبی (واقعنا المعاصر).

٢ لە کتێبی (واقعنا المعاصر) بڕوانە فتوای شێخ ڕەشید ڕەزا و وەلامی ئێمە بۆی.

پاشان دورکەوتنەوەی خەڵکی لە ئیسلام زیاتر دەبێ و-بەکاریگەری هەمو ئەو هۆکارانەی بەسەریاندا زاڵکرابو- بەئاشکرا پێیان دەگوترێ ئەو بەرزبونەوە و ژیار و پێشکەوتن و ئازادبون و ڕەهابونە، وەلادانی شەریعەتی خوا لە حوکم دەخوازێ، لەگەڵ هاوردنی[1] رێبیر و دەستور و یاسا لە ئەوروپای پێشکەوتو-یەکەمجار لە رۆژئاواکەی و پاشان لە رۆژهەڵاتەکەی- و ئەو شەریعەتەی بەر لە چواردە سەدەش دابەزیوە ناکرێ-و دروست نیە- حوکمی ژیانی خەڵکی ئەمڕۆ بکات و، (گەشەسەندن)یش هەردەبێ رێچکەی خۆی بگرێ و ئاینیش بریتیە لەو (کۆتانەی) کە رێی گەشەسەندن لە خەڵکی دەگرن و، چارەنوسیشمان-بمانەوێ یا نەمانەوێ- هەر چارەنوسی ئەوروپایە، کە هەتا دینی فڕێنەدا وەپێش نەکەوت و، (کۆنەپەرستی)ش ناکرێ-بەپێی یاساکانی گەشەسەندن- لەشوێنی خۆیدا جێگیر بێ، چ جای ئەوەی رەورەوەی گەشەسەندن رابگرێ و نەهێڵێ ڕەهابێ!

لە میانەی ئەم هەموەشدا بەخەڵکی دەگوترا کە ئەوان (موسڵمان)ن.. مادام دەڵێن (لا إله إلاّ الله)!!

* * *

ئا ئەمە واقیعی (موسڵمانی هاوچەرخ)ە!

(لا إله إلاّ الله) هەمو ناوەرۆك و هەمو داخوازیەکەی لیٚ بەتاڵکراو، بوە واژەیەك هەر دەگوترا و دەدرایە دەم با و، ئەو (ئاومالك)ەش خۆی پیٚ هەڵواسیبو کە پێغەمبەرﷺ باسی فەرموبو، جا لێمشت[2] رایدەماڵی و و نەیدەتوانی خۆی بگرێتەوە.. چونکە رەگی نەبو! رەگەکانی ئەم ئوممەتە کە لەسەر زەوی باڵادەستی دەکا بریتیە لە (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله)، جا ئەگەر ئەم رەگانە لە ناوەڕۆکی

---

١ هاوردن: استيراد رێبیر: مبدأ

٢ لێمشت: السيل

ڕاستەقینەیان بەتاڵکران و، بونە توێکڵێکی پوکی بەتاڵ لە ناوەڕۆکی زیندو، ئایا دەکرێ دەست بە شتێك بگرن و، ئایا دەکرێ خۆیان لەبەر ئەو گێژەنە گەورەیە ڕابگرن کە لافاوەکە دروست دەکات؟ ئایا ئەمانە هەمان ئەو ڕەگانە نین کە پێشتر ((چاکترین ئوممەت))یان لێ ڕوابو کە بۆ خەڵکی دەرکەوتبێ؟!

بەدرێژایی مێژوی دورودرێژی ئیسلام گەلێك فاکتەر کاریان لە بەتاڵکردنی (لا إله إلاّ الله) کردوە لە ناواخنە ڕاستەقینەکەی.. جا خۆدزینەوە لە ئەرکەکان و، ناتەواوی یاداوەریەکان و، ڕابواردن و خۆشگوزەرانی وێرانکەر و، سلبیەتی صۆفیزم و، کەڵەگایی[1] سیاسی و، هزری ئیرجائی، هەریەك لەوانە لەم ماوە دورودرێژەدا بۆ بەتاڵکردنی (لا إله إلاّ الله) لە ناوەڕۆکە زیندوەکەی کاری خۆی کرد.[2]

خۆدزینەوە لە ئەرکەکان سروشتێکە لە مرۆڤدا، گرانایی زەوی و، گرانایی ئارەزوەکان قورسی دەکەن، چارەسەریەکەش هەر بیرهێنانەوە و یاداوەریە:

﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ: تۆ هەر وەبیریان بخەوە، یاداوەری بەهرە دەدا بەوانەی خاوەن باوەڕن.﴾الذاريات/٥٥.

جا کاتێك یاداوەری تەواو نەبێ -لەروی پلە یا جۆر- ئەوا خۆدزینەوە لە ئەرکەکان بەردەوام دەبێ.. پاشانیش زیاد دەکا.

ئەو بەفیڕۆدان و خۆشگوزەرانیەش[3] کە موسڵمانانی گرتبۆوە ئەو کاتی لەسەر زەوی باڵادەستبون، دەست و مستی لە پەتی پتەوی خودا شل کردن.. جا بە حوکمی حەزکردن لە ڕابواردنی سەرزەوی خۆیان لە ئەرکەکان دەدزیەوە، بۆیە

---

١ کەڵەگایی: استبداد.

٢ فراوانتر باسی ئەم فاکتەرانەمان لە بەشی (خط الأنحراف)ی کتێبی (واقعنا المعاصر)دا کردوە.

٣ بەفیڕۆدان و خۆشگوزەرانی: الترف.

بیدعه و گوناح زۆر بون و، هەمو ئەو شتانەش دەرچون بـون لـە داخوازیـەکانی (لا إله إلاّ الله).

هزری صۆفیگەریش هات وەکـو کاردانـەوەی بـەفیڕۆدان و خۆشـگوزەرانی، جـا پاکیخوازان خۆیان لەو پیسیە دابڕی کە لە کۆمەڵگـەی خۆشـگوزەراندا بڵاوبـۆوە، بەڵام ئەوانیش-لەلایەکی دیکەوە- خۆیان دابـڕی و وازیـان لـە فـەرمان بەچاکـە و بەرهەڵستی کردنی خراپــە هێنـا، بەمشـێوەیە لایـەنێکی گرنگیـان لـە ناوەڕۆکـە زیندوەکەی (لا إله إلاّ الله) بەتاڵکرد..

کەڵەگایی سیاسیش لە هەمانلاوە پشکدار بو لە بەتاڵکردنی نـاوەڕۆکی (لا إلـە إلاّ الله)، کـاتێك فـەرمان بـە چاکـە و بەرهەڵسـتی لـە خراپـە کەڵــەگا خــاوەن دەسەڵاتەکانی توڕە دەکرد و، ئەو (بەرهەڵستکاران)ەیان لەنێو دەبرد کە ڕێیــان لــە سنوربەزێنی و لاڕێبونەکانیان دەگرت، بەمشێوەیە خـەڵك بـۆ نـاو خـودی دەرونـی خۆیان مۆڵیان دەخوارد و (ئـاین) دەبـوە مومارەسـەیەکی تاکەکەسـی، کـە تـەنیا جەختی لەسـەر لایـەنی پەرسـتن دەکـرد و، لەشـێوە کۆمەڵیەکـەی دادەبـڕا، واتـە لەلایەنە سیاسیەکەی بە سیفەتێکی تایبەت. نێوانی (دین) و (سیاسەت)یـش لێـك دابڕدەکرێ و سیاسەت وایلێدێ کە هیچ پەیوەندیەکی بە (لا إله إلاّ الله)وە نەبێ!

پاشان هزری ئیرجائی دێ و ئەم هەمو پەنگخواردنە دادەپۆشی و.. بــە خـەڵکی دەڵێ: بڕوا بریتیە لە بەڕاستدانان و دانپێداهێنان!

❊ ❊ ❊

کاتێك هێرشی خاچپەرسـتان هـات (لا إلـە إلاّ الله) لـە دەرونـی موسـڵمانانـدا گەیشتبوە رادەی هــەرە نزمـی کــە موسـڵمانانی لـە نێـو چوارچێـوەی ئیسـلامدا دەهێشتەوە، لەگەڵ ئەوەی کـــە توشـی گونـاح و تاوانـان دەبـون، واتـە تـەنیا لـە

چوارچێوەی نوێژ و حوکمڕانکردنی شەریعەنی خوا.. گچکەبونەوەشی بەو رادەیە لە دەرونی موسڵماناندا بوە هۆی هێنانی خاچپەرستان و مایەی باڵادەست بونیان لە خاکی ئیسلام، چونکە ئەوان نەیاندەتوانی لەخۆڕا بێن و، نەیاندەکرا لە سەرزەوی باڵادەست بن، ئەگەر موسڵمانان داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله)یان لەبیر با و، لە جیهانی واقیعدا کاریان بەو داخوازیانە بکردبا، چونکە لەنێوان ئەو داخوازیانە-کە زۆرن- خۆ ساز و ئامادەکردن بۆ دوژمنانی خوا و، ماڵ بەخشینی لەم پێناوەدا تێدایە:

﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ: تا بۆتان دەکرێ چەك و جبەخانەی شەڕ و ئەسپی سواری پەیدا بکەن، دوژمنی پێ بترسێنن، کە دوژمنانی خوداشن، غەیری وانیش دوژمنتان هەن نایان ناسن، بەڵام خودا دەیان ناسێ، هەر ماڵێکی لەراهی خودای بەخت کەن، خودا پێتانی دەداتەوە و هیچ ناهەقیتان لێ ناکرێ. ﴾الأنفال/٦٠.

هەروەها لە داخوازیە زۆرەکانی زانست خوازیشی تێدابو کە دەبێتە مایەی باڵادەستبون لەسەر زەوی.. بێ زانستیش باڵادەستی وەدەست نایێ:

((طَلَبُ العِلمِ فَرِيضَةٌ: زانستخوازی فەرزە.)).[1]

هەروەك هەڵگرتنی ئاکارەکانی (لا إله إلاّ الله) یەکێك بو لە داخوازیەکان، وەکو راستگۆیی و دەسپاکی و دڵسۆزی و کارزانی و رێزگرتن لە مافی کەسانی دی و هاوکاری بۆ چاکە و پارێزگاری و هاریکارنەبون لە خراپە و دوژمنکاری.. تاد..

---

١ أخرجه ابن ماجه.

تاد.. كه ئەمەش له گەورەترین ئامرازەكانی بالادەستبونه لەسـەر زەوی، هـەروەك له دەستدانیشی له گەورەترین فاكتەرەكانی لەناوچونه..

﴿وَلاَ تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ : نەچن كێشەتان لیٚ پەیدا بیٚ و سست ببنەوه و هەمو هێزتان لەبەین بچیٚ.﴾الأنفال/٤٦.

﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُوا: هەموتان دەست له ڕشتەی پـەیمانی خوا وەربێنن و بلاو مەبن﴾آل عمران/١٠٣.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَسْخَرْ قَومٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْـهُمْ وَلاَ نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ وَلاَ تَلْمِـزُوا أَنفُسَـكُمْ وَلاَ تَنَـابَزُوا بِالأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّـالِمُونَ، يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنْ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلاَ تَجَسَّسُـوا وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُـوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ: ئەی گـەلی خـاوەن بـاوەڕان! بـا هێندێكتـان گالتـه بـه هێندێكتان نەكەن، لەوانەیه ئەوانەی گالتەیان پیٚدەكەن، لـه گالتـەكارەكان باشـتر بن، ژنیش هەروا، لەوانەیه ئەوانەی دەبنـه گالتـەجاڕ، لـەوی گالتـەیان پێدەكـەن، پەسندتر بن. له سـیلەی چـاو داگرتـن و تەشـەر دەیـەكترگرتن و ناوونـاتۆره لێـك هـەلنان، دەس هـەلگرن، چونكـه لـەپاش بڕواهێنـان، لـەریٚ لادان، بەدنێویـه و ناپەسەنده. كێش پەژیوان نەبێتەوه، لـه ریـزی ناهەقەكانـه.. ئـەی گـەلی خـاوەن باوەڕان! له زۆرێك له گومانـان خـۆ بپـارێزن، چونكـه هێندێـك گومـانی وا هـەن گوناهن. له كاروباری یەكتریش مەكۆلنەوه. پاشمله خراپـەی یـەكتر مـەلێن. ئـاخۆ كەستان حەزی لێیـه كـه گۆشـتی بـرای خـۆی بـه مردویـی بخـوا؟ دیـاره قێزتـان

لیٚدێتەوە. دەبێ لە خودا بترسن. خوا پەژیوانی قبوڵە و دلۆڤانە.﴾الحجرات/١١-١٢.

هەروەها لە داخوازیەکانی و.. داخوازیەکانی..

جا بەتاڵبونی لەو داخوازیانە بو موسڵمانانی توشی (دواکەوتنی عەقیدی) کرد کە دواکەوتنی زانستی و ژیاری و ماددی و ئابوری و جەنگی و سیاسی لیٚ هاتەدی.. ئەمەش خاچپەرستانی وروژاند تا بێن و، ئنجا بوە مایەی بالادەستبونیان لەسەر خاکی ئیسلام.[1]

* * *

بەڵام ئەو رادە هەرە نزمەی مە کوسڵمانانی لەناو چوارچێوەی ئیسلامدا دەهێشتەوە-لەگەڵ ئەو هەمو گوناح و تاوانەی ئەنجامیاندەدا- خاچپەرستی دلڕەشی پێ رازی نەبو کە جولەکەی شەڕانگێزیشی لە دوتوێی خۆیدا گرتبو، دڵیشیان لە ئاست چارەنوسی پلانەکانیان بەرامبەر بە ئیسلام دانەدەکەوت.

﴿وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا: ئەوان دەستتان لیٚ بەرنادەن، هەر دەگەڵ ئێوە بەشەڕ دێن هەتا-ئەگەر بۆیان بلویٚ- ئێوە لە دینەکەی خۆتان وەربگێڕن.﴾البقرة/٢١٧.

﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِنْ عِنْدِ أَنفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ الْحَقُّ: زۆرکەس لە خاوەن کتێبان-چونکە ئیرەییتان پیٚدەبەن- حەزێ دەکەن لەپاش باوەڕی هێنانتان-کە لەلاشیان ئاشکرایە راست کامەیە- پەژیوانتان بکەنەوە.﴾البقرة/١٠٩.

---

١ سەیری بەشی (آثار الأنحراف) بکە لە کتێبی (واقعنا المعاصر).

بەڵێ.. کە موسڵمانان لـە نـاو چوارچێـوەی ئیسـلامدا بـن، گـەرچی بـەو رادە کەمەشـی بـێ، لەگـەڵ هـەمو ئـەو دورکەوتنەوەیـــە لـــە حەقیقـــەتی مـــەزن و سەرتاپاگیری، ئەوە دابین ناکا کە جارێکی دیکە نەگەڕێنـــەوە بـۆ ئـەو حەقیقەتـە، ئەگەر خوای مەزن یەکێکی بۆ ئەم ئومەتە هەنارد کە ئاینەکەی بۆ نـوێ بکاتـەوە، هەروەك درەختی سیس تازە دەبێتـــەوە کـە چـاودێری دەکـرێ و ئـاودەدرێ، مـادام ڕەگەکانی هێشتا لە ژیاندابن.

﴿أَلَمْ تَرَى كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُـــــهَا ثَـــابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ، تؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا: نەتدەدی خودا چۆن مەسـەل دێنێتەوە؟ قسەیەکی بەرێ و جێ، بە شەنگەدارێك دەشبهێ، ڕەگی قایم داکوتاوە و لقی لە تەشقی ئاسمانە، بـە ئـیزنی پەروەردگارەکـەی خـۆی چـوار فەسـڵە میـوەی دەبێ.﴾ابراهیم/٢٤-٢٥.

گلادیستۆنی سەرۆك وەزیرانی بـــەریتانیا لـەوکاتی ئینگلـیز چونـە نـاو میسـر ئاماژەی بە قورئان کرد و گوتی: (تاکو ئەم کتێبە لەدەســت میسـریەکان دا بمێنـێ ئێمە ناتوانین لەم وڵاتەدا ئۆقرە بگرین).

هەروەها تۆماس بین-ڕۆژهەڵاتناسی ئەمریکی- لەپێشـــەکی کتێبـی (شمشـێری پیرۆز)دا، پاش ئەوەی مێژو و سەرکەوتنەکانی موسڵمانانی لە ئاسـیا و ئـەفریقیا و ئـەوروپا پوختکردۆتـەوە، دەڵـێ: (ئێسـتا بارەکـە گـۆڕاوە و موســـڵمانان لـــەنێو چنگمانن، بەڵام ئەوەی جارێك رویدا دەکرێ جـارێکی دیکـەش روبداتـەوە و، ئـەو مەشـخەڵەی کـە موحەممـەدﷺ لـە دڵـی شـوێنکەوتەکانی خـۆی هەڵیگیرســاند، مەشخەڵێکە ناکوژێتەوە..)

هەربۆیە خاچپەرستەکان (جولەکەش لەتوێی ئەواندا) کاریان بۆ ئەوە کردوە موسڵمانان بە یەکجاری لە ئیسلام دەربکەن تاکو دڵنیا و ئارامبن و، بحەسێنەوە، ئەگەرچی بەپێی پلانە ناسراوەکەی خۆیان: (لەسەرەخۆ بەڵام کاریگەر Slow bat sure) دەڕۆیشتن، هەروەك (کرۆمەر)ی یەکەم (باوەڕپێکراوی بەریتانیایی) لەمیسر دەڵێ:

(ئەرکی پیاوی سپی کە چاوەدێری خودایی(!) لەسەر ئەم ولاتەی داناوە بریتیە لە چەسپاندنی کۆمەڵگەکانی **ژیاری مەسیحی** تا دوا رادەی رەخساو، **بەشێوەیەك کە ببێتە بنچینەی پەیوەندیەکان لەنێو خەڵکی**[1] و، ئەگەرچی ئەرکیشی ئەوەبێ-بۆ خۆ دورگرتن لە گومانان- کەوا کار بۆ بەدیانکردنی موسڵمانان نەکا و، لە پۆستە رەسمیەکەی خۆیەوە چاودێری دیاردە ساختەکانی ئاینی ئیسلامی بکا، وەك ئاهەنگە ئاینیەکان و شتی هاوشێوە)!

هەرچی ویستیان-لەبێئاگایی موسڵمانان- بۆیان چوە سەر، لەسەرەتا دەستیان بە لابردنی شەریعەتی ئیسلامی کرد لە حوکم و، بە دورخستنەوەی موسڵمانان لە نوێژکردن کۆتاییان پێهێنا، بەمەش (موسڵمانان) پاشەکشەیان لە هەمو ئەو شتانە کرد کە لە ئیسلامدا مابویان، بەپێی پلانی لەسەرەخۆ.. بەڵام کاریگەر.

هزری ئیرجائیش زۆری زەحمەت نەهاتە پێش بۆ داپۆشینی ئەو پاشەکشەکردنە.. جا ناوی لە کۆمەڵگە جاهیلیەکان نا-کە حوکمیان بە شەرعی خوا نەدەکرد- کۆمەڵگەی ئیسلامی و، سیفەتی ئیسلامیشیان بە هەمو کەسێك بەخشی کە بەزمان دەیگوت: (لا إلـه إلاّ الله)! چونکە ئیسلام تەنیا بەراستدانانە و، نیشانەدیارەکەشی تەنیا دانپێدانانە!

---

[1] واتە لە جیاتی ئیسلام.

کاتێك لە باسەکەماندا دەگەینە ئەم خاڵە، خەڵکانێك هەن وای بۆ دەچن کە ئێمە بەرەو ئەوە دەچین حوکمی کوفر بەسەر بە نەوەکانی ئێستای خەڵکدا دەربکەین، چونکە ئەوان حوکم نابەنە بەر شەریعەتی خوا، جا ئەو خەڵکە لە دەرونی خۆیاندا بەرامبەر تێکڕای دۆزەکە هەست بە (ترکزە)[1]یی دەکەن، جا هەر خێرا لە بنچینەڕا بەرهەڵستی دەکەن، نەوەك دانپێداهێنانی ئەم مەبدەئە بەرەو حوکم دەرکردنیان ببات!

لەجێگای دیکەش ئەوەمان دوپاتکردۆتەوە کە دۆزی ئێمە بریتی نیە لە حوکم دەرکردن دژی خەڵکی[2]! و ئامانجمان مەسەلەیەکی دیکەیە، کە زۆر دورتر و، زۆر ترسناکترە -بەتێڕوانینی خۆمان- لە هەوڵی حوکم دەکردرن بەسەر ئەم نەوەیەی خەڵکی!

چونکە حوکمدانمان سەبارەت بەو خەڵکەی کە ئەمڕۆ لەسەر خاکی ئیسلامیدا دەژین بە ئیسلام یان کوفر شتێك نیە کە بیانباتە بەهەشت یان دۆزەخ! خوای-پاك و بەرز- هەڵوێست لەبارەی ئەوان و لەبارەی هەمو بونەوەر وەردەگرێ:

﴿يُدْخِلُ مَنْ يَشَاءُ فِي رَحْمَتِهِ وَالظَّالِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا: هەرکێی حەزکا وەبەر بەزەیی خۆی دەخا و بۆ ئەوانەش کە ناهەقن، سزای بەژانی سازداوە.﴾الإنسان/٣١. ئێستاکەش ئێمە دەوڵەت نین تاکو حەددی هەڵگەڕانەوە

---

١ ترکزە: خطر

٢ بڕوانە (قضية الحكم على الناس) لە بەشی (الصحوة الإسلامية) لە کتێبی (واقعنا المعاصر)، کە بە درێژی باسی ئەو هۆکارانەم کردوە کە واملێدەکا لەم قۆناغە باس لەو مەسەلەیە نەکەم و هەمو توانام بۆ کرداری رونکردنەوەو فێرکردن تەرخان بکەم بێ نیزیك بونەوە لە دەرکردنی حوکم لەسەر خەڵکی.

بخەینە سەر هەڵگەڕاوەکانی ئەو خەڵکە.. بەڵکو ئێمە بانگەوازێکین، هەوڵدەدەین ئەو راسپاردەیە ئەنجامبدەین کە لەسەر ئەستۆمان دانراوە بەرامبەر بەم ئاینە و، ئەو ئەرکەی بۆی تێدەکۆشین و، بەراستی هەوڵ دەدەین تاکو بگەینە هەندێکی، ئەرکی (رونکردەوە)یە بۆ خەڵکی. جا هەوڵدەدەین لە حەقیقەتەکانی ئەم ئاینە ئەوەیان بۆ رونکەینەوە کە لێیان بزرە-لەدوەم غوربەتی ئیسلامدا-.[1]

کاتێك ئێمە بەو کۆمەڵگەیانەی ئەمڕۆ لەسەر خاکی ئیسلامیدا[2] دەژین، دەڵێین (کۆمەڵگەی جاهیلی)، ئەو کەسانەی وا گومان دەبەن کە ئێمە مەبەستمان بەمە ئەوەیە کە خەڵکەکەی موسڵمان نین، یا بنەڕەت لەنێو ئەواندا کوفرە مەگەر شتێکی دیکەیان لیٚ دەرکەوێ.. لێرەدا ئێمە بەوکەسانە دەڵێین-هەروەك لەشوێنی دیکەش گوتومانە- کە حوکمی کۆمەڵگە بۆ تاکتاکەی خەڵکی ناپەڕێتەوە بەڵکو ئەمە بە حوکم دەچێ لەبارەی دەڤەرێك داخوا خانەی کوفرە یا خانەی ئیسلام. زانایانیش کۆڕان لەسەر ئەوەی کە وەسفی وڵاتێك بە خانەی کوفر یا خانەی ئیسلام پەیوەندی بە بیروباوەڕی خەڵکانی نیشتەجێی ئەو وڵاتەوە نیە، بەڵکو پەیوەستە بە زاڵبونی حوکمەکان تیایدا، جا ئەو خاکەی شەریعەتی خوا حوکمڕانی دەکا خانەی ئیسلامە جا بیروباوەڕی نیشتەجێکانی هەرچۆن بێ، ئەو خاکەش کە شەریعەتێکی

1 پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((بَدَءَ الإسلامُ غَرِيبَاً وَسَيَعوُدُ غَرِيبَاً كَمَا بَدَأْ، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاء: ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکرد و وەك سەرەتا غەریب دەبێتەوە، جا مزگێنی بۆ غەریبان.))رواه مسلم.

2 هەمو ئەو خاکەی رۆژێك ئیسلام حوکمی کردوەو پاشان حوکمی شەریعەتی خوای لەسەر نەماوە و یاساکانی جاهیلی حوکمیان تێداکردوە دەڵێین (خاکی ئیسلامی). حوکمی زانایانیش دەربارەی ئەوەیە کە خەڵکەکەی لێیان داواکراوە کە بیگێڕنەوە بەر حوکمی ئیسلامی تا هەتایێ ئەو ئەرکەشیان لەسەر شان لاناچێ.

غـەیری شـەریعەتی خـوا حوکمـی دەکـا خانـەی کوفــرە، جــا بــا بیروبـــاوەڕی دانیشتوانەکانی هەرچۆن بێ.

میسریش خانەی ئیسلام بو کاتێك لەلایەن موسڵمانانەوە فەتح کــرا هەرچـەندە زۆربـەی دانیشــتوانی لەســەر ئــاینی ئیســلام نــەبون و، ماوەیــەکیش وا مانــەوە، هیندیش خانەی ئیسلام بو کاتێك موسڵمانان فەتحیان کرد لەگــەڵ ئـەوەی زۆربـەی خەڵکەکەی-هەتا ئێستاش- موسڵمان نین. بەڵام بۆیە بە خانەی ئیسلام دەژمــێردرا چونکە ئەحکامی شەریعەتی تێــدا فــەرمانڕەوا بــو بــە چاوپۆشـین لـە بیروبـاوەڕی خەڵکەکەی.

ئا بەم شێوەیە ئەو دەوڵەتۆکانەی کە خاچپەرستەکانیش لــە شـام دایانمـەزران- هەندێکیشیان دوسەد ساڵ بەردەوام بون-خانەی کوفر بون هەرچەندە دانیشتوانی بـە موسڵمانی مانەوە، چونکە خاچپەرستان بە غەیری شەریعەتی خوا حوکمیـــان تێـدا دەکرد.

لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەی موسڵمان ئەو کۆمەڵگەیە کە شەریعەتی خوا حوکمـــی دەکا و، تێڕوانینی ئیسلام و چەمکەکانی ئیسلام و ئاداب و شـێوازەکانی ڕەفتـاری حوکمی دەکەن، بەچاوپۆشین لە بیروباوەڕی خەڵکەکەی. کۆمەڵگەی جاهیلیش ئـــەو کۆمەڵگەیە کە شەریعەتی خوا حوکمی ناکا و، تێڕوانینەکانی ئیســـلام و چـەمك و ئـاداب و شـێوازەکانی ڕەفتـاری حوکمـی ناکـەن، بەچاوپۆشــین لــە بیروبـــاوەڕی خەڵکەکەی و، لە حوکمی خوا دەربارەیان لە قیامــەت ئایـا دەچنـە بەهەشـت یـان دەچنە دۆزەخ.

ئەو خەڵکەی ئەمڕۆش لە خاکی ئیســلامیدا دەژیــن، ئاوێتەیـەکن یـەك حوکـم کۆیان ناکاتـــەوە، هــەندێکیان تێدایــە بــەبێ گومــان موســڵمانن-بـەپێی حاڵــەتی

روکەشیان و، لەرۆژی دواییش حسابیان لەسەر خوایـە- چونکـە دەڵێـن (لا إلـه إلاّ الله) و، پەرستنەکان بەجێدەهێنن و، نکوڵی لە حوکمی جاهیلی دەکەن و، حەز لـە حوکمڕانی شەریعەتی خوا دەکەن و، ئـەوەندەی پێیـان بکـرێ لـە کاروبارەکانیـاندا حوکمی دەبەنـە بـەر، هـی واشـیان تێدایـە بـەبێگومان کـافرن-بـەپێی حاڵـەتی روکەشیان و، لەرۆژی دواییش حسابیان لەسەر خوایە- چونکە ئەوان-ئەگەر بشـڵێن (لا إله إلاّ الله)[1]- نکوڵی لەوە دەکەن کە واجبە حوکم ببردرێتە بەر شەریعەتی خـوا و، قسەیان لەو بابەتە زۆرە، هـەندێکیان دەڵێـن: ئـاین چـی لـە سیاسـەت داوە؟! هەندێکیشیان دەڵێن: چۆن شەریعەتێك کـە پێـش چـواردە سـەدە دابـەزیوە ژیـانی گەشەسەندوی ئەمڕۆی خەڵکی حوکمدەکـا؟ دەبـێ سیسـتمی گەشەسـەندو ژیـانی گەشەسەندو بەڕێوە ببا، یا لەجیاتی ئیسلام دیموکراسـی وەرگریـن یـا سۆسـیالیزم[2] وەرگرین!

هەندێکیشیان تێدایە دەڵێن: ئاین کۆنەپەرستی و دواکەوتنە و دەبێ فڕێی بدەین و خۆی لیّ داماڵین هەتاکو ببینە پێشکەوتنخواز! تێشیاندایە دەڵێ: ئاین پـەیوەندی نێوان بەندە و پەروەردگارە، جێگەی نێو دڵە و پەیوەندی بە واقیعی ژیانەوە نیە!

تۆپەڵێکی خاو و خلیچکیشی تێدایە سـیماکانی ئاشـکرا نـین و، رەش و سـپی تێدا تێکەڵ دەبێ، بەڵام رواڵەتە گشتیەکەی لە داخوازیەکانی ئیسـلام دورە و، جـا ئەم تۆپەڵە خەڵکی لەئاست حوکمکردن لەسەری جیاواز دەبن و، هەر ئەمەشـە کـە

---

١ هەندێکیان بە گوتنی (لا اله الا الله) ناوەستن، بەڵکو وا دادەنێ حەقیقـەتی ئیسـلام هـەر لـەخۆی وەدیهاتوە! ﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَمَـا أُولَئِـكَ بِالْمُؤْمِنِينَ: ئەشڵێن: ئێمە باوەڕمان بە خوا و پێغەمبەر هێناوە و بەرفەرمانین، لەدوای ئەمە برێکیان رووەردەگێڕن، ئەوانە هەر بڕوادار نین.﴾النور/٤٧.

٢ سۆسیالیزم: ئیشتراکیەت.

ئێمە دەڵێین ئامانجمان ئەوە نیە حوکمی دەربارە دەرکەین، بەڵکو ئامانجمان ئەوەیە کە بۆ هەمو خەڵکی حەقیقەتی (لا إله إلاّ الله) رونکەینەوە. چونکە ئێمە پێمان وایە ئەم رونکردنەوەیە -سەرەڕای ئەوەی راسپاردەیەکی خوایە- دەتوانێ خەڵك رازیکا تا واقیعی ژیانیان بگۆڕن، جا خودا بۆیانی دەگۆڕێ- کاتێك ئەوەی لە خۆیاندایە دەیگۆڕن و لەسەر فەرمانی خوا سەقامگیر دەبن- ئنجا لەو زەبونی و سوکی و سەرگەردانی و وێڵیەی تێیدا دەژین دەریاندێنێ کە ئەمڕۆ لە هەمو روی زەویدا تێیدا دەژین و، سەربەرزی و بالأدەستیان بۆ دەگێڕێتەوە هەروەك خودا بەڵێنی بە بەندە بڕوادارەکانی داوە:

﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا: خوا بەوانەی لەئێوە بڕوایان هەیە و ئاکار چاکن، بەڵێنی دا: لەم زەمینە دەیانکاتە جێگەنشین، هەروەکو چۆن ئەوانەی بەر لەوانی کردە جێنشین، دینەکەشیان -کە خۆی پەسەندی کردوە- هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی، تا تەنیا من بپەرستن، هیچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن.﴾النور/٥٥.

ئەمە لەبارەی خەڵکە -تاکەتاکەی خەڵکی-، بەلاّم کۆمەڵگە -وەك رونمانکردەوە- حوکمێکی دیکەی هەیە.. (کۆمەڵگە) تەنیا کۆمەڵە تاکێك نیە، بەڵکو ئەو (سیستەم)ەشە کە ئەو تاکانە دەبەستێتەوەو، لە میانەیدا مامەڵە لەگەڵ یەکتر دەکەن و، پەیوەندیەکانی خۆیانی لەسەر دادەمەزرێنن.

جا ئایا دەتوانین -بەپێی ئەم رێسایە- بڵێین: ئەم کۆمەڵگەیانەی ئەمڕۆ لە ئارادان کۆمەڵگەی ئیسلامین؟! ئایا ئەو سیستەمەی حوکمیان دەکا ئیسلامیە؟ بە

شەریعەت و بەرنامە و ئاراستەکردنەکانی؟ ئایا ئەوەی سـنور بـۆ پەیوەندیـەکانیان دادەنێ و دایاندەمەزرێنێ ئیسلامە؟ ئایـا ئـەوەی تێڕوانینـەکانیان پێکدەهێنـێ و بەرنامـەکانی فـێرکردن و بەرنامـەکانی راگـەیاندن و شـێوازەکانی رەفتاریـان وێنەدەکێشێ ئیسلامە؟

پێغەمبەرﷺ بە پیاوێکی گەورەی هاوەڵانیﷺ فەرمو: تۆ پیاوێکی جاهیلیـەتت تێدایە، تەنیا لەبەر یەك وشەی کە لـە ساتێکی تورەییـدا لـەزاری دەرچـو و، بـە پیاوێکی رەشپێستی گوت: هـەری کـوڕی ژنـە ڕەشـەکە!! جـا پێغەمبـەرﷺ پێـی فەرمو: ((عَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ؟! إنَّكَ امرُؤٌ فِيكَ الجَاهِلِيَة: بـەدایکی روشـکێنت کـرد؟! تـۆ پیاوێکی جاهیلیەتت تێدایە.))[1]

جا دەبێ پێغەمـبەرﷺ کۆمەڵگەکانی ئێمە چۆن ناو ببا؟!

ئەوانەی ئەم کۆمەڵگەیانە بە کۆمەڵگەی ئیسلامی ناودەبـەن و، هەرکەسـێکی بڵێ (لا إله إلاّ الله) پێی دەڵێن موسڵمان، جا واقیعی ژیانی هـەرچۆن بـێ و، ئـەو واقیعەش هەرچەند پێچەوانەی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) بێت، ئەمـەش لەبـەر پارێزگـاری و ئاگالـەخۆبونیان.. جـا ئەوانـە -لەگـەڵ ئـەو هـەمو خۆپارێزیـەیان- هەڵەیەکی گەورە بەرامبەر بانگەواز ئەنجام دەدەن بەبێ ئەوەی بزانن یا مەبەسـتیان بێ.

هەروەها ئەگەر ئەم کۆمەڵگەیانـە ئیسـلامی بـن و، ئەگـەر ئـەو خەڵکانـەش هەمویان موسڵمان بن، ئایا چ وا لە خەڵکی دەکا ببنە موسڵمان یا بـە موسـڵمانی بمێننەوە؟!

---

[1] متفق عليه.

ئەم واقیعەی ئەم کۆمەڵگایانەی تێدا دەژین-بە هەمو ئەو خراپانەی کە تێیدان- توندترین بەربەستی رێی ئیسلامە! جا ئەگەر سیفەتی ئیسلامان بەبالای دابڕی و، گوتمان: ئیسلام چاوپۆشی لە هەمو ئەو خراپەیە دەکا و، خەڵك هەرچی بکەن هێشتا سیفەتی خۆیان پێدەبەخشێ، مادام بە زمانیان دەڵێن (لا إله إلاّ الله)، چی رێ لە گەنجان دەگرێ-بەتایبەتی ئەو گەنج و لاوانەی وازیان لە ئەرکەکان هێناوە- رێی کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم و دیموکراسی[1] و فەوزەویەت و عەدەمیەت و عەبەسیەت و رێبیر و هزرە روخێنەرەکانی دیکەیان لێدەگرێ؟

ئەگەر لەبەر ئاگالەخۆبون و پارێزکاری، سیفەتی ئیسلام بەسەر هەمو ئەو خراپە و لارێبونانەدا ببڕێت کە ئەمڕۆ لە خاکی ئیسلامیدا بەرپایە، با لەخوابترسین لەو گەنجانەی رێگەی ئیسلامیان لێ دەگرین، کاتێك ئەو هەمو خراپەیە دەخەینە چوارچێوەی ئیسلامەوە!!

ئەگەر ئەو مەسەلانەمان بۆ رونبۆوە..

ئەگەر بۆمان رونبۆوە کە پێدانی سیفەتی جاهیلیەت بەو کۆمەڵگایانە یەکەیەکەی خەڵکی ناگرێتەوە..

ئەودی لە پشت ئەم باسەوەش مەبەستمانە ئەوە نیە حوکم لەسەر تاکتاکەی خەڵکی بدەین، بەڵکو مەبەستمان رونکردنەوەی ئەوەیە کە خەڵکی لە دوەم غوربەتی ئیسلامدا نایزانن لەو حەقیقەتی ئیمانەی کە بە (لا إله إلاّ الله)

---

١ گەلێك هەڵخەڵەتاو بیانو لەوە دەگرن کە دیموکراسی بخرێتە ریزی رێبیرە روخێنەرەکان! منیش حەقیقەتەکەیم لە کتێبی (مذاهب فکرية معاصرة) رونکردۆتەوە، کە شانۆگەریەکی جوانە و دەسەڵاتی سەرمایەداریی بەسەر کۆمەڵگەدا لەخۆگرتوە، لەگەڵ زاڵبونی جولەکان بەسەر چارەنوسی خەڵك و، ئەو گەندەڵیەی کە تێشیدایە زۆر لەو چاکە لاوەکیە زیاترە کە وەدیدێنێ!

پەیوەستە و، بانگەوازی خەڵکیش-لەپاشان- بۆ راستکردنەوەی بـار و دۆخـەکانیان بەپێی داخوازیەکانی ئەم حەقیقەتە.

ئەگەر ئەوەمان بۆ رونبۆوە-بە ئارخەیانیەوە- دەگەڕێینەوە بۆ تـەواوکردنی ئـەو باسەی لەبارەی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) پچڕا.

*　　*　　*

پێشتر باسی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله)مان کرد هـەروەکو نـەوەی یەکـەمﷺ تێگەیشتبون لـە کتێبـی خـوا و فـێرکردنی پێغەمبەرەکـەیﷺ و بـە ئاشـکرایی رونمانکردەوە-وەك من بۆی بچم- کە هەمو بیانوەکانی مورجیئان-چ ئەوانی کۆن و چ تازەکان- لەوەی کە هەمو داواکـراو لـە خـەڵکی تـا ببنـە بـڕوادار بریتیـە لـە بەڕاستدانان و دانپێدانان بەبێ هیـچ کردەوەیـەك بـەپێی داخوازیـەکانی (لا إلـە إلاّ الله)-بەتایبەتبش حوکـم بردنـە بـەر شـەریعەتی خـوا-هـەمو بیانوەکانیـان هیـچ پاڵپشتێکی نیە نە لە قورئان و نە لە سوننەتی پێغەمبەرﷺ و نە لـە واقیعـی ئـەو نەوەیەی کە بە راسترین تێگەیشتن لە حەقیقەتی ئیسلام گەیشـتبون و بەراسـترین شێوە پیادەیان کردبـو.. حوکـم بردنـە بـەر شـەریعەتی خـوداش-بـەلای کـەمی- کەمترین رادەیە کە سیفەتی ئیسلام لەسەر زەوی بۆ خـەڵکی بهێڵێتـەوە، لـە رۆژی دواییش لێپرسینەوەیان لەسەر خودایە و.. حوکم نەبردنە بەر شـەریعەتی خـوداش-بەرەزامـەندی و زانسـت و ویسـتەوە- لـە بنچینـەوە (لا إلـە إلاّ الله) هەڵدەوەشێنێتەوەو، خەڵکی لە ئیسلام دەباتە دەرێ..

ئێستاش دێینە سەر باسی ئەو واقیعەی (موسڵمانی هاوچەرخی) تێدا دەژی!

بەلای کەمی لە دو گۆشەنیگاوە باسـی دەکـەین: گۆشـەی یەکـەم دیـاریکردنی کەمترین رادەیە کە لەو واقیعە هاوچەرخەی حوکمی تێدا بە شەریعەتی خوا نـاکرێ

ئیسلامەکە بۆ خەڵکی دەپارێزێ و، گۆشەی دوەمیش بریتیە لە ڕێگەی ڕزگـاربونی خەڵکی لەو بارودۆخانەی ئەمڕۆ تێیکەوتون و-لەخراپیدا- پێشتر بە درێژایی هـەمو مێژوی ئیسلام هاوشێوەی نەبوە.

هەروەها حەقیقەتێکیش دێنینەوە بـیر کـە تکامـان وایـە لـەنێو باسـان لـەبیر نەکرابێ.

حەقیقەتەکەش ئەوەیە کە خەڵك لە میانەی بەرپابونی کۆمەڵگـەی موسـڵمان- واتە ئەو کۆمەڵگەیەی کە حوکم دەباتە بەر شەریعەتی خوا- تـەنیا بـە گوتنـی (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله) دەهاتنە ناو ئیسلام و، لە ژیانی دنیـادا بـە موسـڵمان دەژمێردران و، لێپێچانەوەی ڕۆژی دواییشیان لەسەر خوابـو، بـەڵام ئەمـە مانـای وانەبو کە تەنیا گوتنەکە-بەبێ هیـچ داخوازیـەك- ئـەو سـیفەتەی پێدەبەخشـێن، بەڵکو ئەمە گوتنێکە داخوازیەکی دیاریکراوی لەخۆ گرتوە، کە لە بەڵگە نەویسـت و شتە زانراو و دیارەکانی ئاینە و بریتیـە لـە دانپێدانـانی حاکمیـەتی شـەریعەتی پەروەردگار و، کە دەبێ ئەویش بەتەنیا-دور لە شتی دیکە- بکرێتـە حوکمـڕان و، هەر ئەویشە بە تەنیا-دور لە شتی دیکە- خـەڵك لـە هـەمو کێشـەیەکیاندا بـۆی دەگەڕێنەوە، بۆ وەدیهێنانی فەرمانی خودای بەرز کە دەفەرموێ:

﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ: لەسـەر هـەرچی پێـك نـەهاتن، حوکمەکەی بۆ لای خودایە.﴾الشوری/١٠.

﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُـمْ تُؤْمِنُـونَ بِاللَّـهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ: هەرکاتێکیش لەسەر شتێك لەنێوخۆدا پێك نەهاتن، ئەگـەر بڕواتـان بە خودا و بە ڕۆژێ قیامەتی هەیە، کێشەی خۆتان حەواڵەی خوا و پێغەمبەری خوا بکەن.﴾النساء/٥٩.

هەر کەسێکیش نکوڵی ئەم داخوازیە بکا-کە لە بەڵگەنەویستەکانی ئەم دینەیە و لە کۆمەڵگەی موسڵماندا قورسایی ئەمری واقیعی هەیە- حەددی هەڵگەڕانەوەی لەسەر پیادە دەکرێت لەگەڵ ئەوەی هێشتا بە دەمی دەڵێ (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله)، کە ئەوە دەسەلمێنێ تەنیا بە زمان گوتن-بەبێ ئەوەی داخوازی لەخۆ گرتبێ- سیفەتی ئیسلام نابەخشێ.

ئێستا بۆ واقیعی هاوچەرخ دەگەڕێینەوە، کە شەریعەتی خوا تیایدا حوکم ناکا، بەڵکو کۆمەڵە یاسایەکی جاهیلی لەجیاتی ئەو فەرمانڕەوایە، جا ناوی دیموکراسی لیبرالی بێ، یان ناوی سۆسیالیزم بێ، یا ناوی کۆمۆنیزم بێ یا هەر ناوێکی دیکە کە خودا هیچ دەسەلاتێکی پێنەداون.

چۆن کەمترین رادەی داخوازی (لا إله إلاّ الله) دێتەدی کە سیفەتی ئیسلام بە خەلکی دەدا؟!

دیارە باس لە **رواڵەتی ئیسلام** ناکەین! ئەگەرچی لەنێو قسانیشدا دێتە بەر باس..

ئەرکی بانگەوازکاران ئەوە نیە بڕوانامەی ئیسلامەتی بە ساختە بدەنە خەڵکی! یا رێیان پیشاندەن چۆن رواڵەتی ئیسلام لە ژیانی دنیادا بپارێزن ئەگەرچی لەلای پەروەردگاریشیان رەت بکرێنەوە! بەڵکو ئەرکیان ئەوەیە کە بۆ خەڵکی رونبکەنەوە چۆن بە راستی ببنە ئیماندار و، لەرۆژی دوایی لەلای خودا قبوڵ بکرێن: ﴿**يَوْمَ لاَ يَنْفَعُ مَالٌ وَلاَ بَنُونَ، إِلاَّ مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ**: ئەو رۆژە کە ماڵ و مناڵ بەکار نایە، مەگەر ئەوەی بە دڵی پاکەوە بچێتە بارەگای خودا.﴾الشعراء/٨٨-٨٩.

تەنانەت رواڵەتی ئیسلامیش لەژیانی دنیادا بێجگە لە گوتنـی (لا إلـه إلاّ الله) مەرجی دیکەشی هەنە، هەروەك رونی دەکەینەوە..[1]

کەمترین ئەو رادەیەی لەلای خودا سیفەتی ئیسـلام دەبەخشـێ، لەوکاتـەی کـە شەریعەتی خوا لەسەر زەوی بەرپا نەبێ، فەرمودەیەکی پیرۆز بەشـێوەیەکی گردەبـڕ یەکلا و رونی کردۆتەوە کە لێکدانەوە هەڵناگرێ.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: ((مَا مِنْ نَبيٍّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إلاَّ كَانَ لَـهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ، يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِه، ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِـنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ، يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ، وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ. فَمَنْ جَـاهَدَهُمْ بِيَدِه فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِـهِ فَـهُوَ مُؤْمِنٌ. وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنْ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ: هەر پێغەمبەرێکی خـودا پێـش من هـەناردبی دۆسـت و هـاوەڵی هـەبون، سـوننەتەکەیان وەرگرتـوەو کاریـان بـە فەرمانەکانی کردوە، پاشان خەڵکانێکی دیکەیان لەپاش هـاتون ئـەوەی گوتویانـە نەیانکردوە و، ئەوەیان کردوە کە فەرمانیان پێنەکراوە، جا هەرکەسـێکی بەدەسـت جیهادیان بکا ئەوە بڕواداره و، هەرکەسێکی بە زمـان جیـهادیان بکـا بـڕواداره و، هەرکەسێکی بە دڵ جیهادیان بکا بڕواداره و، لەپاش ئەمەش بار تەقای یـەك دانـە خەردەل بڕوا نیە.))[2]

---

[1] لە کتێبی (واقعنا المعاصر) بە هەمان شێوە ئەم دۆزەم توێژیوەتەوەو، لە بنەڕەتدا وابـو کـە کتێبـی (مفاهیـم) یەکەمجار چاپ بکرێ، بەڵام کە-بەقەدەری خوا- دواکەوت و کتێبـی (واقعنـا المعـاصر)ی کەوتە پێش، لەوێ پێویست بو کە هەندێك دۆز رونکەمەوە کە لە بنەڕەتدا لـە کتێبـی (مفـاهیم)دا هاتون.

[2] أخرجه مسلم.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ. فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ: میرگەلێکتان لەسەر دەکرێنە گەورە، چاکەیان لێدەبینن و خراپەشیان لێدەبینن، جا ئەوەی لە دڵڕا پێیناخۆشبو ئەوا سەلامەتە و، ئەوی نکوڵیشی لێبکا سەلامەتە، بەڵام نەك کەسێك لێی رازی بێ و شوێنکەوتە بێ.))[1]

فەرمودەی یەکەم بڕوا -بە پلە جیاوازەکانیەوە- بۆ هەرکەسێك دەسەلمێنێ کە بەرامبەر حوکمی جاهیلیەت بەدەست، یا بە زمان، یا بەدڵی جیهاد بکا، بەشێوەیەکی بڕەریش نەرێ لە بونی ئیمان دەکا لە پاش ئەمانەوە، فەرمودەی دوەمیش بڕوای هەمو ئەو کەسانەش رەتدەکاتەوە کە لە حوکمی جاهیلیەت رازیبون و شوێنیکەوتون.

هەرکەسێکیش لە کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺ رابمێنێ، چاك دەزانێ کە ئەگەر واژەی ئیمان و ئیسلام پێکەوە لە دەقێکدا هاتبون، ئەوا مەبەست لە ئیمانەکە کردەوەی دڵە و بە ئیسلامەکەش کردەوەی ئەندامەکانە، بەڵام ئەگەر بە تەنیا یەکێکیان هات ئەوا هەردوکیان دەگرێتەوە، جا بە سەلماندن بێ یا بە نەفی کردن، واتە ئەو رەتکردنەوە گردەبڕەی لە فەرمودەکەدا هەیە، ئیسلام و ئیمان پێکەوە لە یەککاتدا رەتدەکاتەوە، نەك بەو شێوەیەی کە دەڵێن ئەوە ئیمان رەتدەکاتەوە بەڵام ئیسلام رەتناکاتەوە، ، بەمەش پێچەوانەی ئیجماعی زانایانی ئەم دینە رەفتار دەکەن!

هەرچی رواڵەتی ئیسلامیشە لەژیانی دنیادا ئەوا مەرجەکەی -لەپاڵ گوتنی (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله)- بریتیە لەوەی کە بە ڕەزامەندی و بەدواداچونەوە حوکم

---

[1] أخرجه مسلم.

نەبردرێتە بەر تاغوت، چونکە ئەمە مایەی هەڵوەشـانەوەی (لا إلـه إلاّ الله)یـە و، هیچ واقیعێکی بۆ ناهێڵێتەوە کە تەنانەت لە سەلماندنی رواڵەتەکـەی ئیسلامیشـدا شایستەی باسکردن بێ.

بۆیەش ئەمە ناڵێین تاکو حوکم بەسەر یەکێك لە خەڵکیدا دەربکەین، چونکە لە تواناماندا نیە-هەروەك کاری ئێمەش نیە- کە سینگی خەڵکی هەڵدڕین تـا بزانـین ئایا ئەوانە بە خواست و ڕەزامەندیەوە شوێن حوکمـی تـاغوت دەکـەون و، دانیـان بەوەدا ناوە کە ئەم حوکمە مافی حوکم کردنی لە شـەریعەتی خـوا زیـاترە، یـاخود زۆریان لێکراوەو لەناخەوە رقیان لێیە، ئارەزو دەکەن شـەریعەتی خـوا حوکـم بکـا بەڵام ناتوانن، بێجگە لەوانەی کە بەزمانیان یان بە واقیعی ئینتمایان بـۆ هزرێکـی جاهیلی، بانگەواز بۆ حوکمڕانی شەریعەتێکی غەیری شەریعەتی خـوا دەکـەن یـان کەسێکی کە بە حاڵیەوە دیاربێ بایەخ بەم ئاینـە نـادات و، لـەلای یەکسـانن کـە شەریعەتی خوا یا شەریعەتی تاغوت حوکم بکا.

بەڵکو بۆ هەندێ ئـەم قسـانە دەکـەین تـاکو خـەڵك بزانـن لـە تـرازوی خـوادا کەوتونەتە کوێ..

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ: ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بە چەند بەڵگەی ئاشکراوەو وێڕای ئەوان، کتێـب و هۆی هەڵسەنگاندنمان ناردەخوار، هەتا خەڵك بێ جیـاوازی و بـە داگـەری لـەناو یەکا رەفتار بکەن.﴾الحدید/٢٥.

ترازوی خوا کە بنچینەکانی لە قرئاندا رونکراوەتەوە دەفەرموێ: حوکم دو جۆرن و سێیەمیان نیە، یان حوکمی خودا یان حوکمی جاهیلیەت:

﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ: ئایا ئەوان حوكمی جاهیلیەتیان دەویێ! دەوجا لەلای ئەو كەسانەی وا لە بڕوای خۆیانا هیچ شك و گومانێكیان نیە، كامە حوكم لە حوكمی خوا چاترە. ﴾المائدة/٥٠.

كەواتە چەترێكی جەماعی هەیە لە واقیعە هاوچەرەخەكەیاندا سێبەری لە خەڵك كردوە.. كە بریتیە لە حوكمكردن بە غەیری ئەوەی خوا دایبەزاندوەو، خەڵكیش هەمو لەژێر ئەو چەترە راوەستاون و بەسێبەرە مەلول و ماتەكەی دایگرتون كە لە حوكمی خوا غەزریوە،[1] بەلاّم ئەو خەلكە لە تەرازوی خوادا دو كۆمەلّی جیاوازن، هەركەسێكی بەو چەترە جاهیلیە رازیبێ ئەوە بەشێكە لە چەترەكە، هەركەسێكی نكولێشی لێكرد و بەرامبەری تێكۆشا ئەوە بەپێی پلەی تێكۆشانەكە و پلەی نكولّیكردنەكەی لەلای خودا قبولّكراوە.

ئەمە ترازوی پەروەردگارە و كەس بۆی نیە بەپێی ئارەزوی خۆی بیگۆڕێ.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلاَ مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ : ئەگەر خوا و پێغەمبەروكەی فەرمانیان بە هەركارێك دا، هیچ پیاوێك و هیچ ژنێكی خاوەن باوەڕ ناتوانن پەسندی نەكەن. ﴾الأحزاب/٣٦.

بەلاّم ئەم بڕە شارەزاییە بە تەرازوی خودا بەسنیە تاكو مانای بەدلّ تێكۆشان بزانین، كە بریتیە لە كەمترین رادەی كردەوە كە خەلّك لە چوارچێوەی بڕوادا دەپارێزێ كاتێك شەریعەتی خوا لەسەر زەویدا بەرپا نەبێ، لەپاش تێكۆشانی دلّیش بارتەقای دەنكەخەردەلێك بڕوا نیە، بەلاّم زۆر لە خەلّكی-بەكاریگەری هزری ئیرجائی- وا دەزانن كە لە تێكۆشان بەدلّ-یا نكولّیكردن بەدلّ- هەر ئەوەندە بەسە كە مرۆڤ بە زمانی بلّێ: خودایا ئەمە مونكەرێكە تۆ رازی ناكا! یا لە ناخی

---

١ غەزرین: النشوز

دڵیەوە بیروباوەڕی وابێ کە ئەمە مونکەرێکی خودا رازی ناکا، پاشانیش رەفتاری لەگەڵ ئەم مونکەرەدا هەمان هەڵسوکەوتی ئەو کەسە دەبێ کە پێی رازیە و، روی تێدەکا!

ئەمەش بۆیە چونکە هزری ئیرجائی چی بە بڕوا کرد، کاتێك گۆڕی و تەنیا کردیە بەڕاستدانان و دانپێداهێنان و، کردەوەکانی لێ دامالی، ئاواشی بەسەر نکولیکردنی دڵدا هێنا و کردیە کارێك کە لەنێو دڵدا نهێنی بێ و هیچ واقیعێکی رەفتاری نەبێت کە پێی بناسرێتەوە.

ئیمامی غەزالی -لەگەڵ ئەوەی پیاوێکی سۆفیش بوە- لەبارەی حەقیقەتی نکولیکردنی دڵدا دەڵێ:

• {لە عیکریمەوە لە ئیبنی عەباسەوە‌ هاتوە، دەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لاَ تَقِفَنَّ عِنْدَ رَجُلٍ يُقْتَلُ مَظْلُوماً فَإِنَّ اللَعْنَةَ تَنْزِلُ عَلَى مَنْ حَضَرَهُ وَلَمْ يَدْفَعْ عَنْهُ: لەلای کەسێك رامەوەستە کە بەزوڵملێکراوی دەکوژرێ، چونکە نەفرەت دادەبەزێتە سەر ئەوەی لەلای ئامادەبێ و داکۆکی لێنەکا)). دەڵێ: هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لا يَنْبَغِي لإِمْرِئٍ شَهِدَ مَقَاماً فِيهِ حَقٌ إلاَّ تَكَلَّمَ بِهِ، فَإِنَّهُ لَنْ يَقْدِمَ أَجَلَهُ وَلَنْ يَحْرِمَهُ رِزْقاً هُوَ لَهُ: کە یەکێك هەڵوێستێکی دیت کە حەقێکی تێدابو دەبێ باسی بکا، چونکە ئەمە نە مردنی پێشدەخا و نە ڕێی بژێویەکی لێدەگرێ کە هی خۆی بێ.))

جا ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە کە چونە خانەی زۆردار و فاسیقان دروست نیە و، نابێ لە شوێنێك ئامادەبی کە خراپەکاری لێئەنجامدەدرێ و توانای گۆڕینیت نەبێ، چونکە فەرمویەتی نەفرەت دادەبەزێتە سەر ئەوەی لەوێ ئامادە دەبێ، هەروەها

دروست نیە تەماشای خراپەکاریەك بکا بەبێ پێویستی بەبیانوی ئەوەی کەنەفتە[1] و هیچی پێناکرێ}.[2]

جا لەبەر ئەم واتایەشە کە تێکۆشان بە دڵ بە (مجاهدة) ناوبـبرێ-واتـە بکەوێتـە دەروازەی جیهاد- و شایستەی ئـەوە بـو کـە ببێتـە (بـڕوا) ئەگـەر لـە کـەمترین رادەشیدابێ و، شایستەی ئەوەبو، ببێتە بەربەسـتێك لـەنێوان مـرۆڤ و توڕەبونـی خودا، هەرچی نکوڵیکردنیشە بەدڵ بە تەریقەتی مورجیئان ئـەوا هـەروەکو بڕوایـە لەسەر تەریقەتی مورجیئان، شایستەی ئەوە نیـە ئـاوڕی لیّ بدرێتـەوە، نـە کـەس قەڵەو دەکا و نە برسیەك تێر دەکا!

* * *

ئێستاکەش دێینە سەر دواین خاڵی ئەم بەندە، کە ئەویش ڕێگەی رزگاربونە.

کاتێك بە خەڵکی دەڵێیت کە ڕێگەی رزگاری بریتیە لە راستکردنەوەی چەمکـە ئیسلامیەکان-بە تایبەتیش چەمکی (لا إله إلاّ الله)- خەڵکێکی زۆر هێندە پێیـان سەیرە دەمیان بستێك دادەچەقێ و.. زۆرانیش هەر نکۆڵی لێدەکەن!

لەلای هەندێك خەڵکی ڕێگەی رزگاری بریتیە لـە شـەڕکردن لەگـەڵ هـەژاری و نەزانی و نەخۆشی، بریتیە لە بنیاتێکی ئابوری پتەو، بریتیە لە دابینکردنی خۆراك بۆ هەمو برسیەك و کار بۆ هەمو بێکارێك و، فێرکردن بۆ هەمو فێرخوازێك..

لەلای هەندێکیش بریتیە لە لابردنی پاشکەوتنی ژیاری و مـاددی و زانسـتی و تەکنەلۆجی..

---

١ کەنەفت: عاجز

٢ إحياء علوم الدين- المجلد٣ الجزء٧ ص٩، دار الفكر العربي.

لەلای هەندێکی دی بریتیە لە چاکسازی ئاکارە داڕماوەکان و، بەرتیلخۆری بەربڵاو و، درۆ و دوڕویی و، فێڵ و پشتگوێخستن و، ترسنۆکی و خۆگنخاندن[1] و، بێویژدانی و گوێپێنەدان..

لەلای هەندێکی دیکەش بریتیە لە قسە یەکخستن و نەهێشتنی جودایی و یەکڕیزی و لابردنی رق و کینە و، سەرخستنی بەرژەوەندی گشتی..

لەلای هەندێکی دیکە و.. لەلای هەندێکی دیکە و.. لەلای هەندێکی دیکەش..

ئێمەش دەڵێین: بۆ ئەم هەمو شتانە بەڵێ! هەموی چاکسازیە و! هەموی پێویستە! بەڵام ئایا رێگەکەی چۆنە؟!

• بەدرێژایی سەدەیەکی تەواو تاقیمانکردەوە کە ئەو شتانە چاك بکەین و، فێرگەمان کردنەوەو پەیمانگامان کردنەوەو زانکۆمان کردنەوە، جادە و رێمان دروستکردن و کارگەمان دامەزراندن و رێگەمان پڕ ترومبێل کرد و، ماڵەکانمان پڕ سەلاجە و گیزەر و تەلەفزیۆن کردن..

خۆ بڕێکی کەمان لەو شتانە دروست نەکرد..

ئەدی پاشان..؟!

کێشە و گیروگرفتەکانمان توندوتیژتر بون و، تەنگژەکانمان پتر گرێکوێرەیان تێکەوت و، ئێمەش لاوازتر بوین و لەبەرچاوی خەڵکی سوکتر بوین، جا نەك تەنها (نەتەوەکان) وەك بخۆران بۆ سەر خوانێ[2] پڕیان داینێ.. بەڵکو ریزبەڕ و بودەڵەی ئەم دنیایەش، کە خودا زەلیلی و زەبونی لەسەر نوسیون، یەکەم کەسبون کە

---

١ گنخاندن: تقاعس

٢ خوان: قصعة

غاریان دا ئەو خوانچەیە[1] و، یەکەم کەسبون قەپیان لە ماڵ و ناموس و لـەخوێنمان گرت.

ئێمـەش دەڵێـین: ڕێگـای سـەرفرازی بریتیـــە لـــە راســـتکردنەوەی چەمکـــە ئیسلامیەکان، بە دەسپێکردن لـــە چـەمکی (لا إلـه إلاّ الله)وە، ئەگـەر خـەڵکیش دەمیان باڵێك داچەقێنن.. یا هەبن نکوڵی بکەن.

ئەوانەی وا گومان دەبەن کـە (لا إلـه إلاّ الله) بریتیـە لـەو واژەیـەی بـە زمـان دەگوترێ، بێگومان دەمیان لەسەرسوڕمان و بۆ نکوڵیکردن لێکدەکەنەوە.. چونکە ڕۆژانە دەبینن سەدان ملیۆن جار ئەم واژەیە دەگوترێ، دەشبینن خراپە لەجێی خۆی نابزوێ، بەڵکو دەبینن خراپەکاری هەر رادەکشێ و فراواندەبێ و توندتر دەبێ و، بـە تێپەڕبونی ڕۆژان قەبارەی چەندهێندانە دەبێتەوە.

ئەو کەسانەش کە وا گومـــان دەبـەن داواکـراو لـە (لا إلـه إلاّ الله) بریتیـە لـە بەڕاستدانان و دانپێداهێنان بە سەیرلێهاتن و بۆ نکوڵیلێکردنی بێگومـــان دەمیـان لێکدەکەنەوە.. چونکە باوەڕپێکردن دەبینن-لەروانگەی خۆیانەوە- و دانپێدانـانیش دەبینن، ئەوجا هیچ گـیروگرفتێکیش نـابینن چارەسـەربوبێ و، تەنگژەیـەك بـەدی ناکەن ڕو لە سوکی بێ.

ئەوانەی پێشیان وایە کە (بیروبـــاوەڕ) (مسـلمات)ە و، بەراسـتیش تەسـلیمبون رویداوە، ئەوا بۆ شتێکی دیکەی غەیری بیروباوەڕ هەوڵدەدەن، چونکە-لەروانگـــەی خۆیانـەوە- وا دەبینـن کـە بیروبـاوەڕ بەرپایـە و، لەگـەڵ هـەندێش دەبینـن ئـەو بیروباوەڕە هیچ شتێك لە واقیع ناگۆڕێ و، پێناچێ بتوانێ لە داهاتویەکی نزیك یان

---

[1] خوانچە: خوانی بچکۆڵە.

دوریشدا شتێك بگۆڕێ.

ئەوانە و ئەوانە و ئەوانەش قوربانی هـزری ئیرجـائین کـە (لا إلـه إلاّ الله)ی لـە ناوەڕۆکە زندوەکەی بەتاڵکرد و، کردیــە واژەیـەك کـە بـەزمان دەگوتـرێ و، هیـچ مەدلولێکی نیە و، لە واقیعی ژیانیشدا هیچ بارستاییەکی نیە.

کاتێك ئێمەش نکوڵی لەو هزرە ئیرجائیە دەکەین و، بانگەواز بۆ راستکردنەوەی دەکەین، تەنها بۆ مشتومڕێکی زیهنی ئێمە ئــەوە ئـەنجام نـادەین، بـەڵکو لەبـەر ئەوەیە کە کاریگەریە ژەهراویەکەی لە ژیانی ئوممەتدا بەدی دەکــەین، لەگـەڵ بـڕی دوریەکەی -لەهەمانکاتدا- لەگیانی ئیسلام.

پێشمان خۆشە بپرسین، بۆئــەوەی ڕێگاکـە بدۆزینــەوە: ئایـا ئــەو نەخۆشـیانەی ئەمڕۆ موسڵمانان بەدەستیانەوە ناڵەیان دێ؛ دواکەوتنی زانستیو ژیـاری و فیکـری و ئاکاری و ئابوری و رامیاری و ماددی و...تاد... تــاد.. ئایـا ئەمانـە نەخۆشـی (ئیســلامی)ن؟ بـە واتـا لـە هـەڵگرتنی ئیســلام و، مومارەســەکردنی ئیســلام و، پارێزگاریکردن لە ئیسلامەوە هاتون؟!

هەتاکو وەڵامێکی زانستی واقیعی بدەینەوە کە لە ئارەزوەوە ســەریهەڵنەدابێ و دەمارگیری نەیجولێنێ، دەپرسین: ئایا کۆمەڵگەی یەکەم کـە ئیسـلامی هـەڵگرت و مومارەسەی کرد و پارێزگاری لێکرد هیچ یەکێك لـەو سیفەتانەی هـەڵگرتبو؟ یـا بەتەواوی پێچەوانەی ئەم وێنەیە بو کە لە واقیعی هاوچەرخماندا بەدی دەکەین؟!

ئەوجا دەپرسین تاکو بگەینە ئــەنجام: کامــە نــەوە (لا إلـه إلاّ الله)ی بـە هــەمو داخوازیەکانیەوە بەدیدەهێنا؟ کامەشی (لا إله إلاّ الله)ی لە ناوەڕۆکەکەی دەرهێنــا و کردیە وشەیەك تەنیا بەزار بگوترێ.

جا ئەگەر وەڵامەکەمان زانی نهێنی ئەو هەمو نەخۆشیانە دەزانین کــە جیــهانی ئیسلامی داگرتوە لە مێژوی نوێی خۆیدا..

بەراستی تەنیا (لا إله إلاّ الله) نیە کە چەمکەکەی لــە هەسـتی نــەوەکانی ئــەم دواییە گەندەڵ بوە، بەڵکو هەمو چەمکە ئیسلامیەکانە بەبێ ئــەوەی هیچیــان لێ ببوێرین[1]. بەراستیش واقیعی هاوچەرخ دەرەنجامی گەندەڵی هەمو چەمکەکانــە لــە یەککاتدا، هەروەکو لە خوێندنەوەی (چەمکی پەرستن) و (چــەمکی قەزاوقــەدەر) و (چەمکی دنیا و قیامەت) و (چەمکی ژیار و بنیاتنانی زەوی) دەردەکەوێ..

بەڵام (لا إله إلاّ الله) یەکــەمین پایــە و گــەورەترین پایــەی ئیســلامە هــەروەکو پێشتر باسمانکرد، هەر بۆیەشە کاریگەریەکەی گەورەترین و ترسـناکترینیانە، جـا چ لە حاڵەتی پیادەکردنی راستودروست یا لە حالەتی لادان لە حەقیقەتەکەی بێ، هەر لەبەر ئەمەشە کــە ئیســلام لــە میانــەی سێزدەســاڵان لــە مەککــە و، پاشــان لــە سەرتاپای سەردەمی مەدینەییدا بایەخێکی گەورە و مەزنی بەم دۆزە داوە..

جا دەبێ داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) لە فەرمایشتەکانی خودا و پێغەمبەرﷺ وەبیر خۆمان بێنینەوە بەو شێوەیەی چۆن نەوەی یەکەم هۆشیان پێداشکابو،:

داخوازی یەکــەمی بریتیــە لــە یەکتاپەرسـتی پــەروەردگاریتی و پەرسـتراوێتی، لەگەڵ یەکتاپەرستی ناو و سیفەتەکان (واتە یەکتاپەرستی باوەڕ).

داخوازی دوەمیشی بریتیە لە ئاراستەکردنی پەرستن بۆ خودای تەنیا و بێهــاوەڵ (واتە یەکتاپەرستی پەرستن).

---

[1] بوارد: استثناء .

داخوازی سێیەمیش بریتیە لە تەنیا حوکم بردنە بەر شەریعەتی خودا بێجگە لە هەمو شەریعەتەکانی دیکە (واتە یەکتاپەرستی حاکمیەت).[١]

داخوازی چوارەمیش بریتیە لە بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکانەی خودا لەسەر برواداراني فەرزکردون -جگە لەوانەی پێشەوە- وەکو زانستخوازی و، ئاواکردنەوەی زەوی بەپێی بەرنامەی پەروەردگار و، خۆسازدان بۆ بەرەنگاری دوژمنانی خودا و، بڵاوکردنەوەی بانگەواز لەسەر زەوی و، لەسەروی هەر هەموشیانەوە جیهادکردن لەپێناو خودا.

داخوازی پێنجەمیش خۆڕازاندنەوەیە بە ئاکارەکانی (لا إلە إلاّ الله)، کە بەوردی لە قورئان و سوننەتدا باسکراون.[٢]

ئایا ئەمە لێکدانەوەیەکی دروستکراوە بۆ داخوازیەکانی (لا إلە إلاّ الله)، هەر لەخۆڕا و بەبێ بەڵگە هاوردومانە؟!

یەکێك لەوانەی لە بواری بانگەواز کاردەکەن جارێك پێی گوتم -دڵسۆزیشم لە پرسیارەکەیدا بەدی دەکرد-: پێغەمبەرﷺ هەواڵی پێداوین کە ئیسلام لەسەر پێنجان بنیاتنراوە، شەهادەی (لا إلە إلاّ الله محمد رسول الله) و نوێژکردن و زەکاتدان و، ڕۆژوگرتنی ڕەمەزان و، حەجی ماڵی خوا بۆ ئەوکەسانەی پێیاندەکرێ: ئەدی تۆ مەرجی حوکم بردنە بەر شەریعەتی خوات لەکوێ هێناوە و، ئەوەت لەسەرچی بنیاتناوە کە بە یەکێك لە داخوازیەکانی (لا إلە إلاّ الله)ی دادەنێی:

---

١ کە دەڵێین: یەکەم و دوەم و سێیەم، بەپێی بایەخ و گرنگی ڕیز نەکراوە، بەڵکو ئەمە زەرورەتی قسەکەیە دەنا هەموی لە یەك ئاستن کە بە عەقیدەوە پەیوەستن -واتە بە بنەڕەتی ئیمان- و لێدەرچونیشی شرکە و مرۆ لە ئیسلام دەردەکا.

٢ هەروەها کە دەڵێین چوارەم و پێنجەم بەپێی بایەخ و گرنگی ڕیزمان نەکردون، چونکە هەردوکیان دەبێ بێتەدی بۆ وەدیهاتنی بڕوای ڕاستەقینە ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا﴾.

لەکاتێکدا کە پێغەمبەرﷺ لـەگوتنی بـەولاوە چیدیکـەی داوانـەکردوە؟! یەکسـەر پێمگوت: بەمەرجدانانی حوکمبردنە بەر شەریعەتی خـوا لـە دەقـی کتێبـی خـوادا هاتوە: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِـي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا: بەڵام نەخێر، سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەمانە نابنە خاوەنی بڕوا مەگەر کاتێك کە لە کێشـە و هـەرای نێـوان خۆیانـا حوکم بێننە لای تۆ و لە دڵەوەبە هەر فەرمانێ تۆ بیدەی پێی رازی بن و بە تەواوی ملکەچی بن.﴾النساء/٦٥. کە ئەم مەسەلەیەش دەخرێتە ناو داخوازیەکانی (لا إلـه إلاّ الله)، ئەمە یەکێکە لە بەڵگەنەویستەکانی ئەم ئاینە، مادام دانمان بەوەدا هێنـا کە ئیمان نایەتەدی مەگەر بە حوکم بردنە بەر شەریعەتی خـوا، چاکـە بزانـین ئـەو حوکم بردنە بەر شەریعەتە دەکەوێتە نێو کامە لە پایەکانی ئیسلام: ئایا دەکەوێتـە نێو نوێژ؟ ئایا دەکەوێتە نێو زەکات؟ ئایا دەکەوێتە نێو رۆژی؟ ئایا دەکەوێتـە نێـو حەج؟

ئەگەر وەبەر یەکێك لەم پایانە نەکەوێ، ئایا بێجگە لەوە دەمێنێتەوە کە بەبـەر پایەی یەکەم بکەوێ، کە پایـەی (لا إلـه إلاّ الله)یـە و، ماناکـەی دەسـتگرتنە بـە هەمو ئەوەی لەلای خوداوە هاتوە، جا مەرجی حوکم بردنە بـەر شـەرعی خوداشـی دەکەوێتە ناو، هەروەك هەمو ئـەو ئەرکانەشـی دەکەوێتـە نـاو کـە خـودا فـەرزی کردون؟

لە حەقیقەتدا ئیسلام هەموی داخـوازی (لا إلـه إلاّ الله)یـە، چونکـە داخـوازی دانپێداهێنان بەوەی خودا یەکێکە و هاوبـەش لـە موڵـك و، لـە وەدیـهێنان و لـە مشورگێڕی و، زاڵێتی و، بژێوبەخشی و، لە توانایدا نیە، بریتیە لە پەرستنی خودا

بەبێ هاوبەش، بەمانای گوێڕایەڵبون بۆ فەرمانەکانی و، سەرجەم فەرمانەکانیشی بریتین لە (ئیسلام).

ئەگەرچی خودای بەرز هەندێك پەرستنی بەرجەستە کردون و کردونی بە پایە، ئەوا ئەو ئەرکانەی دەمێننەوە کە خودا فەرمانی پێکردون، بەڵگەی ناوێ کە دەبێ بە بەر پایەی گشتگیری یەکەم بکەون کە هەمو ئیسلام لەخۆ دەگرێ، لەگەڵ هەمو ناوەڕۆکی ئیسلام!

ئەگەر مەسەلەکەش وانیە، با مورجیئەکان-چ ئەوانی کۆن چ ئەوانەی ئێستا- پێمان بڵێن ئەو ئەرکانە دەچنە نێو کامە لە پایەکانی ئیسلام؟! خۆ ئەگەر وەبەر هیچ یەکێك لە پایەکانیش نەکەون، ئەدی جێگەیان لە ئیسلامدا لە کوێیە، لەکاتێکدا کە بریتین لە ئەرکە **فەرزکراوەکان**. هەندێکیشان-وەك حوکم بردنە بەر شەریعەتی خوا- دەکەونە نێو بنەماکانی بیروباوەڕ؟!

واتای شایەتمان هێنان-هەروەك چەندین جار پێشتر باسمانکرد- بریتیە لە پابەندبون بەوەی لەلایەن خواوە هاتوە و، پاشان هەمو ئەرکەکانی پەروەردگاریشی بەبێ بواردن دەچێتە ناو.

لێرەدا لە بواری پۆلێنکردنی ئەو سەرپێچیانەدا نین کە لە مرۆڤ رودەدەن لە وەدیهێنانی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله)، داخوا کامەیان دەکەوێتە بازنەی وردەگوناهان و کامەشی دەکەوێتە بازنەی گوناهەگەورەکان و، کامەشی دەکەوێتە بازنەی هاوبەشپەرستی، چونکە ئێمە لەبواری رونکردنەوەی ئەو کاریگەریەین کە لەژیانی مرۆڤدا رودەدا کاتێك داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله)-هەموی-بەراستودروستی بەرپا دەکەن و، کاریگەری پێچەوانەشی کە ئەوکاتە رودەدا کە (لا إله إلاّ الله) لە ناوەڕۆکەکەی خاڵی بکرێت و، بکرێتە واژەیەکی سەرزارەکی بەبێ

هیچ داخوازییەکی واقیعی، جا ئــەوە هاوبەشپەرستی بـێ یـان تـەنیا یـاخیبون و تاوان.

بەڵام ئەمە ڕێمان لێناگرێ کـە ئاماژەیـەکی خـێرا بـۆ ئـەوە بکـەین کـە هـەر لاڕێبونێك لە یەکتاپەرستی بیروباوەڕ (یەکتاپەرستی پەرستراوێتی و پەروەردگارێتی و نـاو و سـیفەتەکان) هاوبەشپەرسـتیە و، هـەر لاڕێبونێکیـش لـە یەکتاپەرسـتی پەرستن (واتە ئاراستەکردنی هەمو جۆر و ڕەنگەکانی پەرستن تەنیا بۆ خودای گەورە بەبێ هاوبـەش و هـاوەڵ) هاوبەشپەرسـتیە و، هـەر لاڕێبونێـك لـە یەکتاپەرسـتی حاکمیـەت (واتـە حوکـم بردنـە بـەر شـەریعەتی خـودا بەتـەنیا و بێجگـە لـە شەریعەتەکانی دیکە)، ئەویش هەر هاوبەشپەرستیە، هەموشـی -هەرسـێك- یـەك ئاستیان هەیـە کـە دەچنـە نێـو بنـەماکانی بیروبـاوەڕ، هاوبەشپەرسـتیش لەهـەر کامەیان هاوبەشپەرستی گەورەیە و مرۆڤ لەدین دەردەکا:

﴿وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَـــيْءٍ نَحْـنُ وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ: ئەوکەسانەی شەریکیان بۆ خـوا پـەیدا کـرد، گوتیان: ئەوکەسانەی شەریکیان بۆ خوا پەیدا کـرد، گوتیـان: ئەگـەر خـوا مـەیلی لێبا، نە ئێمە و نە باب و باپیرانمان، غەیری خۆی هیچمـان نەدەپەرسـت، هیچمـان بێ فەرمانی ئەو بە ناڕەوا نەدەزانی.﴾النحل/٣٥.

جا ئەمە هاوبەشپەرستی پەرستن و هاوبەشپەرستی حاکمیەت دەگرێتەوە.

پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِـنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُـوَ سُبْحَانَهُ عَمَّـا يُشْـرِكُونَ: لـەبری خـوا ڕەبەنـەکانی خۆیـان و مەسـیحی کـوڕی مەریەمیان کردە خوا، فەرمانیشیان پێدرابو بێجگە لەخوای تاك و تەنیا نەپەرستن،

له غەیری ئەو هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ. خودا بێ عەیبە و بەدورە لەو شتانەی بە هاوتای ئەوی دەزانن.﴾التوبة/٣١.

ئەمەشیان هاوبەشپەرستی حاکمیەت و هاوبەشپەرستی بیروباوەڕ دەگرێتەوە و.. هەموشی وەك یەكن.

* *

كاتێك نەوەكانی یەكەم لە موسڵمانان دەركیان بە حەقیقەتی چەمكی (لا إلە إلاّ الله) كردبو و، لەواقیعی ژیانیاندا وەدیهاتبو، ببونە (چاكترین ئوممەت كە بۆ خەڵكی دەركەوتبێ) و هەر ئەوان ئوممەتی زاڵ و باڵادەست بون لە زەویدا و، هەر ئەوان ئوممەتی زانست و ژیار بون و، ئوممەتی بەها و ئاكارەكان بون، كە لە زۆر بواراندا ئەو موعجیزەگەورانەی لەسەردەست هاتەدی كە مێژو دەیانزانێ.

بەڵام كاتێك چەمكی (لا إله إلاّ الله) لە دەرونی نەوەكانی پاشینی ئەم ئوممەتە- لەگەڵ چەمكەكانی دیكەش- كزبو و، كاتێك واقیعێكی لە ژیانیدا نەما، هەنگی ئاگاداركردنەوەكەی پێغەمبەرﷺی تێدا هاتەدی:

((**يُوشِكُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمُ الأُمَمُ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ عَلَى قَصْعَتِهَا. قَالوا: أَمِنْ قِلَّةٍ نحن يَوْمَئِذٍ يَا رسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُم غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ**: هێندەی نەماوە كە ئوممەتەكانی دیكە بێنە سەرتان وەكو ئەو بخۆرانەی دەچنە سەر لەگەنی نانخواردن.. گوتیان: ئایا لەبەر كەمی ژمارەمان لەو رۆژیدا، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: نەخێر ئەو رۆژی ئێوە زۆرن، بەڵام وەكو ئاومالكی سێلاوێ وان))[1]

---

١ أخرجه أحمد وأبوداود

ئەوجا ئەم ئوممەتە بو بە گەمەی دەستی دوژمنانی، بە هەمو قسە و کردەوەیەکی لەنێوبەر، بەرەو بەهیلاکچونی رادەکێشن و لە دین توشی ئاژاوەی فیتنەی دەکەن. ﴿وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنْ الْقَتْلِ: ئاژاوەش لە کوشتنێ خراپترە﴾البقرة/٢١٧. تا لە رێگەی گومراییشدا دوایان کەوێ ئەوان پتر گومرای دەکەن!

ئەمڕۆکەش ئوممەت لەرێگەی رزگاربون و سەرفرازی دەگەڕێ.

کاتێك بە خەڵکیش دەڵێین: رێگەی سەرفرازی لە راستکردنەوەی سەرجەم چەمکەکانی ئیسلامرا دەست پێدەکات و دەبێ لە چەمکی (لا إلە إلاّ الله)وە دەست پێبکەین، هەندێك خەڵك-بەساکاریەکی راستەقینە یان بە ساکاریەکی دروستکراوەوە- واگومان دەبەن ئێمە راستکردنەوەی چەمکان دادەنێین لەباتی دابینکردنی نان بۆ برسیان، یا زانست بۆ زانستخوازان، یان دامەزراندنی کارگە، یا پڕچەککردنی سوپایان!

ئەمەش مەسەلەیەکە هیچ ژیرێك بۆی ناچێ!

پێغەمبەریشﷺ کاتێك بیروباوەڕی خەڵکەکەی لە مەککە راستدەکردەوەو، چەمکی راستەقینەی (لا إله إلاّ الله)ی بە بڕواداران پیشاندەدا، پێی نەدەگوتن: مەخۆن هەتا بیروباوەڕتان راست دەکەنەوە، مەفرۆشن و مەشکڕن و، بۆ خۆتان بەدوای سەرچاوەی بژێودا مەگەڕێن هەتا زۆر چاك لە واتای (لا إله إلاّ الله) دەگەن!

ئەمە مەسەلەیەکە بە هیچ ژیرێك بۆی ناچێ!

بەڵکو پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کردن و-ئەوانیش دەیانخوارد و دەیانخواردەوە و، دەیانفرۆشت و دەیانکڕی و بە زەویشدا دەگەڕان و دەڕۆیشتن-بەپێی داخوازیە راستەقینەکانی (لا إله إلاّ الله) پەروەردەی دەکردن. بەگوێرەی دابەزینی لەلای

خوداوه، تاکو کۆششیان هەموی راستاڵ ببێ و، لە کۆتاییدا ببنە (باشترین ئومـمـەت کە بۆ خەڵکی دەرکەوتوە).

کە ئەمڕۆش دەڵێین: هەردەبێ چەمکەکانی ئیسلام راستبکرێنەوە و لە چـەمکی (لا إله إلاّ الله) دەستپێبکرێ، مەبەستمان لەمە ئەوەیە کە پێغەمبـەرﷺ یەکـەمجار ئەنجامیدا. مەبەستیشمان لــە کارخسـتنی گـەڕان بـەدوای نـان یـا چـەکدارکردنی سوپایان، یا دامەزراندنی کارگـان، یـا کردنـەوەی فێرگـە و قوتابخانـان نیـە تـاکو چەمکی (لا إله إلاّ الله) راستدەکرێتەوە!

ئەمڕۆ ئێمە-کە هەوڵی (چاکسازی) دەدەین- گازاندەمـان لـە بزربونـی گیـانی (هەست بە ئەرك کردن[1]) هەیە لەلای خەڵکی، کەسێك نیە بجوڵێ یا کارێك بکا لــە پێکەی هەستکردن بـەوەی کـە ئـەرکێکی لەسەرشـانە و پێویسـتە ئـەنجامی بـدا، بەڵکو-ئەگەر کاریشی کرد- بۆیەی دەکا هەتا بەرژەوەندی خـۆی وەدیبـێ، گوێـش ناداتێ لەرێگەی حەڵاڵ یا حەرامەوە بێ، جا فەرمانبەری بچوك بــە بـەرتیل نـەبێ کار ناکا و، فەرمانبەری (گەورەش!) لێنەدا لەماڵی حەرام کار ناکا.. جـا رێگـەی چاکسازیی ئەمانە چۆنە؟

هەروەها گازاندەمان لە بێسەروبەری و لەخۆڕایی هەیە لە هــەمو کردەوەکانمـان کە ماڵێکی زۆر و کاتێکی نازدار و دەرفـەتی دەگمـەنمان لـەکیس دەدەن و، دەبنـە مایەی وێرانبونی زۆر لە پرۆژەکانمان.. جا رێگەی چاکسازی چۆنە؟

گازاندەشمان لە دوڕویی و درۆ و فێــڵ و خەڵـەتاندن و کـەمی ئەمانـەت لـەلای خەڵکی هەیە.. جا رێگەی چاکسازی چۆنە؟

---

١ هەست بە ئەرك کردن: الاحساس بالواجب.

هەروەك گازاندەمان لە تەمبەڵی و دەستبەخۆدا بەردانەوەو بە فشە وەرگرتنی کاروباران هەیە. جا رێگەی چاکسازی چۆنە؟

هەروەها گازاندەمان لە نەمانی رۆحی زانستی هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکانمان، چونکە تێڕوانینی بابەتیانەمان نیە-کە ئارەزوی تێکەڵ نەبێ- و رقمان لە نەخشەکێشان و رێکخستنە.. جا رێگەی چاکسازی چۆنە؟.

وە گازاندەمان لە نەمانی (گیانی کۆمەڵکاری) و، زاڵبونی گیانی تاکویستی و خۆپەرستی تەنگو بەرتەسکە.. جا رێگەی چاکسازی چۆنە؟

هەروەها گازاندەمان هەیە لە خیانەتی (سەرکردەکان)مان و، چڵکاوخۆریان بۆ دوژمنانمان و، رامکردنی وڵاتانیان بۆ بەرژەوەندی دوژمنەکانیان لەپای ئارەزوی حوکم و دەسەڵات.. جا رێگەی چاکسازی چۆنە؟

گازاندە دەکەین و.. گازاندە دەکەین و.. گازاندە دەکەین و.. زیاتر لە سەدەیەکیش تێپەڕی ئێمە-هەڵخەڵەتێن یا خەڵەتێنراو- بەخەیاڵ وامان بۆ خۆمان سازکردوە کە بۆ چاکسازی تێدەکۆشین و لەرێگەی رزگاری و سەرفرازی دەگەڕێین..

کۆتایی رێگەکەشمان بریتیە لە دروێنەی تاڵ!

* * *

ئەوانەی بەبێ بنەمایەکی عەقیدەیی بیر لە کردنەوەی قوتابخانە و، دامەزراندنی کارگە و، بەهێزکردنی سوپا و، دابینکردنی نان، دەکەنەوە، پێیانوایە بەخۆیان کۆمەڵێکی (کرداری) (واقیعی) (زانستی)ن و ئامرازە راست و دروستەکانیان هەڵبژاردوەو، خۆیان لە (پیوارەکان= الغيبيات) پالاوتوە و، لە ئەندێشە و خەیاڵان دورن و-بێگومان- دەگەنە چارەسەری کرداریانە کە خەڵکی لە گیروگرفتەکانیان رزگار دەکات..

ئێمەش بەکەس نالێین فێرگان مەکەنەوە و، کارگان دامەمەزرێنن و، نـان دابـین مەکەن و، سوپایان بەهێز مەکەن.. بەڵام پڕ بـە زاریشـمان پێیـان دەڵێـین: ئەگـەر ئەمەتان هەمو بەبێ بیروباوەڕێکی دروست دروستکرد، ئەنجامەکەی هەر ئەوە دەبێ کە ئێستا لە حاڵی ئومەتەکـەتاندا دەیبینـن، پـاش هـەوڵ و تێکۆشـانێك کـە لـە سەدەیەکی تەواو پتری خایاندوە!

قوتابخانان بکەینەوە.. جا چی تیادا فێری زارۆڵانمان بکەین؟!

دەزگای راگەیاندنی (نوێ) دامەزرێنین، ئـەدی چـی بـۆ گەلەکـەمان تێـدا بـڵاو بکەینەوە؟!

کارگان دامــەزرێنین، ئـەدی چـۆن بەڕێوەبـەر و فەرمانبـەر و کارگـەرانی تێـدا کاربکەن؟! بەرهەمەکەشی بەرەو کوێ بڕوا؟!

سوپایان پڕچەککەین.. ئەدی سەرۆك و سەرکردەکانی چی دەکەن؟!

لیـوا عـەبدولمونعیم حەسـەنی، فـەرمانڕەوای شـاری غـەززە لــە سـەردەمی شکستەکەدا، کاتێك بۆ ماوەی چەند مانگێك لە یەك زیندان پێکەوە بوین،[1] باسی ئەوەی بۆ کردم کە جولەکە ئەو رۆژی بەدیل گرتبویان کە بە ترومبێلەکـەی خـۆی- بەهەڵە- لە بەرەبەیانی شکستەکەدا چوبوە نێو خاکی جولەکان.

پاش ئەوەی هەواڵی شەڕ و دۆڕانیان پێڕاگەیاندبو کە بەخۆی ئاگای لـە هیچیـان نەبو! یەکەمین پرسیار ئەوەبو کە لێیان پرسیبو: ئایا تا ئێستاش برایانی موسـڵمان لە سوپای میسریدا ماون؟! پێی گوتن: بەدڵنیاییەکی تـەواوەوە نـەخێر! بـەڵام بـۆ

---

١ جولەکە لە بەرەبەیانی شکستەکەدا دەسگیریان کرد پاشـان بـەریاندا، دواتـر جـەمال عـەبدولناصر لەبەر هەندێك هۆ کە هەر بەخۆی دەیزانێ گرتی! چەند مانگێك لە زیندانی (القناطر)یشدا مایـەوە هەتا جەمال عەبدولناصر مرد و، بەریاندا.!

دەپرسن؟! گوتیان: ئێمە ناتوانین ئـــەوە لـەبیر بکـەین کـە لەسـاڵی ١٩٥٦ رویـدا، کاتێك دوانەفسەرەکانی برایانی موسڵمان شــەش سـەعاتی تـەواو لـە تەنگەبـەری (متیلا) خشینی سوپای جولەکانیان راگرت، هەتا لەسەر تۆپەکانیاندا کوژران!

بەمشێوەیە جولەکە لە خودی تۆپەکە ناترسێ، بـــەڵکو-هـەردەم- شـتی دیکـە هەیە پتر لێی دەترسێن!

ئەوان زەندەقیان لە بیروباوەڕی ئەو پیاوە چوە کە لە پشت تۆپەکەوە دەجەنگێ.. زراویـان لـە (لا إلـه إلاّ الله) دەتۆقـێ.. چونکـە لـە هـەمو چەکـە بکوژەکانیـــان کاریگەرترە.!

روسەکانیش لە ئەفغانستان لە چەك ناترسێن.. چونکـــە موجـاهیدان چـەکێکی وایان نیە باسبکرێ بەرامبەر فڕۆکە و زرێپۆش و بۆمبی سوتێنەر و گازی ژەهـراوی و هەمو ئامرازەکانی کۆکوژی دڕندانە کە روسەکان بەکاری دێنن، بـەڵام ئـەوان لـە (لا إله إلاّ الله) دەتۆقن، چونکە هەر ئەمەیە ورەی موجاهیدی ئەفغانی بۆ مـــاوەی هەفت ساڵی بەدوای یەك بەرامبەر هێرشە دڕندانەییەکانی روس بەرزدەکاتـەوە، بـە چاوپۆشین لە ئەنجامی کۆتایی شەڕەکە ئاخۆ بە کامە لادا دەشکێتەوە.[١]

جارێکی دیکەش ئێمە ناڵێین (لا إله إلاّ الله) بدەنە سەربازان و تۆپیان مەدەنێ، هەروەك هــەندێك کەســی لـەخۆڕا سـاکار یـان خـاوەن سـاکاری دروسـتکراو وای لێکدەدەنەوە! بەڵکو دەڵێین: تۆپ بە تەنێ شەڕ ناباتەوە، ئەگـەر پیاوەکـەی پشـتی خاوەن بیروباوەڕ نەبێ.. جا بەڵێ با تۆپ بکڕین، بەڵام با لە پاڵیشی پیاوێك بنیـات بنێین بەڕاستی بڕوای بە (لا إله إلاّ الله) هەبێ.. ئەوکاتە گورگەکان ناتوانن گاز لـــە نیشتمانی ئیسلامی بگرن و ئارامی لێتێکدەن وەکو ئەمڕۆ! هەر لەبەر هەمان ئـــەم

---

١ ئەم کتێبە لە سەردەمێکدا نوسراوە کە جیهادی ئەفغانی دژ بە ڕوسان لە گەرمەیدا بوە. -ژیوان-

هۆیەشە دوژمنان مکوڕن[1] -بەکرێگیراوەکانیشیان لەناوەوە- هەمو ئەوانـــە لەسـوپا دەربێنن کە بڕوایەکی راستەقینەیان بە (لا إله إلاّ الله) هەیە، چونکـە ئـەوان چـاك حەقیقەتی ئەم ئاینە دەزانن و، دەزانن (لا إله إلاّ الله) دەتوانیٚ چ بکا کـاتێك ئـەو داخوازیە راستەقینەی بۆ دڵان دەگەڕێتەوە کە رۆژی لەلای خوداوە دابەزی، هەیبو!

﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَـاءَهُمْ : ئـەهلی کتێـب-چـۆن کوڕانی خۆیان دەناسن- ئەم پێغەمبەرەش دەناسن.﴾البقرة/١٤٦.

* * *

ئەوجا بۆ (گیروگرفتەکانمان) دەگەڕێینەوە..!

(واقیعی)یە (کرداری)یە (زانستی)یەکان دەڵێن: دەلیمان گـەڕێن و باسوخواسـی بیروباوەڕمان بۆ مەکەن! وەرن با سەیری واقیـع بکـەین! وەرن بـۆ ملیۆنـان دەمـی کراوە و گەدەی برسی.. لەگەڵ ئێمەدا لە (چارەســەری زانسـتی) بگـەڕێن بـۆ ئـەو گیروگرفتـە ئابوریانـەی کـە جیـهانی ئیسـلامی پێـوەی گرفتـارە لـە دواکەوتنـــە شـەرمئامێز و هـەژاری تـا سـەر ئێسـکان و ژمـارەی زۆری دانیشـتوان و کـەمی داهاتی..

ئێمەش دەڵێین: بەڵێ! بگەڕێن! وا سەدەیەکی تەواو زیاتریشە دەگــەڕێن.. بـە چ ئەنجامێك لێی دەرچون؟!

ئێمە، ئێمەی-خەیاڵیە، پیواریـــە، خەونبینـە، میسـالیەکان[2]- دەڵێـین: خـاکی

---

١ مکوڕ: حریص

٢ وشەی (میسالیەت) لە زاراوەی ئەواندا بە زەم دێ نەك مەدح، بەڵکو بەپێی دابی وان خراپترین شتە مرۆڤی پێ وەسف بکرێ! چونکە واتای-لەلای ئەوان- ئەو کەسەیە کە خۆی بە خـەونی وەدینـەهاتو خەریك بکا و، گیروگرفتی (جەماوەر) بێچارەسەری راستەقینە جێبهێڵێ!

ئیســـلامی بـــه پترۆڵەکـــەی و، کانزاکـــانی و، بەروبومـــە کشـــتوکاڵیەکانی و، داهاتەئاویەکانی، بە روبەرە فراوانە یەکپارچەکەی، بە هێزە مرۆییەکـەی-بـەخۆی- بە فەزلی خودا- دەوڵەمەندترین پارچەی سەر روی زەویە! بەڵام خەڵکەکەی ئـــەمرۆ هەژارترین خەڵکی سەر روی زەوین و لە هەموان زیاتر گیروگرفتیان هەیە..

بۆچی؟!

ئایا لەو رۆژەی کە بەراستی موسڵمان بون موسڵمانان هەژاربون، کە لە واقیعـی ژیـانی خۆیـان هـەمو داخوازیـەکانی (لا إلــه إلاّ الله)یـــان وەدی دەهێنـــا، کـــە ئاوەدانکردنـەوەی زەوی بـەپێی بەرنامـەی پـەروەردگار و، زانسـتخوازی و، هـــێز ئامادەکردن بۆ دوژمنانیشی لەخۆگرتبو؟!

یاخود موسڵمانان دەوڵەمەندترین خەڵکی سەر روی زەوی بـون و لـە هـەمویان پێشکەوتوتر بون و لە هەمویان باڵادەستتر بون؟

پاشان کـە لـە بیروبـاوەڕ بـەپاش کـەوتن،[1] لـە زانسـت و ئـابوری و جـەنگ و سیاسەت و فیکر و ئاکاریس کەوتنە پاش...[2] ئـەوروپای خاچپەرسـت بەسـەریاندا زاڵ بو و دەستدرێژی کردە سەر خاکەکەیان و، خێر و بێری دزین و، زەبونی کـردن و کردنی بە کۆیلە و، خوێنی مژیـن، جـا ئـەوروپا لەسـەر حسـابی ئـەوان زل بـو و، ئەوانیش پتر داهێزران تا گەیشتنە ئەو حاڵەتەی ئەمرۆ تیایدان.

ئەمرۆش هەوڵدەدەن تا خۆیان لەو حاڵەتە رزگاربکەن، ئەوەش رەتدەکەنەوە کـە بۆ بەرنامەی پەروەردگار بگەڕێنەوە و، جارێك لە سوسیالیزم دەگـەڕێن و، جـارێك

---

١ بگەڕێوە بۆ باسی (التخلف العقيدي) لە بەندی (آثار الإنحراف) لە کتێبی (واقعنا المعاصر).

٢ هەروەها بگەڕێوە بۆ رونکردنەوەی پەیوەندی نێوان دواکەوتنی عەقیدی و ژیاری و ئابوری و جەنگی و سیاسی...تاد، لە هەمان شوێن.

بەدوای پیشەسازی و، جارێك بۆ قەرز لە دەوڵەتە (گەورە)کـان دەگـەڕێن.. پاشـان گیروگرفتەکان گرێکوێرەی تریان تێدەکەوێ و، دراوی وڵاتەکان بەهای دادەبـەزێ و، قەرز بودجەکان قورس دەکا و، بەرهەمهێنان دادەبەزێ و، برسیەتی زیاد دەکـا و.. ئاکاریشی لەگەڵ تێکدەچێ، یا هەر گەندەڵیە و بۆ گەندەڵی زێدە دەبێت.

هـەروەها بـە خـەڵکی نـاڵێین: هەسـتن سـەروەریتان بگێڕنـەوە بەسـەر خـاك و دەرامەتتان و، ئەو داگیرکەرانە دەرکەن کە ئێـوەی کـردە کۆیلـە و دزی لێکـردن و خوێنیان مژین، چونکە ئەمە رێگەی وەدەستهێنانەوەی ئەو هێز و دەسـەڵاتەیە کـە رۆژێك لەرۆژان هەتانبوە..

جا لەگەڵ ئەوەی ئەمە لەخۆیدا راستە.. موسڵمانانیش بۆ هێز و دەوڵەمەندی و باڵادەستیەکەی پێشویان ناگەڕێنـەوە مەگـەر سـەروەرێتی خۆیـان بەسـەر خـاك و داهاتەکانیاندا بگێڕنەوە و رێ بگرن لە کردارە گەورەکانی دزی کە دوژمـن بەسـەر قەوارەی ئابوری واندا مومارەسەی کردوە و تا ئەم ساتەش بەردەوامە..

لەگەڵ ئەوەی ئەمە بەخودی خۆی راسـتە، بـەڵام لـەنێوان ئێمـە و وەدیـهێنانی ئەمە جیهادێکی دور و درێژ هەیە کـە رەنگـە چـەندین نـەوە بخایـەنێ و.. دەمـە برسـیەکانیش تەنانـەت چـەند رۆژێکـی دیـاریکراویش ناوەسـتن چ جـای ئـەوەی بەدرێژایی چەند نەوەیەك ئارام بگرن!

بە خەڵکە (کردای)ە (واقیعی)ە (زانستی)یەکان ناڵێین: واز لە پیشەسازی بێنن، یا واز لە گەڕان بەدوای داهات بێنن بۆ بودجە ماندو و قەردار و لاتەکەتان..

بەڵام ئێمە پێیان دەڵێین: هەر هەوڵێکی لەم رێگایـە بـدرێ بـەبێ گەڕاندنـەوەی خەڵك بۆ چـەمکی راسـتەقینەی بیروبـاوەڕ و، پـەروەردەکردنیان لەسـەر چـەمکی

راستودروست، وەکو دەفرێکی کونی لێدێ هەرچەندە هەوڵدەین پڕیکەین دوبارە بەتاڵ دەبێتەوە!

پیشەسازی-وەك بەزمانی خۆیان دەڵێن- هەوڵێکی (ژیاری)ە و تەنیا کارێك نیە ئامرازێك ئەنجامی بدا..

بەڵام ئێمە دەڵێین: ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەپێی داخوازی بەرنامەی پەروەردگار یەکێکە لە داخوازیە زۆر و جۆربەجۆر و هەمەلایەنەکانی (لا إلـه إلاّ الله)، کاتێك پیشەسازیش لەسەر بەرنامەی (لا إله إلاّ الله) دابمەزرێ ئەوا کارگەران دزی لە کات ناکەن هەروەکو ئەمڕۆ لەسایەی (سۆسیالیزم)دا دەیدزن و پشتیان بە نێزیکبونەوە لە خاوەن دەسەڵاتەکان دەبەستن بەهۆی ماستاوچیەتی و دوڕویی و سیخوڕی لەسەر براکانیان! گەورە فەرمانبەرانیش بەرهەمی کارگە نادزن تا لە بازاڕی رەش بیفرۆشنەوە تاکو بە ساناترین رێگا سامانێکی حەرامیان دەستبکەوێ! فەرمانڕەواکانیش چاویان لە ئاست دزە گەورەکان ناپۆشن چونکە لە کۆتاییدا دەسکەوتەکانیان لەگەڵدا بەش دەکەن!

تەنیا لەو کاتەدا پیشەسازی رۆڵی راستەقینەی خۆی دەبینێ لە وەلاتانی هەژاری و زێدەکردنی داهات و بەرزبونەوەی بەهای دراوی خۆماڵی و دابینکردنی ئامرازەکانی هێز بۆ وڵات، سەرەڕای ئەو رێژەنەی کە ژیانی خەڵکی دادەگرێ کاتێك نەفرەتی سوخۆری[1] لە ژیانی خۆیان هەڵدەگرن، جا خودا ناخۆشیان لەسەر هەڵدەگرێ و، رێژەنەکانی ئاسمان و زەویان بۆ دەکاتەوە..

* * *

---

[1] رێژەن: البركة            سوخۆری: أكل الربا

(چاكسازان) وەك باسمانكرد گازاندەیان لــە روحـی بێسـەروبەری و لـەخۆڕایی و نەمانی رۆحی زانستی و كرداری لە توێژینەوەی گیروگرفتەكاندا هەیە..

ئەمەش هەموی راستە.. بەڵام هۆی چیە؟

ئایا ئەو (چاكساز)انە بەدرێژایی یەك سەدەی تەواو هــەوڵیان نـەدا ئـەم هـەمو عەیبە چاك بكەن؟

ئەدی بۆ سەرنەكەوتن؟!

ئەو ناوچەیەی كە بە قەدەری خودا ئیسلامی تێدا بڵاوبۆوە، زۆربەی-هەروەك لە كتێبی (واقعنا المعاصر) رونمانكردۆتەوە- دەكەوێتە ناوچەی گــەرم و نیمچـە گـەرم (مەگـەر زۆر بەدەگمـەن)، جـا ئـەم ژینگەیـە-بەسروشـتی خـۆی- ژینگەیـەكی بێسەروبەرە و رقی لە سیستەمە، خۆڕسكە و رقی لە نەخشەكێشانە، پشـوكورتە و گەرم دەبێ و هەڵدەچی پاشان دوای ماوەیەكی كەم سارد دەبێتەوە بەر لــەوەی ئـەو كارە ئەنجام بدات كە بۆی گەرم داهاتبو!

ئیسلام لەوێوە هەڵیگرتەوە و، (چاكترین ئوممەتی لێ دروست كرد كە بۆ خـەڵكی دەركەوتبێ).

حەزیش ناكەم لەوێ چیم گوتوە لێرە دوبارەی بكەمەوە..

بەڵام ئەم ئوممەتە رێكبون و سیستەم و پشودرێژی و گیانی زانستی و تـێڕوانینی بابەتیانە لە ئاینەكەی فێربو كە تەواو دەكەوێتە سەر دژەهێڵی كاریگەری ژینگــەی بێسەروبەری لە خۆڕا و پەرتەوازە.. ئەمەش یەكێك بو لە كاریگەریەكانی كـاركردن بـە داخوازیـە زۆر و جۆراوجـۆر و هەمەلایەنەكـەی (لا إلـه إلاّ الله)، جـا كـاتێك كاریگەری ئیسلام كەمبۆوە، لەوكاتەی (لا إله إلاّ الله) لە ناوەرۆكە راستەقینەكەی خاڵی كرا و، هەمو داواكراوێك لەم ئوممەتە بوە بەڕاسـتدانان و دانپێدانـان، دوبـارە

کاریگەری ژینگە گەڕایەوەو بەسەر خەڵکیدا زاڵبو، خەڵك گەڕانەوە بۆ بێسەروبەری خۆیان و، خۆڕسکی و، پەرتەوازەیی و، پشوکورتی خۆیان..

(چاکسازان)یش گازاندە لەوە دەکەن و، حەقی خۆشیانە..

بەڵام ڕێگا چۆنە بۆ چاکسازی ئەو کاریگەریە گەورەیەی ژینگە لە دەرونی خەڵکیدا، لەگەڵ نەبونی تاکە ڕەگەزێك کە ڕەنگە بەسەر کاریگەری ژینگەدا زاڵبێ، کە ئەویش بریتیە لە بیروباوەڕ بە چەمکە ڕاستەقینەکەی، وەك چۆن خودا یەکەمجار دایبەزاندوە و، چۆن یەکەمجار ئەرکی خۆی بەتەواوی لەژیانی ئوممەتدا بینی؟![1]

ئایا هیچ ڕێگەیەك هەیە؟!

* * *

کە بە خەڵکی دەڵێین: ڕێگای ڕزگاری و سەرفرازی بە ڕاستکردنەوەی تێکڕای چەمکە ئیسلامیەکان دەست پێدەکا و لە پێش هەموشیانەوە چەمکی (لا إله إلاّ الله).. ئێمە چ دەڵێین ڕێك و ڕاست هەمان شتمان مەبەستە..

ئێمە چاك دەزانین گیروگرفتی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و فیکری و ئاکاری مەزنمان هەن تا ڕادەیەك وا لە خەڵکێکی زۆر دەکەن لە ئاست چاکسازی توشی بێهیوایی بێن.

بەڵام لە هەمانکات دەزانین هەرهەوڵێك بۆ چاکسازی کە گەڕانەوەی خەڵکی بۆ حەقیقەتی ئیسلام لە حیسابی خۆی دانەنێ، هەولێکی ناکامە و هەر لەسەری ڕێوە جێدەمێنێ..

ئەزمونی سەدەیەکی تەواویش بۆ سەلماندنی ئەم بۆچونە بەسە..

---

[1] ئەگەر دەتەوێ بگەڕێوە بۆ بەشی (الصحوة الإسلامية) لە کتێبی (واقعنا المعاصر).

ئەوانەی تەمایان بە چاکسازی هەیە لەسەر شێوازی رۆژئاوایی-سەرمایەداری یا کۆمۆنیستی- بە بانگەشەی ئەوەی کــە ئـەوروپا-بەهــەردو بەشـەکەیەوە- هـەمو هۆکارەکانی هێز و باڵادەستی هەیە کــە ئێمــە لێـی بێبەشـین، جـا ئێمـەش بۆیـە پێویستە شوێن رێچکەی ئەوان بکەوین تــاکو بگەینــە هــەمان ئــەنجام لــەو هــێز و باڵادەستیەی ئــەوان پێــی گەیشــتون.. ئەوانــە خۆیــان لــە رێــڕەوی ســوننەتەکانی پەروەردگار دەبوێرن کە لە ژیانی مرۆڤدا هەن، چونکە لە روونـاهی خـوا پــەردەپۆش کراون، جا بە پەردەپۆشکراوی بیردەکەنەوە.

ئەوەی لە ئەوروپای بێبڕوای بێدیندا رودەدا بەخۆی وەدیــهاتنی بــەڵای کەمــەوە دوانە لە سوننەتەکانی خودا:

﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَـــيْءٍ : جـا وەختـێ ئـەو هەمو ئامۆژگاریانەیان کە کرابون لەبیر چوەوە، هەمو دەرگاکانی بەختــەوەریمان بــۆ کردنەوە﴾الأنعام/٤٤.

﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيـــهَا لاَ يُبْخَسُونَ: هەرکێ ژینی ئەم دنیایە و زەرق و بەرقی ئــەوی دەوێ، ئێمــە پاداشـتی کردەوەیــان-بەتــەواوی- هــەر لـــەم دنیایـــە دەدەینـــێ و هیچیشـــیان لێ کـــەم ناکرێتەوە.﴾هود/١٥.

ئەوروپا بڕوای نەما، لە هەمانکاتدا ئارەزوی لە ژیــانی دونیـا و ئارایشــتەکەی بو، هەمو هەوڵی خۆشی بۆ خستنەگەڕ، خوداش بەپێی ئەم دو سوننەتە پێکەوە لــە زەویدا باڵادەستی کردن.

بەڵام (چاکسازان)ی خاوەن مێشکی وەرگێڕدراو، لــە دو مەســەلە بێئاگــان کــە ئەوانیش هەر لە سوننەتەکانی خودان.

یەکەمیان ئەوەیە کە خودا بە هەمان شێوە موسڵمانان باڵادەست ناکا کە بێبڕوایانی پێ باڵادەست دەکا! بەڵکو تەنیا ئەوکاتە باڵادەستیان دەکا کە لەسەر ڕێبازی وی راستاڵ دەبن:

﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا: خوا بەوانەی لەئێوە بڕوایان هەیە و ئاکار چاکن، بەڵێنی دا: لەم زەمینە دەیانکاتە جێگەنشین، هەروەکو چۆن ئەوانەی بەر لەوانی کردە جێنشین، دینەکەشیان-کە خۆی پەسەندی کردوە- هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی، تا تەنیا من بپەرستن، هیچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن.﴾النور/٥٥.

بەڵام کاتێك لە ڕێبازەکەی دوردەکەونەوە بەهیچ شێوەیەك باڵادەستیان ناکات هەتاکو دوبارە بۆ سەر ڕێگاکەی دەگەڕێنەوە.

دوەمیش ئەوەیە کە ئەم باڵادەستبونە-ی دەست کافران- تاسەر نیە.. بەڵکو قۆناغێکی زەمەنی دیاریکراوە کە خودای-پاك و بەرز- تەقدیری کردوەو پاشان سونەتەکەی بە تێکشکانی بێبڕوایان کۆتایی دێ:

﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ، فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: جا وەختێ ئەو هەمو ئامۆژگاریانەیان کە کرابون لەبیر چوەوە، هەمو دەرگاکانی بەختەوەریمان بۆ کردنەوە هەتا کەوتنە خۆشی و شادی. ئەوسا لەپڕ و نەکاوێك بەر تورەیی خۆمان خستن و هەمو ناهومێد مانەوە... ئیتر ئەوسا

ئەوکەسانەی پیشەیان هەر ناهەقی بو، دوابڕاویــون و سـپاس بـۆ خـوای راهێنــەری هەمو دنیا.﴾الأنعام/٤٤-٤٥.

ئەمڕۆ وا بـــۆ خـودی رۆژئـاوایش دەرکـەوتوە کـە ژیارەکـەی رو لـە داڕمانــە، هەرچەندە ئەمەش زۆر دور دیاربێ!

﴿فَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَحْوِيــلاً: قـەت نـابینی رێ و شوێنی(سوننەتی) خوا بگۆڕدرێ و جێبەجێ بێ﴾فاطر/٤٣.

ئەمــەش هــەموی سـەرەڕای حەقیقـەتێکی مـــەزن کـــە ئـــەوروپای بێـــبڕوای لیٚبێئاگایە-چونکە بێبڕوایە- هەرچی ئەوانەشن کە دەڵێن موسڵمانین ئەوا نابێ لێی بێئاگابن، دەنا-وەکو (براکانیان)- کافر دەبن!

ئەو خۆشیەی ئەوروپا تێیدایە-بۆ کاتێکی سنوورداره و لەو بەرەکەتە خاڵیــە کـە خـودا تـەنیا بـە بڕوادارانـی تایبـەتکردوە- رابواردنـی ژیـانی دنیایـــە و بـــەس، لەقیامەتیش بێجگە لە دۆزەخ چیدیکەیان نیە:

﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيـــهَا لاَ يُبْخَسُونَ، أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُـــوا فِيـــهَا وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ: هەرکێ ژینی ئەم دنیایـــە و زەرق و بــەرقی ئـەوی دەوێ، ئێمە پاداشتی کردەوەیان-بەتەواوی- هەر لەم دنیایە دەدەینێ و هیچیشیان لیٚ کەم ناکرێتەوە.. ئەوانە هەر ئەوکەسانەن رۆژی قیامەت غــەیری ئـاگر، بەشـیان نیــە و هەرچی لە زەمین کردیان بە فیڕۆ چو.﴾هود/١٥-١٦.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الأنعام وَالنَّـــارُ مَثْــوًى لَـــهُمْ: ئەوانەی کە کافر و بێبڕوان، لەدنیادا ڕایدەبوێرن و دەلەوەڕێن، وەك لەوەڕانی ئـاژەڵ و جێگەیان لە ئاگردایە.﴾محمد/١٢.

بـەڵام موسـڵمانان بـۆ ئەمـە تێناکۆشـن! بـەڵکو خـودا بـەڵێنی جێنشـینی و باڵادەسبون و ئاسایشـی لەسـەر زەویـدا پێـداون-ئەمـەش ئەوپـەڕی تـەمای ئـەو کەسانەیە کە ژیانی دنیایان دەوێ- و هەروەها بەڵێنی پێداون کە لە ژیـانی دنیـادا ڕێژەنی ئاسمان و زەمینیان بۆ بکاتەوە، ئەمەش لە بێبڕوایان گیراوەتـەوەو هەرچـەند خێروبێریان لەلا زۆربێ، لەگەڵ ئارخـەیان[1] بونـی دڵ کـە بێبڕوایـان لێـی بێبەشـن، چونکە ئەمە بەیادی خودا دێتەدی و ئەوانیش یـادی خـودا ناکـەن.. هـەروەها لـە سەروی هەمو ئەوانـەش بـەڵێنی بەهەشـتگەلێکی پێـداون کـە روباریـان بـەژێردا ڕەتدەبێ، لەگەڵ ڕەزامەندیەکی مەزنتری خودا:

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنْ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ: نیشتەجێی ئەو بازێڕانە ئەگەر خوایان بناسیبا و خۆپارێزیبان، دەروازەی بەرەکـەتمان لە ئاسمان و زەمینەوە بەڕویاندا دەکردەوە.﴾الأعراف/٩٦.

﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ: ئەوکەسانەی کە باوەڕیان بەخودا هەیە و بەیادی خوا دڵیان ئارخـەیان دەبـێ، بـاش بزانن کە یادی خوا ئۆقرە و ئارامی دڵانە.﴾الرعد/٢٨.

﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ: خوا بەڵێنی بە پیاوان و ژنانی بەباوەڕ داوە، باغاتێکیان خـەڵات دەکـا، جۆباریـان بەبەردا دەڕوا و هەر دەوێدا دەمێنێتەوە. چەندین خانوی هەرەباشی لـەناو باغـاتی

[1] ئارخەیان: طمأنينة

عەدندا بۆ دانـاون. رەزای خـوداش، کـە لـە گشـتی هێژاتـرە، دەسـکەوتی مـەزن ئەمەیە.﴾التوبة/٧٢.

جـا ئـەوە کێیـە بەهەشـت بـە دۆزەخ بگۆڕێتـەوەو، پاشـانیش بڵـێ مـن لـە موسڵمانانم؟!

❊ ❊ ❊

**ڕێی ڕزگاری و سەرفرازی بریتیە لە ڕاستکردنەوەی چەمکە ئیسـلامیەکان و لـە چەمکی (لا إله إلاّ الله)وە دەست پێدەکات.**

**ئێمە وا بۆ خەڵك هەڵنابەستین کە دارعەسایەکی ئەفسوناوی هەیە بۆیـان دریـژ دەکرێ و گیروگرفتـەکانیان بـۆ چارەسـەر دەکـا، هـەر تـەنیا ئەگـەر چەمکـەکانی ئیسلامیان لە دەرونی خۆیاندا ڕاستکردەوە و، گەڕانـەوە بـۆ مومارەسـەکردنی لـە جیهانی واقیعدا..**

**بەڵکو ئێمە لە شەڕێکی کوشـندە ئاگاداریـان دەکەینـەوە کـە هـەمو دنیـا لـە سەریانی بەرپا دەکا، هەروەك کوفر ئەمڕۆ شەڕی موسڵمانان دەکا لە ئەفغانستان..**

**سەرەڕای ئەو هەوڵە (بابەتیانە)ی کە دەبێ بیدەن بۆ دۆزینەوەی چارەسەری کـرداری بۆ گیروگرفتەکانیان. کە لە شەریعەتی خوا و لە بەرنامەکەی هەڵێنجراوە، کە دەبێ حوکمی ژیان بکات، چ بۆ نەهێشتنی دواکەوتنی ئابوری یان زانستی یان ژیاری یان تەکنەلۆجی یان جەنگی یان فیکری یان سیاسی.. تاد.. تاد.. تاد..**

**لێرەدا ڕەنگە هەبێ بڵێ: ئەگەر لە هەردو حاڵەتاندا هـەر هـەوڵ بدەیـن، بۆچـی خۆمـان لەرادەبـەدەر مـاندو بکـەین.. بۆچـی چارەسـەرە ئامادەکـانی ئـەوروپا وەرنەگرین-ڕۆژئاواکەی بێ یا ڕۆژهەڵاتەکەی هەرکەس بە زەوقی خۆی- دوژمنداری**

هەمو دنیاش لەکۆڵ خۆمان بکەینەوە، لەگـەڵ ئـەو هـەمو هـەوڵ و توانایـەی لـە ڕوبەڕوبونەوەی ئەو دوژمنداریەدا بەفیڕۆی دەدەین؟!

وەڵامی ئەم پرسەش ئەزمونی سەدەیەکی تەواوە!

سەدەیەکی تەواو گیروگرفتە بناغەییەکانی تێدا چارەسەر نـەبوە بـەڵکو گـرێ و گۆڵ و توندوتیژی پتر بوە، سەرەڕای پتر سوکبون و زەبونی و وێڵی و سەرگەردانی..

گێلایەتیەکی تاڵیشە مرۆڤ زیاتر ژار هـەڵمژێ و، هـەمو جـارێك واش تێبگـا کەوا ڕو لە چاکبونەوەیە!

هەرچی ڕێگای ئیسلامە، بەڵێ ڕێگایەکی زەحمەتە.. بەڵێ مایەی هیلاکبونـە.. بەڵێ بە ترکزان دەورە دراوە.. بەڵام ڕێگای ئازادانە..

هەرچی ڕێچکەی کۆیلانیشە.. ئەوە هەر ڕێچکەی کۆیلانە!

* * *

ئەو (لا إله إلاّ الله)یەی ئێمە بانگەوازی بۆ دەکەین، ئەوە نیە کە مورجیئە کۆن و نوێکان بانگەوازیان بۆ کردوە!

ئەوەی مورجیئەکان-بەکۆن و تازەیانەوە- بانگـەوازی بـۆ دەکـەن و بریتیـە لـە (بەڕاستدانان و دانپێداهێنان). هیچ لەو واقیعە تاڵە نـاگۆڕێ کـە ئـەمڕۆ خـەڵکی تێدا دەژین، سەرەڕای ئەوەی کە وا لە گەنجانی (ڕۆشنبیر) دەکـا پشـت لـە ئیسـلام بکەن و، لە تاقانە ڕێگەیەك دوریان دەخاتەوە کە چاکــە و خـێری ڕاسـتەقینەی لێ دێتەدی.. خـێری دنیـا و قیامـەت پێکـەوە، چونکـە ئێمـە کـاتێك بەوگەنجانـەی هەڵوەدای ڕۆژئاوان دەڵێین: ئەو کۆمەڵگەیانەی ئەمڕۆ لە ئارادان ئیسـلامین و، ئـەو ئاومالکانەی ئەمڕۆش دەژین(موسڵمانن).. چۆن ئـەوەی لێ چاوەڕوان دەکەین ڕو لـە

ئیسلام بکا بۆ چارەسەرکردنی هەریەکێك لە گیروگرفتەکانی؟! چۆن تـەمامان پێـی دەبێ روی خۆی راست راگرێ و،[1] ملی بەرەو رۆژئاوا وەرسوڕاوی راستکاتەوە؟!

بەڵکو ئەو (لا إله إلاّ الله)یـەی بانگـەوازی بـۆ دەکـەین ئـەوەی کـە خـودا لـە کتێبەکەی خۆیدا دایبەزاندوە و، پێغەمبەرﷺ فـێری یـاوەرانی کـردوە و، پێشـینە صالّحەکانﷺ مومارەسەیان کردوە، ئـەو (لا إلـه إلاّ الله)یـەی کـە داخوازیـەکانی هەن..

یەکتاپەرستی بـاوەڕ، یەکتاپەرسـتی پەرسـتن، یەکتاپەرسـتی حاکمیـەت، هەڵگرتنی ئاکارەکانی (لا إلـه إلاّ الله)، ئـەنجامدانی ئەرکـەکانی پـەروەردگار کـە زانسـتخوازی و، ئاوەدانکردنـەوەی زەوی و، خـۆ سـازدان بـۆ دوژمنـانی خـوا و، پەخشکردنی بانگەواز لەسەر روی زەوی و، جیهاد لەپێناو خوادا دەگرێتەوە.

جا کاتێك (لا إله إلاّ الله) لەدڵی خەڵکیدا لـەوە پاکدەبێتـەوە کـە لـە فیکـری ئیرجائیەوە بۆی هاتوە، بەتایبەتی هـزری مورجیئـە تازەکارەکـان کـە لـە تێکـڕای هەمو داخوازیەکانی بەتاڵیان کردوە..

کاتێك کە داخوازی لە ژیانی ئەو کەسانەی بەزار دەیڵێن دەبێتە پەرستنی خـودا بەتـەنیا و بێهاوبـەش و، ژیانیـان لەسـەر شـەریعەتی خـودا و بەرنامەکـەی دادەمەزرێنن و، بە جیهادێکی راستەقینە لەپێناو خوادا جیهاد دەکەن..

ئەو رۆژە ژیانیان سەرتاپا دەگۆڕێ و.. سوکی و زەبونی و، وێڵی و سـەرگەردانی و، هەژاری و نەزانی و نەخۆشی لە خۆیان دەتەکێنن و، خودا جارێکی دیکە لەسـەر

---

١ خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا : تۆ هەر رو لەم دینە بکە و هـەر بـەرەو هـەق هەنگاو بنێ.﴾الروم/٣٠.

زەوی باڵادەستیان دەکات هەروەك بەڵێنی پێداون.. نەك بە دارعەسایەکی ئەفسوناوی، بەڵکو بە هەوڵ و ئارەق و خوێن و فرمێسك.. بەڵام وەك ئەو هەوڵە نابێ کە ئەمڕۆ دەیدەن لەنێو سەرگەردانی و، ئەو ئارەقەی کە لە زەبونی دەیڕێژن و، ئەو خوێنەی وەکو باجی ئەو زەبونیە دەیڕێژن و، ئەو فرمێسکەی لە داخ و حەسرەتی وێڵبونێ دەیڕێژن.. بەڵکو هەموی لە پێناوی خودا دەبێ.. جا خودا لە ژیانی دنیا پیرۆزی دەکا و.. لە قیامەتیشدا بە بەهەشت و ڕەزامەندی پاداشت و ڕێزانەی دەداتەوە.

# بەندی دووەم

# جەمکەپەرستی

# چەمکی پەرستن

لە ترسناکترین ئەو لاڕێبونانەی کە نەوە پاشینەکانی موسڵمانان تێیکەوتون- پاش لاڕێبونیان لە تێگەیشتنی (لا إله إلاّ الله)- بریتیە لە لاڕێبونیان لە تێڕوانینی چەمکی پەرستن.

کاتێك مرۆڤ بەراوردێك ئەنجام دەدات لەنێوان ئەو چەمکە گشتگیر و فراوانەی کە نەوەکانی یەکەمین لەبارەی مەسەلەی پەرستنەوە تێی گەیشتبون، لەگەڵ ئەو چەمکە نابوت و بودەڵەیەی کە نەوە هاوچەرخەکان تێی گەیشتون، پێی سەیر نابێ چۆن ئەم ئوممەتە لە ترۆپکی باڵای خۆیەوە هەڵدێرا و کەوتە ئەو دامێنەی ئەمڕۆ تێیدا دەژی و، چۆن لە پلەوپایەی سەرکردایەتیکردن و پێشەوایەتی تێکڕای مرۆڤایەتی دابەزی، تا ببێتە ئەو ئاومالکەیەی ئوممەتەکان لە هەمو لاوە قەپی لێدەگرن، هەروەك گورگ نێچیری خۆی دەڕنێتەوە و، لەهەمانکات مرۆڤ دەزانێ ئەو رێگەیە کامەیە کە دەبێ رابونی ئیسلامی بگرێتە بەر کاتێك کە هەوڵ دەدا ئەو ئاومالکەیە لەو دامێنە هەڵگرێتەوە کە تێیدا دەژی، تا خواستی خوا چۆنە ئاوا بگەڕێتەوە و ببێتە ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا دەرکەوتن و سەرتان هەڵدا.﴾آل عمران/١١٠.

چەمکی راستودروستی پەرستن لە هەستی نەوەکانی یەکەمیندا ئەوەبو کە پەرستنی خوا بریتیە لە سەرتاپای مەبەستی بونی مرۆڤ، هەروەك لەو ئایەتە پیرۆزە تێیگەیشتون کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ: مـن

هەر بۆیە جندۆکە و مرۆڤم وەدیهێنا، هەتاکو بمپەرستن.﴾الذاريات/٥٦.

ئەم ئایەتە پیرۆزە لە هەستی ئەوان مانایەکی زۆر گەورە و قوڵی لەخۆگرتبو، کە سەرتاپای هەمو ژیانی مرۆڤی دەگرتەوە، چونکە قورئان بە زمانی خۆیان دابەزیبو و، ئەوان لە فروسمانەکانی[1] ئەو زمانە دەگەیشتن و، نهێنیە رەوانبێژیەکانیان پەی پێ دەبرد، جا لە واتای ئایەتەکە دەرکیان بەوە دەکرد کە مەبەستی بونی مرۆڤ لە پەرستندا کۆبۆتەوەو، هەرگیز بۆ شتێکی دیکە لێی ناترازێ. چونکە (نفي) و (استثناء) لە زمانی عەرەبیدا بەهێزترین شێوەی کۆکردنەوەو کورتهەڵاتنن، واتاکەی لێرەشدا: رەتکردنەوەی هەمو مەبەستێکی بونی مرۆڤە بێجگە لە پەرستن، لەگەڵ کۆکردنەوەی تێکرای مەبەستی ئەم بونەشی لە پەرستنی خوادا.[2]

---

١ فروسمان: إيحاء.

٢ هەندێك خەڵك هەن مشتومڕێکی زیهنی بێسود بەرپا دەکەن، وادەگەیەنێ کە مرۆڤ بۆ تاقیکردنەوە وەدیهێنراوە نەك بۆ پەرستن، بە پشت بەستن بەم ئایەتە پیرۆزانە: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ : ئێمە مرۆڤمان لە تنۆکێکی ئاوێتە وەدیهێنا تا تاقی بکەینەوە.﴾الانسان/٢. ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً : ئەوە کە مردن و ژینی داهێناوە تا ئێوە تاقیکاتەوە کامتان ئاکاری جوانترە.﴾الملك/٢. ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً: هەرچی لەم سەرزەمینەیە ئێمە کردن بە ئارایش تا تاقیان بکەینەوە کامەیان کارچاکتر دەبن.﴾الکهف/٧.. قورئانی پیرۆزیش لەگەڵ خۆیدا پێچەوانە نیە، بەڵکو بەشێکی راڤەی بەشێکی دیکەی دەکات و وردی دەکاتەوە. جا ناکۆکی لە نێوان ئەم ئایەتانەدا نیە. چونکە ئەو تاقیکردنەوەی مرۆڤ لە ژیانی دنیادا توشی دێ بریتیە لەوەی کە هەرچی لەسەر دنیادایە ئارایشە. جا مرۆڤ لە هەڵوێستی بەرامبەر ئەو ئارایشتە تاقی دەکرێتەوە: ئایا تیایدا پابەند دەبێ بە پەرستنی خودا، واتە لەچێژ لێوەرگرتنی لە ئاستێك رادەوەستێ کە خودا حەڵاڵی کردوە، یا شەیتان دەپەرستێ و سنورەکانی خودا دەبەزێنێ؟ بەمشێوەیە پەرستنی خودا خوازگەکەیە و بریتیە لە مەبەستی بونی مرۆڤ نەك شتێکی دیکە.

لەپاش ئەوەشدا هەستێکی راستگۆیانەیان بەمەزنێتی خوای-بەرز و باڵادەست-هەبو و دوابەدوای ئەمەش هەستیان بەوە دەکرد کە بەندە-لەپایەی بەندایەتیدا-چی لەسەر شانە بەرامبەر خودا-لەپایەی خواوەندێتیدا- لە دڵڕاستی بەندایەتی بۆ خوا و، دڵڕاستی[1] پەرستنی.. پێکەوە.

ئەوجا چەمکی پەرستنیش لەلای ئەوان تەنیا لە چوارچێوەی دروشمەکانی پەرستندا[2] کۆنەدەبۆوە، هەروەك لە هەستی نەوەکانی دواییندا کە تێگەیشتنێکی نامۆ بە ئیسلامیان هێناوە لەم چوارچێوەیە کۆبۆتەوە.

ئاشکرایە دروشمەکانی پەرستن نابێ بریتی بن لە هەمو (پەرستن)ێکی داواکراو لە مرۆڤ. مادام مەبەستی بونی مرۆڤ لە پەرستنی خوادا کۆ ببێتەوە هەروەکو ئایەتە پیرۆزەکە باسی دەکا، چۆن مرۆڤ دەتوانی تەنیا بە دروشمەکانی پەرستن مافی ئەو پەرستنە بدات؟!

ئایا دروشمەکانی پەرستن لە رۆژ و شەوێکدا چەند دەخایەنن؟ ئایا لە هەمو تەمەنی مرۆڤدا چەند دەخایەنن؟

ئەدی ئەوەی لە تەمەن دەمێنێتەوەو؟ ئەو وزەیەی دەمێنێتەوە؟ لە چ خەرج دەکرێ و کێوە دەچێ؟ لە پەرستن خەرج دەکرێ یا لە غەیری پەرستن؟ ئەگەر لە غەیری پەرستن بێ ئەدی چۆن مەبەستی بونی مرۆڤ دێتە دی کە ئایەتەکە بە تەواوی لە خوداپەرستندا کۆی کردۆتەوە؟ چۆن بۆ مرۆڤیش دروستە-لەخۆڕا- بەبێ مۆڵەتی خودا مەبەستێك بۆ بونی خۆی-یا بەشێك لە بونی خۆی- دابنێ؟

* * *

---

١ دڵڕاستی: اخلاص.

٢ دروشمەکانی پەرستن: الشعائر التعبدية .

مرۆڤ-هەرچەند هەوڵدا- ناتوانێ تەنیا لە میانەی دروشمەکانی پەرستن، لە نوێژ و رۆژی و زەکات و حەج ئەرکی ئەو پەرستنە جێبەجێ بکات کـە بەرامبـەر خـودا لەسەری فەرز کراوە..

مرۆڤ فریشتە نیە و.. ناشبێتە فریشتە.

هەر فریشتەش-بە تەنیا ئەوەندەی ئێمە بزانین- ئەو وەدیهێنراوە نورانی و ڕونەن کە شەو و رۆژ پاکیگاری[1] دەکەن و ساردنابنەوە: ﴿وَمَنْ عِنْدَهُ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ عَــنْ عِبَادَتِهِ وَلاَ يَسْتَحْسِرُونَ، يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لاَ يَفْتُرُونَ: ئەوانەش کـە لـەلای ئەون، لە پەرستنی بەفیز نین، فلیش نابن.. بەشەو و رۆژ هەر پاکانەی خوا دەکـەن، سستی نازانن.﴾الأنبياء/١٩-٢٠. هەرئەوانیشن-بەتـەنیا- کـە هیـچ فـەرمانێکی خودا ناشکێنن: ﴿لاَ يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَـــرُونَ: لـە فـەرمانی دەرناکەون و هەرچی بەوانی دەسپێرێ بەجێی دێنن.﴾التحريم/٦.

کەچی مرۆڤ ئەو گیانلەبەرەی لە مشتێك قوڕی زەوی و فویەك لە ڕۆحی خــودا وەدیـهاتوە، کـە-لـەپاڵ رۆحـە رۆشــــنەکەی- جەستەیەکشـــی لـــەخۆگرتوە کــە زەحمەتدەکێشێ و هەوڵدەدا و، دەخــوا و دەخواتــەوە و، مــاندو دەبــێ و دەنــوێ و، مێشکێکیش بیر لە مشوری داخــوازی هەســتی و واتاییــەکانی ژیــان دەکاتــەوە و، لەگەڵێك بواردا خەیاڵ دەگێڕێ، بۆیە ناتوانێ بەشێوازی فریشتان خودا بپەرستێ کە شەو و رۆژ پاکیگاری دەکەن و ساردنابنەوە و، بەشتی دیکەش خەریك نابن کە لــە پاکیگاریان بکات.

ئەگەر خوداش بیخواستبا کە مرۆڤ بە پەرستنێکی چەشنی فریشـــتان ئـەرکبار بکا، ئەوا وزەی فریشتانی پێدەبەخشێ تا پاکیگاریەکی بەردەوام و بێ ســاردبونەوە

[1] پاکیگاری: تسبيح

ئەنجام بدات و، هەر لە سەرەتاوە پێکهاتەکەی بەشێوەیەکی دیکـە رێـك دەخسـت، کە سارد نەبێتەوە و ماندونـەبێ و بـێزار نـەبێ، چونکـە خـودا بـە بـەزەیی خـۆی هەرکەس لە قەدەر توانای خـۆی ئـەرکبار دەکـا و، ئـەو پەرسـتنەی لەسـەر هـەر بونەوەرێکی فەرزکردوە لە وەدیهێنراوەکانی خۆی، لەگەڵ سروشتی ئەو بونـــەوەرە و سنوری وزەکانیدا گونجاوە..

گـەردونیش هـەموی-بەبونەوەرەکانیـەوە- بـە فـەرمانی پـەروەردگاری خـــۆی پەروەردگاری خۆی دەپەرستێ..[1] هەریەکەش بەو شێوازە تایبەتەی کـە خـودا بـۆی ئامادەکردوە:

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لاَ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ: هەمو شـتێك- بـە پەسـن دانـەوە- پاکیگـاری ئـەو دەکـا، بـەڵام ئێـوە پاکیگاریـەکانی ئـــەوان نابیسن.﴾الإسراء/٤٤.

﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ: تـۆ نـابینی ئـەو کەسـانەی وا لـەناو عاسمانـەکان و ئەوانـەی لـە زەمینـــدان و خـۆر و هـــەیڤ و ئەستێرەکان و کۆسار و درەختان و جانەوەر و زۆر لە مەردم سـوژدە هـەر بـۆ خـوا دەبەن؟﴾الحج/١٨.

﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا فَقَالَ لَـــهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ: پاشان روی نـا لـە بـەرزایی، کـە ئەوسا هەر تاریکان بو، بەوان و بە زەمینی گوت: خۆش یا ناخۆش، دەبێ بێنە بەر فەرمانم. گوتیان: وا بەخۆشی هاتین.﴾فصلت/١١.

---

١ بێجگە لە یاخیانی جنۆکە و مرۆڤ.

بەلاّم خـودای-پـاك و بـەرز- وای خواسـتوه کـه مـرۆڤ بـه جۆرێکـی تاکانـه وەدیبێنێ لەنێو سەرجه م بونەوەرانی خۆی..

﴿ذَلِكَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ، الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِنْ طِينٍ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلاَلَةٍ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ، ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِنْ رُوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ: خودایه زانا به نادیار و دیاران و هـەر خـۆی خـاوەن دەسـەلاّت و دلۆڤانـه، خـودا کەسێکه هەمو شـتی بەوپـەڕی رێکـی و لـەباری دروسـت کـرد و مرۆڤیشـی لـه سـەرەتادا لـه مـاکی قـوڕ وەدی هێنـا..لەپاشـان نەتـەوەی ئـەمی لـه پالاّوتـەی چۆرەئاوێکی کەم بایەخ وەدیهێنا..ئەوسا راسته و پاستەی کـرد و لـەگیانی خـۆی فـوی پێداکـرد، گوێچکـه و چـاو و دلّیشـی داوه بـه ئێـوه. کـەمتان شوکرانەبژێرن.﴾السجدة/٦-٩.

جا بەهرەکانی ژماردوه و، زانستی ئەوەنده فـێرکردوه کـه لەگـەلّ ئـەو ئەرکـه رێکبکەوێ که بۆی وەدیهێنراوە:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً: ئـەو کاتـەی پەروەردگاری تۆ به فریشـتانی راگـەیاند: مـن دەمـەوێ جێنشـینێك لەسـەرزەمین دیاری بکەم.﴾البقرة/٣٠.

﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا: خودا هەمو ناوێکی فێری ئادەم کرد﴾البقرة/٣١.

گەلێك ئامرازیشی بۆ کەوی و رامکردوه که لەم کارەدا یارمەتی بدا:

﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ: هـەرچی لـەناو ئاسمانـەکان و زەمینـدان، هـەموی هـی خـودان، ئـەو بـۆ ئێـوەی کـەوی کردون.﴾الجاثية/١٣.

لەمیانەی ئەو هەموەشدا ساز و ئامادەی کردوە تا ئەو راسپاردەیە هەڵگرێ کـە ئاسمانەکان و زەوی پێیان هەڵنەگیرا:

﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَـأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَـهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ: ئێمە ئەم ئەمانەتیەمان لەبەرامبـەر ئاسمانـەکان و زەمین و ئەو هەمو کێوانـە رانـا، هیچیـان لـەخۆیان رانـەدی بچنـە ژێـری و لێـی دەترسان، پاشان مرۆڤ لەئەستۆی خۆی گرت..﴾الأحزاب/٧٢.

جـ مرۆڤ لە هەمو ئەو شتانە-و لەدەست هەمو ئەو شتانە- لە مـاندوبونێك و زەحمەتکێشانێکی بەردەوامدایە:

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي كَبَدٍ: ئێمە مرۆڤمان لەگەڵ مـاندوبون و خـەمان وەدی هێنا.﴾البلد ٤.

﴿يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلاَقِيهِ: ئەی مـرۆڤ! زەحمـەت و رەنجی زۆر دەدەی بگەی بە پەروەردگاری خۆت، سا تۆش دێی.﴾الأنشقاق/٦.

پاشان خودا پەرستنێکی بەسەردا فەرزکردوە کە لەگەڵ پێکهاتـە و ئەرکەکـەیدا گونجاوبێ، لەگەڵ وزە جۆراوجۆرەکانی، ماندوبونی و، ئەو رەنـج و زەحمەتـەی لێـی دانابڕێ کۆك و گونجاوبێ. لە هەمانکاتیشدا لەگەڵ ئەو بەهرانـەی رێکبکـەوێ کـە لەناو بونەوەراندا تایبەتمەندی کردوە و، لەگەڵ بـوارە فراوانـەکانی چـالاکی و، ئـەو راسپاردەیەی هەڵیدەگرێ.. پەرستنێك لەهیچ شتێك پەکی ناخا و، شتێکی ناخاتـە سەرشان کە پێی نەکرێ و، لە هەمانکاتدا فراواندەبێ تا هەمو بونی دادەگرێ هـەر لەساتی ئەرکباربونیەوە تا ساتی مردن، لە هیچ چرکەیەك لە چرکـەکانی هۆشیاری لێی دانابڕێ و، لە چاوتروکانێك یا خولیایەك یا جۆرێك لە جۆرەکانی چالاکی جێـی نایەڵێ:-

﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَـــهُ: بڵێ: من نوێژکـردنم و پێکـهێنانی ڕێوشـوێنی حـەج کـردنم و ژیـن و مـەرگم، بـۆ خودایە، کە هەرخۆی پەروەردگاری جیهانە، هیچ شەریکی نیە.﴾الأنعـــام/١٦٢-١٦٣.

ئەوە ئەو پەرسـتنەیە کـە مـرۆڤ پێـی ئـەرکبار کـراوە، نوێـژ و نوسـك-واتـە دروشمەکانی پەرستن- دەگرێتەوە و لەگەڵ ئەوانیشدا هـەر هـەمو ژیـان دادەگـرێ.. نەوەی یەکەمیش﷽ بەم شێوەیە لە واتای پەرستن گەیشتبون..

هەرگیز لەنێو دروشمەکانی پەرستن گـەمارۆیان نـەدابو، بەشـێوەیەك تـەنیا ئـەو ساتانەی دروشمەکانی پەرستنیان تێدا ئەنجام دەدەن بە تەنیا ببنە ساتانی پەرستن و، پاشماوەی ژیانیشیان لە (دەرەوەی پەرستن) بێ!

بەڵکو لە هەستی ئەواندا ژیان هەموی پەرستن بو، دروشمەکانیش ساتانێکی چـڕ بـون، مـرۆڤ تێیـاندا ئـەو وزە گیانیـەی دەسـتدەکەوت کـە بـۆ بەجێگـەیاندنی پەرستنەکانی دیکە هاریکاری بو، بۆیە ئاهەنگێکی تایبەتیان بـۆ سـازدەکرد، وەك ئەو ڕێبوارەی ئاهەنگ بۆ ئەو خۆراکە ساز دەکـا کـە لـە سـەفەرەکەیدا یارمـەتی دەدا، لەگەڵ ئەو ساتەی کە خۆراکەکەی دەستدەکەوێ.

ئەوان وابون کە پەروەردگاریان وەسفی کردون: ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّـــهَ قِيَامًـا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ: ئەوانەی-چ بە ڕاوەستاوی و چ لـە جێـوە، بـە دانیشـتن، چ لەسەر تەنیشت- هەر یادی خوا دەکەن.﴾آل عمران/١٩١.

واتە لە هەمو حاڵەت و بارێکی خۆیاندا..

هەروەك لە زیاتر لە شوێنێکی پتر لـە کتێبێـك باسمـانکردوە، یـاداوەری ئـەوان تەنیا بە زمان نـــەبو، تـەنیا یـادی دڵـیش نـەبو، بـەڵکو لـەپاڵ ئـەوەو ئەمەشـدا

کردەوەیەك بو بە گیانی پەرستنی خودا ئەنجام دەدرا.

هەرچی ئەو زیکرەشە کە بە تەریقەتی تەقەتەقی تەسبیحان دەکرێ، لەوانەوە ﷺ نەهاتوە.

هەروەها یاداوەریش بە شێوازی خەڵوەتی خواپەرستی کە مرۆڤ تیایدا لە واقیعی هەستپێکراو بزر دەبێ و، لە دنیا دادەبڕێ تاکو بۆ پەروەردگاری خۆی تەنیا بێنێتەوە، کە بەمەش لە کردەوە دادەبڕێ لە واقیعی سەر زەوی.. ئەمەش لەو ئەوەیە ناوازەیەوە بەدی نەکراوە.

کاتێك خەڵکانێکی موسڵمانانیش بڕیاریاندا وابکەن پێغەمبەری خواﷺ بەرهەڵستی لێ کرد، وەك بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە کە: (جارێك سێ کەس چونە ماڵێك لە ماڵەکانی پێغەمبەری خواﷺ و پرسیاریان لەبارەی خواپەرستی پێغەمبەرﷺ کرد، کە پێیان گوتن وەك بڵێی بە کەمیان زانی، بۆیە گوتیان: ئێمە لە کوێین لەچاو پێغەمبەری خواﷺ کە خوا لە گوناهی پێشینە و پاشینەی خۆشبوە؟ یەکێکیان گوتی: هەرچی منم هەمو رۆژێك بەرۆژو دەبم و رۆژێکی نیناخۆم، یەکێکی دی گوتی: منیش شەوانە هەڵدەستم و نانوم، سێهەمیش گوتی: منیش ژنان ناخوازم.. کە پێغەمبەری خواﷺ بیستیەوە فەرموی: ((**أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا؟ أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَعْبَدُكُمْ لَهُ، ولَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُقُمُ وَأَنَامُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي**: ئەوە ئێوەن وا و واتان گوتوە؟ کەچی بەخوا من لە ئێوە پتر لە خوا دەترسم و لەئێوە پتر دەیپەرستم، بەڵام من بەرۆژو دەبم و بێرۆژوش دەبم و، شەوهەڵستی دەکەم و دەشنوم و، ژنانیش دەخوازم، هەر کەسێکیش بە سونەتی من رازی نەبێ لە من نیە.))

ئەوان لەکاتی مومارەسەکردنی ژیان لە بوارە جیاجیاکـانیدا پەرسـتنیان ئـەنجام دەدا، پەرستنی هەرەگەورەشیان بریتی بو لــە کـاروکردەوە لـە بـوارە جیاجیاکـانی ژیان، یادی خودایان دەکرد و لە خۆیان دەپرسی: ئایا ئەوان لە بارێکدان کــە خـودا رازی دەکا یا خودا تورە دەکا؟ ئەگەر لــەباری رەزامــەندی بـوان ستایشـی خوایـان دەکرد و ئەگەر لە بارێکی دیکەش بــوان داوای لێخۆشـبونیان دەکـرد و بـۆ خـودا دەگەرانەوە:

﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِــهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُــمْ يَعْلَمُــونَ، أُوْلَئِــكَ جَزَاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَنِعْــمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ: ئەو کەسانەی هەرکاتێك کاری خــراپ دەکـەن، یـان ناحـەقی لـەخۆ دەکەن، خودا لەبیر نابەنەوە و لەبەری دەپارێنەوە، لە خەتاکانیان ببورێ، بێجگە لە خوداش کێ لە گوناهان دەبورێ؟ جـا ئەوانـە لەسـەر کـارێ کەزانیویانـە هەڵەیـە، پێداگر نین.. ئەوانە پاداشیان لەلای پەروەردگاریان لێبوردنە و بەهەشـتگەلێکە کـە جۆباران بە بەریاندا دەرۆن و تاهەتایە هەر لەو بەهەشتە دەمێننەوە، چەندە جوانــە پاداشتی ئاکار چاکان.﴾آل عمران/١٣٥-١٣٦.

یادی خودایان دەکرد و لەخۆیان دەپرسی: ئایا خودا لــەم چرکەیــەدا چـی لێمـان دەوێ؟ واتە: لەم چرکەیەدا چ ئەرکێکمان لەسەر شــانە؟ جـا ئەگـەر ئەرکەکـە ئـەم ئایەتە بوایە:

﴿فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآخِرَةِ : بـا ئەوانــەی بـۆ قیامەتێ دەس لە دنیایێ هەڵدەگرن، بچنە جیهاد لەرێی خودا.﴾النساء/٧٤.

یادی خودا لێرەدا دەبوە مایەی جیهادکردن لە پێناو خودا.

ئەگەر ئەرکەکە: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ: بە تەرزێکی جوان و ڕەوا دەگــەڵیانا هەڵسوکەوت بکەن.﴾النساء/١٩. بوایە، یاداوەری خودا دەبوە مایــەی ئــەنجامدانی ئەو فەرمانەی خودا بەرامبەر ژنان.

ئەگەر ئەرکەکە: ﴿قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَــارًا: خۆتـان و کــەس و کاریشـتان لــەئاگر بپـارێزن.﴾التحـــریم/٦. بوایــە ئــەوا یادکردنــەوەی خــودا دەبــوە مایـــەی پەروەردەکردنی ماڵ و منداڵ بەپێێ بەرنامەی پەروەردگار کە ڕەفتارەکانیان بــەپێی ڕێکخەرە پەروەردگاریەکان ڕێکدەخا و، هەست و بیر و کردەوەشیان بۆ ئــەو شـتانە ئاراستە دەکا کە خودا رازی دەکا.

ئەگەر ئەرکەکە ﴿فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ: شانەوشان لە زەویدا بگەڕێن و لە بژێوەکەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە.﴾الملـــــك/١٥. بوایە، داخوازی یادی خودا دەبوە ڕۆیشتن و گەڕان بەسەر زەوی و داواکردنی بژێـــوی خودا لە سنوری ئەوەی خوا حەلاڵی کردوە، چونکە گەڕانەوە هەر بــۆ لای خودایــە، جا موحاسەبەی خەڵك دەکا لەسەر ئەو کردەوانەی لە ژیانی دنیادا ئەنجامیان داوە.

ئەگەر ئەرکەکە ((طَلَبُ العِلمِ فَرِيضَةٌ: زانستخوازی فەرزە.)).[1] ئــەوا خواسـتی یادی خودا دەبوە کۆشش بــۆ داواکردنــی زانســت لــەپێناو ئاوەدانکردنــەوەی زەوی بەپێی بەرنامەی پەروەردگار، جا زانستەکە زانستی شەرعی بوایە کە مرۆڤ حــەلاڵ و حەرامی پێ دەناسێتەوە و موباح مەندوب و مەکروهی پێ لێــك جیادەکاتــەوە، یان زانستی وزەکانی گەردون بوایە، بۆ وەدیهێنانی رامکردنی پەروەردگار کە خــودا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ مرۆڤی کەویکردوە:

---

[1] أخرجه ابن ماجه.

﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ: هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەمینـدان، هەمـوی هـی خـودان، ئەو بـۆ ئێـوەی کـەوی کردون. ﴾الجاثية/١٣. ئەو رامکردنەشی بە هەوڵێکی زانسـتیانە نـەبێ کـە مـرۆڤ خەرجی کا بۆ ناسینەوەی خاسیەتەکانی مادده و وزه عەمبارکراوەکانی گەردون و، هەوڵی جەستەیی لە گۆڕینـی ماددەی خـاو و وزەکـان بـۆ ئاوەدانیـەك کـە پێداویستیەکانی خەڵك لەسەر زەوی بێنێتە دی، هەروەکو لەسەرەوەی ئەمانەش جوانی و ئارایشتیان بۆ دابین دەکا کە خودا بە موباحی داناون.

لە بەندی پێشو ئەو ئایەتە پیرۆزانەمان هێنایەوە کە خودای پـەروەردگار تیـایدا وەسفی ئەو بڕوادارانەی کردوە، لەگەڵ دەلالەتی ئاشکرایی ئەو ئایەتانە:

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لأُولِي الأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ، رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الأَبْرَارِ، رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلاَ تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ، فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَابًا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ: لە وەدیهێنانی ئاسمانان و لـە زەمیندا و ئاڵوگۆڕی شەو و رۆژان، زۆر نیشانەی پتەو هەیە بۆ ئەوانەی کـە خـاوەن دڵی وشیارن.. ئەوانەی-چ بە راوەسـتاوی و چ لـە جێـوە، بـە دانیشـتن، چ لەسـەر

تەنیشت- هەر یادی خوا دەکەن و لە سازدانی ئەم ئاسمانــان و زەمینــە رادەمێنــن، دەڵێن ئەی پەروەردگارمان! تۆ ئەم دەزگایەت بە فیڕۆ سازنەداوە، پاکی و بێعەیبی بۆ تۆیە، هەر بۆ خۆشت لە ئازاری بەئاگرمان بپارێزە.. پــەروەردگارمان! هەرکــەس تۆ بیخەیتە ئاگر، توشی شورەییت کردوە. ئەوانەی ناهەقیارن، هیــچ کــەس نایەتــە هانایان.. پەروەردگارمان! ئێمە بیستمان بانگ رایەڵێك بانگی دەکرد کــە بــاوەڕی بە پەروەردگارتان بێنن، ئێمەش باوەڕمان هێنا، سا بۆ خۆت ئــەی پــەروەردگارمان! لە گوناهانمان خۆش ببە و هەر خراپەی کردومانـــە، بیکوژێنــەوەو لەگــەڵ ئەوانــەی پیاوچاکان بمان مرێنە.. پەروەردگارمان! ئەو شــتانەش بەئێمــە رەوا ببینــە کــە لــە زمان پێغەمبەرانتەوە بەڵێنت پێمان داوین، شەرمەزاری رۆژی قیامەتمان مەکە. تۆ لە هەرپەیمانێ بیدەیت لاریت نیە.. پەروەردگاریان ئاوا بە دەنگیانــەوە هــات، کــە: من کردەی هیچ مرۆڤێك-لەنێر و مێ- بەبێ پاداش ناهێڵمەوە، هەموتان لای مــن وەك یەکن. ئەو کەسانەی لە زێدی[1] خۆیان دەرکراون و لەڕای من ئازاریــان دیــوە و چونە جیهاد و دژی منیان کوشتبێ یــان بــە کوشــت چوبــن، بێگومانــە گوناهیــان دەکوژێنمەوە و لە پاداشتی کردەوەیان دەیانخەمە نــاو باغــاتێك جۆباریــان بەبــەردا دەڕوا. کە ئەمە چاکەی خودایـــە دەربارەیــان، کــە پاداشــی هــەرە باشــیش وا لای خوایە.﴾آل عمران/١٩٠-١٩٥.

دەلالەتەکەشی-هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد- ئەوەیــە کــە خــودای پــاك و بەرز وەڵامی تێفکرین و لێوردبونەوە و نــزا و ملکــەچی داوەتــەوە کــاتێك ئەمانــە هەموی لە واقیعی ژیاندا گۆڕاون و بون بە کردەوە.

---

[1] زێد: نیشتمان.

لەو شــێوە ئاراســتەکردنانەش کـە لـە کتێبـی خـوادا پـەخش و بـڵاون و، لـە ڕێنماییەکانی پێغەمبەرﷺدا هاتون، بڕوادارانـــی نـەوەی یەکـەم و نـەوەکانی دوای ئەوان تێگەیشتن کە پەرستنی داواکراو تەنیا لە دروشمەکانی پەرستندا کۆنابنەوە و، لەوە فراوانتر و گشتگیرترن.

واش تێگەیشتن کە نوێژ و نوسك-واتە دروشمەکان- بریتین لەو پێگەیـەی مـرۆڤ تێیدا هەنگاو دەنێ بۆ ئەنجامدانی پەرستنەکانی دیکـە، کـە هـەمو ژیـان، بـەڵکو تەنانەت مردنیش دەگرێتەوە!

مردنیش بەخۆی ناکرێ ببێتە پەرستن، چونکە مرۆڤ تیایدا سەرپشك نیە، بەڵام مەبەستی ئەو ئایەتە پیرۆزەی دەفەرموێ: ﴿وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَـالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ : ژین و مەرگم، بۆ خودایە، کە پەروەردگاری دنیایە هەر خۆیەتی، هیـچ شەریکی نیە.﴾ ئەوەیە کە مرۆڤ مرد هاوبەشپەرست نـەبێ بـە خـودا و، ئەمــەش کەمترین رادەیە وا لە مرۆڤ دەکا-لەمردنێ- خوداپەرســت بـێ، بـەرزترین رادەش ئەوەیە کە مردنەکەی شەهیدبون بێ لەپێناو خودا.. کە لوتکەی خوداپەرستیە..

بەتەنیا بەهۆی ئەم بەرنامەیــەش.. واتــە بـە جێبـەجێکردنی خوداپەرستنێکی سەرتاپاگیری تەواو، کە ژیان و مردن دەگرێتەوە، مەبەستی بونی مرۆڤ دێتــە دی و، ئەوکات مــرۆڤ-بـەپێی توانـای خـۆی- پەرســتنی داواکـراوی لەئاسـت خـودا ئەنجامداوە..

ڕەنگە ئەم واتایەش نامۆ یان بێدادانە بێتە بەر هەستی (موسڵمانی هاوچـەرخ)، پاش ئەوەی چـەندین نەوەیـە راهـاتوین کـە وەك تێکـڕای پەرســتنی داواکـراو لـە موسڵمان، بڕوانینە دروشمەکانی بەندایەتی و، واش تێگەیشـتوین ئەگـەر موسـڵمان

ئەو دروشمانەی بەجێی گەیاندن هەمو پەرستنەکانی سەرشانی ئەنجامداوە و، کەسێك بۆی نیە پتری لێ داوابکات!

بەلاّم دەبێ سەرچاوەمان بۆ دیاریکردنی چەمکە ئیسلامیەکان قورئان و سوننەت بێ و، وێنەی پراکتیکی دروستی قورئان و سوننەتیش وەك ئەوەیە کە نەوەی یەکەمﷺ مومارەسەیان کردوە و، پێغەمبەری خواشﷺ شایەدی بۆ داون کە لە هەمو سەدەکانی دیکە چاکترن:

((خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ: چاکترینتان سەدەی منە و، پاشان ئەوەی دوای ئەمە دێ)).[1]

ئا ئەمە سەرچاوەیە.. نەك ئەو کەموکوڕی و لاڕێبون و گۆڕانکاریەی بەدرێژایی کاروانی مێژو بەسەر موسڵماناندا هاتوە..

دروستبونی کەموکوڕی یان لاڕێبونیش لەمیانەی ئەو کاروانە درێژە بەگوێرەی مرۆڤ شتێکی نامۆ نیە:

﴿عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِنْ قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا: بەر لە ئێستاش دەگەڵ ئادەم پەیمانن بەست، لەبیری کرد و پێی نەکرا پێکی بێنێ.﴾طه/١١٥.

بەلاّم سەیرە -لەو غەریبیەی ئەمڕۆ ئیسلام تێیدا دەژی- کە وێنە راستەکە بە وێنەیەکی چەوت بگۆڕدرێ، پاشان مکوڕیش بین کە ئەمیان وێنە راستەکەیە!.. جا ئەگەر یەکێك بێ و وێنەراستەکەمان پێشان بدا هەروەك لە قورئان و سوننەت و سەربردەی سەلەفی صالحدا هەیە، بە توندڕەو تۆمەتباری دەکەین و، خۆمان نەیناسینەوە!

*　*　*

---

[1] أخرجه الشيخان.

له قورئانی پیرۆزدا -هەروەکو پێشتر رونمانکردەوە- ئەوە هاتوە کە خودا جنۆکـە و مرۆڤی تەنیا بۆ ئەوە خولقاندوە هەتا بیپەرستن:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ: مـن هـەر بۆیـە جندۆکـە و مرۆڤـم وەدیهێنا، هەتاکو بمپەرستن. ﴾الذاریات/٥٦.

ئەوجا خودای-پاك و بەرز- ئەرکیشی بەسەر خەڵکدا فەرزکردوە:

﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنْبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ : عەبدایەتی خوا بکەن و هیـچ شـت مەکـەن بـە شـەریکی. دەربارەی دایك و بابتان و خزمەکان و هەتیوان و هەژاران و هاوسای دیوار بـەدیوار و هاوسای دور و هەواڵی هەمیشەییتان، ئەوانەی لەرێدا مـاون و ئەوانـەی بونەتـە موڵکتان، تا دەتوانن چاکە بکەن. ﴾النساء/٣٦.

﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا، يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً: خودا فـەرمانتان پێـدەدا، هـەرچی ئەمانەتـە بیاندەنـەوە بـە خاوەنیـان[١]، هەرکاتێکیش لەنێو خەڵکی حوکم دەکەن، بێلاگری و بە یەکسـانی حوکـم بکـەن. خودا زۆر باش ئامۆژگاریتـان بـۆ دەکـا، خـودا هـەمو شـتێك دەبیسـێ و هـەمو

١ لەپێشەوەی هەمو ئەمانەتەکان دانپیانانە بە بەندایەتی بۆ خـوای تـاك، ئـەم دانپیانانـە عـەقیدەی تەواو بە تاکیەتی خودا و، ئـەنجامدانی دروشـمـەکانی پەرسـتن بـۆ ئـەو بەتەنـها و، بـەحاکم دانـانی شەریعەتەکەی بەسەر هەمو کاروبارێکدا لەخۆ دەگرێت.

شتێکیش دەبینیێ.. ئەی گەلی خاوەن بــاوەڕان! بەرفـەرمانی خـودا و پێغەمبـەری خودا و کاربەدەستانی خۆتان بــن، هـەرکاتێکیش لەسـەر شـتێك لـەنێوخۆدا پێـك نەهاتن، ئەگەر بڕواتان بە خودا و بە ڕۆژێ قیامەتی هەیە، کێشەی خۆتان حەواڵەی خـوا و پێغەمبـەری خـوا بکـەن. ئـەم کـارە بۆتـان باشـترە و ئاکـامی چاکـــتری هەیە. ﴾النساء/٥٩.

﴿فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآخِرَةِ وَمَنْ يُقَاتِلْ فِـــي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًـا: بـا ئەوانـەی بـۆ قیامـەتێ دەس لە دنیایێ هەڵدەگرن، بچنە جیهاد لەڕێی خودا. ئەوەش کـە دەچێتـە جیـهاد لـەڕێی خـودا، چ بکـوژرێ و چ ســەرکەوێ، لـــەو دنیـــا پاداشــتێکی گــەورەی دەدەینێ. ﴾النساء/٧٤.

﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَـــدُوَّ اللَّـــهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِـــي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ: تا بۆتان دەکرێ چەك و جبەخانـەی شـەڕ و ئەسپی سواری پەیدا بکەن، دوژمنـــی پـێ بترسـێنن، کـە دوژمنـــانی خوداشــن، غەیری وانیش دوژمنتان هەن نایان ناسن، بەڵام خودا دەیان ناسـێ، هـەر مـاڵێکی لـەراهی خـودای بـەخت کـەن، خـودا پێتـانی دەداتـەوە و هیـــچ ناهـــەقیتان لێ ناکرێ. ﴾الأنفال/٦٠.

﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّـهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا: بە تەرزێکی جـوان و ڕەوا دەگـەڵیانا بجوڵێنــەوە. ئەگـەر خۆشـتان نەهات لێیان، شتی وا هەن ئێوە حەزی لێ نەکەن و چاکـەی زۆری لـەخواوە بۆنگـۆ تێدابێ. ﴾النساء/١٩.

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ: خوایە کە ئەم زەمینەی بۆ کەوی کردون، شانەوشان لە زەویــدا بگــەڕێن و لە بژێوەکەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە. ﴾الملك/١٥.

﴿وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلاَ تُخْسِرُوا الْمِــيزَانَ: کێشــانەتان بەرامبــەر بــێ و نەکا تەرازوتان سەرکا. ﴾الرحمن/٩.

ئەمە و دەیانی دیکە لە ئــەرکی سیاســی و کۆمەڵایــەتی و ئــابوری و هــزری و روحی و باوەڕی و ئەخلاقی..

هەروەها پێغەمبەری خواﷺ ئەرکی فەرز کردون:

((طَلَبُ العِلمِ فَرِيضَةٌ: زانستخوازی فەرزە.)).[1]

((إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَـــةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ: خودا چاکەکاری لەسەر هەمو شتێك نوسیوە، جا ئەگەر شتێکتان کوشت بەباشی بیکوژن و، ئەگــەر سەرتان بڕی بەباشی ســەریبڕن و، بــا هــەر یەکــەتان چەقۆکــەی خــۆی تیــژ بکــا و کوشتیەکەی ئازار نەدا)).[2]

((اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: الشِّرْكُ بِاللَّــهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيــمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصِنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ: خۆتان لــە هــەفت تاوانە گەورەکــە لادەن. گوتیــان: ئەوانــە چــین ئــەی پێغەمبــەری خــوا؟ فــەرموی: هاوبەشپەرستی بەخوا و، سیحر و، کوشــتنی ئــەو نەفســەی خــوا حــەرامی کــردوە

---

١ أخرجه ابن ماجه.

٢ أخرجه مسلم وأبوداود والنسائي وابن ماجه.

ﻧﻪﮐﻪر ﺑﻪ ﺣﻪق و، ﺧﻮاردﻧﯽ رﯾﺒﺎ و، ﺧﻮاردﻧــﯽ ﻣــﺎڵﯽ ﻫــﻪﺗﯿﻮ و، ﻫــﻪڵاﺗﻦ ﻟــﻪ ڕۆژی ﺟﻪﻧﮓ و، ﻧﺎوﺑﻪدﮐﺮدﻧﯽ ﺋﺎﻓﺮەﺗﯽ ﺧێﺰاﻧﺪاﺗﺮی ﺑێﺌﺎﮐﺎی ﺑڕوادار)).[1]

((إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّـيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ: ئەگەر یەکێکتان شتێکی خوارد با بەدەستی ڕاستە بخوا و، ئەگەر شتێکی خواردەوە با بەدەستی ڕاستە بخواتــەوە، چونکــە شــەیتان بــە چەپە دەخوا و بە چەپە دەخواتەوە)).[2]

((يَا غُلامُ سَمِّ اللَّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ: کوڕیژگە، بســم الله بکــە و، بە ڕاستەت بخۆ و، لە پێشەخۆتیش بخۆ)).[3]

((أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ بِسَبْعٍ وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ؛ أَمَرَنَا بِعِيَـــادَةِ الْمَرِيـــضِ وَاتِّبَـــاعِ الْجَنَائِزِ وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ أَوْ الْمُقْسِمِ وَنَصْرِ الْمَظْلُـــومِ وَإِجَابَـــةِ الدَّاعِي وَإِفْشَاءِ السَّلامِ وَنَهَانَا عَنْ خَوَاتِيمَ أَوْ عَنْ تَخَتُّمٍ بِالذَّهَبِ وَعَـــنْ شُـــرْبٍ بِالْفِضَّةِ وَعَنْ الْمَيَاثِرِ وَعَنْ الْقَسِّيِّ وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيـــرِ وَالإِسْـــتَبْرَقِ وَالدِّيبَـــاجِ: پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی بە حەفت شت پێکردیــن و نــەهی لــە حــەفت شــتیش کرد، فەرمانی پێکردین سەردانی نەخۆش بکەین و، شوێن جەنازە بکەوین و، دوعا بۆ پژمیو بکەین و، کە سوێندمان خوارد یا یەکێك سوێندی خوارد بیگەیەنینە جێ و، زۆرلێکراو سەربخەین و، وەڵامی داوەتکار بدەینەوە و، ســڵاوکردن بڵاوبکەینــەوە و، نەهی کرد لە ئەنگوستیلەی زێڕ و، لە خواردنەوە بە دەفری زیو و لــە زینپۆشــی ئاوریشمین و لەو پۆشاکەی کە هێڵی ئاوریشمینی تێدایە و لە پۆشــینی ئاوریشــم و ئاوریشمی سفت و دیباج-کە ئەمیش جۆرێکە لە ئاوریشم-.)).[4]

---

١ أخرجه مسلم.

٢ أخرجه مسلم.

٣ أخرجه مسلم.

٤ أخرجه مسلم.

((مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنْ الْإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ: هەر پێغەمبەرێك خودا پێشە من بۆ ئومەتێکی ناردبێ حەواری و هاوەڵی هەبوون، کە رێوشوێن و سوننەتەکانیان وەردەگرت و پابەندی فەرمانەکانی دەبون، پاشان خەڵکانێکیان بەدوادا دەهات شتێکیان دەگوت و شتێکی دیکەیان دەکرد و، شتی وایان دەکرد کە فەرمانیان پێنەکرابو، جا هەرکەسێکی بەدەست جیهادیان بکات ئەوە بڕواداره و، هەرکەسێك بە زمان جیهادیان بکات ئەوە بڕواداره و، هەرکەسێکی بە دڵ جیهادیان بکا ئەوە بڕواداره و، لەپاش ئەمەش بارەستای یەك دەنکە خەردەلەیەك بڕوا نیه.))[1]

ئەمە و دەیان ئەرکی دیکەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و هزری و روحی و باوەڕی و ئەخلاقی.

جا دەبێ ئەمانە بکەونە کوێ لەو پەرستنەی خودای پاك و بەرز- بە تاکە مەبەستی وەدیهێنانی جنۆکە و مرۆڤی داناوە.

ئایا ئەم هەمو ئەرکە دەکەونە ناو چێوەی پەرستن یان دەرەوەی؟

ئەگەر بکەونە دەرەوە چۆن واتای ئەو ئایەتە پیرۆزە دەردەچێ کە تێکڕای ئەرکباری تەنیا لە پەرستندا کۆدەکاتەوە، نەك شتێکی دیکە؟

کەواتە-ئاشکرا- دەبێ پەرستن تەنیا لە دروشمەکانی پەرستندا کۆنەبێتەوە هەروەك نەوە پاشینەکانی موسڵمانان تێی‌گەیشتون، واتای پەرستنیش دەبێتە

---

١ أخرجه مسلم.

هەمان ئەو واتا فراوانەی ئەم دو ئایەتە پیرۆزە هەڵیدەگرن:

﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَاي وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ: بڵێ: من نوێژکردنم و پێکهێنانی ڕێوشوێنی حەج کردنم و ژین و مەرگم، بۆ خودایە، کە هەرخۆی پەروەردگاری جیهانە، هیچ شەریکی نیە. فەرمان وا بە من دراوە و من لە ریزی موسڵمانان یەکەمینم.﴾الأنعام/١٦٢-١٦٣.

ئاشکراشە کە وتاری هەردو ئایەت ئاراستەی پێغەمبەری خواﷺ کراوە بەڵام لەدوای ئەویش ئاراستەی هەمو ئوممەتەکەی کراوە، تایبەتمەندێتیەکەی پێغەمبەری خواﷺ لەوەدایە کە یەکەمینی موسڵمانانە و، لە خودی ئەرکبارکردنەکەدا نیە، کە ئەرکێکە بۆ هەمو موسڵمانێکی کە شایەتمانی (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله) بێنێ.

نەوەکانی یەکەمیش هەر بەم شێوەیە لە واتای پەرستن گەیشتبون هەروەکو خودا فەرزی کردبو..

هەستی موسڵمان لەو نەوانەدا بە ئەرکی جیهاد لەپێناو خودا وەکو هەستکردنی بو بە نوێژ کردن، لەویان خودا دەپەرستێ و، لەمیشیان هەر خودا دەپەرستێ و، پەرستنێکیش جێگەی ئەوی دیکە ناگرێتەوە، چونکە هەر یەکێکیان-بەتەنیا-واتای تەواوی ئەو پەرستنە وەدیناهێنن کە خودا دەیەوێ.

هەروەها هەستکردنی بە هاوسەرگرتن تا خۆی لەکاری خراپ بپارێزێ و، تاکو رێگەی زۆرکردنی ئوممەتی موسڵمان بگرێ کە بۆ هەڵکێشانی رەگوریشەی هاوبەشپەرستی لە زەویدا و بڵاوکردنەوەی یەکتاپەرستی و بەرپاکردنی حوکمی خودا تێدەکۆشێ هەمان هەستی پەرستن بو. لە هەستیشیدا واتای پەرستن لەگەڵ

واتای چێژوەرگرتنی جەستە تێکگیرنابن مادام چێژوەرگرتنەکە لـــە حەلاڵێکـە کـە خودا موباحی کردوە. کە پێغەمبەری خوداش ﷺ پێــی فــەرمون: ((وَفِــي بُضْــعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ: هەر یەکێکتان کە لەگەڵ خێزانی جوت دەبــێ بــە خـێر و ســەدەقە بۆی دەنوسرێ))، لەسەرەتادا سەریان سوڕما و، گوتیـــان: ئــەی پێغەمبــەری خــوا! ئێمە کە یەکێکمان دەچێتە لای ژنەکەی بۆ تێرکردنی ئارەزوی خۆی، پاشان پاداشی لەسەر وەردەگرێ؟! پێغەمبەری مامۆستا ﷺ بۆی رونکردنەوە و فەرموی: ((أَرَأَيْــتَ لَوْ وَضَعَهَا فِي الْحَرَامِ أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ؟ فَإِذَا وَضَعَهَا فِي حَلَالٍ فَلَــهُ عَلَيْــها أَجْرٌ: ئەی ئەگەر لە حەرام بەکاری هێنا سزای نەدەبو؟ ئەگەر لە حەلاڵیش بــەکاری بێنێ پاداشی هەیە)).[1] لەپاش ئەوەدا چیدیکە سەیریان پێنەهات و، زانیشــیان کـە چالاکیە سروشتیەکانی جەستە لە ئیسلامدا خواپەرستنە ئەگەر لــەڕێی خــودا بــێ و، پابەندیی تێدابێ بە فەرمانەکانی خودا.

هەستی موسڵمان بە کوششی بۆ بژێوی خوازی و زانستخوازی، ئاوەدانکردنەوەی زەوی و، هەمو چالاکیــەکی جەســتە و عــەقڵ و روحــی هــەروابو.. هــەموی هــەر خواپەرســتن بــو، پەرســتنێکی حــەقیقی نــەك مـــەجازی، پەرســـتنێك بەهـــەمان ئیخلاصەوە ئەنجامی دەدا کە نوێژی پێدەکرد.

ئەوجا پاشان ئەم ئومەتە ئــەو هــەمو دەســکەوتانەی بــە هــەمو ئاراســتەیەکدا وەدەست هێنا و، ئەو موعجیزانەی ئەنجامدا..

ئەو ئومەتــەش نــەیدەتوانیوا بــەو ســانایی و بــەو خێراییــەی کــە لــە مێــژودا هاوشێوەی نیە، قەڵاکانی هاوبەشپەرستی بکوتێ و لە ریشەوە هەڵیانکێشێ.

---

١ أخرجه مسلم.

نەشیدەتوانی ئەو هەمو نمونە بەرزە بەرجەستە بکا کە لە جیهانی واقیعدا بەرجەستەی کرد، لە بەرپاکردنی دادگەری پەروەردگار لەسەر زەوی و، خاوێنی مامەڵە و هەڵسوکەوت و، وەفاداری بۆ پەیمانەکان و، ئازایەتی نەفس و، پاڵەوانێتی بێوێنە لە گۆڕەپانی جەنگ و لە گۆڕەپانی ئاشتیدا..

نەشیدەتوانی نە بزوتنەوە زانستیە مەزنەکەی نە ژیارە باڵایەکەی خۆی دابمەزرێنێ..

لە تواناشیدا نەبو ئەو هەموە بکات، یا بەشێکی لیْ ئەنجام بدات، ئەگەر ئەو هەستە قوڵەی نەبوایە بەوەی کە ئەوەی ئەنجامی دەدات هەموی ئەو پەرستنەیە کە خودا مرۆڤی بۆ وەدیهێناوە و، ئەگەر بە هەمان هەستی نوێژکردنیش ئەنجامی نەدابان.

* * *

کەواتە موسڵمان دەبێ پەروەردگاری خۆی بپەرستێ تاکو مەبەستی وجودی خۆی وەدیبێ کە خودا بۆ هەندێی وەدیهێناوە و، مەبەستی بونی مرۆڤی تێدا کۆکردۆتەوە؟

لەپێش هەمو شتێکەوە بە یەکتاپەرستی خودای بەرز دەپەرستێ.. واتە بە داننان بەوەی کە بێجگە لە خودای-پاك و باڵا- هچ خودایەکی دیکە نیە و تاکە لە پەروەردگارێتی و پەرستراوێتیدا و، تاکە لەناو و وسیفەت و کردەوەکانی:

﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ: بزانە بێجگە لە خودا هیچ خواوەند و پەرستراوێکی دیکە نیە.﴾محمد/١٩.

﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا: خودا بپەرستن و هیچ شت مەکەن بە شەریکی.﴾النساء/٣٦.

ئەمەش (لا إله إلاّ الله) پەرستنی یەکەمە-هەروەك لە بەندی پێشو باسمانکرد- داخوازی هەن بەوان نەبێ تەواو نابێ و، تەنیا واژەیەك نیە بە زمان بگوترێ و مەسەلەکە کۆتایی بێ و (خانەکە پڕبێتەوە)، هەروەك هزری ئیرجائی بەبێ هیچ پاڵپشتێك لە قورئان و لە سونەتی پێغەمبەرﷺ خەڵکی پێخەڵەتاندبو.

داخوازیەکانیش-هەروەك پێشتر بە باسیاندا ڕەتبوین- بریتیە لە هەمو ئیسلام! لەگەڵ جیاوازی لە پلەی (پابەندکردن- إلزام).. هەندێ داخوازی هەن بە بنەمای بڕواوە پەیوەستن-وەك باوەڕبون بە وەحدانیەتی خودای بێشەریك و، روکردنە خودای بێشەریك بە دروشمەکانی پەرستن و، بە حاکمکردنی شەریعەتی خودای بێشەریك- بەبێ ئەمانە بەندە نابێتە بڕوادار، هەندێکیشی بە تەواوێتی بڕواوە پەیوەستن کە بریتین لە ئاکارەکانی (لا إله إلاّ الله) و، ئەرکەکانی دیکە کە خودا فەرزی کردون- بەندەش بەبێ ئەوانە بڕوای کامڵ و تەواو نابێ.[1]

پاشان دروشمەکانی پەرستن دێن لە شوێنی خۆیان پاش دانپێدانان بە (لا إله إلاّ الله)، کە واتای-هەروەك باسمانکرد- دانپێدانانە بە هەمو ئەوەی لەلای خوداوە هاتوە لەگەڵ پێوە پابەندبونیان..

ئیسلامیش پێشوازیەکی بەرچاوی لە دروشمەکانی پەرستن کردوە لەبەر حیکمەتێکی بەرچاو، چونکە ئەمانەن بە بەردەوامی دڵ بە خودا دەبەستنەوە و هەمیشە تازە دەبنەوە، هەروەك رونمانکردەوە بریتیە لە وێستگەی توێشو وەرگرتن کە مرۆڤ ئەو توێشوەی تێدا وەردەگرێ کە لە رێگاکەی یارمەتیی دەدا.

موسڵمانانیش-هەردەم- هەستیان بەو بایەخە تایبەتیە دەکرد کە ئیسلام بەو دروشمانەی داوە، جا ئاهەنگیان بۆ دەگێڕا و جەختیان لەسەر دەکرد، بەڵام نەوەکانی

---

[1] بگەڕێوە بۆ بەندی یەکەم.

دوایی لەبارەی ئەم جەختکردنە دووچاری گەلێك هەڵەی تێڕوانین و ڕەفتار بون.

هەڵەی یەکەم-وترسناکترینیان- بریتی بو لـە کۆکردنـەوەی سـەرجەم پەرسـتنە داواکراوەکان تەنیا لە دروشمەکانی پەرستندا.

ئەم تێڕوانینـە هەڵەیـەش بـوە مایـەی دەرهێنـانی (لا إلـه إلاّ الله) بـە هـەمو داخوازیـە بـاوەڕی و ڕەفتاریـەکانی لـە چوارچێـوەی پەرسـتندا، تـا وای لێـهات- لەهەستی خەڵکیدا- پەرستن لـە نوێـژڕا دەسـتی پێدەکـرد و، لـە (لا إلـه إلاّ الله) دەستی پێنەدەکرد!

مەبدەئی جودابونەوەکەش لە سەرەتادا مەسەلەی (زاراوە) بـو، چونکـە (لا إلـه إلاّ الله) (بیروباوەر/عەقیدە)ە، دروشمـەکانیش (پەرسـتنکاری/عیبـادات)ن، لەگـەڵ ترسناکی خودی ئەم جیاکردنەوە زاراوەییەش-وەك ترسناکی جیاکردنەوەی زاراوەییە لەنێوان (پەرستنکاری) و (مامەڵەکاری/موعامەلات)[1]-ترسناکیەکە لـە سـەرەتادا سنوردار بو کاتێك (بیروباوەڕ) بە واتا ڕاستەقینەکەی خـۆی وەردەگـیرا کـە لـەلای خوداوە پێی دابەزیبو و، پێشینە چاکـەکانیش تێـیّ گەیشـتبون و، بریتـی بـو لـە یەکتاپەرستی پەروەردگاریّتی و یەکتاپەرستی پەرستراوێتی و یەکتاپەرسـتی نـاو و سیفەتەکان و، داخوازیەکانیان لە ژیانی مرۆڤ لەروی باوەڕ و فیکر و ڕەفتارەوە..

---

١ زانایانی ئیسلام جیاکاریەکی زاراوەییان لەنێوان (عەقیدە) و (عیبادات) و (موعامەلات) سازداوە، لەبەر داخوازی (زانستی) تایبەتمەند، بەڵام وایان لە هەستدا جێگیربوە کە نابێ هەموی دەگرێتەوە و لەسەر یەکێکیان کورت هەڵنایێ. هەر یەکێکیشیان بەتەنیا-نوێنەرایەتی ئـایین ناکـات جـا لـەروی گشتگیری و تەواوێتی بێ، یا لەو ڕووەوە بێ کـە بەسـەر خـەڵکیدا فـەرزکراوە بـە پێوەپابـەندبون و جێبەجێکردن.. بەڵام کاتێك شپرزەبون لەمیانەی کاروانـە مێژووییەکـەدا ڕویـدا، ئـەم لێکجوداکـردنـە زاراوەییـە کاریگەریـەکی خراپـی لەسـەر چەمکـەکانی خـەڵکیدا هـەبو، کـاتێك چـەمکی (عیبادەت/پەرستن) تەنیا لە جێبەجێکردنی دروشمـەکانی پەرسـتنەوە کورتهـەڵاتن و، (عـەقیدە) و (موعامەلات)ی لیّ چونە دەر.

کاتێك هـزری ئیرجـائی بیروبـاوەڕی یەکتاپەرسـتی کورتکـردەوە و، لـە هـەمو نێوەڕۆکە زیندوەکەی بەتاڵی کرد و تەنیا لە بەڕاستدانان کۆی کـردەوە بەمەبەسـتی ڕزگاربون لە قیامـــەتێ و دانپێدانـانیش بـۆ ڕزگـاربون لـە دنیـادا.. ئـەوا لایـەنی هەرەگەورەی (پەرستن)ی ڕاستەقینە کە خودا بەسەر بەندانیدا فــەرز کـردوە کـورژ بو[1] و، پاشماوەکـەش-ئەگـەر بـە تـەواوترین شـێوازیش جێبـەجێکرا- هێشـتا لـە تێرکردنی واتای ڕاستەقینەی پەرستن کەموکوڕی دەبـێ کـە خـودا ئافـەریدانی بـۆ وەدیهێناوە، خوداش دەربارەی دەفەرموێ:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ: مـن هـەر بۆیـە جندۆکـە و مرۆڤـم وەدیهێنا، هەتاکو بمپەرستن.﴾الذاريات/٥٦.

یەکەمجار مەسەلەکە پێناچێ هێندە ترسـناك بـێ! موسـڵمانانیش ئەگـەر چـی بەزاراوە واشیان دانابێ کە پەرستن بریتیە لـە جێبـەجێکردنی دروشمـەکان- نـاکرێ لەناخی دەرونیاندا یەکەمین پایەی ئیسلامیان پشتگوێ خستبێ کـە دانپێنانـە بـە هەردوو شەهادەکان!

بەڵام حەقیقەتی واقیع لە ژیانی (موسـڵمانی هاوچـەرخ) ترسـناکی مەسـەلەکە دوپات دەکەنەوە..

کاتێك پەی پێبردنێکی ڕاسـتو دروسـت بـۆ پەرسـتن هـەبو، کـە بـەدانپێدانانی بەندایەتی تەنیا بۆ خوای بێ شەریك دەست پێدەکات، پێش نوێژ و ڕۆژی و زەکـات و حەج. ئەوا ئەو دەیاردەیە نایەتە دی کە ئەمڕۆ لە ژیانی (موسـڵمانی هاوچـەرخ) لە ئارادایە و بریتیە لەوەی ملیۆنان مـرۆڤ بیروباوەڕیـان وایـە کـە ئەگـەر مـرۆڤ دروشمەکانی جێبەجێ بکات ئەوا بڕوادارێکە بڕوایەکەی تەواو و بێ کەم و کوڕیە..

---

[1] کورژبون: تقلص.

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إِذَا رَأَيْتُمْ الرَّجُلَ يَعْتَادُ الْمَسَاجِدَ فَاشْهَدُوا لَهُ بِالْإِيمَانِ: ئەگەر پیاوێکتان دیت هاتوچۆی مزگەوتان دەکا ئەوا شایەدی بڕوای بۆ بدەن!))[1] کە لە فەرموودەکەدا باسی هاموشۆی مزگەوتانی کردوە و باسی حوکم بردنە بەر شەریعەتی خودای نەکردووە!!

فەرموودە چەسپاوەکانی پێغەمبەری خواش ﷺ هەمووی حەقن.. بەلاّم بەلگە هێنانەوە بەفەرموودەیەکی دیاریکراو لە فەرمودەکانی بڕوا بەدابڕکراوی و جوداکراوەیی لە فەرمودەکانی دیکە کە حەقیقەتی بڕوا و هەلّوەشێنەرەوەکانی دیاریدەکەن، نابێتە هۆی گەیشتنە پەی پێبردنێکی دروست.. دەنا چۆن دەچێتە عەقلّ کە پێغەمبەری خوا ﷺ شایەدی بۆ ئیمانی پیاوێك بدا (ئەگەر فەرموودەکە صەحیح بێ) هەر تەنیا لەبەر ئەوەی هاتوچۆی مزگەوتان دەکا، ئەگەر کابرا کەوتبێتە نێو هاوبەشپەرستییێکی راشکاو کە (لا إله إلاّ الله) لە بناغەوە هەلّدەوەشێنێتەوە و، بنەمای بڕوا هەلّدەوەشێنێتەوە؟! ئایا دانپێدانان بە (لا إله إلاّ الله) -کە حوکم بردنە بەر شەریعەتی خوا یەکێکە لە داخوازیەکانی- مەرجێکی پەیوەستی بڕوا نیە لە پێش هاتوچۆی مزگەوتان و نوێژکردنێ، هەر چەندە لە فەرموودەکەی پێشوش باسنەکراوە، چونکە ئەمە لە بەلگەنەویستەکانی ئاینە، کە فەرمودەی دیکەی پێغەمبەرﷺ رونیان کردۆتەوە هەروەك ئایەتی پیرۆزەکانی کتێبی خواش رونیانکردۆتەوە؟

ئەو هەلّگەڕاوانەی ئەبوبەکریش ﷺ جەنگی دژی بەرپاکردن نوێژیان دەکرد و هاتوچۆی مزگەوتانیان دەکرد، لەگەلّ ئەوەشدا کەس شایەدی ئیمانی بۆ نەداون!

---

[1] أخرجه الترمذي وابن ماجه وأحمد والدارمي. قال الألباني: إن سنده ضعيف وكل طرقه كذلك. أنظر كتابه (ضعيف الجامع الصغير) ١/ ١٨٤.

بەڵکو شەڕیان لەگەڵ کرا و جەنگیان لەدژ بەرپا کرا، چونکە پشتیان لــە حوکمێـك نە ئەحکامی خودا کـــرد، لەگـەڵ دانپێداهێنـان و جێبـەجێ کردنـی حوکمـەکانی دیکە.. جا ئەدی ئەوانەی پشت لە سەرجەم حوکمی خوا دەکـەن و، بەخۆشـنودیەوە رو لە حوکمێکی غەیری خوا دەکەن؟!

ئەمڕۆکەش خەڵك رەنگە نەزانن کە حوکم بردنـە بـەر غـەیری شـەریعەتی خـوا بەرەزامـەندی و ویسـتی خۆیـان هەڵگەڕانەوەیـە لـــە ئیســـلام و بنـــەمای بـــڕوا هەڵدەوەشێنێتەوە.

ئێمەش نامانەوێ بچینە نێو دۆزی حوکم دەرکردن لەسەر ئەم نەوەیەی خەڵك و، ئایا نەزانیەکەیان بۆ دەبێتە بیانو یان نا، ئەمە دۆزێکە و ئێمە هەر لــە بنـەڕەتدا لەبەر چەند هۆیەك کە لە کتێبی دیکەدا باسمان کردون[1]، خۆی لێنادەین.

بەڵام ئێمە ئێستا خەریکی رونکردنەوەین..

دەرهێنانی (لا إله إلاّ الله) و داخوازیەکانی- لە چێـوەی بازنـەی پەرستندا و، بەخەیاڵی ئەوەی کە پەرستن بە دروشمەکان دەست پێدەکـات و، لـە دروشمـەکان کـۆ دەبێتەوە، گـەلێك شـێرازە تێکچوونـی گـەورەی لـە ژیـانی موسـڵمانی هاوچـەرخ دروستکرد کە ئیسلامی لەگەڵدا راست هەڵناکەوێ. بۆیە هــەردەبێ لــە تـێڕوانین و لـەرەفتاردا پێکـەوە راسـتبکرێنەوە بـۆ راســـتکردنەوەی ژیـــانی موســـڵمانان و، دەرهێنانی موسڵمانان لەو سیاچاڵەی تێیکەوتون و، بـــەهۆی ئـەو تێکەوتنـەیان- بونەتە ئاومالکی سێلاوێ.

* * *

---

١ ئەگەر دەتەوێ (قضية الحكم على الناس) ل٤٣١-٤٥٤ لە کتێبی (واقعنا المعاصر) بخوێنەوە.

کاتێك چەمکی پەرستن تەنیا لە دروشمـــەکاندا کـۆ بـۆوە، (کـاروکردەوە)ش بـە هەمو جۆرەکانیەوە لەو چەمکە هاتە دەرێ. هەر لەکاری سیاسیەوە بگــرە کـە لـە چاودێری ئوممەت بەسەر فــەرمانڕەوا و، ئامۆژگــاری کردنــی و، فـەرمان پێکردنـی بەچاکە و بەرهەڵستی کردنــی لــە خراپــە تــا لەســەر فـەرمان و شـەریعەتی خـودا راســتەرێ بــێ و، دادگــەری پــەروەردگار پیــادە بکــات هــەروەکو خـوا فـــەرمانی پێکردووە، جا کۆمەڵگە لەنێو بەهرە و نیعمـــەتی ئیســلامدا بحەسێتەوە کـە خـوا بەفەزڵ و منەتی خۆی بەبەندەکانی بەخشیوە:

((الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْـــلاَمَ دِينًا: وا لەمڕۆوە دینەکەتانم تەواو کرد و بەبێ کورتی و کەمایەتی چاکەم دەربارەی ئێوە کرد، ئیسلامیشم بە دینی ئێوە هەڵبژارد.))المائدة/٣.

خودای بەرز دەفەرموێ:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُـــمْ فَـــإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِـــرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَـــأْوِيلاً: ئـەی گـەلی خـاوەن بـاوەڕان! بەرفـەرمانی خـودا و پێغەمبــەری خــودا و کاربەدەســتانی خۆتــان بــن، هــەرکاتێکیش لەســەر شــتێك لەنێوخۆدا پێك نەهاتن، ئەگەر بڕواتان بە خودا و بە ڕۆژێ قیامەتی هەیە، کێشـەی خۆتان حەواڵەی خوا و پێغەمبەری خوا بکەن. ئەم کـارە بۆتـان باشـترە و ئاکـامی چاکتری هەیە.﴾النساء/٥٩.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێ:

((مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إِلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَـــابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَـــا لاَ

يَفْعَلُونَ وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنْ الْإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ: هەر پێغەمبەرێکی خودا پێش من هەناردبی دۆست و هاوەڵی هەبون، سوننەتەکەیان وەرگرتوەو کاریان بە فەرمانەکانی کردوە، پاشان خەڵکانێکی دیکەیان لەپاش هاتوە ئەوە گوتویانە نەیانکردوە و، ئەوەیان کردوە کە فەرمانیان پێنەکراوە، جا هەرکەسێکی بەدەست جیهادیان بکا ئەوە بڕوادارە و، هەرکەسێکی بە زمان جیهادیان بکا بڕوادارە و، هەرکەسێکی بە دڵ جیهادیان بکا بڕوادارە و، لەپاش ئەمەش بارەتەقای یەك دانە خەردەل بڕوا نیە.؟))[1]

بەو شێوەیە ئایەتە پیرۆزەکە سەرچاوەی دەسەڵات لە کۆمەڵگەی موسڵماندا دریاری دەکا کە: خودا و پێغەمبەری خودایە و، فەرمان بەگوێڕایەلی خودا و پێغەمبەر دەکا بەشێوەیەکی رەها[2] لەهەموو فەرمانێك یا هەموو بەرهەڵستیەك کە لە کتێبی خوا یا لە سونەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ هاتبێ. پاشان ئایەتەکە فەرمان بەگوێڕایەلیّ فەرمانڕەوا و کاربەدەستان دەکا نەك وەك شتێکی سەربەخۆ، یان بەرەهایی وەك گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی، بەڵکو بە مەعطوفی لەسەر گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەر، واتە لەوەی ئەوان فەرمانیان پێداوە نەك بەپێچەوانەوەی ئەوەی لەلای خودا و پێغەمبەرەوە هاتوە، چونکە گوێڕایەڵی بۆ هیچ وەدیهێنراوێك نیە ئەگەر بەسەرپێچی لەوەدیهێنەر بێ:

((إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ: بەرفەرمانی و گوێڕایەڵی هەر لەکاری چاکدایە.)).[3]

---

[1] أخرجه مسلم.
[2] رەها: مطلق.
[3] أخرجه الشيخان .

ئینجا ئایەتەکە ئەو سەرچاوەیە روندەکاتەوە کە موسڵمانان لەهەر کێشەیەکی توشیان بێ بۆی دەگەڕێنەوە کە: خودا و پێغەمبەرەکەیەتی و، لەو سەرچاوەیەش بترازێ کەسی دیکە نیە، هەر وەك ئایەتەکە ئەم مەسەلەیە، کە گەڕانەوەیە بۆ خودا و پێغەمبەر لەهەر کێشەیەکدا، بەبڕوا هەبوون بە خودا و بە رۆژی دوایی دەبەستێتەوە، واتە راستەوخۆ بەبیر و باوەڕ، بەمشێوەیە دۆزی سیاسی هەرەگەورە کە دیاریکردنی سەرچاوەی دەسەڵاتە، لەگەڵ ئەو سەرچاوەیەی کە لەحاڵەتی کێشەدا بۆی دەگەڕێنەوە دەبنە دۆزی بیروباوەڕ کە وابەستەی ئەو بنەمایەن کە تێکڕای بیروباوەڕی لەسەر دادەمەزرێ و، بریتیە لە: (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله).

هەرچی ئەو فەرموودەیەش کە هێناومانەوە، ئەوا رەفتاری ئوممەت دیاریدەکا کاتێك سەرپێچیەك لەحوکمی خودا رودەدا، جا بڕیار دەدا کە ئەو سەرپێچیە پێویستی بە بەرەنگاربوونەوە هەیە بەدەست یا بەزمان یا بەدڵ بۆ گێڕانەوەی مەسەلەکان بۆ ئەو سەرچاوەی هەموو مەسەلەکانی بۆ دەگێڕدرێتەوە و، بریتیە لەوەی کە لەلای خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ هاتوە و، ئەو رەفتارەش بەراستەوخۆیی بەدۆزی بڕوا دەبەستێتەوە، ئەویش بەتەواو بێبڕوا دانانی ئەو کەسەی سەرپێچی دەبینێ و بەیەکێك لە پلەکانی بەرەنگاربونەوە بەرەنگاری نابێتەوە کە نزمترینیان رکلێبونەوەی دڵە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الْإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ: لەپاش ئەمەش بارەتەقای یەك دانە خەردەل بڕوا نیە.؟)).

بەمشێوەیە (کاری سیاسی) دەبێتە بەشێك لە بیروباوەڕ و بەشێك لە پەرستن، لەچێوەی هیچ یەکێك لەم دو بازنەیە بەدەر نیە، بەمجۆرە ئوممەت تێگەیشتبو کە چاودێری عومەریﷺ دەکرد کاتێك یەکێك لە رەعیەتەکەی پێی دەڵێ: ئەمرۆ

نەگویێ بۆگرتنت لەسەر ئێمەیە نە گوێڕایەڵی تاكو بۆمان روندەبێتەوە ئەو كراسـەی لەبەرتە لەكوێت هێناوە! یا لەو كاتـەی عومـەر فـەرمانی دا نـەختی ژنـان گـران دانەنێن ژنێك لەرەعیەتەكەی پێی دەڵێ: شـتێكی فراوانـت بچـوك كـردەوە! خـودا دەفەرمووێ: ﴿وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا﴾ تۆش لەبەر خەڵكی تەنگ دەكەیەوە؟! جـا عومەر گوتی: عومەر هەڵەی كرد و ژنێك راستی كرد!

بەڵام ئەو كەڵەگاییە سیاسیەی ئومەویـەكان لـە كـاتێكی زوی ژیـانی ئومـەتی ئیسلامدا دەستیان پێكرد، لەگەڵ ئەو خۆدزینەوە بەرەبەرەییەی لەبەر ئەركـەكان و، سوفیگەرێتی كە هەندێك باری تایبەت لە ژیانی ئوممەتدا دروسـتی كـرد و، هـزری ئیرجائی كە بڕوای-ئەوەی خەڵكی پێ دەچێتە بەهەشت- تەنیا لە بەراست دانـان و دانپێدانان كورت هەڵێنان.. هەموو ئەو فاكتەرانە پێكەوە پەرسـتنیان لـە هەسـتی خەڵكدا تەنیا لە دروشمەكانی پەرستندا كۆكردەوە و، ئیسلام لە هەستی خەڵكدا پتر لەوە نزیك بۆوە كە ببێتە مومارەسەكردنێكی تاكەكەسی كە هەر مرۆڤێك بەتـەنێ پێـی هەڵدەسـتێ، كـاتێك خـەڵك لـە مومارەسـەی (كـاری سیاسـی) ئیسـلامی دوركەوتنەوە كە دیاریترین كارێك بو كۆمەڵی موسـڵمان مومارەسـەیان دەكـرد و، وای لێكردبون شایستەی ئەم وەسفەی خودای مەزن بـن كـە چاكـترین ئومـەت بـن لەنێو خەڵكی سەریان هەڵدابێ و دەركەوتبێ:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْـهَوْنَ عَـنْ الْمُنكَـرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ: ئێوە چاكـترین كۆمـەڵن لـەناو مـەردمی دنیـادا سـەرتان هـەڵدا، فەرمان بە چاكە دەدەن و رێ لە ناڕەوا دەبەسـتن، باوەڕیشـتان بـەخوا هەیـە.﴾آل عمران/١١٠.

کاتێك کاری سیاسی لە چێـوەی بازنـەی پەرسـتن چوە دەرەوە، یەکـەم گـرێی ئیسـلام شـێوازەی تێکچو-گرێـی حوکـم-، ئەگـەر چـی لەسەرەتاشـدا تـەواو هەڵنەوەشاوە، چونکە خەڵك هێشتا لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا حوکمیان دەبردە بـەر شەریعەتی خوا و، لەو بترازێ شەریعەتێکی تریـان نـەدەدیت کـە گوێڕایـەڵ بـون و جێبـەجێکردنی واجـب بـێ، بـەڵام حوکمڕانکردنـی شـەریعەتی خـودا، زۆرداری فەرمانڕەوایانی لەتەکدابو لەگەڵ ئـەو زۆرداریانـەی کـە پیادەکردنەکـەیان ناتـەواو دەکرد لەچاو ئەوەی کە خودا فەرزی کردبو و پێشینە چاکەکانیش جێبـەجێیان کـرد بوو.. چەند سەدەیەکیش بەم حاڵـە تێپـەڕی تـاکو لەچـەرخی تـازەدا ئـەو گرێیـە بەتەواوی هەڵوەشاوە کاتێك شەریعەتی خوا هەر لەبنەڕەتەوە لە حوکم وەلانراوە بـە یاساکانی مرۆڤ ئاڵوگۆڕ کرا و، بوە یەکەمین گرێـی ئیسـلام کـە هەڵبوەشـێتەوە، هەروەك پێغەمبەری راستگۆ ﷺ فەرموویەتی: ((**لَيُنْقَضَنَّ عُرَى هَذَا الدِّين عُـرْوَةً عُرْوَةً، فَأَوَّلُهَا نَقْضًا الْحُكْمُ، وَآخِرُهَا نَقْضًا الصَّلَاةُ**: گرێکانی ئیسلام یەك لـەدوای یەك هەڵدەوەشێن. یەکەمجاریش حوکم هەڵدەوەشێ، دواهەمینیش نوێژ.))[1]

لەگەڵ هەبوونی ئەو فاکتەرانەی ئاماژەمان پێکـردن، کـە کـاری سیاسـیان لـە چێوەی پەرستندا دەرهێنا، چاوەڕوان نـەدەکرا کزبونەکـە لـە چـەمکی بیروبـاوەڕ و چەمکی پەرستن بەو حەددە راوەستێ، بـەڵکو وا چـاوەڕوان دەکـرا کـە کزبوونەکـە بەرەبەرە بۆ دۆزەکانی دیکەی کار و کردەوەش دزە بکات، جا بەرەبـەرە کـارکردنی لە بازنەی بڕوا و بازنەی پەرستن هێنایە دەرێ، نەك بەو واتایەی خـەڵك وازیـان لـە نیش و کار هێنابێ و چیدیکە کار نەکەن، چونکە مـرۆڤ بـۆی نـاکرێ لـە ژیـانی

---

١ أخرجه أحمد .

دنیادا واز لــه ئیشـوکار بێنـێ، کـه خـوای گـه‌وره بـۆ زه‌حمه‌تکێشـانی بـه‌رده‌وام وه‌دیهێناوه:

﴿يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلاَقِيهِ: ئه‌ی مـرۆڤ! ره‌نجـی زۆر ده‌ده‌ی بگه‌ی به‌ په‌روه‌ردگاری خۆت، سا تۆش دێی.﴾الأنشقاق/٦.

به‌ڵکو به‌واتای که‌ کارکردن له‌ ژیانی دنیا، له‌ هه‌ستی خه‌ڵکیدا له‌ بازنـه‌ی بـڕوا جودا بۆوه‌ کـاتێك بـڕوا لـه‌ به‌ڕاسـتدانان و دانپێداهێنـاندا کۆبـۆوه‌ و، لـه‌ بازنـه‌ی په‌رستنیش جودا بۆوه‌ کاتێك په‌رستن ته‌نیا له‌ دروشمه‌کاندا کورتهـه‌ڵات.. جـا کـار کردن سـتونێکی دیکـه‌ی بـۆ دروسـتبوو کـه‌ قـازانج کـردن بـو، یـان گلدانـه‌وه‌ و موڵکدارێتی، یان زاڵبون و ده‌سه‌ڵات بو، یا چێژوه‌رگرتنی هه‌ست یـا چێژوه‌رگرتنـی مه‌عنـه‌وی بـو.. یـا هـه‌ر هـانده‌رێك لـه‌ هـانده‌ره‌ (زاتیـه‌کان) کـه‌ مـرۆڤ بـۆ به‌رهه‌مهێنان و کارکردن هانده‌دا و په‌یوه‌ندی به‌بونی بڕوا بـه‌خودا یـا په‌رسـتنیه‌وه‌ نیه‌..

له‌هه‌ستی مرۆڤیشدا وایلێهات که‌ ئه‌و کاته‌ی به‌ (په‌رستن) خه‌ریك ده‌بـێ لـه‌کار داده‌بڕێ و، کاتێك (کار ده‌کا) له‌ په‌رستن داده‌بڕێ، بۆیه‌ دو ساتی تـه‌واو جیـاواز و لێکدابڕاوی بۆ دروست بو که‌ هیچ په‌یوه‌ندیه‌کیان له‌ نێواندا نه‌بو؛ ساتی کـارکردن و سـاتی په‌رسـتن، سـه‌ره‌ڕای سـاتی سـێیه‌م کـه‌ ده‌که‌وتـه‌ ده‌ره‌وه‌ی کـار و ده‌ره‌وه‌ی په‌رستنیش و، ئه‌ویش ساتی رابواردن و هه‌سانه‌وه‌یه‌ جا دروست بێ یا نادروست!

وایلێهات ئه‌و سێ بازنه‌یه‌ لێك دابڕان، به‌ده‌وری ناواخنه‌کانیاندا (کڵۆم) دران و، مرۆڤ چیدی نه‌یده‌توانی بگاته‌ یه‌کێکیان هه‌تا ته‌واو له‌ دوانه‌که‌ی دیکه‌ ده‌رده‌چو!!

*   *   *

نەوەی یەکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردەی کردبو، مەسەلەکە بەو شێوازە شێوازە تێنەدەگەیشتن کە نەوەکانی دوایی تێدا لارێبوون. بەڵکو وەك باسمانکرد ژیان هەموو بەپەرستن تێدەگەیشن، جا نوێژ و نوسك و هەموو کار و کردەوەیەکی دەگرتەوە و، هەروەها ساتی سرەوت و هەسانەوەشی دەگرتەوە، لەهەموو ژیانی مرۆڤدا هیچ شتێك نەبو لەدەرەوەی بازنەی پەرستندا بێ کە مەبەستی بونی مرۆڤی لەسەر ئەم زەویەدا تێدا کۆبۆتەوە، بەڵکو سات لەدوای سات جۆری جیاواز بون لە پەرستن، هەمووی پەرستن بون ئەگەر چی جۆر و بوار و دەوروبەرەکانیشی جیاواز بان.

نوێژ و نوسك پەرستنن.

• رەنج و زەحمەتکێشان پەرستنە، جا رەنجی سیاسی یا کۆمەڵایەتی یا ئابووری یا فیکری یا زانستی یا... تاد. بێ.

حەسانەوەی دڵانیش بۆ ئەوەیە لە پەرستن ماندو و بێزار نەبن.

هەرچی نوێژ و نوسکە ئەوا مەسەلەی پەرستنی تێدا رون و ئاشکرایە و ئاتاجی رونکردنەوە نیە.

رەنجیش مەسەلەی پەرستنی تێدا تەواو ئاشکرابو لەلای ئەو نەوەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەژێر چاودێری خۆی پەروەردەی کردن. ئەوانی کە بە پێوە و بەدانیشتن و بەپاڵکەوتن یادی خودایان دەکرد، بەو شێوازەی پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد.

زەحمەتکێشان کە لەواقیعی ژیاندا کارکردنە- ببوە ئەو پەرستنە بەردەوامەی موسڵمان ئەنجامی دەدا و،-بۆ ئەنجامدانیشی- خۆی بەو خۆراکە روحیە قوڵە تێر

دەکرد کـە دروشمـەکانی پەرستن پێیـان دەبەخشـی-کـاتێك بەشـێوە دروسـتەکەی ئەنجامی دەدان، لە پالاوتەیی و لێبڕان بۆ خوا، لەگەڵ ملکەچی و ترس و دڵکزی.

پەرسـتنیش لـەو زەحمەتکێشـانەدا لـەدو مەسـەلەی سـەرەکی رەنگـی دەداوە: ئاراستەکردنی بەرەو خوا و، پابەند بوون تیایدا بـەوەی خـوا دایبـەزاندووە. ئـەوجا یەکسەر دەگۆڕا بۆ پەرستنێك کە پێی لەخوا نێزیك دەبۆوە و، لە پـای ئـەنجامدانی شایستەی پاداشتی لای خودا دەبو.

هەرچی سرەوتن و حەسانەوەش بو، دەیاندیت کە پێغەمبەری خـوا ﷺ گاڵتـە و دەسبازی لەگەڵ خێزانەکانی دەکـرد و، خـێزانی خـۆی دڵخـۆش دەکـرد و، لەگـەڵ هـاوەڵانیدا ﷺ بەسـاکاری رەفتـاری دەکـرد و لەگـەڵیان دەچـوە نـاو کێڵگـان و دادەنیشت یا بـۆ وەرزش لەگـەڵیاندا دەچـوە دەرەوەی شـار و، پێشـبڕکێی ئەسـپ سواری لەبەر دەستیدا ئەنجام دەدرا و.. بانگی دەکردن و ئاراستەی دەکردن بـۆ ئـەو شتانەی ماندوبون و بێزاری لە دڵەکانیان نایەڵێ، دور لە گونـاه و لـە پێوەگلانێـك کە بەسەر ئەرك و واجبەکاندا زاڵ بێ، جا وایـان هەسـتدەکرد کـە هەسـانەوە بـەم شێوەیە کاتێك بار و زروفی چڕ و پڕ ئەرکیان رێگەی دەدان پەرسـتنەکانی چـالاك دەکرد و بۆ بەجێـهێنانیان کاریگـەر بـو، بـەمجۆرە ئـەمیش دەکەوتـە چوارچێـوەی پەرستنەوە..

بەمشێوەیە ژیانیان هـەموو لـە پەرستن بەسـەر دەبـرد.. پەرسـتنێك هـەموو چالاکیەکانی گیـانی دەگرتـەوە، لەگـەڵ هـەموو چالاکیـەکانی عـەقڵ و، هـەموو چالاکیەکانی جەستە، مادام ئەمە هەموی بۆ خودا ئاراستە کرابێ و روی لەخوا بێ و، تێدا پابەندی ئەوە بێ کە خوا دایبەزاندوە.. ئەمـە لەهـەمانکاتدا پەرسـتنێکە مرۆڤ بێزار ناکا و لەتوانای خۆی زیاتری ناخاتە سەر شان، چونکـە ئـەو چالاکیـە

سروشتیەی لێوەردەگرت، کە مرۆڤ بەحوکمی خودی پێکهاتەکەی خۆی دەتوانێ بیبەخشێ، ئەوجا بەو دەسکاریە ساکار و لەهەمان کات قوڵەی کە بۆ خودا ئاراستەی دەکرد، دەگۆڕا بۆ پەرستن، و، چاوی پێ لە ڕەزامەندی خوداش بو.

ئەمەش چەمکی راستو دروستی پەرستنە هەروەکو خوا دایبەزاند.. ئەو چەمکە گشتگیر و فراوان و قوڵە:

﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَاي وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ: بڵێ: من نوێژکردنم و پێکهێنانی ڕێوشوێنی حەج کردنم و ژین و مەرگم، بۆ خودایە، کە هەرخۆی پەروەردگاری جیهانە، هیچ شەریکی نیە.﴾الأنعام/١٦٢-١٦٣.

* * *

کاتێك مەسەلەکەش بەم تێگەیشتنە بو کەنەوەی یەکەم لە کتێبی خوا و فێرکردنی پێغەمبەرەکەی ﷺ تێگەیشتبوون هیچ بازنەیەکی داخراو لەژیانی موسڵمانانندا نەبو سات دوای سات لە یەکێکیانەوە بچێتە ئەوی دیکە.. (پەرستن)یش تەنیا ساتێك لە ساتەکان نەبو، کە موسڵمان لێیەوە بۆ یەکێکی دیکە دەرچێ.. بەڵکو بازنەیەکی فراوانی سەرتاپاگیر هەبو، مرۆڤ لەلایەنە جیاجیاکانیدا لە چالاکیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە هاتوچۆی دەکرد و، لە هەموو حاڵەتەکانیشدا لەناویدا راوەستابا یا بجوڵابا هەر خودای دەپەرست:

﴿يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ: -چ بە راوەستاوی و چ لە جێوە، بە دانیشتن، چ لەسەر تەنیشت- هەر یادی خوا دەکەن.﴾آل عمران/١٩١.

ئەمەش وەنەبێ خوبەخشینێك بێ هەر بەوان تایبەت بێ و، خەڵکی دیکە نەگرێتەوە.. بەڵکو ئەوە تێگەیشتنی راست و مومارەسەی راستی پەرستن بوو

ئەوجا لە نێوان خۆیان پێشبڕکێیان بو نەك لەو کڕۆکە هاوبەشە، کە پەرستن هەموو جۆری چالاکیەکانی دەگرتنەوە، بەڵکو لەو بڕەی هەر یەکێکیان تێدەکۆشا لەبوارە جیاجیاکانی پەرستندا وەدەستی بینێ، بەو بڕەی کە خودا یاریدەی دەدان و سەریدەخستن.

پێشوازیەکی زۆر گەرمیشیان لە دروشمەکان دەکرد هەروەکو باسمانکرد، لەبەر ئەوەنا کە تاکە بواری پەرستن بو جا هەموو هەست و نەست و ئامادەبوونی رۆحی خۆیان و ملکەچی و سەردانەواندنیان بۆ خودا، تێدا هەڵدەڕشت.. بەڵکو لەبەر ئەوەی لە هەستی ئەوان-هەروەك لە حەقیقەتێکیشدا وایە- ئەو دروشمانە ئەو وێستگانە بون کە مرۆڤ توێشوی تێدا وەردەگرێ بۆ پاشماوەی رێگاکە.. یان ئەو کانیاوە بون کە بەردەوام تاقەت تازە دەکاتەوە بۆ ئەنجامدانی پەرستنەکانی دیکە کە لەسەر مرۆڤ فەرز کراون.. هەرجارێکیش توێشو تەواو دەبێ یا دێتە سەر تەواو بوون، رێبوارەکە گەیشتوتە وێستگەیەکی دیکە تا تویشو بۆ قۆناغی داهاتوی دابین بکا..

نوێژ توێشویەکی رۆژانەیە کە لەشەو و رۆژێکدا پێنج جار دوبارە دەبێتەوە، رۆژوش توێشویەکی ساڵانەی چڕ و کۆکەرەوەیە کە مانگێکی تەواو دەخایەنێ، مرۆڤ تیایدا لەپەرستنێکەوە بۆ پەرستنێکی دیکە و، بۆ پەرستنێکی دیکە دەچی، زەکاتیش وەرزێك یا چەند وەرزێکی ساڵانەیە مرۆڤ تیایدا لەرژدی پاکدەبێتەوە و، مومارەسەی بەخشینی رۆحی و مادی دەکات و، حەجیش لەتەمەندا وەرزێکە و، مرۆڤ تیایدا لە هەموو خۆشی چێژە فانی و بەسەرچوەکانی زەویدا دادەبڕێ و، ڕو لە خودا دەکاو، و هەموشی توێشوە.. بۆ ئەو رێگەیەی کە ماوە و... پەرستنیش هەموو رێگەکە دەگرێتەوە..

با بڕوانینه هەندێك نموونە لە ڕەفتاری هاوەڵان ﷺ تا پەی بەو حەقیقەتە قـــوڵ و وردە ببەین، کە بریتیە لە گشتگیری پەرستن لە هەستی ئـــەواندا بـــۆ هـــەمو کـــار و هەمو بیر و هەمو هەستێك و، هەمو ساتێکیش لـــە ســـاتەکانی تەمـــەن و، کـــورت هەڵنەهاتنی لە چەند ساتێکی دیاریکراو کـــە دروشمـــەکانی پەرســـتنی تێـــدا ئـــەنجام دەدرێ..

بۆ نموونە ئەو ئەعرابییەی کە پێغەمبەری خـــوا ﷺ پشـــکی خـــۆی لـــە غەنیمـــەت دایێ، ئەویش بەپێغەمبەری گوت: من بـــۆ ئەمـــە شـــوێنت نەکـــەوتم! بـــەڵکو بۆیـــە شوێنت کەوتم تا لێرەمەوە-ئاماژەی بەگـــەردنی خـــۆی کـــرد- بـــەتیرێك بپێکرێـــم و بکوژرێم جا بچمە بەهەشت.

پێغەمبەریش فەرمووی: ((**إِنْ تَصْدُقِ اللَّهَ يَصْدُقْكَ**: ئەگەر لەگەڵ خـــودا ڕاســـت بی خوا ڕاستت بۆ دێنێ))[1]، ئایا ئەو کابرایە لە ترۆپکی پەرستندا نەبوە کـــە ئـــەو کارەی کردوە؟!

کەچی لەو ساتەدا هیچ یەکێکی لە دروشمەکانیش بەجێنەدەگەیاند!

بەڵکو پەرستنی ئەو ساتەی ئەنجام دەدا کە تێی دابو، لەو بۆنەیەی کە تێی دابو و، لەئاستی لوتکەشدا بەجێی گەیاند.

وەك نموونەش ئەو ئافرەتەی کە خوی[2] دەگرت و لەشی دەردەکەوت، جا داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کـــە دوعـــای چابوونـــەوەی بـــۆ بکـــا، پێغەمبـــەر ﷺ پێـــی فەرموو: ((**إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ، وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ ﷻ أَنْ يُعَـــافِيَكِ**: ئەگەر حەزت لێبێ ئارام دەگری و پاداشتت بەهەشت دەبێ، ئەگەر دەشتەوێ دوعـــا لەخوای-بەرز- دەکەم چاکت بکاتەوە)). گوتی: ئارام دەگرم! گوتی:

---

[1] أخرجه النسائي .

[2] خو: فێ: صرع.

بەلاّم من لەشم دەردەکەوێ، جا بۆم لەخوا داوابکە دەرنەکەوم، پێغەمبەریش ﷺ دوعای بۆ کرد..

ئایا ئەو ئافرەتە لە لوتکەی پەرستندا نەبوە کە ئەو قسەیەی کردوە؟! کەچی لەو ساتەدا هیچ یەکێکیش لە دروشمەکانی بەجێنەدەگەیاند! بەڵکو پەرستنی ئەو ساتەی ئەنجام دەدا کەتێی دابو، لەو بۆنەیەی کە تێیدابو، لە ئاستی لوتکەش پەرستنەکەی بەجێ دەهێنا.

هەروەها سەلمانی فارسیش بەنمونە وەرگرە کاتێك عومەر ﷺ لەسەر مینبەر بو دەیگوت: هۆ خەڵکینە، گوێبدەنێ و گوێڕایەڵ بن، سەلمان گوتی: ئەمڕۆ نەگوێت بۆ رادەگرین و نەگوێڕایەڵیت دەکەین! عومەریش-بەبێئەوەی تورە بێ- گوتی: بۆچی؟ سەلمان گوتی: تا بۆمان روندەکەیتەوە ئەو کراسەت لەکوێ بو کە لەبەرت کردوە! عومەر تورە نەبوو، بەڵکو بانگی عەبدوڵلای کوڕی عومەری کرد و پێی گوت: توخوا! ئەو کراسەی لەبەرمە هی تۆیە؟ گوتی: بەڵێ!.. سەلمان گوتی ئێستا ئەمرکە! ئێمە گوێ رادەگرین و گوێڕایەڵ دەبین!

ئایا کەسیان یەکێك لە دروشمەکانی ئەنجام دەدا؟ بەڵکو هەریەکەیان پەرستنێکی ئەنجام دەدا! سەلمان خودای دەپەرست بەچاودێری کردەوەکانی فەرمانڕەوا تا دڵنیابێ لەوەی دادگەری پەروەردگار لە رێچکەی خۆیەتی، عومەریش-بەگیانی پەرستن لەلوتکەدا- تورەنەدەبو لەوەی یەکێك لە رەعیەتەکانی لەسەر مەترە کوتاڵێکی زیاد یەخەی دەگرێ و لێی دەپێچێتەوە!

نمونەی ئەو پیاوە هەژارە و ژنەی سەیرکە، کە پیاوەکە وایلێهات لای پێغەمبەری خوا ﷺ گازاندە لە هەژاری خۆی بکا، تا شتێکی بداتێ باری سەرشانی سوك بکا، بەلاّم ژنەکەی پێی دەڵێ: ئایا لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ گازاندە لەخوا

دەکەی؟! جا پیاوەکە رادەوەستێ و ئارامدەگرێ!

ئایا ئەمە ساتێکی پەرستن نەبوە و؟ لەلوتکەی پەرستنیشدا نەبوە؟!

نمونەی ئەو پیاوەش وەربگرە کە بۆ جەنگ چوە دەرەوە و چەند دەنکە خورمایەکی لەدەستبو، جا بۆنی بەهەشت پەلەی لێکرد و ئارامی هەلگرت، دەنکە خورماکانی دەستی فرێدا و دەیگوت: ئەگەر بمێنم تا لەمانە تەواو دەبم زۆر درێژ دەخایەنێ!!

چۆن ئەو ساتە بالآیانە ناو دەبرێن.. ئەگەر ساتانی پەرستن و لەبەرزترین لوتکەی پەرستندا نەبن؟!

*   *   *

هاوەلآن ﷺ -بەشێوەیە پەروەردگاری خۆیان دەپەرست..

بەنوێژ و نوسك دەیانپەرست..

بەکار و کردەوە دەیانپەرست..

بەسرەوت و هەسانەوەی پاك و بێگەرد دەیانپەرست کە رێ لەکوێربونی دلآن دەگرێ..

جیاوازیش زۆرە ئەگەر پەرستن لە نوێژ و نوسك و دروشمەکان کورت هەلبێ و، کار و هەسانەوەی لێ دەرچێ، لەگەلْ ئەوەی هەموی هەر پەرستن بن و، مرۆڤ لەنێوانیاندا سات لەدوای سات بێت و بچێت، بەلآم هیچ ساتێك لە بازنەی پەرستن دەرنەچێت کە روی دلْ لەخودایە و، بەفەرمانەکانی خودا پابەندە..

جیاوازیەکە لە پاکژی دەرون و لە رەفتار..

هەروەك جیاوازییە لە جۆری ئەو (دەسکەوت)ەی مرۆڤ لەسەر زەویدا ئەنجامی دەدات، بەتەنیا بێ یا بە کۆمەلْ..

هەرچی جیاوازی پاکژیەکەیە ئاشکرایە.

کاتێك کار دەبێتە پەرستن نەفرِوفێلْ نــە خیانــەت، نـە درۆ، نەخەڵــەتاندن، نـە دەسدرێژی بە زوڵم و زۆر بۆ سەر مافی خــەڵك، نـە ئـەنجامدانی کـاری حـەرام بـۆ قازانج یان زاڵبون یان رابواردنی؛ هیچ لەوانەی تێناکەوێ..

کاتێك هەسانەوە دەبێتە پەرستن بەهیچ شـێوەیەك دانابـەزێ و، سـوك و ریسـوا نابێ و، لە مرۆڤایەتی مـــرۆڤ ناهێنێتــە خـوار هــەروەکو ئێسـتا لــە جاهیلیــەتی هاوچەرخدا لە جۆرەکانی (رابواردن) رودەدا کە هەمولایــەکی گرتۆتــەوە و، هــەمو فاحیشـەیەکی ئاسایی یان ریزپەڕ بۆ خەڵك دەڕازێنێتەوە.

هەرچی دەسکەوتیشە، رەنگــە ئـەمرۆ وا بەخـەیاڵی هـەندێ کـەس دابـێ کـە مەزنترین دەسکەوتی مێژو ئــەو دەســکەوتەیە ئـەوروپا لـەم سـەردەمەی ئێســتادا ئەنجامیداوە و.. ئەمەشی ئەنجام داوە کە تەواو لە (ئـــاین) و لەپەرســتنی خـوا دور بوە..

جا لێرەدا دەبێ لە کۆمەڵە حەقیقەتێك ئاگادارین..

گومان لەوەنیە ژیازی مادی هاوچەرخ دەسکەوتێکی گەورەی لە هەندێك لایەنی ژیاندا وەدەست هێناوە، دیارترینیان پێشــکەوتنی مــەزنی زانســتی و پێشـکەوتنی تەکنەلۆجیە کە بەروبوومی زانستی بۆ سانا کردنی ژیان و سوککردنی باری مــرۆڤ بەکارهێناوە، لەگەڵ بلیمەتی لە رێکخستندا کە رۆڵی خــۆی لەســاناکردنی ژیــان و ســوککردنی ئــەرك و گێڕانــەوەی کـاتێکی زۆردا دەبینــێ، لەگـەڵ هـــەندێك لـــە (مافەکان) و (دابین کردن)[1] دا دەردەکەوێ کە خەڵکی ئەوێ سودی لێدەبینن.

---

[1] دابین کردن: ضمانات.

بەڵام دەرەنجامی کۆتایی ئەم ژیارە مادیە تەواو لەوە دورە کە ببێتــە وێنەیــەکی ڕۆشنی (مرۆڤ) یا ببێتــە مایــەی ســەربەرزکردنی، ســەرەڕای هــەمو ئــەو لایەنــە روناکانەی تێدایە، بەهۆی ئەو زۆرداریە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەی تێیدایە، لــەپاڵ ئیمپریــالیزم و، بــەزاندنی ســنوری حەرامــەکان و، پیســوپۆخڵی هەســتی و مەعنەوی و، شڵۆق بونی باری ئەخلاقی و، کوژانــەوەی ڕۆح و، شــکانی نــەفس و، هێنانەخوارەوەی مرۆڤ لەو شوێنە شیاوەی کە خودا بۆی وەدیهێناوە و، ڕێــزی پــێ لێناوە، تاکو لەکۆتاییدا ببێتە کۆیلەیەکی زەلیل بۆ هەمو شتێك.. جگە لە خوا.[1]

ئەمەش چوارڕیانی نێوان دەسکەوتی ئــەوروپای هاوچەرخــە لەگــەڵ دەســکەوتی ئوممەتی ئیسلامی کاتێك ژیانی لەسەر پیادەکردنی ڕاستی ئیسلام ڕاوەستا بوو..

ئەوەی ئەمڕۆ ئەوروپا ئەنجامی دەدا ئــەوە نیــە کــە یەکــەم ئوممــەتی ئیســلامی ئەنجامیدا، تەنانەت لێشی نێزیك نیە، ئەگەر چی هەندێك بەشــەکانی وێنەکــە، لــە هەندێك مێشکاندا تێکەڵ دەبن.

ئەوەی یەکەم ئوممەتی ئیسلامی ئەنجامیدا تــەنیا فراوانگــەری و رزگــارکردن و، باڵا دەستی و دەسەڵات نــەبو، بەتــەنێ دامــەزراندنی بزوتنەوەیــەکی زانســتی یــان بزوتنەوەیــەکی ژیــاری یــا ئاوەدانکردنەوەیــەکی مــادەی روی زەوی نــەبو.. ئەمــە هەموی لەبەخششی پەروەردگارە کە بێجیاوازی بە کافر و ئیمانداری دەبەخشێ:

﴿كُلاًّ نُمِدُّ هَؤُلاَءِ وَهَؤُلاَءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّــــكَ مَحْظُــورًا: هەمو لایان لە خەڵاتی پەروەردگارت بێبەش ناکــەین، خــەڵاتی پــەروەردگاری تــۆ هیچ لەمپەری لەبەر نیە.﴾الاسراء/٢٠.

---

[1] ئەگەر دەتەوێ بەندی (الديمقراطية) لە کتێبی (مذاهب فكرية معاصرة) بخوێنەوە.

گەلێك جاهیلیەتی مێژوش پشکیان تێدا هەبوه:

﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ، ثُمَّ كَانَ عَاقِبَةَ الَّذِينَ أَسَاءُوا السُّوءَى أَنْ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَكَانُوا بِهَا يَسْتَهْزِئُون: ئاخۆ هیچ گەشت و گوزاریان لەم زەمینەدا نەکردوە، تا بڕوانن پێشینەکانی رابردو-کە لەمان تواناتر بون و زەویان کێلا و ئاوەدانتریشیان کرد و پێغەمبەرانیشیان بە نیشانەیەکی ئاشکراوە هاتنە لایان- چیان بەسەر هات؟ خودا غەدری لیٚ نەکردن؛ بەلاٚم خۆیان هەر غەدریان لەخۆیان کرد.. لە ئاکاما ئەوانەی خراپەیان کرد، خراتریان توش هاتەوە؛ کە نیشانەکانی خوایان بەدرۆ زانی و گالتەجاڕییان پێدەکرد.﴾ الروم ٩-١٠.

﴿فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِنْدَهُمْ مِنَ الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُون: کە پێغەمبەرانی ئێمە بە نیشانەی ئاشکراوە چونە لایان، بەو هۆیە کە زۆر دەزانن، دڵیان خۆش بو؛ کەچی ئەوەی ئەوان گەمەیان پیٚدەکرد، دەوری لێدان.﴾غافر/٨٣.

بەلاٚم ئەوەی ئوممەتی ئیسلامی کردویەتی بریتی بو لە دامەزراندنی ئەو ئاوەدانی و ئەو ژیارە و ئەو هێزە زاڵ و بەتوانایە لەسەر بناغەیەك لە بەهای وا کە لە مێژوودا بێجگە لە مێژوی ئەم ئوممەتە ناوازەیە، لەوێنەیەی واقیعێکی کرداری رەفتار ئامێز نەهاتۆتە دی.

هەرکەسێکی ویستیشی با بەراوردێك لە نێوان بزوتنەوەی رزگارکردنی ئیسلامی و ئیمپریالیزم بکا و، لە نێوان دادگەری پەروەردگار هەر وەك موسڵمانان پیادەیان کردوە لەگەڵ ئەو (دادگەری)یەی جاهیلیەتی هاوچەرخ لە نێوان سپی و

ردشان له ئەمریکا و له خواروی ئەفریقیا هەیە، ساز بکات، هەروەها بـا لـەنێوان خاچپەرستی زایۆنی و موسڵمانان له فەلەستین و یا حەبەشه یا ئەریتیریا یا چاد یـا فلیپین، یا له جیهانی کۆمۆنستدا بەراوردێك بکا! با بەراوردێکیش ئـەنجام بـدا لـه نێوان وەفاداری موسڵمانان بۆ پەیمانەکانیان و له نێـوان ئـەو پەیماننامانـەی ولآتـان مۆری دەکەن و دوایی له دەرفەتێك دەگـەڕێن تـا هەڵیبوەشێننەوە! هـەروەها لـه نێوان گەڕانی بزوتنـەوەی زانسـتی ئیسـلامی بـەدوای چاکـه و خـێر و، لـه نێـوان بەکارهێنانی زانست له جاهیلیەتی هاوچەرخدا بۆ لادانـی خـەڵك لـه بیروباوەڕیـان بەخودا و، بەکارهێنانی بۆ وێرانکاری وەحشیانه و، بەکارهێنانی بـۆ گـەندەڵکردنی ئاکار[1] و، له نێوان گشتگیری ژیاری ئیسلامی بۆ (مرۆڤ) له هەمو لایەنەکانـەوە، بـەرۆحی و بەمادەیـەوە و، جـەختکردنی ئـەم ژیـارەی ئـەمرۆ لەسـەر لایەنـه بەرهەستەکانی ژیان و پشتگوێ خستنی لایەنی رۆحی.

ئەمه رێك ئەو جیاوازیەیه که لەنێوان مومارەسەکردنی ژیان بەهەستی پەرسـتن، واتـه پەرسـتنی خـوادا هەیـە، لەگـەڵ مومارەسـه کردنـی-بەهۆشیاری بـێ یـا بەبێهۆشی- وەك پەرستنی شەیتان، لەگەڵ زۆری ئەو شێوازانەی شەیتانپەرستی پـێ مومارەسه دەکرێ!

ئوممەتی ئیسـلامیش لـەترۆپکیدا بـو کـاتێك بەهەسـتی پەرسـتن مومارەسـەی (کار)ی دەکرد بەڵام کاتێك بەرەبەرە کار لەچـەمکی پەرسـتن چـوە دەرێ، دەسـتی پێکرد به پلەی جیاواز له له ترۆپك هاته خوارێ..

* * *

---

[1] هەر وەکو حەبی منداڵنەبون بۆ بڵاوکردنەوەی فاحیشه لەسەر زەوی بەکار دێ و، پیتاندنی دەستکرد لەنێکدابڕینی پەیوەندیەکانی خێزان و گەند کردنی وەچه خستنەوە بەکار دێ.

بەتەنیا کاریش-بەهەمو بوارەکانیەوە- نەبو کە لەچەمکی پەرستن هاتە دەرێ کاتێك پەرستن تەنیا لە دروشمەکاندا کۆ کراوە.. بەڵکو کارەسات لەوێدا بو کە (ئاکار) لە بازنەی پەرستن هاتە دەر..

بنکە ئاکاریە فراوان و سەرتاپا گیرەکە، یەکێکە لە سیما هەرە گەورەکانی ئەم ئایینە، کە هەمو کردەوەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە.

هیچ شتێك نیە لە ژیانی مرۆڤ دا لە بازنەی ئاکار بەدەر بێ، نە رەفتاری و نە هزری و نە هەستی و نە هیچ یەکێك لە جۆرەکانی چالاکی، سیاسی بێ یا کۆمەڵایەتی یا ئابوری یاخود هونەری.. تاد. بەڵکو هەمو چالاکیەك لە چالاکیەکانی بە ئاکارەوە پابەستە و لەسەر بنچینەیەکی ئەخلاقی هەڵقوڵاو لەو پەیمانەوە کە مرۆڤ تێیدا دان بەبەندایەتی خۆی دادەنێ بۆ خودا:

﴿أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ، الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَلاَ يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ، وَالَّذِينَ يَصِلُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوءَ الْحِسَابِ، وَالَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلاَنِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ: ئاخۆ کەسێ بڕوای وابێ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە هەمو راستە، وەك ئەوەیە کە لەم بارە کوت و کوێرە؟ ئەم رامانە هەر بۆ خاوەن ئاوەزانە.. ئەو کەسانەی پەیمانی خوا پێك دێنن و تازە لێی پاشگەز نابنەوە.. ئەو کەسانەش کە هەودای نێوانی خۆیان لەگەڵ خودا-وەك خودا فەرمانی داوە- قوت ناکەن و لە پەروەردگاریان دەترسن و لە حیساب کێشانی دژوار نیگەرانن.. ئەو کەسانەش کە لەراهی رەزای خودا خۆیان گرت و نوێژیان کرد

و-بەنهێنی و بە ئاشکرا- لەو بەشەی ئێمە پێمان دان، خێر دەکەن و بە چاکە خراپەکانیان دەشۆنەوە؛ دوارۆژی خۆش بۆ ئەوانە﴾الرعد١٩-٢٢.

ئەو پەیمانەش پەیمانی فریشکە[1]کە خودا لە جیهانی تۆرەمەدا لێی وەرگرتون، یان ئەو پەیمانەیە کە هەموو پێغەمبەرێك لە خەڵکی وەردەگری کە تەنیا خودا بەبێ هاوبەش بپەرستن:

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا: ئەوساش کە پەروەردگاری تۆ لە پشتی نەوەی ئادەم زار و زیچی بەرهەم هێنا، لەسەر خۆیان شایەتی هەر بە خۆیان دا. گوتی من پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان بەڵێ ئێمە لەوە ئاگادارین. نەکا رۆژێ دوایی بڵێن نەمانزانی. ﴾الأعراف/١٧٢

﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ: بۆ ناو هەمو کۆمەڵەیەك پێغەمبەرێکمان بەرێ کردوە کە خودا بپەرستن و لە شەیتان دوورەپەرێز بن. ﴾النحل ٣٦.

بەلاّم لە ئاهەنگەکەدا[2] ئەوە گرنگە کە (پەیماننامە) کە هەندێك لە داخوازیەکانی ورد دەکرێنەوە و دەردەکەوی کە لە بنچینەدا داخوازی (ئاکارن)، هەر چەند برێك مەسەلەی بیروباوەڕ و هەندێك مەسەلەی رەفتاری و، هەندێك مەسەلەی دەرونیش دەگرێتەوە: ﴿الَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلاَنِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ: ئەو کەسانەش کە

---

١ فریشك: فطرة.

٢ ئاهەنگە: سیاق

لەراهی رەزای خودا خۆیان گرت و نوێژیـان کـرد و-بەنـهێنی و بـە ئاشـکرا- لـەو بەشەی ئێمە پێمان دان، خێر دەکەن و بە چاکە خراپەکانیان دەشۆنەوە﴾الرعد/٢٢.

لێرەوە سەرهەڵدانی پابەند بوونی ئاکارمان لە ئیسلامدا لـەلا روندەبێتـەوە کـە پەرسـتنی خـوا، پـاش هـەبونی یـەقین بەپەرسـتراوێتی و، بـەوە کـە هـەرچی بـۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ دابەزاندوە حەقە، واتە: داخـوازی (لا إلـه إلاّ الله، محمـد رسـول الله)یە.

پاشان بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم ئایەتانە و ئایەتگەلێکی دیکە لە کتێبـی خـوا کـە پـەیمان بەسـتن لەگـەڵ خـوادا کـە لـە ئیسـلام بنچینـە ئاکاریەکـەی لەسـەر دادەمەزرێ، فراواندەبێ هەتاکو هەمو کردەوەکان دەگرێتەوە:

﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَـاهِلُونَ قَالُوا سَلاَمًا، وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا، وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا، إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًـا، وَالَّذِيـنَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا، وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّـهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِـكَ يَلْقَ أَثَامًا، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا، إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَـنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَـانَ اللَّـهُ غَفُـورًا رَحِيمًا، وَمَنْ تَابَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مَتَابًا، وَالَّذِينَ لاَ يَشْـهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا، وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِـرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا، وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُـنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا، أُوْلَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيـهَا تَحِيَّـةً وَسَلاَمًا، خَالِدِينَ فِيهَا حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًـا: عـەبدە راسـتەکانی رەحمـان ئـەو

کەسانەن کە بەبێ دەعیە دەچنــە ڕێـوە و هـەر کـاتێکیش نەزانـەکان بیـاندوێنن، پەرسڤی نەرم و نیانیان دەدەنەوە، ئەوانەش کـە شـەو تـا ڕۆژ، ڕوەو پـەروەردگاری خۆیـان سـوژدە دەبـەن و وەسـتاون. ئەوانەشـن کـە وا دەڵێـن ئـەی پـەروەردگاری هەمومان! جەزرەبەدانی دۆزەخمان لێ دورخەوە. چونکە ئەشـکەنجەی دۆزەخ دوایـی نایە. کە بەراستی زۆر شوێنێکی نالەبار و زۆر ئەنوایـەکی خراپـە، ئەوانەشـن کـە لەکاتی ماڵ بەخشینا، نە یەکجاری دەست بڵاون، نە تەواویش دەست قوچاون، هەڵ لەو نـاوەندەدا مـاون، ئەوانەشـن کـە وێـڕای خـوا، هیـچ شـتێکی تـر ناپەرسـتن، کەسێکیش ناکوژن کە خوا ڕژتنی خوێنی بە ناڕەوا زانیوە. مەگین بە هـەق، توشـی داوێن پیسیش نابن. هەرکێ ئەم کارانە بکا؛ تاوانی خۆی دێتەوە ڕێی. ڕۆژی دوایی دوچەندانە ئازار دەدرێ و بە سوکایەتی هەر لەوێدا دەمێنـێ. مەگـەر ئـەوی تۆبـە دەکا و باوەڕ دێنێ و ئاکاری چاك ڕەچاو دەکا. کە خودا خراپەکانیان بـە چاکـە بـۆ دەگۆڕێتەوە و خوا لێبوردەی دلۆڤانە. هەرکەسێکی تۆبە بکا و ئاکاری چاك ڕەچـاو بکا، بەراستی دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا. ئەوانەشـن کـە بـەدرۆ، شـایەتی نـادەن و ئەگەر بەلای کاری نالەباردا ڕادەبـورن مەردانـە خـۆی لێ لادەدەن. ئەوانەشـن کـە هەرکاتێ نیشانەکانی پەروەردگاریان وەبیر دەخاتەوە، وەك کـەڕ و کوێـر ناوەسـتن و گوێ پێدەدەن. ئەوانەشن کە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان! ژن و منالانی وامـان پـێ ببەخشە ببنە مایەی چاوڕونیمان و بشمانکە پێشەوا بۆ خۆپارێزەکان. جـا ئەوانـەی لە پاداشی خۆڕاگرتنیان ئۆدەکانی بەهەشت یان پێدەدرێت و لەوێدا هەر بـە درود و سەلامەوە لەگەڵیانا ڕوبەڕو دەبن، هەر لەوێدا دەمێننەوە کە زۆر بنکەیەکی باشە و زۆر نشیمەنێکی خۆشە.﴾الفرقان/٦٣-٧٦.

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاَتِهِمْ خَاشِعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ، إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ، فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ، أُوْلَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ، الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: بێگومان باوەڕداران رزگارانن، ئەو کەسانەی لە نوێژیاندا خۆیان بە گەورە نازانن، ئەوانەش کە لە قسەی پوچ دوری دەکەن. ئەوانەش کە زەکات دەدەن. هەر ئەوانەش کە شەرمی خۆ دەپارێزن، مەگین لە هاوسەری خۆیان. یان ئەوی ملکی خۆیانن، کە نابێ سەرکۆنە بکرێن، هەرکەسێش جیا لەمانەی بوێ، ئەو کەسە لە ئەندازە لادەرە.. ئەوانەش لە رزگارانن کە ئامانەت و بەڵێنیان دەپارێزن. ئەوانەش کە لەسەر نوێژکردنێ سورن. ئەمانە گشتیان بەشبەرن، ئەو کەسانەی کە بەشبەری بەهەشتن و تا هەتا هەر تیای دەبن.﴾المؤمنون/١-١١.

ئەوجا فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ دێن کە زۆر بەپتەوی ئاکار بەبڕواوە دەبەستنەوە، بەبون و نەبونەوە:

((مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُحْسِنْ إِلَى جَارِهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسْكُتْ: هەر کەسێکی بڕوای بەخودا و بەرۆژی دوایی هەبێ با لەگەڵ دراوسێیانی چاکە بکا و، هەر کەسێکی بڕوای بەخوا و بەرۆژی دوایی هەبێ با رێزی میوانی بگرێ و، هەرکەسێکی بڕوای بەخوا و بەرۆژی دوایی هەیە با یا خێر بڵێ یا نەدوێ))[١].

---

١ أخرجه مسلم.

((مَا آمَنَ بِي مَنْ بَاتَ شَبْعَانَ وَجَارَهُ جُوعَان وَهُوَ يَعْلَـم: ئـەو کەسـە بـڕوای بەمن نەهێناوە کە بە تێری دەنوێ و دەشزانی دراوسێیەکەی برسیە)).[1]

((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، یەکێکتان بڕوا ناهێنن، تاچی بۆ خۆی پێخۆشە ئەوەشی بۆ براکەی پێخۆش دەبێت.))[2]

((الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ (أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ) شُعْبَةً فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنْ الْإِيمَان: بڕوا حەفتا و چەند (یا شەست و چەند) هۆبەیەکە چاکترینیـان گوتنـی (لا إلـه إلاّ الله)یـە و، نزمترینیـان لابردنی خراپەیە لەسەر ڕێگا و، ئابڕوش هۆبەیەکی بڕوایە.))[3]

((أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْ نِفَاقٍ حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ: چوار سیفەت هەن لەهەرکێدا هەبن دوورویـەکی تـەواوە، هەر کەسێك یەکێکیانی هەبێ، سـیفەتێکی دووڕویـی تێدایـە تـاکو وازی لێدێنـێ: ئەگەر قسە بکا درۆ دەکـا و، ئەگـەر پـەیمانیدا دەیشـکێنێ و، ئەگـەر بـەڵێنی دا وەجێی ناگەیەنێ و، ئەگەر دوبەرەکیشی کرد..))[4]

لە عائیشە-ڕەزای خوای لێبێـت-یـان پرسـی لـەبارەی ئاکـاری پێغەمبـەر ﷺ گوتی: ئاکاری قورئان بو.[5]

لە سوفیانی عەبدوڵلای ثەقەفیـەوە دەڵـێ: گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لـە ئیسلامدا قسەیەکم پێ بڵێ لەپاش تۆ (یا جگە لەتۆ) لەکەسـی دەیکـەی نەپرسـم،

---

١ أخرجه الطبراني. ٢ متفق عليه.

٣ متفق عليه. ٤ متفق عليه. ٥ أخرجه مسلم.

فەرمووی: ((قُلْ آمَنْتُ بِاللَّهِ ثُمَّ اسْتَقِمْ: بڵێ بڕوام بەخوا هێنا و پاشان راستاڵ بە.))[1]

لە هەموو ئەمانەشدا وا روندەبێتەوە کە ئاکار بەشێکی رەسەنە لەم ئاینەدا و، راستەوخۆ لە بڕوابون بەخوداوە هەڵدەقوڵێ و، بڕوادار وەك پەرستن و بەندایەتی بۆ خوا مومارەسەی دەکات، نە کۆمەڵە مەسەلەیەکی پەراوێزن لە ژیانی بڕوادار و، نە-لە هەستیدا- لە چوارچێوەی ئەو پەرستنە بەدەرن کە بۆ خودا ئەنجامیان دەدا.

بەڵام تەسکبونەوەی چەمکی پەرستن و، کۆبونەوەی لە دروشمەکاندا، بەرەبەرە ئاکاری لە عیبادەت دەرهێنا.. جا ئەنجامەکەی چ بو؟

ئەنجامەکەی وابو کە بوە شتێکی ئاسایی پیاوێك ببینی لە مزگەوت نوێژ بکا - و هاموشۆی مزگەوتان بکا- پاشان درۆ بکا! لەکاتێکدا لە پێغەمبەر ﷺ یان پرسی: ئایا بڕوادار ترسنۆك دەبێ، فەرموی: بەڵێ، پاشان لێیان پرسی: ئایا بڕوادار درۆزن دەبێ فەرموی: نا.![2]

بو بە شتێکی ئاسایی کە پیاو دوای نوێژێ لە مزگەوت بێتە دەرێ پاشان فێڵ لە موسڵمانان بکا، لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا: ئەوەی فێڵمان لێبکات لە ئێمە نیە)).[3]

بوە شتێکی ئاسایی کە پیاو لە نوێژ بێتە دەرێ و خیانەی لەو ئەسپاردەیە کردبێ کە پێی راسپێردراوە، یا ئەو بەڵێنەی شکاندبێ کە داویەتی، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئەمانە لە ریز نیشانەکانی دورویی دادەنێ!

---

١ أخرجه مسلم.    ٢ أخرجه مالك في الموطأ.    ٣ أخرجه مسلم.

سەیریش نیە کە خەڵك لە کۆتەکانی ئاکـــار خۆیـان بدزنـەوە، چونکـە کـۆت و پێوەندی قورسن لەسەر ئەوانەی کە خودا ڕێنوێنی کردون!

بەڵام سەیر لەوەدایە کە ئەو خۆدزینەوەیە-بەهەمو شوێنەوارە کاولکارەکانی لـە ژیانی ئوممەتدا- لە هەستی خەڵکدا بەمەسەلەی پەرســتنەوە گرێنـەدراوە! پەرستن بریتیە لە دروشمەکان و.. هەر کەسێکی دروشمەکانیش جێبەجێ بکا ئەوا پەرســتنی داواکراوی بەجێگەیاندوە.. هەرچی ئەو هەڵزەلینە ئاکاریانەشـن راستـە نـەنگین و، واعیزەکانیش لە هەمو وتارێکدا باسیان دەکەن، بەڵێ، بەڵام لەبازنەیـەکی دیکـەی جودا لەبازنەی پەرســتن.. چونکـە چێـوەی ئـەم بازنـە تـەنیا بەسـەر دروشمـەکاندا (داخراوە)!

مایەی شەرمەزاریشە بۆ ئەم ئوممەتە کە جاهیلیەتی هاوچەرخ لە هەڵسوکەوت و مامەڵەی ڕۆژانــەی لــە بەڵێنتـەکانی راسـتدەبێ (درۆش بـۆ مەسـەلە سیاسـیەکان هەڵدەگرێ) و راسپاردە بەجێدەگەیەنێ و، فێڵ ناکا و، خیانەت ناکـا.. لـەکاتێکدا ئوممەتی (ئیسلامی!) تا تەپڵی سەری لەنێو درۆ و فێڵ و خیانەت و پەیمانشـکێنیدا نقومە.. بێجگە لەوەی خوا ڕەحمی پێکردوە!

ئەوروپا-لە بیروباوەڕی ئێمە- ئوممەتێکی خاوەن ئاکارێکی راسـتەقینەی ڕەسـەن نیە..

ئەو ئاکارانــەی لەهەڵسـوکەوتی ڕۆژانـەیدا هەیـە، ئاکـارێکی سـود گەراییـە، ئامانجەکەی تەنیا دەسخستنی سودە لـە ژیـانی دنیـادا، ئـەوروپاش لـە بازرگـانی زیرەکـی جولەکـە فـێر بـوە، کـە بـەدرێژایی دو سـەدەی رابـردو دەسـتی بەسـەر داهاتەکانی ئەوروپادا گرتـوە و بەتایبـەتی ئـەو سـەدەیەی دوایـین، ڕو خۆشـی و، راستگۆیی و، مامەڵەی دەسپاکانە لەگەڵ (کڕیار) دا، مایەی قازانجێکی بەردەوام و

سود وەرگرتنێکی بەردەوامە، پتر لـە فێـلْ و درۆ و بـەلێن شـکاندن.. جـا خۆیـان لەسەر ئەو ئاکارە بەسودانە راهێنا و، بەراستی منداڵانی خۆیـان لەسـەر پـەروەردە کرد، کە توانایەکی راستەقینەی دیراسەکراو و رێکخـراوی تێـدا خـەرج دەکـرێ و، دەشبێتە مایەی پێکهێنانی وێنەیەکی رواڵەت جوان لە واقیعی ژیانی خەڵکدا.

ئەوان وا دەڵێن-و بڕواشیان وایە- کە ئەمانە (بەهای ژیارین)..

بەڵام ئێمە گومانێکی زۆرمان لەوەدا هەیە، چونکە تێکڕای سـەرمایەداری کـە حوکمی رۆژئاوا دەکا و کاروباری بەڕێوە دەبا لەسەر زۆران جۆری فرتوفێـلْ و درۆ و خەڵەتاندن لەپێناو دەسخسـتنی پشـکی هـەرە گـەورەی قـازانج بەرپایـە، چونکـە قـازانج-بەهـەر رێگایـەك بـێ- ئامـانجی یەکەمینیـەتی و، نـەك راسـتگۆیی و نەدەسپاکی و نەچاکەکاریەکانی دیکە، بەڵکو ئەمە-هەر لـەڕێوە- وەکـو ئـامرازی سودبەخش بەکار دێن بۆ دەسخستنی پشکی گەورەتر لە قازانج، هەروەك پێشتر لـە سیفەتەکانی بازرگانی زیرەکی جولەکەدا باسمانکرد، کـە بـۆ خـۆی کۆڵەگـەی ئـەو سەرمایەداریەیە و، لەکاتێکیش ئەگەر ئەو سـیفەتە چاکانـە نەبونـە هـۆی قـازانج کردن، یاسود بەهۆی سیفەتە پێچەوانەکانەوە وەدیهات، ئـەوا بابـای ئـەوروپی زۆر بەئاسانی دەسبەرداری گەلێك لە (ئاکارەکان)ی دەبێ هەر وەکو هەردەم لە جیهانـە سیاسی و خەڵەتێنەکەیان رو دەدا و، لە کۆلۆنیالیزم رو دەدا و، لە پەیوەندیـە نێـو دەوڵەتیەکان و، لە مامەڵەی سپی پێست لەگەلْ نیگرۆکان و.. تاد.

کەچی لـە ئیسـلامدا-لەوێنـە راسـتەقینەکەی- ئاکـار بریتـی بـو لـە بـەهای راستەقینە و رەسەن، چونکە ئامانجەکەی دەسکەوتنی قازانجی مادی نەبو و، لەسەر ئەو قازانجەش دانەمەزرابو، بەڵکو ئامانجەکەی وەفـاداری بـو بـۆ ئـەو (پەیمانـە)ی لەگەلْ خودا بەستراوە، هەروەها لەسەر (پەرستن)ی خواش دامـەزرابو، هـەروەك لـە

هـەمانكات كۆمەڵـە بەهايـەكی ژيـاری رەســـەنیش بـــون چونكـــە مۆركێكـــی (مرۆڤايەتی)یان هەڵگرتبو و، بە رەگەزێك یا بە رەنگێك تايبەت نەبو، بەڵكو ئـەو ئاكارە لە (مرۆڤ) دەردەچو وەك مرۆڤێكی-بڕوادار- و ئاراستەی (مـــرۆڤ) دەكـرا تەنانەت ئەگەر بڕواداریش نەبوایە بەو شتانەی موسڵمانان بڕوایان پێی هەبو.

كاتێك ئوممەت مومارەسەی بـــڕوا راســـتەقینەكەی و، پەرســـتنە راســـتەقینەكەی دەكرد و، (ئاكار) لەنێو هەستیدا بەشـێك بـو لـەو پەرسـتنەی لەسـەر موسـڵمانی بڕوادار فەرز كراوە، گەلێك موعجیزە رویاندا كە لەمێژودا دوبارە نەبونەوە.

ئەوەبو لە ماوەی كەمتر لە نیو سەدە، فەتحی ئیســلامی لـەلای خۆرهـەڵات لـە هینـدەوە تـاوەكو زەريـای گرتـــەوە لـــەلای خۆرئـــاوادا، ئەمـــەش خێرايیـــەكی سەرسوڕهێنەرە كە لەهەموو مێژودا هاوشێوەی نیە، قازانجیش ئەو (خاكـــە)ە نـەبو كە فەتح كرا، چونكە موسڵمانان بـــۆ فراوانكردنـــی خـــاك لەدورگـــەوە دەرنەكـــەوتن! بەڵكو ئامانجیان، وەك رەبعی كـــوڕی عامـــیر بـــۆ رۆســـتەمی ســـەركردەی فارســـانی رونكردەوە وابو: (خودا بۆیەی هەناردوین هەتا هەركەسێكی خودا خواســـتی لێبـــێ، لە كۆیلایەتی بۆ بەندان دەری بێنین بـــۆ بەندایـــەتی خـــودا و، لـــەزوڵم و زۆری دنیـــا دەری بێنین بۆ فراوانی دنیا و قیامەت).

دەسكەوت و قازانجی هەرە مەزن (دڵەكان) بون كەبە روناكی خودا رێنوێن بون و چونە ناو ئاینی خودا.

ئەمەش لەترسی هێزی رزگاركاران نەبوو، هەروەك لەبـــەر زوڵـــم و زۆرێـــك نـــەبو رزگاركاران لێیان كردبن! چونكە لەخودی خۆیان و بیروباوەڕەكانیان لێیان دڵنیا بـــون و. خەڵكیش بـــەچاوی خۆيـــان حەقیقـــەتی ئـــەو ئاســـایش و دڵنیاییـــەیان دیـــت كـــە موســـڵمانان پێیان بەخشین كاتێك لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە و حەزیان نەكرد بچنـــە

ناو ئیسلام.

بەڵکو (ئاکار)ی رزگارکاران لە گەورەترینی ئەو هۆیانە بو کە دڵی خەڵکیان بۆ ئەم ئاینە کردەوە، سەیریش نیە چونکە پێشتر ئاکاری پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەورەترین هۆیەکانی رێنوێنی خەڵك بو هەروەك خودای پەروەردگاری شایەدی بۆ داوە:

﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ: ئاکاریشت گەلێك بەرزە﴾القلم/٤.

﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ: لە بەزەیی خوداڕایە کە تۆ هێندە نەرم و نیانی دەگەڵیان؛ ئەگەر یەکێکی دڵڕەق و توند بای، بڵاوەیان لێ دەکردی.﴾آل عمران/١٥٩.

موعجیزەکەش نە لەئاست ئەو خێراییە سەرسوڕهێنەرە وەستا کە وڵاتانی تێدا رزگار کرا، نە لە ئاست موسڵمانبونی ملیۆنەها مرۆڤ بەخۆشی خۆیان و لە خۆشەویستیان بۆ ئەو ئاینەی رزگارکەران هێنابویان و، نە لەئاست گۆڕانی رێنوێنبوان بۆ سەربازی سەر و دڵڕاست بۆ ئەو بیروباوەڕەی وەریانگرت کە بەخۆشی و بەخۆبەخشین جیهادیان دەکرد بۆ بڵاوکردنەوەی لەسەر روی زەوی بێئەوەی کەس زۆریان لێبکات یا فشارێکیان بخاتە سەر.. بەڵکو موعجیزەکە راکشا و بوە دیاردەیەك کەنە لەپێشتر و نە لەپاشتر دوبارە نەبۆوە و، بریتی بو لە هاتنی ئەو ملیۆنانە بۆ نێو زمانی عەرەبی، تەنانەت ئەوانەش کە لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە و موسڵمان نەبون و، دیانەکانی میسر و شام و وڵاتە رزگارکراوەکانی دیکە زمانی خۆیان لەبیر کرد کە پێی دەدوان و، پەرستنەکانی خۆیان پێ ئەنجام دەدا و، وایانلێهات بەعەرەبی قسان بکەن و، بەعەرەبی بنوسن و، پەرستنەکانیان-لەسەر ئاینی خۆیان- بەعەرەبی ئەنجام بدەن!

بەڵکو ئیسلام-بەئاشتی- گەیشتە بەشێکی فراوانی ئاسیا و ئەفریقیا لەسەر دەستی بازرگانان کە بۆ بازرگانی هاتبون نەك بۆ بانگەواز! بەڵام ئاکارە ئیسلامیەکان وای لێیان کرد خەڵك خۆشی بوێن و، ئاینەکەیانیان خۆشبوێ کە بەم ئاکارانەوە پەروەردەی کردبون، جا چونە نێو ئەم ئاینە!

ئەمەش لەبەرامبەر دانێ کە ئەمڕۆ (موسڵمانان) بەهۆی بەد ئاکاریانەوە چۆن دەبنە لەمپەر لەرێگای خوا!

ئەوروپا، هەر لە تەواوی رۆژئاواوە تاوەکو ئەمریکا، ئەمڕۆ کەوتۆتە ئەو تەنگانەیەی خودا ئەو کەسانەی لێ ئاگادار کردۆتەوە کە پشت لەیادی وی دەکەن: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى: هەرکەسێکیش بە ئامۆژگاری من نەکا، ژینی لە تەنگانەدایە و رۆژی دواییش بە کوێری لە گۆڕی دەردەخەین.﴾طه/١٢٤.

تەنگانەیەکی دەرونیە و هەمو ئەو پێشکەوتنە مادی و زانستی و تەکنەلۆجی و ئابوری و ئاواکاریەی کە تێدا دەژین قەرەبوی ناکاتەوە، بەڵکو ئەو (کۆمەڵگەی زەبەندی/ مجتمع الوفرة) کە هەندێ لە گەلان پێی گەیشتون و لە (کۆمەڵگەی خۆشگوزەرانی/ مجتمع الرفاهية)[1] تێپەڕاندوە، تەنگانەی دەرونی تێدا گەیشتۆتە لوتکە و، لە دڵەڕاوکێ و شێتبون و، خۆ کوشتن و نەخۆشیە دەرونی و دەماریەکان و خوپێوەگرتنی شەراب خواردنەوە و تلیاك کێشان و گوناح و تاوان و ریزپەڕی گەندەڵبونی فریشك رەنگی داوەتەوە..

١ گەلانی (پێشکەوتو) لەسەرەتا بەدوای بەرزکردنەوەی ئاستی ژیاندا گەڕان، کەبەدەستیان هێنا هەوڵی خۆشگوزەرانیان دا، کە بەمیش گەیشتن لەزەبەندی دەگەڕان، کە قۆناغێکی ئابوری دورترە.

خەڵك لەوێ لە ڕێگەی ڕزگـــاربون دەگــەڕێن.. جـا تێیاندایـە دەبێتـە بـوزی و، هەیانە دەست بــە پەرسـتنی کریشـنا دەکـات و، هەشـیانە خـۆی بـەملا و ئـەولا دادەدات..

ئیسلامیش ڕێگای ڕزگاری و سەرفرازیە.. خودا بۆیەی دابەزاندوە تا خەڵکی لـە تاریکیەوە بۆ روناکی دەربێنێ..

سەدان کەسیش لەرۆژئاوادا ساڵانە دێنە ناو ئیسلام..

بەڵام ئەم سەدانە ڕەنگە ببونایــە هــەزاران و ملیۆنــان ئەگــەر گەلـە فاکتــەرێك نەبوایە کەرێی ئیسلام بـــون لەئـــەوروپیان دەگـرن. لەوانــەش بێگومــان بەربەسـتی خاچپەرسـتی و، هــەروەها ڕەوینــەوەی خــەڵك لــە (ئـاین) بەگشـتی بـەهۆی ئــەو کردەوانەی کڵێسای ئەوروپی ئەنجامیدا لە شێواندنی وێنەی ئـاین و دورخسـتنەوەی خەڵك بەهۆی ڕەقەکاری و زۆرداریی.. هەروەها واقیعی موسڵمانانیش فاکتەرێکە!

خەڵکێکی زۆر لە ڕۆژئاوا گوێ بۆ بانگەوازکارە موسڵمانەکان ڕادەگرن کە باسی ئیسلامیان بۆ دەکەن، پاشان بەزمان یا بەکردەوە پێیان دەڵێن: ئەگەر ئیســلام بـەم شێوە جوانە بێ کە ئێوە دەیخەنە ڕو، ئەدی بۆ بەخۆتان ئاوان؟! بۆچی ئێـوە درۆزنـی فێڵبازی خەڵەتێنی پەیمان شــکێنی ناڕاسـتن لەهەڵسـوکەوتتان.. سـەرەڕای ئـەوەی خۆبەخۆیی -دژایــەتی یــەکتر دەکـەن و ڕقتـان لێکـە و لەسـەر هیـچ شـتێك کـۆ نابنەوە[1] ؟!

---

[1] هەروەها ڕۆژئاوا لە دواکەوتنی ژیاری و مادی و زانستی لای موسڵمانان هەڵدێن و دەڕەونەوە، بەڵام ئەوەی زیاتر دەیانڕەوێنێتەوە ئەو بەدناکاریەیە کە لە ژیـــانی موسـڵمانانـدا هەیـە لـە درۆ و فێـڵ و پەیمانشـکێنی و ڕێگا خوار و خێچەکانی هەڵسوکەوت و مامەڵە.

بەجۆرە واقیعی موسڵمانان لەروی بانگەوازی ئیسلامی دەوەستێت، بەری رێی سەرفرازی لەو ملیۆنان خەڵکە سەرگەردانە دەگرێ!

لەگەڵ هەندێشدا خەڵکانێکی زۆر هەر بەخێرایی بەسەر ئەو مەسەلە ترسناکەدا رەت دەبن، لەلای ئەوان پتر لە داخ و کەسەرێکی کاتی نابزوێنێ، پاشان شانیان هەڵدەتەکێنن و دەڕۆن.. گومانیش لەوەدا نیە کە یەکێك لە گەورەترین هۆکارەکانی ئەم کاردانەوە لاوازەش بریتیە لە دەرچونی ئاکار-لەهەستی ئەواندا- لەبازنەی بیروباوەڕ و بازنەی پەرستن، کە ئەم دوانە-لە هەستی ئەوان دو بازنەی داخراون، نەپاشکۆیان هەن نەداخوازی!

تا ئێستاش بانگەوازکارێکی بەرێزم لەبیرە کە لە بانگەوازدا هەوڵی بەرچاوی هەن خوا پاداشتی بەچاکەی بداتەوە انشاء الله، جارێك لەکاتی گفتوگۆی نامەیەکی زانکۆدا بەتوندی بەخوێندکارێکی گوت: پەیوەندی ئاکار بە (لا إله إلاّ الله)وە چیە؟! بیروباوەڕ-هەر وەك ئێمە فێری بوین- خواوەندێتی و پێغەمبەرێتی و گوێلێبونەوە و، شتێکی دیکەی لەدوا نیە! جا تۆ ئەم پەیوەندیەت لە کوێ هێنا کە دەتەوێ لە نێوان (لا إله إلاّ الله) و لە نێوان ئاکاردا دایمەزرێنی؟!

بەم شێوەیە-دوای دەرهێنانی لەبازنەی بیروباوەڕ و بازنەی پەرستن- وەك مەسەلەیەکی (زیادە) سەیری ئاکار دەکرێ، ئەگەر هەبێ باشە و! ئەگەر نەشبێ خراپ نیە! چونکە بڕوا بە (لااله الا الله) جێگیر دەبێ و، پەرستنیش بەدروشمەکان جێبەجێ دەبێ. بەڵام ئەم (سونەتە) ئاکاریە ئەگەر لە حیسابیش بێتە خوار گوێی نادەینێ! بێگومان ئێمە لە حیسابی خۆشمان دامانەبەزاندوە! ئەوەنیە بەردەوام لەوتارە وەعزیە هەفتانە و، مانگانە و، وەرزیەکانمان (باس)ی دەکەین، رەنگە پێش

باسکردن و پاش باسکردنیش بزانـین کـه قسـەکانمان بـەبا دەچـێ. لەگـەڵ ئـەوەش بەتەمای هیدایەتی خەڵکی واز لە وەعزی بەردەوام ناهێنین.[1]

دەبێ چەند هۆبە لە هۆیەکانی بڕوا داڕمابن کە لە فەرمودەکـەی پێغەمبـەر ﷺ داهاتوون، ئەو کاتەی کە ئاکار داڕما و رووخا[2]؟!

* * *

کاتێك چەمکی پەرستن تەسك بۆوە لەنێو نەوەکانی پاشین و تەنیا لە دروشمـەکان خڕبۆوە و لە بازنەی پەرستنی چالاکی کرداری رۆژانە دەرچوو، جا چـالاکی سیاسـی یا کۆمەلایەتی یا ئـابوری بـێ و.. هـەروەها ئاکارەکـانی (لا إلـه إلاّ الله)شـی لێ دەرهاوێشترا، گوناح زۆر بـون و گوناهکـارانیش زۆر و، بـەرێوەچونی کۆمەڵگـەش شلەژا و، لارێبون و زۆرداری تێدا زۆر بو و، پـتر لـە جـارێك کەوتـە نێـو نسـکۆ و شپرزەبون و تێکشکانی گەورە..

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم برە بریتی نـەبو لـە هـەمو ئـەو کارەسـاتانەی کـە توشـی چەمکی پەرستن هاتن.. بەڵکو قۆناغێك بو لە رێگەی غلۆربونەوە و دابەزین!

ئەوەی تاکو ئێستا باسمـانکرد بریتـی بـو لـە کورتیهـەڵاتن و بەرتەنگبونـەوەی چەمکی پەرستن تاکو وای لێهات تەنیا لـە دروشمـەکانی پەرسـتندا کۆبـوە بـێ لـە هەمو کردەوەکانی دیکە، بـەڵام ئـەم مەسـەلەیە بـەخۆی-بەسروشـت- بـوە هـۆی بەرتەسکبونەوەیەکی زیاتر.. پلە بە پلە!

---

١ بەنیازین کتێبێك بەناونیشانی (کیف ندعوا الناس) بلاوکەینـەوە، دۆزی وەعـز و سـودەکانی تێـدا باسدەکەین.

٢ فەرمورودەی: (الایمان بضع وسبعون شعبة..)

هەرچی پلەی یەکەمە بریتیە لــە تەسـکبونەوەی خـودی دروشمـەکان بـۆ چـەند کردەوەیەك کە هەر بۆ خۆیان بونە مەبەست. بەبێ ئەوەی هیچ لــە داخوازیـەکانیان بێنە دی! بەجۆرێك هەر خودی بەجێگەیاندنی ئەو دروشمانە بوە هەمو (پەرستن)ێـك کە لە مرۆڤ داوا کراوە!

گومانیش لەوەدانیە کە نەوەی یەکەم-کە زانستی خۆی لە قورئـان و فـەرمووده وەرگرت-مەسەلەکە بەمشێوەیە تێنەدەگەیشت!

چونکە قورئان و سونەت رەهەندێکی دەرونی و رەفتاریان بەهــەر دروشمێـك لــە دروشمەکانی پەرستن بەخشی کە تەنیا لەبەجێگەیاندنیاندا کورت هەڵنایێ.. بــەڵکو راستتر وایە بڵێین لەو رەهەندە بە بەئەنجامدانی دروشمەکان دەست پێدەکات.. پاشان رادەکشێ تاکو روبەرێکی فراوان لە ژیانی مرۆڤدا دادەگرێ!

خودای بەرز لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ تَنْــــهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ: نوێژ بکە چونکــە نوێژکـردن مـرۆڤ لــە کـاری ناشـیرین و نارەوا دەپارێزێ.﴾العنکبوت/٤٥.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ياأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ: ئەی گەلی خــاوەن بـاوەڕان، بۆتـان نوسـراوە رۆژو بگرن، هەوەك لەسەر پێشینەکانیشتان نوسرا، بەڵکو لەخودا بترسن.﴾البقرة/١٨٣.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلاَ حَاجَــةَ لِلَّهِ بِتَرْكِهِ طَعَامِهِ وَشَرَابِهِ: ئەوەی واز لە قســەی سـاختە و کـارپێکردنی نـەهێنێ، خودا پێویستی پێ نیە واز لە خواردن و خواردنەوەی بێنێ.))[١]

---

١ أخرجه البخاري.

دەفەرموێ: ((رُبَّ صَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ صِيَامِهِ إِلَّا الْجُوعُ وَالعَطَشُ: ڕۆژوگر هەیە لە برسیەتی و تینویتی بترازێ چیدیکەی لە ڕۆژوەکەی بۆ نامێنیتەوە.))[1]

خودای بەرزیش دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطهرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا: لە دارایییەکی هەیانە سەدەقەیان لیّ وەرگرە، تا بەوە پاك و خاوێنیان بکەیتەوە.﴾التوبة/١٠٣.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ لَا يَقْبَلُ إِلَّا طَيِّبًا، وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ فَقَالَ: {يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ}، وَقَالَ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ}، ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَهُ إِلَى السَّمَاءِ: يَا رَبِّ! يَا رَبِّ! وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِّيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ: هۆ خەڵکینە خودا باشە و باشیش نەبێ قبوڵی ناکا و، خودا چ فەرمانێکی بەپەیامبەران داوە ئەویشی بە بڕواداران داوە، فەرمویەتی: (هۆ گەلی پەیامبەران، لە شتە باشەکان بخۆن و کردەوەی چاك ئەنجام بدەن، من ئاگام لە کار و کردەوەکانتان هەیە) وە فەرمویەتی: (ئەی گەلی بڕواداران لەو شتە باشانە بخۆن کە بژێویمان داون)، پاشان باسی پیاوێکی فەرمو کە سەفەرێکی درێژ دەکا و قژن و تۆزاوی دەبێ و هەر دەڵێ: ئەی پەوەردگارم! ئەی پەوەردگارم! کەچی خواردنی حەرامە و خواردنەوەی حەرامە و، پۆشاکی حەرامە و، بە حەرامی نانی داوە، جا چۆن وەڵامی ئەوە دەدرێتەوە؟!))[2]

١ أخرجه أحمد وابن ماجه.

٢ أخرجه مسلم.

خوای بەرزیش دەفەرموێ: ﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللَّهُ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِي يَاأُوْلِي الألْبَابِ: هەرەتی حەج چەند مانگێکی دیاریکراون. هەرکەسێکی لەوانەدا فەرزی حەجێ بەجێ بێنێ، توخنی ژنان کەوتن و ناوونا تۆرە لێك هەڵدان و لەرێگەی خودا لادان و قسە بەزۆرانێدان و شەڕ و هەرا-بەڕای ببڕای- لە حەج دا نین.. هەر کارێکی چاکیش بکەن خوا دەیزانێ. زەوادی رێگەشتان پێبێ؛ چاکترین تێشو بۆ ئێوە، خۆ لە گوناح پارازتنە، دەبێ لەمن ترستان هەبێ ئەی گرۆی خاوەن ئاوەزان. ﴾البقرة/١٩٧.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ، لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الأنعام فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ، ثُمَّ لِيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ، ذَلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ الأنعام إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنْ الأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ، حُنَفَاءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ، ذَلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِنْ تَقْوَى الْقُلُوبِ، لَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَا إِلَى الْبَيْتِ الْعَتِيقِ، وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنْسَكًا لِيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الأنعام فَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ، الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَالصَّابِرِينَ عَلَى مَا أَصَابَهُمْ وَالْمُقِيمِ الصَّلاَةِ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ، وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُمْ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا مِنْهَا

وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ كَذَلِكَ سَخَّرْنَاهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ، لَنْ يَنَالَ اللَّـــهَ لُحُومُهَا وَلاَ دِمَاؤُهَا وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقْوَى مِنْكُمْ كَذَلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا اللَّـهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَبَشِّرْ الْمُحْسِنِينَ: بانگەوازی خەڵك بكە بێنە حەج، بە پیــادەیی و بە سواری لەسەر پشتی هــەمو حوشـترێكی لاواز كـە دێـن لــە هـەمو ڕێگایـەكی دورەوە، بەتۆ بگەن. با بێنە بەهرەبردنی بۆ خۆیـــان و لــە چـەند ڕۆژی دیـاریكراو. لەسەر وڵساتێ پێیداون، یادی ناوی خودا بكەن. خۆتان لە گۆشتیان بخۆن و بـا ئـەو كەسانەش لێی بخــۆن كـە تامــەزرۆن و هــەژارن.. لـەپاش ئــەوە گـەمار لـەخۆیان دورخەنەوە و نەزرەكانیان پێك بێنن و با خول بخۆن بە دەوری ماڵی كەونارا. ئا بــەم جۆرە هەس كەس دەســتوراتی خـودا بــەڕێز بگـرێ، لـەلای پەروەردگاریــەوە بـۆی چاكترە. پاتاڵیشتان بۆ ڕەوایە. مەگەر ئەوی كە پێتان رادەگەیــەنرێ، لـە گـەماری بتەكان دورەپەرێز بن.. لە درۆش خۆ بپارێزن. بە دڵی پاك بۆ خودا بن. شەریكی بۆ پەیدا مەكەن. هەركەسێكی شــەریك بـۆ خـودا بناسـێ، وەك ئەوەیـە لـە حـەواوە هەڵدێراوە و مەل تێی ڕۆبون، یان بایەك هەڵیداشتبێ بۆ شـوێنێكی دوری چەپــەك. دیارە هەركەسی ئەو پێودانەی خوا داینـاوە ڕێز لێبگرێ، كە بەدڵ لە خوا دەترسـێ، تا ماوەیەكی دیاریكراو بەهرەی وڵساتیان پێدەگا.. ئەوسـا جێـی سـەربڕینیان لای ماڵە كەوناراكەیە. بۆ هەمو خاوەن ئاینان یاســای قوربـانی كردنمـان دیـاری كـرد. تاوەكو لەسەر وڵساتێ كە بۆ ڕۆزی پێمان داون، ئەوان ناوی خودا بێنن. خوای ئێـوە تاك و تەنیایە. خۆتان بدەنە دەست ئەم و مژدە بەو كەسانە بدە كە خۆیان بــە كـەم دەزانن. ئەو كەسانەی كاتــێ نـاوی خـودا دەبیســتن، دڵیـان ترسـی لــێدەنیشێ و هەركاتێ بەڵایان بەسەر دێ، خۆڕاگرن و نوێژ دەكەن و لــەو ڕۆزی كـە ئێمـە پێمـان داون لەرای خودای بەخت دەكەن، بۆمان داناون كە وشــتری قوربـانی لەوانەیـە كـە

بەریاسای خودا دەکەوێ. ئێوەش بەهرەیان لیٚ دەبەن، تا بە پێــوەن، نــاوی خوایــان لەسەر بێنن. هەرکات لەسەر تەنیشت کەوتن و سەریان برا. لێیان بخۆن. تامــەزرۆی شەرمێونیش و پارسەکی لیٚ بێبەش مەکەن. ئێمە ئەوانەمان بــۆ ئێــوە دەســتەمۆ کرد. بەشکۆ شوکرانەبژێر بن. گۆشت و خوێنی ئەوانە بۆ خودا ناچێ، تەنیا هەستی ترستان لەخوایە بەو دەگا. ئەوانــەی بەمشــێوەیە بــۆ ئێــوە رام کــرد. هــەتا باســی مەزنایەتی و سوپاسی خودای خۆتان بکەن، کە ئــەم رێگــەی نیشــان داون مــژدەش بەکارچاکان بدە.﴾ الحج ٢٧-٣٧.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((..وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّـــةُ: حەجێکیش کە گوناهی تێدا نەبێ بێجگە لەبەهەشت پاداشتێکی نیە.))[١]

• وە دەفەرموێ: ((مَنْ أَتَى هَذَا الْبَيْتَ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْـــهُ أُمُّهُ: ئەوی هاتە ئەم ماڵە و قسەی نابەجێ و گوناهی نەکرد، وەك ئەوەی لێدێتــەوە کە لەدایکی بوە)).[٢]

پوختەی ئەم ئایەت و فەرمودانەش ئەوەیە کە دروشمــەکانی پەرســتن داخوازیــان هەن و، تەنیا بــەخودی خۆیــان تــەواو نــابن، واتــە تــەنیا بەئــەنجامدانیان، بــەڵکو داخوازیگەلێکیان بەگەڵ دادێ و بەدوا دێ، کە واتا راســتەقینەکەیان پێدەبەخشــن، لەگەڵ ئەرکە راستەقینەکەیان لە ژیانی ئوممەتی موسڵماندا.

راستە کە خودای-پاك و بەرز- ئەم ئوممەتــەی بــەخودی ئــەم پەرســتنکاریانەوە کردۆتە بەندە و، خوداش خوایشــتی چۆنــە وا فــەرمان دەکــا و کــەس مــافی نیــە بەحوکمی وی دابچێتەوە و، هەر خۆی چۆنی بــوێ و بــەچی بــوێ خــەڵکان دەکاتــە

---

١ متفق عليه.

٢ متفق عليه.

بەندە ﴿لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ: لەبارەی کردەوەکانی پرسیاری لێناکرێ و ئەوان لێیان دەپرسرێ. ﴾الأنبياء/٢٣، کەسیش مافی نیە بەندایەتی بکـا بـەو جـۆرە پەرستنانە نەبێ کە خودا لەسەری فەرز کردوە یان بەو کارانەی خودای بـەرز لـەلای. موستەحەبە.

جا لەم روەوە دەڵێین: ئەم پەرستنکاریانە هەر بەخودی خۆیان مەبەسـتن و هیـچ شتێك جێگەیان ناگرێتەوە، هەر چەند بـەندە لـە لای خۆیـەوە هـەولبدات و، هـەر چەند وا رابگەینێ کە ئەو خودا بەو جۆرە پەرستنانە لە خۆی رازی دەکا کە لەخۆڕا دایهێناون.. بەڵام لە ئایەت و فەرمودەکاندا دیارە ئەو پەرستنکاریانە مەبەستێکی دورتریشیان هەڵگرتوە، کە بەڕاشکاوی لە دەقەکاندا هاتون، بەشێوەیەك پێویستیان بەلێهەڵێنجان یان ئیجتیهاد نیە[1]، ئـەوە دەسـەلمێنن کـە ئەمانـە بـەخودی خۆیـان ئامانج نین و، بەجێگەیاندنیشیان بـەبێ داخوازیـەکان حیکمەتەکـەی و مەبەسـتی فەرزکردنەکە بزر دەکا.

ئەو قسەیەش کە دەڵێ خـودا تـەنیا بـۆ ئـەوە فـەرزی کـردون کـە بەندایـەتی بەبەندەکانی بکا و تاکو بزانێ کێ لە غەیبەوە گوێڕایەڵی دەبێ و کێ یـاخی دەبـێ و، مەرجیش نیە حیکمەتێك لە پشت فەرزکردنەکەیەوە هـەبێ کـە لـەلای مـرۆڤ زانراوبێ، چونکە حیکمەتەکەی لەلای خوایە..

ئەم قسەیە لەگەڵ ئەوەی لە خودی خۆیدا قسـەیەکی راسـتە، مـافی تـەواو بـە پەرستنەکان نادات و، هەمو بوارەکانی داناپۆشێ.

---

١ رەنگە مرۆڤ پێویستی بەهەڵێنجان و ئیجتهاد بێ تا ئەو حوکمانە بزانێ کە دەقیان لەسەر نیـە لـە بارەی پەرستنکاریەکان، بەڵام ئەوەی دەقی لەسەر هەیە پێویستی بەهەڵێنجان و ئیجتهاد نیە.

چونکە مادام خودا-ی پاك و بەرز- حیمەتەکەی-یا بەشێکی- رونکردۆتەوە لــە فــەرزکردنی پەرســتنەکان، ئێمــە بۆمــان نیــە دەقــەکانی خــودا و پێغەمبەرکــەی رەشکەینەوە کە باس لە حیکمەتەکان دەکەن و، دەڵێین: پەرستنکاریەکان بە خــودی خۆیان فەرز کراون، هیچ شتێکیش لە پشت ئەوەوە داوانەکراوە!

بەڵێ بەخودی خۆیان مەبەستن، بەڵام نەك تەنیا بــۆ خــودی خۆیــان، بــەڵکو بــۆ خودی خۆیان و بۆ ئەو داخوازیانەی لە دوایانەوەن.. جا ئەگەر هەر بۆ خودی خۆیان ئەنجامەان دان و داخوازیەکانمان گوێ پێنەدا کە لەدەقەکاندا هاتون، ئایــا ئــەو کاتــە ئێمە ئەو پەرستنەمان ئەنجامداوە کە خودا فەرزی کردوە؟!

ئەمە ئەو دۆزەیە کە نەوەکانی پاشین لێی بێئاگا بون کاتێك پەرستنیان تەنیا لە دروشمەکان کۆ کردەوە، پاشانیش دروشمەکانیشیان تەنیا لە ئەنجامدان کۆ کردەوە..

راستیشە کە خەڵك دەرەنجامەکەی ئەو بەر تەسك بونــەوەیان بەشــتێکی خــراپ دانــا، کــاتێك خــەڵکێکیان بینــی دروشمــەکانیان ئــــەنجامدەدا و پاشــان بــەپێی داخوازیەکان کاریان نە دەکرد، بەڵکو پێچەوانەبون لەگەڵ ئەو داخوازیانــە، نوێژیــان دەکرد بەبێ ئەوەی نوێژەکانیان لە فاحیشە و کاری خراپ بیانگێڕێتــەوە و، بــەرۆژو دەبون و رۆژیەکەیان نەدەبوە مایەی خۆپارێزیان و، زەکاتیــان دەدا و ماڵەکانیشــیان حەرام یا تێکەڵ بە حەرام بو و، حەجیان دەکــرد و حەجەکەشــیان پارێزکــاری و بــۆ خودا ملکەچ بونی زیاد نەدەکردن و، لە شایەدیدانی ساختە نەیدەگێڕانەوە!

ئەمەیان رەتکردەوە چونکە نەفس هەر بە فیترەت ئەمە رەت دەکاتەوە...

بەڵام ئەمە رەتکردنەوەیەکی کورت بو کە نەدەگەیشتە گۆڕینی ئەو خراپەکاریــە گەورەیە، چونکە تەنانەت لە هەستی خودی ئەوانەشدا کە نکوڵیان لێدە کــرد ئــەوە چەسپابو کە ئەوانە بە هەر شێوەیەك بێ پەرستنەکەیان ئەنجامداوە؟!

نـەخێر! پەرسـتنیان بەجێنـەهێناوە! راسـتە دروشمەکـەیان ئـەنجامداوە! بـــەڵام جیاوازیەکی گەورە لە نێوان ئەنجامدانی دروشمێك و ئەنجامدانی پەرستندا هەیە!

یەك پەرستن لە ئیسلامدا نیە تەنیا ئەنجامدانەکەی داوا کرابێ..

بەڵکو راستتر وایە-وەك پێشتر رونمانکردەوە- بڵێین: پەرستن بەئەنجامدان دەسـت پێدەکا و تەنیا بە رودانی ئەو داخوازیە تەواو دەبێ کە لەئەنجامدانەکەی داواکراوە.

یا بە دەربڕینێکی تر بڵێین: ئەنجامدانی دروشمێك-یا پەرستن- گـەر بەتـەنیا بـێ رەنگـە (رواڵـەتی ئیسـلام) پیشـان بـدا لـە ژیـانی دنیـادا، جـا حوکمـەکان وەك موسڵمانێك بەسەر خاوەنەکەیدا جێبەجێ دەکرێت.. بەڵام -بەتەنیا- لـەلای خـودا وەرناگیرێ.

(لا إله إلاّ الله) بە گۆکردنی[1] دەست پێدەکا.. بەڵام تەنیا گوتنی یەکتاپەرسـتی وەدیناهێنێ، کە بریتیە لە حەقیقەتی ئیسلام، تەنیا کـاتێك مـرۆڤ پابـەندبونێکی رەفتاری واقیعی بەو شتانەوە دەبێ کە هەر دەبێ پێیانەوە پابەند بێ و، بریتـین لـە هاوبەشپەرستی نەکردن لە باوەڕ و، ئەنجامدانی دروشمەکانی پەرستن تەنیا بۆ خودای بێ هاوەڵ و، حوکم بردنە بەر شەریعەتی خوا لە هەموو مەسەلەیەکدا.

نوێژیـش بـە کردنـی دەسـتپێدەکات-بـەو شـێوەیەی کـە خـودا و پێغەمبـــەر رونیانکردۆتەوە- و بە ئەنجامدانی رواڵەتی ئیسلام دەردەخا، بەڵام لەلای خودا قبوڵ نابێ هەتاکو داخوازیەکەی وەدی نەیێ کە وازهێنانە لە فاحیشە و خراپەکاری. بۆیە خودای بەرزیش دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ، الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ سَـــاهُونَ، الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ، وَيَمْنَعُونَ الْمَـــاعُونَ: هـاوار بـۆ ئـەو نوێژکەرانـەی هـۆش بـە

---

١ گۆکردن: نطق.

نوێژەکەیان نادەن، ئەوانەی کـە دەسـتەی روبینـانن، دەبنـە بـەرگر لـە بـاربودان و زیارەش. ﴾الماعون/٤-٧.

پەرستەکانی دیکەش بەهەمان شێوە..

* * *

کاتێك گەندەڵیش بەو رادەیەی رونمانکردەوە گەیشتە چەمکی پەرستن، کە تـەنیا لە دروشمەکاندا کۆکراوە، پاشان دروشمەکانیش تەنیا لـە ئـەنجامدانیان کـۆ کرانـەوە بەبێ وەدیهاتنی ئەو داخوازیانەی پێیانەوە پەیوەستن.. بێگومان ئەمە گەندەڵیـەکی زۆر گەورە بو، لەگەڵ ئەمەشدا مەسەلەکە بەو ڕادەیە رانەوەستا، چونکە سروشـتی بەرتەنگ بونەوە وایە کە هەر بەرەو زیادبون دەچێ مادام خەڵك هەستی پێ نەکـەن و، هەست بەوە نەکەن کە کەموکوڕیان لە ئەنجامدانی ئەرکدا هەیە و، لە راسـتەرێ لا کەوتون..

نەوەکانی یەکەم ئاهەنگێکی مەزنیان بۆ دروشمەکانی پەرستن دەگێڕا -ئەگەر چـی پەرستنیشیان تەنیا لە دروشمەکان کۆ نەکردبۆوە-، چونکە هەستی دەکرد -هـەروەك باسمان کرد- کە دروشمەکان بریتین لە وێستگەیەکی توێشـو وەرگرتـن و، هەسـتیان دەکرد کە سەفەرەکەیان پێویستی بەو توێشوە هەیە.[1]

نوێژ لە هەستی ئەواندا -هەروەك دەشبێ وابێ- راوەسـتان بـو لەبـەر دەسـتانی خودا و، ملکەچی و سەردانەواندێك بو لەگەڵ ئەو وەستانەی بەر دەسـتانی خـوا دا دەگونجا.

---

١ بەراشکاوی لەباسی حەجدا وشەی (زاد/توێشو) لە قورئاندا هاتوە کە دەفەرموێ: ﴿وَتَزَوَّدُوا فَـــإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِي يَاأُوْلِي الاَلْبَابِ﴾البقرة/١٩٧.

خودا لە دڵیانادا ئامادەبو-ئەو ئامادەبونەش حوکمی هەمو هەڵوێستەکەی دەکرد، چونکە خوا لێیانەوە نزیکە و ئاگای لێیانە، دەیانبینی کە خۆ بۆ نوێژ ئامادە دەکەن، دەیانبینێ کە نوێژەکە دەکەن و، کە قورئان دەخوێنن و، کە کڕنۆش دەبەن و سوژدە دەبەن و هەڵدەستنەوە و، لەهەمو چرکەیەکدا هەستیان دەکرد کە خوا لێیانەوە نێزیکە، چاودێری جوڵانەوە و سرەوتنەکانیان دەکات و، ئاگای لە ترپەی دڵیانە و، ملکەچیان لێ قبوڵ دەکا و، وەڵامی نزایان دەداتەوە.. جا ئەمە هەموی کاریگەری لەدەرونیاندا هەبو، بۆیە نوێژیش-دوای ئەوە- کاری خۆی لە ژیانیاندا ئەنجامدەدا، لەخودا نێزیکتری دەخستنەوە و، ڕێی فاحیشە و خراپەکاری لێدەگرتن و، ئارەزوی تاعەتی خودا و پێغەمبەرکەی زیاد دەکردن، چونکە بەو تاعەتە لە ژیانی دنیا و لە ڕۆژی دوایی ڕەزامەندی خودا وەدەست دێنن..

ڕۆژوش لە هەستی ئەواندا-هەروەك دەبێ بەخۆشی وابێ- ڤیستڤاڵێکی مەزنی پەرستن و، نێزیکبونەوە بو لە خوا بەتاعەتان..

تەنیا برسیەتی ڕۆژێ و تێربونی شەوێ نەبو!

وەرزێك بو لەلایەنی دەرونی و ڕۆحیەوە خۆیان بۆ ئامادە دەکرد هەروەك یەکێك کە خۆی بۆ چونە حەرەمێکی پیرۆز ئامادە بکات، دەرونی خۆی بەملکەچی و سەردانەواندن ئامادە دەکرد بەر لەوەی پێیەکانی هەنگاوێك هەڵنێن، ئەوجا نەفسی بەهەمو هەنگاوێك کاریگەر دەبو کە لەو دەوروبەرە دەیهاوێشت، هەروەك کۆمەڵە تیشکێکی لێ وەرگری تا وەکو ناخی بسمێ..

پەرستنێکی گشتگیر بو دەرونی لە زۆر چڵك و قرێژان پاکدەکردەوە کە لە ژیانی ئاسایی مرۆڤدا لە دەرونان کەڵەکە دەبن، جا کاتێك سیستەمی ژیانی خۆی

دەگۆڕی و، دەچوە نێو سیستەمێکی تازەی ژیان لەو چلکانە دەرباز دەبــو و دەچــوە دەرێ..

هەروەك گۆڕینی سیستـەمی خۆراك چالاکی بـۆ خانـەکانی لـەش دەگێڕێتــەوە و زیندەگیەکەی نوێ دەکاتەوە. بەمشێوەیەش ئەو گۆڕانکاریــە دەرونیـیـە لـە ڕۆژودا ڕودەدا، ژیانی گیـــان تــازە دەکاتــەوە، جـا زۆر بــەڕونی بـۆ هــەندێك ئاسـۆی ڕون باڵدەگرێ کە پێشتر هاموشۆی نەدەکردن، یان بۆیان دەچو بەڵام لەژێر قورسی بـــاری کاروباری ڕۆژانە کۆچی لێوە کردون، ئەو کاروبارانەی کە پتر مامەڵە لەگەڵ جیهانی هەستدا دەکەن نەك جیهانی گیان، جا ئەو مانگە پیرۆزە وزە ڕۆحیە ڕونەکەی خـۆی بـۆ دەرون دەگێڕێتــەوە و، جـا بنیـاتی مـرۆڤ تـازە دەبێتـــەوە و، هەســـتەکان و ئارەزوەکان لە دەرونیدا هاوسەنگ دەبن..

پاشان ڕۆژو خۆتەرخانکردنی دەرون و ڕاهێنیانیەتی لەسەر بەرزیخوازی لە ئاسـت حەز و ئارەزوەکاندا، گەشە بەپارێزکاری و ملکەچی دڵان دەدا بۆ خودا.

پارێزکاری لەگەڵ زاڵبونی ئارەزوەکاندا نابێ.. بـــەڵکو لەگـەڵ ئـەو ڕێکوپێکیـە دەبێ کـــە دەرون پابــەندی ئـەو ســودانە دەکـا کـە خـوا دایڕشـتون و لـە بارەیـان فەرمویەتی: ﴿**تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا**: ئەمانە سنوری خودان نەچن توخونیـــان بکەون. ﴾البقرة/١٨٧.

یان ﴿**تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا**: ئەمانــەن ســنوری خـوا، لـە ســنوری خـوا دەرمەچن. ﴾البقرة/٢٢٩.

ڕێکوپێکیـش پێویســتی بـەڕاهێنان هەیـە بـۆ ئـەوەی ببێتـە عـادەت، تـــاکو ئارەزوەکـانی دەرون و جەسـتە خۆیدەنـە دەسـت ویسـتی مـرۆڤ و، جڵـەویان لـــە دەستانی خۆی بگرێ، لەهەر کاتێکی ویستی بە بڕ و پێوانە- بۆی شل کا و، -بــە

بڕ و پێوانە- لێی بگرێتەوە.

ڕۆژوش ئـەو ڕاهێنانەیـە و! بـەهێزترین هاندەرەکـــانی جەســـتە و دەرونیـــش دەگرێتەوە کە بریتین لە: خواردن و خواردنەوە و سێکس، ئینجـا ڕۆژو ڕاهێنـانێکی یاریدەدەرە بۆ پارێزکاری:

﴿ياأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُـــمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، بۆتان نوسراوە ڕۆژو بگرن، هەوەك لەسـەر پێشینەکانیشتان نوسرا، بەڵکو لەخودا بترسن.﴾البقرة/١٨٣

زەکاتیش لەهەستی ئەواندا-هەروەك دەبێ بەخۆشی وابێ- پاککردنـەوەی دەرون و مـاڵ بـو پێکـەوە و، پـاکژی هـەمو ژیـانیش بـــو بـــە لایەنـــە بەرهەســـت و مەعنەویەکەیەوە.

(باج)ێك نەبو بدرێتە دەولـەت.. بـەڵکو نزیکبونەوەیـەك بـو پێشـکەش خـودا دەکرا.

جیاوازیەکی زۆریش هەیە کە باج بەهەموو جۆرەکانیەوە، لە هەسـتی بـاجدەران تێکەڵ بە دەسەلات و ستەمی دەولەت بێ، لەگەڵ ئەوەی کە ئەوەی دەیـدا هەست بکا بـــە بەخشـینەکە پـاك دەبێتـەوە و.. قرێـژ و چڵکـەکانی دەشـواتەوە، پاشـان لاپەڕەیەکی نوێ بۆ کار و هـــەوڵدان هەڵدەداتـەوە کـە هیـچ پەڵەیـەکی تێـدا نیـە سپیاتیەکەی بشێوێنێ، جا بەزەویدا دەسوڕێتەوە تـا لـەبژێوی خـودا بخـوا و، چـاو ببڕێتە ڕەزامەندی خودا لە ڕۆژی دواییدا:

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْض ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ: خودایە کە ئەم زەمینەی بۆ کەوی کردون، شانەوشان لە زەویدا بگـەڕێن و لە بژێوەکەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە.﴾الملك/١٥

ئەو پاكژبونەوەی ئەم ئايەتە پيرۆزەش ئاماژەی پێدەكات: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطهرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا: لە داراييەكی هەيانە سەدەقەيان لیٚ وەرگرە، تا بەوە پاك و خاوێنيان بكەيتەوە.﴾التوبة/١٠٣. تەنيا پاكبونەوە نيە لە رژدی و قرچۆكی، بەڵكو پاكژكردنەوەی هەمو شتێكە لەسەر زەويدا لەوەی حەرامێكی تێبكەوێ يا ئاراستەی بەحەرامێك بیٚ.

مرۆڤی صاڵحيش كە ئيسلام دەيەوێ دروستی كا هەتا لەسەر روی زەويدا بەرۆڵی جێنشينی هەڵسیٚ، دەبیٚ لە لايەكەوە لە ئارەزوی ماڵ و سامان بەرز و باڵاتر بیٚ و لەلايەكی ديكەش هەست بەپەيوەندی برايەتی بكا لە نێوان خۆی و بڕواداران، برايەتيەك كە ئەركی بەخێوكردنی كەنەفتەكانيان و يارمەتيدانيان بۆ دابينكردنی ژيانێكی بەرێز بخاتە ئەستۆ كە ئيسلام بۆ هەموو خەڵكی دابينی دەكا.

كاتێك مرۆڤ لەشتی پاك و حەلاڵ دەپێچێتەوە كە بۆ بژێوی تێدەكۆشیٚ و، بەدوای ئەو برايەتيەدا دەگەرێ لەگەڵ بڕواداران، بێگومان گيانی هەڵدەكشیٚ و بەرزدەبێتەوە و چۆن خوا دەيەوێ ئاوا پاك دەبێتەوە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا: ديارە هەركێ گيانی خاوێن راگرتوە، رزگار بوە﴾الشمس/٩.

گەڕان بەدوای بژێويش لەگەورەترين ئەو خليسكانەيە[١] كە مرۆڤ توشی دێ، چونكە هەندێك ئارەزو هەن دەرون خۆشی دەوێن:

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأنعام وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا: ئارەزوی ژنان كردن و كوری زۆر پەيداكردن و دەسكەوتنی كۆمای زلی زێو و زێڕان

١ خليسك: مزلق.

و ڕەوەئەسپی بەدروشم و وڵسات و زەوی کێڵانێ، بۆ مەردم ڕازاوەتەوە و لە ژیـــانی دنیایەدا مایەی خۆشین.﴾آل عمران/١٤.

دەرونەکانیش ڕەنگە لەو ئارەزوانەدا نقوم بن، ئەگەر لەلایەکەوە پابـەندی شـتی باش و حەڵاڵ نەبن و، لەلایەکی دیکەشـــەوە بەبـەها بـەرزەکان خـەریك نـەبن کـە هەستی دەرون لەخۆ دەگرێ و لە چێژی مل ئەستوری بەر هەست بەرزی دەکاتەوە:

﴿قُلْ أَؤُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ ذَلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِـــهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُطهرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِـــيرٌ بِالْعِبَادِ. الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، الصَّـــابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنْفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالأَسْـــحَارِ: بڵـێ: ئـاخۆ دەتانـەوێ پێتان بڵێـم لەمـە باشـترەکە چۆنـە؟ بـۆ ئەوانـەی لـە هەڵـە خۆدەپـارێزن، لـەلای پەروەردگارتانەوە بەهەشتێکی وایان دەبێ، ڕوباریان بەبەردا دەڕوا و هەتا سەر هەر لەوێ دەبن و چەند ژنی پاك و بێگـــەرد و سـەرەڕای ئـەو هـەمو خۆشـیەن، ڕەزای خودایان پێدەگا خودا چاوی لە عەبدەکانی خـۆی هەیـە. ئەوانـەی کـەدەڵێن: ئـەی پەروەردگارمان ئێمە بڕوامان پێت هەیە. سا تۆ لە گوناهمـان ببـورە و لـە سـزا و ئەشکەنجەی ئاگر بمانپارێزە. ئەو کەسانەی **خۆڕاگرن و بەڕاستیانە و ئامادەی هــەر فەرمانێکن و ماڵی خۆیـــان لــە ڕای خــوا بــەخت دەکــەن و هــەمو ڕۆژێ ســەر لەبەیان لەخودا دەپارێنەوە لێیان خۆش بێ**﴾آل عمران/١٥-١٧.

مکوڕبونیش لەسەر پاکژبونەوە لەکاتی گەڕان بەدوای بژێویدا، لەگەڵ بەخشـینی ئەو داهاتانەی لەوێ دەسدەکەون لەپێناو خودا کە ئەمانـەش حەقیقـەتی زەکـاتن، لە گەورەترین یارمەتیدەرەکانی دەرونی مرۆڤن تا لەسەر ئاسۆی هەرەبەرز ڕاستەرێ بێ و، نەکەوێتە نێو قوڕ و چڵپاوی ئارەزوەکان.

پاشان پاکژی مەرجە بۆ ئەوماڵەی کە زەکاتی لێدەدرێ: ((إنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ لَا يَقْبَلُ إلَّا طَيِّبًا: خودا باشە و تەنیا باشیشی قبوڵە)).[1]

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! لە باشترین ئەو شتانەی دەستتان دەکەون لەو شتانەی کە لە زەمین پێمان داون و پەیدای دەکەن، بەخت بکەن نەك لە شتێ هێندە چرۆك کە بۆ خۆشتان ئەگەر چاوپۆشی لێنەکەن.﴾البقرة/٢٦٧.

ئینجا زەکات بەم شێوەیە داخوازی خۆی لە ژیانی بەرفراوانی موسڵماندا ئەنجامدەدا، نەك تەنیا لەلایەنی ماڵەکەی:

﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ: ئەوانەشن کە هەرچی لەرای خودا داویانە، هەر دەیدەن، کەچی لەسامی گەڕانەوەیان بۆ لای پەروەردگاریان دڵەکوتەیان توش دەبێ.﴾المؤمنون/٦٠.

هەرچی حەجیشە -لەگەڵ ئەوەی لە تەمەندا یەکجارە بۆ کەسێکی بتوانی بچێ، لەگەڵ ئەوەی (بۆ چەند رۆژێکی دیاریکراوە)- پەرستنێکە کاریگەریەکی قوڵی لە ژیانی موسڵماندا هەیە، کاتێك هەر وەکو نەوەکانی یەکەم تیایدا دەژین، کە پەرستنیان بەواتا سەرتاپاگیر و قوڵەکەی مومارەسە دەکرد.

حەج پەرستنێکە هەمو پەرستنەکانی لە دو توێی خۆیدا دەگرێتەوە.. بەجەختکردنێکی ئاشکرا لەسەر پەرستنی یەکتاپەرستی..

بریتیە لە پاڵاوتەبون و لێبڕان بۆ خوا.. دابڕانە لە هەمو ئەو شتانەی لە ژیانی دنیادا دەرون پێیانەوە پەیوەستە، لەکەسوکار و نشینگە[1] و نیشتمان و رابواردن..

---

١ پێشتر باسکرا.

تەنانەت پۆشاکیش کە مرۆڤ وا راهاتوە خۆی پێ (بڕازێنێتەوە) و تەرز و جوان لە قەدەر باڵای خۆی بیدورێ..

دابڕانە لەم هەمو شتە بۆ خوا.. بەتەنیا.. وەك بەرفەرمان بون و یاداوەری و روتێکردن و نوێژ و نوسك و پەرستن..

لە حەشرێکیشدا کە رۆژی حەشر دێنێتەوە بیر..

لەگەڵ برێك هیلاکی و ماندوبون، بەلاّم نەك وەك ئەو (زەحمەتکێشان)ە کە راهاتوە ژیانی خۆی تێدا بەسەر دەبا.. زەحمەتکێشانێکە لە جۆرێکی دی، دەرون بۆ لای رۆژی دوایی رادەکێشێ بەقەدەر هێندەی لە خۆشیەکانی زەوی دەریدەکێشێ..

(چەند رۆژێکی دیاریکراون).. بەلاّم لە حیسابی دەروندا روداوێکی مەزن و قوڵە.. گۆڕانکاریەکی تەواو و گشتگیرە لە دەروندا تا قەلاّیی ناخی رۆدەچێ و هەمو قرێژەکەی لێ دەردەهاوێ.. تاکو وەك خەڵقێکی دیکەی لێدێ.. کە لەو چرکەیەدا لەدایکبوە، بۆ ئەوەی گەشتێکی تازەی ژیان دەست پێبکات جودا لەوەی پێشتر هەبو..

جا لێرەدا حەج داخوازی خۆی لە ژیانی موسڵماندا ئەنجام دەدا، فەرموودە راستەکەی پێغەمبەر ﷺیش دێتە دی: ((**مَنْ أَتَى هَذَا الْبَيْتَ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ**: ئەوی هاتە ئەم ماڵە و قسەی نابەجێ و گوناهی نەکرد، وەك ئەوەی لێدێتەوە کە لەدایکی بوە)).[٢]

* * *

---

١ نشینگە: مسکن.

٢ متفق علیه.

کاتێك چەمکی پەرستن گۆڕا ئەمانە هەموی زۆر بەتوندی گۆڕان..

که خەڵك ئاگایان لە (داخوازیەکان)ی پەرستن نەما، لە روتێکردنێکی دڵڕاستانە بۆ خودا و، سەردانەواندن و ملکەچی لە ئاستانەی پاکیدا و، کاتێك پەرستن لەو پابەندبونانە دابڕا کە پێیەوە پەیوەستن، لەگەڵ ئەو ئەنجامانەی کە دەبێ بیانداتە دەست..

کاتێك روبەرەکەی لە دەرونی ئەوانەی ئەنجامی دەدەن تەنگبۆوە..

کاتێك داواکراو تەنیا بوە بەجێگەیاندنی دروشمێك و، (پەرستن) هەموی لەم مەسەلەیەدا کورت هەڵات، ئەو جۆرە پەرستنە لێی دەوەشاوە زیاتر و زیاتر بەرتەنگ بێتەوە، تاکو داواکراو بوە ئەنجامدانی دروشمەکە **بەهەر شێوازێك بێت**.. ئەگەر بەجێگەیاندنێکی میکانیکی بێگیانیش بێ، یا جێبەجێکردنی لاسایی کارانە کە پابەندبون بە نەریتەکان زیاتر لەهاندەی خواپەرستی دەیبزوێنێ..

ئەمە ئەو وێنەیە بو کە پەرستنی گەیشتێ لەو نەوەیەی داڕوخانەکەی بینی..

نوێژ گەیشتە رادەیەك تەنیا بوە چەند جوڵانەوەیەك و بەبێ هیچ ملکەچی و سەردانەواندێك ئەنجامدەدرا، بەبێ ئاوڕدانەوە لەواتای ئەو قورئانەی تێیدا دەخوێنرا، نوێژکەر-کە تەواو دەبو- هەستت نەدەکرد کاریگەریەکی وای لە دەرونی بەجێهێشتبێ، یان لە هەڵسوکەوتیدا رەنگی دابێتەوە، ئەمە ئەگەر بەتەواوی- لەکاتی نوێژکردن- بە حسابکردنی قازانج و زەرەری، یا بەکاروبارێکی رۆژانەی دیکەی خەریك نەبوبێ!

رۆژیش بەتەنیا بۆتە لەخۆقەدەغەکردنی خواردن و خواردنەوە لەچەند سەعاتێکی رۆژێ، لەگەڵ تامەزرۆییەکی گەورە بۆ خواردن لەپاش فتارکردنەوە، کە دەگاتە رادەی زێدە مەسرەفی، وەك بڵێی مانگی خواردن بێ نەك مانگی رۆژو!

سەرەڕای گەڕان بۆ شتی (خافڵێنەر) لەشەوانی رەمەزاندا، وەك دانیشتنێکی زۆر لە دیار رادیۆ و تەلەفزیۆن، یا لەمەش سەیر و سەمەرەتر، ئەوەی کە هەندێك رۆژنامەی (موحتەرەم) لەولاتانی (ئیسلامی) (پێشکەوتو)دا بانگەوازان بلاو دەکەنەوە و دەڵێن: فلانە ژنی سەماکەر (شەوانی رەمەزان زیندو دەکاتەوە!!) لەسەر فلانە تیاترۆدا و ئاهەنگەکە تا پاش نیوەشەو دەخایەنێ، تیاترۆش لە (رۆژوگران) جمەی دێ کە لە پێش و لە پاش سەماکەدا رۆژودەگرن، بەبێ هیچ شەرم و هەستکردن بە هیچ گوناهێك لە دەرونیاندا و، بەبێنەوەی هەست بکەن ئەوەی لەو شەوانەدا رودەدا دژە لەگەڵ رۆژوگرتنەکەیان، لێشیان بپرسی دەڵێن: -خوات لێ رازی بێ- ئەمە ساتێکە و ئەویش ساتێکی دیکە!.. هەروەکو دەستەواژە جاهیلیە هاوچەرخەکە دەیڵێ: (ساتێك بۆ پەروەردگارت و ساتێکیش بۆ دڵت)!

زەکاتیش-ئەگەر خاوەن ماڵ بشیدا- لە ریباخۆری نایگێڕێتەوە و لە ئاستیدا دڵتەنگ و شەرمەزاری ناکا! چونکە ئەویان پەرستنە و ئەمیشیان کاسبیە! هیچ پەیوەندی و تێکەڵبونێکیش لە نێوان پەرستن و کاردا نیە! سەرەڕای ئەو فرتوفێڵ و تەڵەکەبازیانەی کە (زەکاتدەر) بەشێکی ئەو ماڵەی پێ دەگێڕتەوە کە بەخشیویەتی بەفێڵکردن لەو هەژارە بێدەرامەتانەی کە ماڵەکەی پێداون!

حەجیش دەرفەتێکی مەزنە تا نازناوی (حاجی) وەربگری.. پاشان (حاجی) هیچ شەرم نیە ئەگەر سوێندی بەدرۆی خوارد، کە (بەرژەوەندی) بازرگانی یا هەر جۆرە مامەڵەیەك وابخوازێ! سەرەڕای ئەو شتانەی هەر لە خودی حەجدا رودەدەن و پیاوی ژێر سەرسام دەکەن، چ جای موسڵمانی بڕوادار، لەو شەڕەشانە-بەقەستیە- و، لەو (حاجیانەی) کە براکانی خۆیان لە ئیسلام و براکانی حەجیان دەخەنە ژێر پێ و تا دەیانکوژن دایاندەپلۆسن و گوێش نادەنێ، تاکو بەهەر شێوەیەك بێ لە رەجم یا لە

تەواف تەواو بن و دەستیان بەربێ! سەرەڕای نەفامی جاهیلان کە هەندێك روکنی وا بەجێدێڵن بەبێ ئەوان حەجەکە تەواو نابێ، یان سەرپێچی راشکاو ئەنجام دەدەن بەبێ فدیە و نوسك.. چونکە نازانن!

* * *

زاناکانمان دەڵێن: هەرئەرکێك ئەنجامدرا لەسەر مرۆڤ لادەچێ، جا شێوەی ئەنجامدانەکە هەر چۆن بێ.. تەنانەت ئەگەر هیچ پاداشێکیشی نەبێ!

یا-بەزمانێکی دیکە- خانەکە پڕبۆوە وتەواو!

هەروەها زانایانمان دەڵێن: مادام واجبەکەی بەجێگەیاند جا بەهەر شێوەیەك بێ ئەوا بڕاوادارە و تا سەر لەئاگردا نامێنێتەوە. بەڵکو مورجیئە دەڵێن: هەر دەچێتە بەهەشت تەنانەت ئەگەر یەك دانەش لەکردەوەکانی ئیسلای ئەنجام نەدابێ!

تا زۆر نەچینە ناو مشت و مڕەوە، تەسلیمی قسەی زاناکانمان دەبین! بەچاو پۆشین لەوەی کە ئەو ئایەت و فەرمودانەی بەبەڵگە دەیانهێننەوە داخوا لەسەر واقیعی هاوچەرخماندا پیادە دەبێ یان نا!

پاشان.. خۆمان لەبەردەم ئوممەتێك دەبینینەوە کە گوێی لێ نیە-تەنیا ئەوەی خوا رەحمی پێکردبێ- ئەگەر بچێتە دۆزەخ، مادام تاهەتایێ تێیدا نامێنێتەوە.. ئەوەشی بەسە کە لە مانەوەی تاهەتایە و نەمری لەنێو ئاگری دۆزەخ رزگاری بێ!

کەسیش ناڵێ پەنجا هەزار ساڵ مانەوە لە دۆزەخ و پاشان لێدەرچونی بەرەحمەتی خوا، وەکو بەنەمری و بەبەردەوام مانەوەیە تیایدا..

بەڵام ئوممەتێك کە گوێنەداتێ بچێتە دۆزەخ مادام تا هەتایێ تێیدا نامێنێتەوە.. گوێی لێنەبێ کە لە تاقیکردنەوە بکەوێ بەهیوای ئەوەی (لیژنەکانی بەزەیی) دەریبیچوێنن.. سەیر نیە وەك باسمانکرد ببێتە ئاومالکی سێلاوی.

ئوممەتەکانی دیکە وەك بخۆرانی سەر لەگەنێك تێوەی بئالێن، کێش و بایەخیشی بۆ دانەنرێ، وەك ئەوهۆزەی شاعیرێکی کۆنی عەرەب هەجوی کردون:

**ويقضى الامر حين تغيب تيم ولا يستأذنون وهم شهود!**

واتە: کار بەسەر دەچی کاتێك (تەیم) لەوێ نین و، کە ئامادەشن کەس مۆڵەتیان لێوەرناگرێ.

جیاوازیەکی فراوان هەیە لە نێوان چەمکی پەرستن چۆن لەلای خوداوە دابەزیوە و، پێغەمبەری خوا ﷺ فێری خەڵکی کردوە و نەوەی یەکەم هۆشی پێدا شکاوە و مومارەسەی کردوە، لەگەڵ ئەو چەمکە شێوا و نابوت و پوکاوەیەی کە نەوەکانی دوایی تێیگەیشتون.. جا مومارەسەیان کردبێ یان نا!

چەمك و تێگەیشتنی یەکەم بو کە چاکترین ئوممەتی بۆ خەڵك دەرخست..

چەمك و تێگەیشتنی دواییش بو کە ئاومالکی سێلاوی دەرخست..

بۆیە هەر دەبێ چەمکەکان راستبکرێنەوە..

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ: خوا لەهیچ گەلێك ناگۆڕێ، تا ئەوان دڵیان نەگۆڕن. ﴾الرعد/١١.

﴿قُلْ لاَ يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ: بلێ: پیس و پاك وەك یەك نین. با زۆرایی پیسەکەش بۆت سەرسوڕێن بێ. ﴾المائدة/١٠٠.

مەسەلەکە نەهی پەراوێزە و نەلاوەکیە و.. نە مەسەلەیەکی سوکەڵەیە کە بڕە وەعز و ئیرشادێك چارەی بکا.. یا تەنانەت لافاوێك لەوەعز و ئیرشاد..

مەسەلەیەکە پێویستی بە سەرلەنوێ بنیاتنانەوە هەیە..

پەرستن بەمشێوە شێواو و بودەڵە و پوکاوەیە، ئەگەر هەمو هەزار ملیۆنەکەش کە ئەمڕۆ لە زەریاوە بۆ زەریایان داگرتوە و تێیدا دەژین، ئەنجامی دەن، لەوەی تێی

کەوتون رزگاریان ناکا و، لەو چالاّوی سوکی و زەبونی بەرزیان ناکاتەوە کە لەهەمو لایەکەوە دەوری داون.

مەسەلەیەکە ساکارە.. لەبەر ئەوەی ئەو پەرستنە نیە کە خـودا نوسـیویەتی و، سەر بڵندیشی لەگـەڵدا تۆمـارکردوە بـۆ ئەوانـەی بەشـێوە راسـت و دروسـتەکەی ئەنجامی دەدەن و.. بالاّ دەستی و جێنشینی سەر زەویشی بۆ نوسیون..

﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِــي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّـهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا: خوا بەوانەی لـەئێوە بڕوایـان هەیە و ئاکار چاکن، بەڵێنی دا: لەم زەمینە دەیانکاتە جێگەنشین، هـەروەکو چۆن ئەوانەی بەر لەوانی کردە جێنشین، دینەکەشیان-کە خۆی پەسـەندی کـردوە- هـەر بۆیان دادەمەزرێنیّ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی، تا تەنیا من بپەرستن، هیـچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن.﴾النور/٥٥.

کۆڵەگەکەشی هەروەك لە ئایەتە پیرۆزەکە دا ئاشکرایە (پەرسـتن)ە کـاتێك بـەو جۆرە ئەنجام دەدریّ کە خوا نوسیویەتی..

هەرچی ئەو پەرستنەشە کە ئاومالّکی ئەمڕۆ لە زەریا تـا زەریـای گرتـوە-بـێ لەوانەی خوا رەحمی پێکردون- ئەنجامی دەدەن، ئەو پەرسـتنەی(لا إلـه إلاّ الله) لـە داخوازیەکانی خاڵیدەکا و، دەیکاتە تەنیا واژەیەك کە بەزار گـۆ دەکـری و، هـەمو ئەرك و تەکلیفـەکانیش لـەچێوەی پەرسـتن دەباتـە دەریّ و، دروشمـەکان لەبارگـەی زیندوی هاندەر بـەتالّ دەکـات و، وەك بەجێگـەیاندنێکی شـێواوی لاوازی بێگیـان

وازی لێدێنن، ئەوە بێجگە لەو دۆڕانە وەدی ناهێنن کە ئاوماڵکەکە لە واقیعی زەویدا مومارەسەی دەکەن..

ئاوماڵکەکەش-بەم پەرستنە بودەڵە شێواوە پوکاوەیە- نەك تەنیا ناتوانێ خۆی رزگار بکا، بەڵکو دەبێتە بەربەست و رێگریش!

ئەوانەی داکۆکیشی لێدەکەن و دەڵێن: بڕواداره و دەچێتە بەهەشت، ئەگەر یەك کردەوەشی لەکردەوەکانی ئیسلام ئەنجام نەدابێ. ئەوانە لەگەرمەی داکۆکی کردنەکەیان-کە بڕوامان وایە دڵسۆزیشن- بێئاگان لەو کاریگەریە خراپەی ئەو داکۆکیە بەجێی دەهێڵێ!

کاریگەری خراپ لە خودی ئاوماڵکەکە، چونکە پتر رێدەدا لەو سڕبونەدا بمێنێتەوە کە تێیدا دەژی و، نایەڵێ چی لە دڵ و دەروندایە بیگۆڕێ تا خودا گۆڕانکاری بۆ بکا، کاریگەری خراپیش لە ئاست گەنجانی (رۆشنبیر) کە بۆ ئیسلام بانگەوازیان دەکەین!

کاتێك بەو گەنجە (رۆشنبیر)انە دەڵێین: ئیسلام چارەسەرە و، (لا إله إلاّ الله) چارەسەرە و، پەرستنی راست چارەسەرە.. بەفشە شانی هەڵدەتەکێنێ و دەڵێ: ئا ئەوەتە ئیسلام لە گۆڕێیە و، ئا ئەوەتە (لا إله إلاّ الله)ش هەیە، ئەوەتا پەرستنیش بەرپایە، لەگەڵ هەندێش موسڵمانان لەهەموو خەڵکی دواکەوتوترن و، گیروگرفتی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتیان لە هەمو خەڵکی زیاترە و، ئاکاری موسڵمانان لە هەمو خەڵك بەدترە! کەواتە با لەدەرەوەی ئیسلام لە چارەسەر بگەڕێین، چونکە- ئیسلام بەرپایە و- هیچ کاریگەریەکی لە ژیانی خەڵکیدا نیە و! ناتوانی چارەسەری کێشە و گرفتی خەڵك بکات!

ئێمەش دەبێ لەگەڵ خۆمان و لەگەڵ خەڵکیدا راشکاو بین و پێیان بڵێین: دور لە دۆزی حوکم دەرکردن لەسەر ئەم نەوەیەی خەڵك،[1] ئەوەی کە ئەمڕۆ لە ژیانی خەڵکدا هەیە ئەو ئاینە نیە کە خوا دایبەزاندوە و، ئەو پەرستنە نیە کە خوا فەرمانی پێداوە، بۆیە دەبێ ئێمە لەسەرەتادا چەمکەکان راستکەینەوە، پاشان بنیاتێکی نوێ لەسەر چەمکە راستەکانی ئیسلام دامەزرێنین.

پاشان پێیان بڵێین: ئەوەی بەسەر موسڵماناندا هاتوە، لەدوا کەوتنی ژیاری و زانستی و عەسکەری و سیاسی و مادی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و هزری و رۆحی...تاد. بەهۆی ئەوەوە نەبوە کە ئەوان موسڵمانن.[2] بەهۆی حەتمیاتە مێژوییەکان و دۆخە ئابوریەکانیشەوە[3] نەبوە، بەڵکو هۆی رەسەن و سەرەکی، یەکەمجار گەندەڵبونی رەفتاری موسڵمانانە، ئینجا گەندەڵبونی تێروانینیان و، لەدواییشدا بەتاڵکردنی ئیسلام لەهەمو ناوەڕۆکەکەی.

چونکە ئەو رۆژەی ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ: تا بۆتان دەکرێ چەك و جبەخانەی شەڕ و ئەسپی سواری پەیداکەن.﴾الأنفال/٦٠. پەرستن بو، کەس نەیدەوێرا خاکی موسڵمانان داگیر کاو خێروبێرەکانی بڕفێنێ!.

ئەو رۆژەی ((طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ: زانستخوازین فەرز-ە-)) بو، دواکەوتنی زانستی لە گۆڕێ نەبو، بەڵکو ئوممەتی ئیسلامی ئوممەتی زانست بوو، کە ئەوروپا

---

١ پێشتر لە بەندی یەکەم (چەمکی لا الە الا الله) و کتێبی (واقعنا المعاصر) بەندی (الصحوة الاسلامية) ئاماژەمان بەم دۆزە کردوە.

٢ ئەمە قسەی رۆژئاوایە کە لە هێرشە فکریەکانیدا بەکاریان دێنا بۆ کەولکردنی موسڵمانان لەو بڕە ئیسلامەی ماویانە.

٣ ئەوەش قسەی کۆمۆنیستان بو کە لە هێرشی فیکریدا بەکاریان دەهێنا تا خەڵك واتێبگەیەنن لە کۆمۆنیزم بترازێ چارەی دیکەیان نیە!

له فێرگه و زانكۆكانیان فێربون.

ئەو رۆژەی ﴿**فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ**: شانەوشان له زەویدا بگەڕێن و له بژێوەکەی بخۆن.﴾الملك/١٥. پەرستن بو، کۆمەڵگە ئیسلامیەکانیش دەوڵەمەندترین کۆمەڵگاکانی سەر زەوی بون!

ئەو رۆژەی ((**كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ**: هەموتان شوانن و هەمووتان لەرەعیەتەکەتان بەرپرسن)) پەرستن بوو، کاربەدەستیش هەستی بەوە دەکرد شوانە و بەرپرسە له رەعیەتەکەی، هەژاران له کۆمەڵگەی ئیسلامیدا کێشە و دۆزێکیان نەبو، چونکە چارەسەری پەروەردگار بۆ کێشەی هەژاری له کۆمەڵگەی ئیسلامیدا وەك خودا پەرستنێك پیادە دەکرا[1]!

ئەو رۆژەی ﴿**وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ**﴾ پەرستن بو، ئافرەتی موسڵمان دۆزێکی نەبو! چونکە هەمو مافەکانی کە خوا فەرمانی پێدابێ بۆی دابین دەکرا و پێی دەدرا، وەك تاعەتێك و، پەرستن بۆ خوا!

---

١ یەحیای کوڕی سەعید دەڵێ: عومەر بۆ صەدەقەکانی ئەفریقیای هەناردم و وەرمگرتن، بەدوای هەژاراندا گەڕام نەمدۆزیەوە، چونکە عومەری عەبدولعەزیز خەڵکی دەوڵەمەند کردبو، جا کۆیلەم کڕین و ئازادم کردن، له کتێبی (الاموال)ی پێشەوای حافیز ئەبوعوبەید قاسمی کوری سەلام کە له ٢٢٤ك دا کۆچی دوایی کردوە (ل٣٥٧-٣٥٨) دا هاتوە: سەعیدی کوڕی ئەبو مەریەم بۆی گێڕامەوە: گوتی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بۆ عەبولحەمیدی کوڕی عەبدولڕەحمانی نوسی کە له عێراق بو، بەخشینەکان بۆ خەڵك بێنە دەر، عەبدولحەمید بۆی نوسی: من بەخشینەکانم بۆ خەڵك هێناوەتە دەر و پێم بەخشینەوە، بەڵام هێشتا لەبەیتولمالی موسڵماناندا ماڵ ماوە، بۆی نوسی: سەیرکە هەر زگورتیەك ماڵی نەبێ و بیەوێ ژنی بۆ بێنی، ژنی بۆ بێنە و نەختەکەی بدە، ئەمیش بۆی نوسی: ئەوەی دیتمەوە ژنم بۆ هێنا و هێشتا لەبەیتولمالی موسڵماناندا ماڵ ماوە. عومەر بۆی نوسی: بڕوانە کێ جزیەی لەسەرە و توانای نەبوە زەویەکەی دابچێنێ، ماڵی هێندە بدێ تاکو زەویەکەی بەناو بێنێ، ئێمە بۆساڵێك و دوان ئەوانمان ناوێ.

دواینی ئەم ئوممەتەش تەنیا بەوە چادەبێ کە سەرەتاکەی پێ چابوە..

یەکەمجار راستکردنەوەی چەمکەکان، پاشان دامەزراندنی بنیاتێکی نوێ لەسەر چەمکە راستەکانی ئیسلام[1]..

هیچ سیحرێکیش پەیدا نابێ لاوازی و پاشکەوتن لەچەند چرکەیەك رەشکاتەوە و بیانکاتە پێشکەوتن و هێز..

بەڵکو سونەتی پەروەردگاری هەن لەسەر زەویدا کە ژیانی مرۆڤیان لەسەر دادەمەزرێ..

کاتێك بەپێی سونەتە راستەکانیش ئیشکەین چارەسەری راستمان بۆ دێ..

سونەتێکی راستیش نیە کە ئاینەکەمان گەندەڵ کەین و پاشان بڵێین: ئەی خوایە! ئەی خوایە هاوار!

---

١ کۆمۆنیستەکان دەڵێن گوایە ئێمە دۆزەکان بەرادەیەکی نارێك کورتدەکەینەوە وە فاکتەری ئەخلاقی (مەبەستیان بیروباوەڕە!) تەنیا دەکەین و هەموو مەسەلەکانی بۆ دەگێڕینەوە، دور لە چوار چێوەی مادی و ئابوری و چینایەتی و مێژوویی، لە ساکاری خۆمان و لەبێئاگاییمان لە ماتریالیزمی دیالەکتیکی و راڤەکردی مادی بۆ مێژو! منیش هزری مادی و قسەکانی دیکەی کۆمۆنیستانم بەدرێژی لە کتێبی (مذاهب فكرية معاصرة) (ل٢٥٨-٤٤٤ لە چاپی یەکەمی ١٤٠٣ك-١٩٨٣ز) گفتوگۆ کردوە، لێرەش بواری دوبارەکردنەوە نیە، بەڵام تەنیا دەڵێین: ئەوەی بانگەوازی بۆ دەکەین تەنیا فاکتەرێکی ئەخلاقی روت نیە هەروەك بەهەمو نەشارەزاییان لە حەقیقەتی ئیسلام ئەوان وایان بەخەیاڵدادێ. چونکە ئیسلام بیروباوەڕێکە سیستەمێکی سیاسی کۆمەڵایەتی ئابوری فیکری ژیاری مادی لێ هەڵدەقوڵێ، بنچینەکانی چەسپاوە و وێنەکەی بەپێی بارەکانی مرۆڤ بەدرێژایی کاروانی مێژو دەگۆڕێ، لە گۆڕانکاریە بەردەوامەکەشدا هەمیشە بە بنچینە چەسپاوەکان مەحکومە کە ناشێ و دروست نیە بگۆڕێن، چونکە گۆڕانیان ژیانی مرۆڤ گەند دەکا، ئەگەر ئێمە فاکتەری ئەخلاقیش (بەرجەستە) بکەین-بەبێ تەنها کردن- ئەوا ئێمە بۆیە وا دەکەین چونکە کۆمۆنیستەکان بەقەستی پشتگوێی دەخەن، چونکە بەهزری جولەکانەوە کاریگەرن کە کۆمۆنیزم بۆی رێکخستون.

چونکە خوا لەبارەی ژیانی دنیا فەرمویەتی: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا: **خوا بەوانەی لەئێوە بڕوایان هەیە و ئاکار چاکن،** بەڵێنی دا: لەم زەمینە دەیانکاتە جێگەنشین، هەروەکو چۆن ئەوانەی بەر لەوانی کردە جێنشین، دینەکەشیان -کە خۆی پەسەندی کردوە- هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی، تا تەنیا من بپەرستن، هیچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن.﴾النور/٥٥.

لەبارەی ژیانی ئاخیرەتیش فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلاَ أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ وَلاَ يَجِدْ لَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا، وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا: **نە بە ئاواتی ئێوەیە و نە بە هەوا و ئارەزوی ئەو کەسانەیە بە ئەهلی کتێب حەسێبن،** هەر مرۆیەك کارێکی نالەبار بکا، بەو کارەی خۆی سزا دەدرێ و جگە لەخوا هیچ کەسی بۆ پەیدا نابێ دۆستی بێ و دەهاواری بێ. **هەر مرۆیەك -نێر بێ یان مێ- هەر هێندە خاوەن باوەڕ و ئاکار چاك بێ،** دەچنە بەهەشتەوە و بە ئەندازەی تلێشی وردیلەی ناوکە خورمایەکیش ناهەقیان لێ ناکرێ.﴾النساء/١٢٣-١٢٤.

لە ئایەتەکانیش ڕا دیارە کە ڕێگەی سەرکەوتن لە دنیادا هەمان ڕێگەی سەرکەوتنە لە قیامەت و لێکدانابڕێن.

ئەوانەی لە دنیادا دەبنە جێنشین و بالاّ دەست دەبن:

﴿**الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ: ئەوانەی لەئێوە بڕوایان هەیە و ئاکار چاکن.**﴾النور/٥٥.

﴿**وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ: هەر مرۆیەك-نێر** بێ یان مێ- **هەر هێندە خاوەن باوەڕ و ئاکارچاك بێ.**﴾النساء/١٢٤.

ئەوانەش لەسەرکەوتوانی قیامەتن.

ئەمەش سەیر نیە لە ئاینێك کە دنیا بکاتە کێلگەی قیامەت و، بەرپاکردنی حوکمی خودا لەسەر زەوی و، وەدیهێنانی دادگەری پەروەردگار و، زانستخوازی، گەڕان بەزەویدا بەدوای بژێوی و، بە چاکە مامەڵەی کەسوکار و، خۆسازدان بۆ دوژمنانی خوا و، هەڵگرتنی ئاکارە بەرزەکان.. بکاتە بەشێك لە پەرستن، کە وەك نوێژ و ڕۆژی و زەکات و حەج داواکراوە.[1]

هەرچی ڕێگەی مورجیئانیشە، کە کردوە لە بڕوا دەباتە دەرەوە و، لە چەمکی پەرستن دەیباتە دەرەوە، ئەوە لە دنیا و قیامەت پێکەوە ڕێگەی دۆڕاندنە:

﴿**قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ: بێژە ڕەفتاری هەرکەسێ بەپێی ئاکاری خۆیەتی.**﴾الاسراء/٨٤.

﴿**وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِمَّا عَمِلُوا: بۆ هەرکەسێ بەرانبەر بە کردەوە و ئاکاری خۆی.**﴾الأنعام/١٣٢.

---

١ لە (چەمکی دنیا و قیامەت) بەوردی باس لەم واتایە دەکەین.

# بەندی سێیەم

# حەمکی قەزاوقەدەر

# چەمکی قەزاو قەدەر

بڕواهێنان بەقەزا و قەدەر بەشێکی سەرەکی بیروباوەڕی موسڵمانە، هەروەك فەرموودەکەی جبریل رونی دەکاتەوە: ((الْإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْقَدَرِ كُلِّهِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ: بڕوا ئەوەیە کە باوەڕت بەخودا و بەفریشتەکان و کتێبەکانی و پەیامبەرەکان و رۆژی دوایی و قەدەر هەبێ بە چاك و خراپیەوە.))[1].

ئەمەش یەکێکە لە سیماکانی ئەم ئوممەتە لەمێژوە درێژەکەیدا.

ئەم چەمکە لەهەستی یەکەمین نەوەکانی ئەم ئوممەتە هێزێکی پاڵنەری بنیاتنەری جوڵێنەر بو، بەقەد ئەوەی لە هەستی نەوەکانی دوایین هێزێکی سلبی روخێنەری شەرمەزارکەر بو، کاتێك چەمکی قەزا و قەدەر لە هەستی ئەم نەوەیەدا لە وێنە راست و دروستەکەی خۆی لایدا کە نەوەکانی پێشین پێی ژیاون و بنیاتیان ناوە و ئاوەدانیان کردۆتەوە و پێی جوڵاون.

وێنەی بەرچاو و روکەشیش[2] لەهەردوو حاڵەتاندا هەریەکە، بەڵام لەراستیدا جیاوازیەکی گەورە لەنێوانیاندا هەیە.. هەروەکو ئەو جیاوازیەی لەهەمو شتێکی ژیانی ئەم ئوممەتەدا رویداوە!

---

١ أخرجه الشيخان.

٢ روکەش: ظاهر.

بێژەی[1] شایەتمان کە بەسەر زاری یەکەمین نەوەکانی موسـڵمانانـدا دەهـات هـەر هەمان ئەو بێژانەن کە بەسەر زاری نەوەکانی دوایین دا تێپــەڕیون (أشـهد أن لا إلـه إلاّ الله وأشهد أن محمداً رسول الله)، بەڵام شادەی نــەوەی یەکـەم زەوی دەهــەژاند و دەیــبزواند چونکـە بـە مایــەی[2] تـەواو و بارگـەی[3] تـەواوی خـۆی لەسـەر زەویـدا کاریدەکرد و، کەچی شادەهێنانی نەوەکانی دوایی هیچ شتێکی لە زەویــدا بەرهـەم نەهێنا، بەڵکو تەنانەت نەیتوانی پارێزگــاری لــە بونـی ئیسـلامی بکـا بەرامبــەر هێرشی عەسکەری و سیاسی و ئابوری و بەرامبەر هێرشی هزری کە لەهەر هـــەمو ئەوانە ترسناکترە، ئەمەش چونکە ئەو واژەیە نەمایەی مابو نە بارگە!

جوڵانەوەکانی نوێژیــش لــە راوەســتان و دانیشــتن و رکـوع و ســوژدە و قورئـان خوێندن و دوبارەکردنەوەی چەند گوفتارێك، لەوەتەی هەیە تا ئەمڕۆ هیــچ شــتێکی لیّ نەگۆڕاوە، بەڵام کاتێك قامەتی ئەو نوێژە دەکرا، بانگــەوازی بونـی ئوممـەتێکی زیندوی بەهێزی شکۆداری دەکرد، چونکە بەخۆی لە حەقیقەت چۆنــە بــەو شـێوەیە ئەنجام دەدرا و، ئوممــەت داخوازیەکانیشــی بــەجێ دەهێنــا، جـا بانگـەوازی بونــی ئوممەتێکی دەکرد کە لە جیهانی واقیعدا مەبەستی بونی مرۆڤایــەتی وەدیــهێنابو، پاشانیش بەسەر هەمو ئوممەتێکدا زاڵبو کە ئەم بونەی بەوێنەی راستودروستی خۆی نەهێنابوە دی، ئەمەش هێنانە ئارای[4] سونەتی خوا بو لەسەر زەوی:

﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ: لە زەبوردا کە لە پاش تەورات بو نوسیمان ئەم زەمینە هەر بۆ عەبدە هێژاکانی ئێمــە دەمێنێ.﴾الأنبياء/١٠٥.

---

١ بێژە: لفظ.

٢ مایە: رصید.

٣ بارگە: شحنة.

٤ ئارا: وجود.

هەروەها هێنانەدی بەڵێنی تایبەتی خوا بو بۆ ئەم ئوممەتە:

﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِـــي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّـهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا: خوا بەوانەی لـەئێوە بڕوایـان هەیە و ئاکار چاکن، بەڵێنی دا: لەم زەمینە دەیانکاتە جێگەنشین، هـەروەکو چۆن ئەوانەی بەر لەوانی کردە جێنشین، دینەکەشیان-کە خۆی پەسـەندی کـردوە- هـەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی، تا تەنیا من بپەرستن، هیـچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن.﴾النور/٥٥.

باوەڕی قەزا و قەدەریش بەهەمان شێوە.. وێنە و روکەشـەکەی بریتیـە لـەبونی بڕوا بەوەی کە هەرچی لەم گەردونە و لە ژیانی مرۆڤدا رودەدا بـە قـەزا و قـەدەری خوایە و، لە تێکڕای ئەم گەردونە پانوپۆڕە و لـە ژیـانی مرۆڤیـش لەقـەدەری خـوا بترازێ هیچ شتێکی دی رونادا.

﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَـدَرٍ: ئێمـە هـەمو بونـەوەرمان بـە قـەدەر و ئـەندازە ئافراندوە.﴾القمر/٤٩.

﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي أَنْفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْـلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ: هـەر بەڵایـەك رودەدا لـەم سـەر زەمینـە و هـەر بەڵایەك کە بەسەر خودی خۆتـان دێ، بـەر لـەوەی وەدی بـهێنین، لـە دەفتـەرێکدا نوسراوە و ئەمە لای خودا ئاسانە.﴾الحدید/٢٢.

﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ: کەس هیچ بەڵای بەسەر نایە، مەگەر خودا فـەرمان و ئـیزن بـدا، هـەرکێش بڕوای بە خودا بێ، دڵی شارەزای خۆی دەکا، خودا هەمو شت دەزانێ﴾التغابن/١١.

﴿قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلاَنَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُؤْمِنُونَ: بلّێ بێجگە لەوەی خودا بۆی نوسیبین توشمان نایە. هەر ئەو سەروەری ئێمەیە و پێویستە خاوەن باوەڕان هەر خۆ بەخودا بسپێرن.﴾التوبة/٥١.

بەلاّم ئەو جیاوازیە گەورەیەی لە حەقیقەتی ئەم بیرەوباوەڕەدا(قەزاو قەدەر)، لە نێوان نەوەکانی پێشین و نەوەکانی پاشین بریتیە لە جیاوازی نێوان پشت بەخوا بەستنی نەوەکانی پێشو لەگەلّ ئەم دەست بەردانەوەی لەسەردەمی بەرتەنگ بونەوە[1] و، پاشان لەسەردەمی سەرەولێژبونەوە[2]، ئەو جیاوازیەش بچوکتر نیە لە جیاوازی (لا إله إلاّ الله) و، جیاوازی نوێژ و پەرستنەکانی دیکە لە نێوان ئەم نەوانە و نەوەکانی پێشو!

موسلّمانی یەکەم بڕوای بەوە هەبو کە هەرچی بەسەری بێ یا لە گەردوندا روبدا بەقەزاوقەدەری خوایە و، هیچ شتێکیش قەدەری خودا ناگۆڕێ کە هەر لە ئەزەلەوە لە لەوحی مەحفوزدا تۆمارە.

پاشان لە دەرەنجامی ئەو بڕوایەیدا بەخۆی دەگوت: ئایا ئەگەر چومە گۆڕەپانی جەنگ و کوژرام بەهۆی چونمە بۆ ئەوێ کە دەکوژرێم؟ یاخود قەدەری خوایە و بەسەرمدا رەت دەبێ، خۆ ئەگەر لەوێ شەهیدی بۆ نوسیبم ئەوا-بەقەزا و قەدەری خوا- دەکوژرێم، ئەگەر گەڕانەوەشی لە چارەدا نوسیبم ئەوە دەگەڕێمەوە؟ پاشان ئەمن ئەگەر خوا مردنی بۆ نوسیبم ئەوا لەم شوێنەشمدابم هەر دەمرم بێ ئەوەی بۆ شەڕیش بچم.. جا گەر وابێ چ هەیە لە جەنگ دوام بخا؟ ترسی مردن کە لەهەر بارێك بێ هەر قەدەرە؟ یا ترسی ئازارکێشان کە لەهەر بارێکدا بێ هەر ئەوەندەم بەر دەکەوی کە خوا لە قەدەری خۆی خەملاّندویەتی؟ نەخێر با بەرەو

---

[1] بەرتەنگ بونەوە: الانحسار.

[2] سەرەولێژبونەوە: الانحدار.

بەجێگەیاندنی فەرزی پەروەردگارمان بچین و، لەوەش بترازێ کەخوا لــە چارەمــانی نوسیوە هیچمان بەسەر نایێ، هەر خودا گەورەمانە و بابڕوادارانیش پشــت بــەخودا ببەستن، ئەوجا بەگیانێکی ئــازاد و مەردانــەوە دەچێتــە شــەڕ و نابــەزێ و بوێــری دەنوێنێ، خوداش بەهۆی وی قەدەری خۆی لەزەویدا بەرپا دەکا و، ئەم ئاینەی پــێ سەر دەخا و بالاّ دەستی دەکا، پاشان قەدەری خوا بەسەر ویشدا بەرپا دەبــێ و، یــا شەهید دەبێ یا سەردەکەوێ.

﴿قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلاَّ إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ: بلــێ ئــاخۆ چــاوەنۆڕن جگــە لــە یەکێ لەو دوانەی کە هەردوکیان باشەکانن(یا شەهید بون، یا سەرکەوتن)، شتێکی ترمان توش ببێ؟﴾التوبة/٥٢.

کاتێك دەرونی دوڕو و بڕوا لاوازەکانیش لە پاش دوڕانی جەنگی ئوحــود شــپرزە بو، چەند ئایەتێکی پیرۆز دابەزین بڕیاری ئــەم حەقیقەتــەیاندا ۆ دوپاتیــانکردەوە و لەدلّ و دەرونی بڕوادارانیاندا چەسپاند:

﴿ثُمَّ أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُعَاسًا يَغْشَى طَائِفَةً مِنْكُمْ وَطَائِفَــــةٌ قَــدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنْفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِاللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ يَقُولُونَ هَلْ لَنَا مِنْ الأَمْــــرِ مِنْ شَيْءٍ قُلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ يُخْفُونَ فِي أَنْفُسِهِمْ مَا لاَ يُبْدُونَ لَكَ يَقُولُونَ لَــوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَا قُتِلْنَا هَاهُنَا قُلْ لَوْ كُنْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِــبَ عَلَيْهِمْ الْقَتْلُ إِلَى مَضَاجِعِهِمْ وَلِيَبْتَلِيَ اللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّــصَ مَــا فِــي قُلُوبِكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ: پاش ئەو خەمە ئارامیەکی ناردە ســەرتان کــە پڕیەتی لە ئۆقرەی خەولێکەوتن بۆ بەسەر هێندێکتان داهات. هێندێکیشــتان هــەر تەنیا خۆتان لەبیر بــو. ئێــوەش هــەروەك خوانەناســەکانی پێشــین بیرتــان لــە خــوا دەکردەوە. دەیانگۆت ئاخۆ لەم کارە چمان بۆ دەکرێ؟ بلــێ گشــت کــار و فــەرمان

بەدەست خودان، ئەوانەی نهێنی دڵیان لەلای تۆ ئاشکرا ناکــەن دەڵێـن ئەگـەر بـە دەستەخۆمان بوایە، ئێمە لێرە نەدەکوژراین. بڵێ ئێوە ئەگــەر لـە مــاڵی خۆشـتان بان، ئەو کەسانەی کوشتنیان لەسـەر نوسـراوە دەهاتنـەوە جێـی راکشـانیان. خـوا دەیەوێ دڵتان تاقی بکاتەوە و هەرچی لە دڵتاندا هەیـە دەریـهاوێ. خـوا لـە رازی دڵەکانتان ئاگادارە. ﴾آل عمران/١٥٤.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ كَفَرُوا وَقَالُوا لِإِخْوَانِهِمْ إِذَا ضَرَبُوا فِـي الأَرْضِ أَوْ كَانُوا غُزًّى لَوْ كَانُوا عِنْدَنَا مَا مَاتُوا وَمَا قُتِلُوا لِيَجْعَلَ اللَّهُ ذَلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ يُحْيِ وَيُمِيتُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ، وَلَئِنْ قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّـهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِنْ اللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ، وَلَئِنْ مُتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى اللَّـــهِ تُحْشَرُونَ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، ئێوە وەك ئەوانە مەبن کە خودایان نەدەناسی و سەبارەت بە براکانیان کە لەسەفەر یـان لـە شـەڕی دووژمنـان بـون، دەیـانگۆت ئەگەر ئەوانە لامان مابان نەدەمردن. نە دەکوژران. هەر بۆیە بو خودا بیکا بە ئـاخ و داخـی سـەر دڵیـان. خودایـە کـە ژینـێ دەدا و دەشمرێنـێ و هـەرکارێکی ئێـوە دەیکەن، خوا دەیبینێ.. ئەگەر لەرێی خودا بمرن، یان لــەرای خـودا بەکوشـت چـن دیارە لێخۆشبونی خودا و بەزەیی ئەو زۆر چاکترە لــەو شـتەی کـۆی دەکەنــەوە، چ بمرن و چ بکوژرێن، بێگومان کە لای خوا کۆدەکرێنەوە. ﴾آل عمران/١٥٦-١٥٨.

موسڵمانی یەکەم ئاوهای دەکرد کــاتێك کەسـنەزانەکانی[١] زەوی دەپشـکنی بـۆ بڵاوکردنەوەی بانگەواز و، زانستخوازی و، گەڕان بەدوای بژێویــدا و، بەهــەر چـوار لای زەویدا دەسوڕاوە و دوچاری ترکزە و ناخۆشیان دەبو.

بنچینەکە لە مێشکیدا وابو: کە هەنگاوباوێ و.. پشت بەخوا ببەستە.

---

١ کەسنەزانەکانی زەوی: مجاهیل الارض.

جا ئەو هەنگاو بەرەو پێش هاوێشتنە چۆن گۆڕا و بوە خۆگنخاندن و دانیشتن لە چاوەڕوانی قەدەری خوا ؟!

* * *

هەروەها لە هەستی موسڵمانی یەکەم وابو کە بڕوا بون بەقەزا و قەدەر بەرپرسێتی لە کارەکان لەکارناخا و کاتێك هەڵە ئەنجام بدا دوچاری سزادان دەبێ.

لەجەنگی ئوحودیشدا وانەکە لەدەرونی بڕواداران مەزن و قوڵ بو.

تیرهاوێژەکان فەرمانی سەرکردە و پێغەمبەری خۆیان ﷺ شکاند، کە فەرمانی پێکردن جێگای خۆیان بەجێ نێڵن تەنانەت ئەگەر بینیان واباڵندە موسڵمانان رادەفڕێنێ، بەڵام کاتێك سەرکەوتنەکەیان بینی و، وایانزانی شەڕ کۆتایی پێهات و گەیشتە مەبەست، دەسکەوتەکان[1] لە فەرمانی پێغەمبەری خوای ﷺ خافڵکردن، جا شوێنی خۆیان جێهێشت و دابەزین، لەترسی ئەوەی نەوەکو لە دەسکەوتەکان پشکیان بۆ دانەنرێ! جا لێرەدا هاوبەشپەرستەکان بەسواری گەڕانەوە و بەسەر سوپای موسڵمانانیان داداو ئارخەیان[2] بون لە لاچونی هێزە گورز وەشێنەکەی سەر کێوی تیرهاوێژان، ئەمە بوە هۆی دۆڕان و پەشۆکانێکی توند لە ریزەکانی سوپادا و، بریندارבونی پێغەمبەری خوا ﷺ و، واتەوات و دەنگۆی بێبڕوایان لەبارەی کوشتنی پێغەمبەر ﷺ و کاریگەری لەسەر لێکدابڕانی یەکێتی سوپادا..

قورئانیش بە سەرکۆنەکردنێکی[3] توندی بڕواداران دابەزی، سەبارەت بەو کردەوەی ئەنجامیاندا، هەروەها راڤە[4] و رونکردنەوە لە قورئان دابەزی، ئەم ئایەتانەش لەم رونکردنەوانە دابون:

---

١ دەستکەوت: غنیمة.

٢ ئارخەیان: مطمئن.

٣ سەرکۆنەکردن: عتاب.

٤ راڤە: شرح.

﴿أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَمَا أَصَابَكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ، وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا: **ئاخۆ کاتێ زیانتان لە دوژمن پێگەیشت، کە جارێکیش دو ئەوەندەتان زیان لێدان هیچ پرسیتان زیانەکەمان لەچی بو؟ بڵێ لەخۆتانەوە بو خوا بۆ هەمو شت توانایە. هەرچی ئەو رۆژە توشتان هات کە دو کۆمەڵ بە یەك گەیین گشتی بە ئیزنی خودا بۆ هەتا خاوەن باوەڕەکان نیشان بدا. تا دوڕوەکانیش بناسێ.**﴾آل عمران/١٦٥-١٦٧.

بزانن ئەوە بەهۆی خۆتانەوە بو.. لەهەمان کاتیش بەمۆڵەت و ئیزنی خوا بو.

بەرپرسێتی لەهەڵەکە لە ئارادایە و، بڕواش بەوەی کە قەزا و قەدەری خوایە و هەر لە ئارایە و.. تێکیشناگیرێن[1].

ئەمەش یەکێك بو لە مەزنترین ئەو شتانەی ئەم ئوممەتە فێری بو و پێی دەناسرا: نەهێشتنی تێکگیران لەنێوان بڕوای مرۆڤ بە بەرپرسێتی لە کردوەکانی خۆی و، بڕوابونی بەقەزا و قەدەری خوا و، بڕیاردانی هەردو مەسەلەکە پێکڕا لەنێو دڵی مرۆڤ بۆ ئەوەی لەنێوانیاندا هاوسەنگ بێ و، لە کاروانی سەر ئەم زەمینەدا هاوسەنگیان پێ راگرێ، لە هەستکردنی بەردەوام بە قەدەری خودا و چاوتێبڕینی لە مەسەلەی گەورە و بچوکدا دانەدەبڕا و، چاوەدێری کردەوەکانی خۆشی لێ دانەدەبرا لەپاڵ هەڵسەنگاندنیان بەتەرازوی هەڵە و راستی.

جا چۆن ئەم هاوسەنگیە ناوازەیە و گۆڕا و بوە خۆدزینەوە[2] لە هەمو بەرپرسێتیەك بەناوی بڕوا بون بەقەزا و قەدەری خوا؟

* * *

---

[1] تێکگیران: تعارض.

[2] خۆدزینەوە: تنصل.

هەروەها لەنێو هەستی ئومەتی یەکەمین ئەوەش چەسپابو کە بڕوا بونـی بەقـەزا و قەدەر لەگەڵ وەرگرتنی هۆکارەکان[1] تێکگیر نابێ.

لەلایەکەوە پەیان بـەوە دەبرد[2] کـە خـودا لـەم گەردونـە و لـە ژیـانی مرۆڤـدا سوننەتی هەن کە گۆڕانیان بەسەردا نـایێ، لەگـەڵ ئـەوەش کـە خـودا-ی بـەرز و بالادەست- سوننەتی سەرئاسای[3] هەیە کـە دەتوانـێ هـەمو شـتێك دروسـتبکا و ئەنجامی بدا و، هیچ ڕێگر و ببەربەستێکیشی نیە، چونکە ویســتی خـودای مـەزن لەهەموو کۆتێك ڕەهایە، بەڵام خودای خاوەن توانای بێ سـنوور قـەزای وابـوە کـە سوننەتی بەرپای لە ژیانی دنیادا جێگیر و نەگۆڕ بـێ و، سـوننەتە سەرئاساکەشـی ئاوارتەبێ[4]، هەردوکیشیان پەیوەستن بەویستی خودا.

• هەر بۆیە هەستی ئەوان وابو کە هەر دەبـێ لەگـەڵ سـوننەتە بـەرپاکاندا بـڕۆن ئەگەر بیانەوێ بگەنە ئەنجامێکی دیاریکراو لە واقیعی ژیانی خۆیان، واتە پێویستە ئەو هۆکارانە وەرگرن کە دەیانگەیەنێتە ئەنجامەکان بەپێی سوننەتە بەرپاکان.

خوداش زۆر بەراشکاوی ئەمەی لە کتێبی خۆیدا رونکردۆتەوە.

خودا قەدەری وابوە بۆ دینی خۆی کە سەربکەوێ و لەزەویدا بالا دەسـت بـێ و، قەدەریشی وابوە کە فێڵ و دەهۆی بێبڕوایان سەرنگوم بێ:

﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَـوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ: ئەو خودایە پێغەمبەری خۆی بەرێکرد، بۆ ڕێبەری و ڕاگـەیاندنی دینی ڕاست، تا سەری خا بەسەر هەمو دینەکاندا. جا بـا بتپەرسـتەکانیش پێیـان ناخۆش بێ. ﴾الصف/٩.

---

١ وەرگرتنی هۆکارەکان: اتخاذ الاسباب.

٢ پەی پێبردن: ادراك.

٣ سەرئاسا: خارق، معجز.

٤ ئاوارتە: استثناء.

﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا إِنَّهُمْ لاَ يُعْجِزُونَ: خوانەناسان وا بیر نەبەن وەپێش کەوتون، ئەوان ئێمە نابەزێنن.﴾الأنفال/٥٩.

ناتوانن توانای خودا لەکاربێخن و بیبەزێنن کە سەرکەوتنی بۆ دینی خۆی نوسیوە و، وە پێش قەدەری خوا ناکەون، هەر قەدەری خوا پێش دەکەوێ و هەر ویستی خودا دێتە جێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ئایا خودا پێی گوتون: مادەمەکێ من قەدەرم بۆ دینی خۆم سەرکەوتن و باڵا دەست بونە، ئێوە دانیشن و چاوەڕێی وەدیهاتنی قەدەری من بن، کە بێگومان هەر دێتە دی؟ نەخێر! بەڵکو-لەهەمان ئەو کاتی کە قەدەری نوسراوی خۆی دەربارەی ئەم ئاینە پێناساندن و پێی راگەیاندن کە بێگومان هەر دێتە دی-پێیانی گوت کە هەر دەبێ جیهاد بکەن و خۆیان ساز و ئامادەکەن:

﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا إِنَّهُمْ لاَ يُعْجِزُونَ، وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ: خوانەناسان وا بیرنەبەن وەپێش کەوتون. ئەوان ئێمە نابەزێنن.. تا بۆو دەکرێ چەك و جبەخانەی شەڕ و ئەسپی سواری پەیدا بکەن، دوژمنی پێ بترسێنن، کە دوژمنانی خوداشن، غەیری وانیش دوژمنتان هەن نایان ناسن، بەڵام خودا دەیان ناسێ، هەرماڵێکی لەراهی خودای بەخت کەن، خودا دەیبژێرێتەوە و هیچ ناهەقیتان لێ ناکرێ.﴾الأنفال/٥٩-٦٠.

﴿إِنْ تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ: ئەی گەلی خواوەن باوەڕان، ئەگەر یاری خودا بکەن، خوداش یاریدەتان دەدا و لەبەر نەیاران نابەزن.﴾محمد/٧.

جا پێویسته هۆكارەكانی سەركەوتن دابین بكرێن، هەر چەندە كە سەركەوتنیش قەدەرێكی بڕیاردراو بێ لەلایەن خواوە.

بەمشێوەیە لەهەستی موسڵماندا بڕوابون بەقەدەری خوا و، بڕوابونی بەوەی كە هەردەبێ كار بەو هۆكارانە بكات كە بەپێی سوننەتی خودا ئامانجەكان دەخەنە دەست، هاتنە پاڵیەك و كۆبونەوە، ئەگەر ئەم ئوممەتە وازیشی لێ نەهێنرا تا بە هۆكارەكان بخەڵەتێ و، واتێبگا -تەنیا خودی هۆكارەكان- دەبنە هۆی گەیشتنە ئەنجام بەدور لە قەدەری خودا، هەروەك كە جاهیلیەتی ئەم سەردەمە تێی كەوتوە، وانە و پەندی حونەینیش بۆ ئەوەبو ئەم مانایە لەدەرونی بڕواداران بچەسپێنێ.

﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُمْ مُدْبِرِينَ، ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ: رۆژی حونەینیش هەروەها، كە هەرچەندە بەزۆری خۆتان دەنازین، كەچی هیچ بەهرەی بۆ نەدان. ئەم زەمینە گوشادەتان لێ تەنگ هەلات. لە دواییدا هەموو پاشەكشەتان كرد و بەرەودوا گەڕانەوە. پاشان خودا دڵنیایی بۆ پێغەمبەرەكەی خۆی و بڕواداران بەرێكرد و زۆر پێشمەرگەشی دابەزاند كە نەتان دەدین، خوانەناسانی سزادا و سزای خوانەناسەكان هەر ئەمەیە.﴾التوبة/٢٥-٢٦.

ئەمەش یەكێك بو لە چەلەنگترین ئەوشتانەی ئەم ئوممەتە فێری بو لەسەری پەروەردە بو، تا لە كاروانەكەی سەر زەمینی لە نێوان دەست بەردانەوە بەبێ وەرگرتنی هۆكارەكان و، لە نێوان پشت بەستن بە هۆكارەكاندا هاوسەنگ بێ.

جا چۆن ئەم هاوسەنگیە ناوازەیە بەرەو سلبیەتێكی تەواو گۆڕا لەگەڵ دەستبەرداربون لە وەرگرتنی هۆكارەكان بەناوی پشت بەخوا بەستن؟

پاشان له هەستی ئوممەتی یەکەمین دا خۆدانە دەست قەدەری خوا و کارکردن بـۆ گۆڕینی واقیعێکی خراپ کاتێك هەبوبێ، پێچەوانە نەبون.

هەموو شتێك لەم بونەدا و له ژیانی مرۆڤدا بەقەزا و قەدەری خـودا روو دەدەن، ئەمە لەدەرونی بڕواداراندا نەمشتومڕی هەڵدەگرت و نه جێگەی گومان بوو.

کاتێك واقیعێکی خراپیش له ژیانی خەڵکیدا دەبـێ، ئـەو واقیعـە بـە قـەزا و قەدەری خوایە و، جا ئەو واقیعە هۆکارەکەی لەلای خەڵکەوە بێ وەك ئـەوەی رۆژی ئوحود بەسەر بڕواداراندا هات بەهۆی سەرپێچیکردن له فەرمانی پێغەمبەر ﷺ یـا لەبارێکدا بێ کە هیچ بەرپرسیێتیەکیان تێـدا نـەبێ، وەك تـاعونی عەمـەواس لـە رۆژانی جێنشینی عومەری کوڕی خـەطاب ﷺ (لـەوان رۆژانیشـدا نـە هۆیـەکانی تاعون ناسرابون نـە چۆنیـەتی چارەسـەکردنی، بۆیـە لـەو کـاتدا بەرپرسـێتیەکەی نەدەکەوتە سەر کەس)، یـا تاقیکردنەوەیـەك بـێ لەلایـەن خـوداوە بـۆ بـڕواداران مشتومالْ کردن و هـاوێرکردنی هـەروەك لـە ماوەکـانی تاقیکردنـەوەی ئـەزموندا رودەدەن کە بەسونەتێك له سونەتەکانی خودا دێنە گۆڕێ:

﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لاَ يُفْتَنُونَ، وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِيـــنَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ: ئاخۆ مەردم لایـان وایـە هەر کەس بڵێ ئێمە باوەڕمـان هێنـاوە، ئیـتر وازیـان لیْدەهێـنرێ و توشـی هیـچ ئەزمونێ نابن؟ ئێمە ئەوانەی بـەر لەمانیشـمان بـە تـاقیکردەوە، بێگومانـە خـوا ئەوانەی کە راستیان گوت، ئەوانەش کە درۆزنن، دیاری دەکا.﴾العنکبوت/٢-٣.

ئەمە و هەمو روداوێکیش کە لەسەر زەوی خەڵك بەسەریاندێ، هەموی بە قەزا و قەدەری خوایە.

بەلاّم خودا فەرمانی بەخەلکی نەداوە تا خۆ بدەنە دەست قەدەری خـوا بـەواتای کارنەکردن بۆ گۆڕینی ئەو واقیعــە خراپـەی کـەتێی کـەوتون، بـەلکو وا فـەرمانی پێکردون کە خۆ بدەنە دەست قەدەری خوا (یا بۆی ملکەچ بـن) بـەواتای رازیبـون بەوەی کە تازە رویداوە وەك قەدەرێکی حەتمی کە نــەدەکرا خـۆی لیّ لادریّ، بـەلاّم لەدیار دانیشتن و نەگۆڕینی، یا هەولّنەدان بۆ گۆڕینی، ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیــە و خودا نە فەرمانی پێـداوە و نەخـەلکی بـۆ هـانداوە و، نـەهیچ پەیوەندیشــی بـە رازیبون هەیە بەو شتەی کە رویداوە وەك قەدەرێکی حەتمی لەلایەن خوداوە.

با ئەو سیّ نمونەیە وەرگرین کە ئاماژەمان پیّ کردن.

کاتێك دۆڕانی ئوحود رویدا، هۆیەکەی لەلایەن بڕوادارانەوە بو، لــە هــەمانکات بە قەدەرێکی خوداش بو:

﴿قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَمَا أَصَــــابَكُمْ يَـــوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ اللَّهِ: بلّیّ: لەخۆتانــەوە بـو خـوا بـۆ هــەموو شـت توانایــە. هەرچی ئەو رۆژە توشتان هات، کە دو کۆمەلّ بە یەك گەیشـــتن گشـتی بــە ئـیزنی خودا بو.﴾آل عمران/١٦٥-١٦٦.

خودا داوای لەبڕواداران کردوە کە تەسلیمی ئەو قەدەرە بڕیاردراوە بن:

﴿فَأَثَابَكُمْ غَمًّا بِغَمٍّ لِكَيْلاَ تَحْزَنُوا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلاَ مَا أَصَابَكُمْ وَاللَّهُ خَبِـــيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ، ثُمَّ أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُعَاسًا يَغْشَى طَائِفَةً مِنْكُــمْ..: جـا خوا جەزای خەمی هەر بە خەم دانــەوە. نـەکا لەبـەر ئـەوەی وا لەدەســتان چـوە و ئەوەی کەوا توشتان بوە خەفەت بخۆن، خودا لەو کارانەی دەیکـەن ئاگـادارە. پـاش ئەو خەمە ئارامیەکی ناردە سەرتان کە پڕیەتی لە ئۆقرەیی خەولیکـەوتن بـۆ سـەر هێندێکتان داهات.﴾آل عمران/١٥٣-١٥٤.

بەڵام ئایا داوایان لێکرا خۆ بدەنە دەست ئەو دۆڕانەوە لێی دانیشن و هەوڵنەدەن ئەو هەڵوێستە خراپە بگۆڕن کە خۆیان تێدا دیتەوە، بەبیانوی ئەوەی کە قـەدەرێکی خودایە و هەرچەندیان هەوڵدابا لێی دەرباز نەدەبون؟!

نەخێر! پێغەمبەری سەرکردە و مامۆستا ﷺ لەو هەڵوێستەدا هەڵســوکەوتێکی وای نواند بەڵگە بو بۆ ئاراستەیەکی تەواو جیاواز لــەم گومانــە، کــە موســڵمانانی بەبرینەکانیانەوە -کۆ کردەوە تــا دوبــارە روبــەڕوی دوژمــن ببنــەوە، هێشــتاکەش کاریگەری دۆڕانــدن نــە لەجەســتەکان کۆتــایی هــاتبو نــە لەدەرونــەکان! خــوداش ئافەرینی لە هەڵوێستی بڕواداران کرد کە بەپیر فــەرمانی خــودا و پێغەبەرەکەیــەوە چون پاش ئەوەی توشی ناخۆشی هاتن:

﴿الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِيــــنَ أَحْسَــنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ، الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّــاسَ قَــدْ جَمَعُــوا لَكُــمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّــهِ وَفَضْلٍ لَمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّــهُ ذُو فَضْــلٍ عَظِيــمٍ: ئـەو کەسانەی کە لەپاش بریندداربونیش فەرمانی خــوا و پێغەمبــەریان بــەجێ‌هێنا، بــۆ ئەوانیان وا کاری چاکیان کــردوە لــە خواترســان. پاداشــتێکی گــەورە هەیــە. ئــەو کەسانەی پێیان وتن: گەلەکۆمەکیتان لی‌کــراوە و بەپانــەوە دێنــە ســەرتان. ئەشــێ ترستان لێیان هەبێ، باوەڕیان بــەهێزتر بــوە و گوتیــان: ئێمــە هــەر خودامــان بــێ بەسمانە و چاکترین پشت و پەنامان تەنیا ئەوە، هاوڕێ دەگــەڵ نیعمــەت و چاکــەی خوادا -بێ‌ئەوەی توشی زیان بــن- گەڕانــەوە و هــەڵوەدای ڕەزای خــودا بــون، هــەر خوداشە چاکەی گرینگی بە دەستە.﴾آل عمران/١٧٢-١٧٤.

ئەوانە ئەو کەسانەن کە بەقەدەری خودا دۆڕاندیان (ئەگەر چی لەهەمان کات هۆیەکەی لەلای خۆیانەوە بێ) دەڵێن: (حسبنا الله ونعم الوكيل). ئەوان پشت بەخوا دەبەستن تاکو لە واقیعە خراپەکەدا بەرەو واقیعێکی نوێ دەرچن و، قەدەری پێشوی خوداش رێی ئەوەیان لێناگرێ کە روەو قەدەرێکی نوێ هەنگاو بنێن! جا ئەگەر یەکەم قەدەری خوا بەهۆی هەڵەی خۆیانەوە توشیانهاتبێ، ئەوا ئەوان چاودەبڕنە قەدەرێکی دیکەی خودا بەهۆی کردەوەیەك کە بەو هیوایە ئەنجامی دەدەن، ئەو کردەوەیەش بریتیە لە وەڵامدانەوەی فەرمانی خودا و پێغەمبەر، واتە بەرەفتارێکی دروست پاش ئەو رەفتارەی کە هەڵەی تێکەوتبو، ئەمەش بریتیە لە وەرگرتنی هۆکارەکان لەگەڵ پشت بەستن بەخوا، بەمشێوەیە لە هەستی ئەواندا خۆدانە دەست قەدەری واقیعی خوا لەگەڵ کارکردن بۆ گۆڕانکاری تێککگیر نەدەبو.

لەتاعونی عەمەواسیشدا. خەلیفە ﷺ هەواڵی تاعونەکەی زانی فەرمانی بە سەربازەکاندا بڵاوەی لێ بکەن، ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح ﷺ گوتی: (ئەوە تۆ لە قەدەری خواوە هەڵدێی؟!) عومەر گوتی: (لەقەدەری خواوە هەڵدێم بۆ قەدەری خوا!)

ئەمەش دەربڕینێکی رەوانە و بەڵگەی ئەوەیە کە خەلیفە ﷺ زۆر بەقوڵی لە دۆزی قەزاوقەدەر گەیشتوە، تاعونەکە قەدەرێك بو بەڕاستی دابەزیبوە سەر خەڵکی، بەڵام هێشتا توشی عومەر و لەشکرەکەی نەبوبو، بۆیە کارکردن بۆ خۆلێپاراستنی کارێکی واجبە و، کاتێك خۆپاراستنەکەش دێتە دی ئەویش هەر قەدەری خوایە. چونکە قەدەری خودا بەتاعون رێ لە قەدەری خوا بەرزگاربون لە تاعون ناگرێ! عومەریش ئەو هۆکارانەی وەرگرت کە پێیوابو دەیانگەیەنێتە دەرباز بون، جا هەر بەقەدەری خوا رزگاریان بو.

لەو تاقیکردنەوەش کە موسڵمانان لەسەر دەستی قورەیــش دوچاری بـون کـە بەخۆی سوننەتێکە لە سوننەتەکانی خوا و لە هیچ کۆمەڵە بڕوادارێك دانەبڕاوە کـە لەسـەرەتای بانگـەواز و پێـش بـاڵا دەسـتبون روبـەروی جاهیلیـەت دەبنـەوە- تاقیکردنەوەکە بەقـەدەری خـوا رویـدا و، بـۆ حیکمـەتێکیش کـەخودا دەیزانـێ و دەیەوێ:

﴿فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ: بێگومـان خـوا ئەوانـەی کـە راستیان گوت، ئەوانەش کە درۆزنن، دیاری دەکا.﴾العنکبوت/٣.

جا ئایا ئەمە لە رێگەی پێغەمبەر ﷺ و بڕواداران گرت کە هـەوڵی گۆڕانکـاری بـدەن؟ جـارێك بـەداواکردنی یارمـەتی لـە هـەندێ هاوبەشپەرسـتان و، جـارێك بەکۆچکردن بەرەو حەبەشە، تاکو لە کۆتاییدا مۆڵەتی کۆچکردن روەو مەدینە درا؟

نەخێر! ئەزمون و تاقیکردنەوەکان بەقەدەری خوا رودەدەن و بـەپێی سـوننەتێك لە سوننەتە حەتمیەکانی خوا بـون، رێگـە لـە هـەوڵی خـۆڵیێ دەربـازکردن نـاگرن، هـەرکاتێکی یـەکێك لـەم شـتانە روو دەدا، ئـەوە بـە قـەدەری خودایـە و، کـە هەوڵەکانیش نوشوستی دێنن،[1] ئەویش هەر بەقەدەری خودا دەبێت!

بۆیە لەهەستی ئوممەتی یەکەم، واجبێتی خۆدانـە دەسـت قـەدەری خـوا لەگـەڵ هەوڵی گۆڕانکاری بەهیوای گەیشتنە قەدەرێکی تازە لەلایـەن خـوداوە، دژ بەیـەك نەبون و تێکنەدەگیران، ئەمەش لەوشاکارانەبو کە ئەم ئوممەتەی لەسەر پەروەردە بو تاکو هاوسەنگی پێ راگرێ لە نێوان سلبیەتی خۆدانە دەسـت کـە ویسـت و ئـیرادە تێکدەشکێنێ لەگەڵ ئەو ئارەزوە سەرکێشەی[2] کە تەسلیم بون ناناسێ.

---

١ نوشوستی هێنان: اخفاق.

٢ سەرکێش: جامح.

ئەم هاوسەنگیە چۆن گۆڕا و بوە دانیشتن و وازهێنان لە گۆڕانکاری بەبانگەشەی خۆدانە دەست قەدەری خوا؟

* * *

بیروباوەڕی قەزا و قەدەر لە شێوە راست و دروستەکەی خاڵی هاوسەنگی هەرە مەزن و ناوازە دەنوێنێ لە هەستی مرۆڤی موسڵمان کە ژیانی خۆی بەپێی ئەم بیروباوەڕە بەڕێوە دەبا.

چونکە سەرەڕای ئەوەی کە حەقیقەتێکە بەخودی خودای پاك و بەرزەوە پەیوەستە لەگەڵ ناو و سیفەت و کردەوە پیرۆزەکانی، بەم پێیە لە بنچینەکانی بیروباوەڕیشەو، لەگەوهەری (لا إله إلاّ الله)یە، چونکە هەر تێڕوانینێك بەوەی کە شتێك خودا تەقدیری نەکردبێ لە مولکی خوادا رودەدا بێگومان هاوبەشپەرستیە..

سەرەڕای ئەمەش ئەم بیروباوەڕە داخوازیەکی زۆر مەزنی لە ژیانی بڕوادارەدا هەیە..

جا ئەمە خاڵی هاوسەنگیە لەنێوان ئاراستەی جیا جیا کە مرۆڤ ئەو کاتە دوچاریان دەبێ کە رەفتار و فیکر و تێڕوانینی بە بەرنامەی راستو دروستی پەروەردگاریەوە رێك ناخرێ..

هەستکردنی مرۆڤ بەمەزنێتی خودا و، دەسەڵات و زاڵێتی بەسەر هەموو شتێکدا و، بەڕێوەچونی هەموو مەسەلەیەك بەپێی خواستی وی هیچ سنورێکی نیە، ئەمەش رەنگە بەوە کۆتایی بێ کە مرۆڤ بگەیەنێتە سلبیەتێکی شەکەت کە هیچ کردەوەیەك نەکا و بەهیوای ئەنجامدانی هیچ شتێك نەبێ!

هەستکردنی مرۆڤیش بەخودی خۆی و، توانای کردەوە و هەڵسوکەوت کردن و دیتنی ئەو بەرهەمەی کە بیر و جەستەی بەرهەمی دێنێ، رەنگە بەوە کۆتایی بێ

کە مرۆڤ توشی خۆ بەخواکردن[1] و نکوڵی و لە سنور دەرچـــون بـێ، وەك سەرســام بونێك بەئیجابیەت و کاریگەریەکەی خۆی!

لەلایـەکی دیکـەوە هەسـتکردنی مـــرۆڤ بەمـــەزنێتی و زاڵێتـــی خـــودا و، بـەڕێوەچونی هـەمو شـتێك بەخواسـتی[2] وی، ڕەنگـە وا لـە مـرۆڤ بکـا، تێکـڕا هۆکارەکان لەبیربکا و، سوننەتە بەڕێوەچوەکانی پەروەردگاری بیر بچێتـەوە کـە لـە بونەوەر و لە ژیانی مرۆڤی دانـاوە وەك تـێڕوانینێك بـۆ ئـەو خواسـتەی کـە هیـچ سنورێکی نیە و هیچ شتێك کۆتی ناکا و نابێتە بەربەستی!

هەروەها هەستکردنی مرۆڤ بەڕێکوپێکی ئەو سوننەتانەی کـە گـەردونیان پـێ بەڕێوە دەچێ و ژیـــانی خەڵکیشـی پـێ بـەڕێوە دەچـی، ڕەنگـە وا لـەمرۆڤ بکـا لەکۆتایی تێکڕا قەدەری خوا یا لەبیر بکـا یـا پشـتگوێی بخـا. خـۆ هەڵواسـینیش بـەهۆکارەکان وەکـو کۆمەڵـە یاسـایەکی حـەتمی هـەردەبێ هۆکـار تێیـدا بگاتــە ئەنجامێك.

لەلای سێیەمیش، هەستکردنی مرۆڤ بەوەی کە هەمو کاروبـارێك بەخواسـتی خودا بەڕێوە دەچی جا چ کردەوەیەك بکا یان نا، وە بیـــەوێ یـا نەیـەوێ، ئەمـەش ڕەنگـە لـە کۆتـایی دا مـرۆڤ وا لێبکـا تێکـڕا واز لـە کردەوەکـان بـهێنێ، وەك بێهیواییەك لەوەی کردەوەکانی کاریگەریان بەسەر ڕەوتی ڕوداوەکـاندا هـەبێ، یـان وەك ڕژدی[3] کردنێك بەو هەوڵ و ماندوبونەی-کە بە خودی خۆی- ناگاتە ئەنجام!

هەروەك هەستکردنی مـرۆڤ بەکاریگـەری کردەوەکـانی سـەبارەت بـە ڕەوتـی ڕوداوەکان و، بەوەی کە ڕوداوەکان لەسەر بڕی کردەوە و جۆری کردەوەی ڕاوەستاوە، ڕەنگە بەوە کۆتابێ کە مرۆڤ بەکردەوەی خۆی سەرسـام بـێ و، واگومـان ببـا کـە

---

١ خۆبەخواکردن: تألیه. ٢ خواست: مشیئة. ٣ ڕژدی: ضن.

بەخۆی قەدەری خۆی دروستدەکا و، چۆنی بخوازێ ئاوای داڕژوا!

ئەگەر هیندۆکی و رەبەنایەتیش ببنە نمونەی جۆری یەکەم لە لارێبون کە بریتیە لە: سـلبیەت و، لـەبیرکردنی تێکـڕای هۆکارەکـان و، دەسـتهەلگرتن لـەکردەوە و بەرهەمهێنان، ئەوا جاهیلیەتی هاوچەرخ ناونیشـانێکی زەقـە بـۆ جـۆری دوەمـی لارێبون کە بریتیە لە: هەستکردنی قەبەکراوی[1] مرۆڤ بەخودی خۆی و، خەڵـەتانی بەهۆکارەکان و، سەرسام بونی بەکردەوەی خۆی و، خەیاڵکردنی ئەوەی کـە بـەخۆی قەدەری خۆی دروستدەکا.

*       *       *

ئەوروپا (وریابونەوە)[2]ی خۆی بەدژایەتی کلێسا و ئـاین دەسـتپێکرد، واتـە لـە حەقیقەتدا لە جاهیلیەتی مەسیحی کلێسای لارێکراو هاتـە دەرێ بـۆ جاهیلیـەتی هاوچەرخ کە لەدوایین سەدەدا گەیشتە لوتکە.

لە جاهیلیەتی سـەدەکانی ناوەڕاسـت، کـە لـە ئـەوروپا سـەدەی تـاریك بـون، (مرۆڤ) لەژێر چەندین فشاری[3] جۆراوجۆردا هـاڕدرابو[4]، لەوانـەش فشـاری کلێسـا بەستەمکاری روحی و فیکری و ماڵی و سیاسـی[5]، هـەروا فشـاری دەرەبـەگ، بـە ستەمی سیاسی و ئـابوری و کۆمەڵایـەتی لەگـەڵ نەزانیـەکی بـەربلاو و، لیخنی[6] تێروانینەکان و، بەرتەسکی ئاسۆکان و، هیچوپوچی ئەوشتانەی بایەخی پێدەدان..

---

١ قەبەکراو: مضخم.

٢ وریابونەوە: النهضة.

٣ فشـار: ضغط.

٤ هاڕدراو: مسحوق.

٥ ئەگـەر ویسـتت بگـەڕێوە بـۆ بەشـی (ئـاین و کلێسـا- الدیـن والکنیسـة) لـە کتێبـی (ڕێبـیرە هاوچەرخەکان- المذاهب الفکریة المعاصرة).

٦ لیخن: ضحل.

پاشان لەلایەکەوە ئەوروپا روی لە زانستەکانی موسڵمانان کرد و، لەلایەکی دیکەوە لە جەنگی خاچپەرستان ئاموشۆی کردن، بەم شێوەیە بارەکە گۆڕا و، (مرۆڤ) لەویَ وایلێهات هەست بەبونی خۆی بکا، بەڵام بە رێکوپێکی و سەقامگیری ئیسلام نا، چونکە زانست و بنچینەکانی ژیاری ماددیان لە موسڵمانان وەرگرت، بەڵام ئەوەیان رەتکردەوە کە ئیسلام وەرگرن.

ئەوجا یەکسەر لەو پەڕەوە بۆ ئەو پەڕ وەرگەڕان بەبێ ئەوەی لەخاڵی هاوسەنگی ناوەڕاست راوەستن.

بۆیە لە جاهیلیەتەکەی چاخەکانی ناوەڕاست چەند بونی مرۆڤ هاڕدرابو، هێندە لە جاهلیەتی هاوچەرخدا هەستی بەخودی خۆی دەکرد و بەقەد بێئاگایی لە هۆکارەکان بەشێوەیەکی گشتی، هێندە بەهۆکارەکان سەرسام بو.

هەروەها هێندەی هیچوپوچی کار و کردەوە و، هیچوپوچی کاریگەری ئەو کردەوانە لەواقیعی ژیاندا، بەکردەوەکان و، کاریگەریان لە ژیانی خەڵکیدا سەرسام بو.

ئەوجا ئەو پێشکەوتنە زانستی و ماددیە هاتە پێش کە لەگەڵ (وریابونەوە)دا لەدایکبو، کە ئەوروپا بنچینەکانی لە موسڵمانان وەرگرتبو، ئەوجا فوی لەو سەرسام بونە کارەساتە کرد و، لە جاهیلیەتی هاوچەرخدا وا بەخەیاڵ خەڵکی داهات کە زانست خوداوەندە و، زانست قەدەرە و، هەر زانست هەموشتێك دادەمەزرێنێ و هەمو شتێك رێکدەخا.

بابای ئەوروپی نەفامی هاوچەرخیش ئاینی بەهەمو ناوەڕۆك و فروسمانەکانیەوە[1] تێهەڵداوە و، لە هەستی وی خودا هیچ پەیوەندیەکی بەژیانی واقیعی سەر زەوی

---

١ فروسمان: ایحاء.

نەماوە، بەڵکو لە هەستی وی هەر بەخۆی-مرۆڤ- چۆنــی پێخۆشـبێ بەوشـێوەیە ژیان دادەرێژێ و، قەدەری خۆی بەخۆی دەنوسێ و، هەربەخۆی مێــژو و روداوەکــان دروستدەکا.[1]

جا لەپاڵ سەراسیمە بونی بەخۆی تــا ئــەو رادەیــە، لەهــەمان کــات بــەهۆکارە دیارەکانیش سەرسام بو، چونکە (زانست) پێی گوت کــە هــەندێك یاســای حــەتمی هەن، ئەو یاسایانە لە ئەوروپا بــە (یاســاکانی سروشــت) نــاو بــراون، چونکــە-کــە خواوەندی کلێسایان تێهەڵدابو- ئەوەیان رەتکردەوە کە سوننەتەکانی گەردون بدەنــە پاڵ خودا، بەڵکو دایانە پاڵ خواوەندێکی تازە کە نەکلێسای هەیە نە ئەرك،.ناویــان نا (سروشت) و وەدیهێنان و مشورگێڕیان[2] بۆ وی گەڕاندەوە.

مادام لەهەستی ئەوانیش یاســاکان حــەتمین، کەواتــە قــەدەر لــە تــێڕوانینی وان بواری نیە! جا قەدەر چ بکا کاتێك نەتوانێ ئــەو شــتانە بگــۆڕێ کــە بەشــێوەیەکی حەتمی رودەدەن؟!-لە بێئاگایی خۆشیان لەبیریان چــو کــە نــەگۆڕی و چەســپیوی سوننەتەکانی گەردون هەر بەخۆی قەدەری خوای وەدیهێنەرە، هەر لــەو رۆژەی کــە ئاسمانەکان و زەوی وەدیهێناوە!-هەر لەکاتی بێئاگاییــان- ئەوەشــیان لــە هەســتی خۆیان لادا کە خودا هەر کاتێکی بخوازێ بەویستی خۆی دەتوانــی ئــەو ســوننەتانە بگۆڕی، بۆیە لەلایــەك موعجــیزە و سەرئاســاکانیان رەتکــردەوە و، لەلایــەکی دی ئەوەشیان نەسەلماند کە بکرێ هەر کاتێکی خوا بخوازێ تێکڕای سیستەمی گــەردون بگۆڕێ!

---

١ رۆژێــك لــە رۆژان کتێبێکــی ئــەوروپایی بــەزمانی ئینگلیزی- دەرچــو، بــەناوی (مــرۆڤ خــۆی دروســتدەکا Man Makes Himseil) لەگــەڵ کتێبێکــی دیکــە بــەنێوی (مــرۆڤ بەتــەنێ رادەوەستێ Man Stands Alone) واتە بەبێ خودا!

٢ مشورگێڕی: تدبیر.

پاشان کە (زانست)یان فراوان بوو-یا بێئاگاییان فراوان بو- ئەوەیان بۆ ڕۆنبـوّوە کە ژیانی مرۆڤایەتی-بەڵکو دەرونی مرۆڤایەتی- لەژێر حوکمی کۆمەڵە یاسـایەکی حەتمین وەك ئەوانەی حوکمـی گـەردونی مـادی دەکـەن، ئـەو حەتمیـەش چـوە نـاو لێکدانـەوەی مـاددی بـۆ مێژو[1] و، لێکدانـەوەی جەسـتەیی بـۆ هەسـتەکان[2] و، لێکدانەوەی جنسی بۆ ڕەفتـاری مرۆڤ[3]و، گـەلێك تیـۆری کۆمەڵایـەتی و ئـابوری دیکە. هەموشی مرۆڤی دەخستە بەر ئەو حەتمیانـە.. بـەڵکو دەیخسـتە ژێـر زۆر و ستەمی بێسنوریان.

پاشان-لە غەزرینێکی جاهیلیانە- هەمو سـەردەمەکانی ڕێنوێنیـان لـە ژیـانی مرۆڤایەتیدا پشتگوێ خست، کە هەموی بەقەدەری خوا بو و، (حەتمی) نەبو بەهیچ یەکێك لەو لێکدانەوە جاهیلیانەی کە بەدور لە قەدەری خـوا هـەوڵی ڕاڤـەکردنی[4] ژیـان و مێـژو دەدەن، هـەروەك-بەقەسـتی[5]- هـەمو شـون و کاریگەریـەکی ئـەو سەردەمانەی ڕێنوێنیان لە ژیانی مرۆڤدا پشـتگوێ خسـت، بەتایبـەتی سـەردەمی ڕێنوێنی هەرە مەزن لە ئیسلامدا!

* * *

لەلایەکی دیکەوە-وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد- گەلێك جاهیلێتی دیکـە لـە مێژودا هەبون نموونەی لاڕێبونەکەی دیکە بون کە بریتی بون لـە: لاڕێبونـی سـلبی وێکهاتنەوە و گرمۆڵەبون[6]، لە چاوەڕوانی ئـەوەی (خواوەندەکـان) ئـەنجامی دەدەن و، ئەو قەدەرانەی بەسەر ژیانی تاك کۆمەڵانی دادەهێنن..

---

١ لای مارکسیەکان. ٢ لای ئەزمونگەران. ٣ لای فرۆید.

٤ ڕاڤەکردن: تفسیر. ٥ بەقەستی: عن عمد، عمداً، عن قصد.

٦ وێکهاتنەوە: انکماش. گرمۆڵە بون: تتوقع.

له بوذی و هیندۆکی و ڕەبەنایەتی چەندین ڕەنگ و جۆر لەو سلبیەتە و دانیشتن و بڕوانەبونی مرۆڤ بەوە بەدیدەکرێت کە خۆی هێزێکی کاریگەرە لەسەر زەوی، یا کردەوەکانی کاریگەریان لەژیاندا هەیە..

هەموی چاوی بڕیبوە فەنابونی مرۆڤ.. جا فەنابون بێ لە (بونەوەری هەرە مەزن) کە لە هەستی واندا مانای خوداوەندی دەگەیاند، یا جێگۆڕکێ و گواستنەوەی گیانەکان(تناسخ الارواح) بێ کە لە دواییدا دەگاتە فەنای هەرە گەورە لەوشتە هەرە مەزنەدا، یا فەنابونی جەستە بەخەفەکردن[1] و داپڵۆسینی[2] تا وەکو ڕۆح لەزیندانەکەی ئازاد بێ، یان فەنابونی سلبی لە ناو دێرێکدا.. یا هەرجۆرێك لە جۆرەکانی فەنابون! (هەولّی سۆفیەکانیش بۆ (فەنا) لەخودی خواوەندەوە تا (وجود)ی لیّ بێتەدی لەمە دورنیە!).

مۆرکی زۆربەگری[3] ئەو لاڕێبونانە هەموی بریتیە لە پەژارە و خەمۆکی و پەنگخواردن لەناو دەروندا، بەقەد ئەوەی مۆرکی زۆربەگری لاڕێبونەکەی دیکە بریتی بو لە ڕابواردنی شێتانە و، گەڕان بەدوای چێژەکانی هەست و، دورکەوتنەوە لە چاککردنی دەرون لەناوەوە و، بەرەڵابون بۆ دەرەوەی خود.

*  *  *

بیروباوەڕی قەزا و قەدەر بەوێنە ڕاستودروستەکەی لە ئیسلام، لەنێوان ئەو دو لایە پێچەوانەیە دێتەدی، بڕیاری زاڵبونی سەرتاپاگیری خودا دەدا بەسەر هەمو ئەوشتانەی لە گەردون و لە ژیانی مرۆڤدا ڕو دەدەن و، لەهەمانکات کاریگەریتی مرۆڤ ناسڕێتەوە و، کردەوە ناسڕێتەوە.و، وەرگرتنی هۆکارەکانیش ناسڕێتەوە.

---

١ خەفەکردن: کبت.    ٢ داپڵۆسین: قمع.    ٣ زۆربەگر: غالب

لەهاوسەنگیەکی تەواودا موسڵمان بڕوا دێنێ کە هەرچی لەگەردون و لە ژیـانی خۆیدا ڕوودەدا قەدەرێکی بڕیار دراوە لەلایـەن خـوداوە، پێشـئەوەی کـە بەڕاسـتی لەواقیعی مرۆڤدا روبدا:

﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي أَنْفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ: هـەر بەڵایـەك رودەدا لـەم سـەرزەمینە و هـەر بەڵایەك کە بەسەر خودی خۆتان دێ. بـەر لـەوەی وەدی بـهێنین، لـە دەفتـەرێکدا نوسراوە و ئەمە لای خودا هاسانە.﴾الحديد/٢٢.

لەهەمانکاتیشدا بڕوا بەوە دێنێ کە دەبێ کار بکـا و، هۆکارەکـان وەرگـرێ و، هەر قەدەرێکیش روبدا بەو هۆکارانـەوە پەیوەسـتە کـە وەریـاندەگرێ (یـا وازیـان لێدێنێ و وەریاننا گرێ)، لەگەڵ جۆری ئەو کردەوانەی ئەنجامیان دەدا:

﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ: گـەندەکاری ئـەم مەردمە لە وشکانی و دەریا خۆی نواند.﴾الروم/٤١.

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ: نیشـتەجێی ئـەو باژێڕانـە ئەگـەر خوایـان بناسـیبا و خۆپارێزبـان، دەروازەی بەرەکەتمان لە ئاسمان و زەمینەوە بەروویاندا دەکردەوە.﴾الأعراف/٩٦.

﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا: هەرکە ویستمان شارێك قڕکەین، دەوڵەمەندە خۆشـگوزەرانەکانی وان، دنە دەدەین بۆ بەدفەڕی و خراپکاری و لـە ئاکامـا ئازاریـان بـۆ واجـۆ دەبـێ ئەوساکە کاولی دەکەین و تێکی دەهاڕین.﴾الاسراء/١٦.

پاشان هەست بەبونی خودی خۆی دەکا و، کار دەکا و، هۆکارەکـان وەردەگـرێ، بەبێ ئەوەی کە بەخۆی یا بەکردەوەکـەی یـا بـەهۆکارەکان سەرسـام بـێ و توشـی

ئاشوب[1] بێ.

لەهەمان کاتیش بڕوا بەوە دێنێ کــە هــەر شــتێکی بەســەر دێ لــەلای خــواوە تەقدیر کــراوە و ئەمــەش وای لێناکــا دانیشــێ و واز لــە ئیجابیــەت و کــردەوە و وەرگرتنی هۆکارەکان بێنێ.

کاتێك ئەمە لە هەستی هەندێك خەڵکی دژیەك و بەپێچەوانە دەچێ، ئــەوە لــە هەستی بڕواداردا هاوسەنگیەکی جوان و ناوازە دروستدەکات کە یاریدەی دەدات بۆ گێڕانی ڕۆڵی جێنشــینی پێگەیشــتو لەســەر زەوی و، وای لێدەکــات لەســەر زەوی کردەوە ئەنجام بدا و دڵیشی روە و خودابێ لە ئاسمانێ.

چونکە ئەو وەك خواپەرستێ هۆکارەکان وەردەگــرێ و، لــە ســوننەتە بــەرپاکانی خوداوە پێگە دەگرێ و، لەهــەمانکات هەســتدەکا ئــەو ئەنجامــەی پێــی گەیشــتوە قەدەرێکە خوای مەزن بڕیاری داوە، نەك بەروبومی ئــەو هۆکارانــەی وەریگرتبــون، خودی هۆکارەکانیش نابنە هۆی حەتمی بــۆ گەیشــتنە ئــەنجام، بــەڵکو هۆکارەکــان بەقەدەری خودا دەبنە هۆی گەیشتنە ئەنجام و، ئەگەر وا بخوازێ کە هۆکــار نەگاتــە ئەنجام، لەم بارەدا هەر ویستی خوایە دێتە دی نەك حەتمیەتی هۆیەکان!

ئا ئەمەش جیاوازیە بنەڕەتی و ڕەسەنەکەی نێوان موســڵمان و هــەردوو لایەنــە جاهیلیەکەی ترە کە یەکەمیان دەبێتە هۆی واز لــەکار هێنــان و هەســت بەبــەهای بونی مرۆڤانەی خۆی ناکا. هی دووەمیش کار دەکا و سەرسامی بە هۆکارەکانــەوە و، لەهەستیدا وەکو پەروەردگاریان لێهاتوە!

موسڵمانی بەراستی بڕوای بەقەدەری خوا لە بڕوای هیچ کەســێکی دیکــەی ئــەم بونە کەمتر نیە، بەڵام لەمەزنێتی ڕۆڵی خۆشــی لــەم زەویــە بێئاگــا نیــە، چونکــە

---

[1] ئاشوب: فیتنە.

قەدەری خوا وای خواستوە کە مرۆڤ بکاتە جێنشین لەسەر زەوی و، سەرجەم ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویش هەیە بۆی رام و کەوی بکات و، رێز و پایەی پتر لە زۆربەی وەدیهێنراوان بداتێ و، بیکاتە پەردەی قەدەری خۆی لەزەویدا.

لەلایەکی دیکەوەش، لە هیچ کەس کەمتر هۆکارەکان وەرناگرێ و، لە توندترین ئەو کەسانەی کە هۆکارەکانیش وەردەگرن کەمتر هەست بەیاسای هۆ و ئەنجام ناکا، بەڵام لە هەستی ئەمدا هۆکارەکان حەتمی نین و، یەکجاری نین، ئەگەر قەدەرێك لەلایەن خوا و بڕیاری لەسەرنەدا.

جاهیلی ئەوروپایی هاوچەرخیش زۆر بەسادە و ساویلکەیی لە عەقلیەتی ئیسلامی دەڕوانێ و دەڵێ عەقلیەتێکی غەیبیە و بڕوای بەیاسای هۆیەکان نیە، بەو قسەیەشی نەزانی خۆی لەمەسەلەیەك دەردەخا کە هەستی تەسکی ناتوانێ بیگرێتە خۆ، عەقلیەتی ئیسلامی-راستەقینە- غەیبیە، بەڵێ چونکە بڕوای بەغەیب هەیە و، بڕوای بەقەدەری خودا هەیە، بەڵام لەهەمانکات عەقلیەتێکی زانستی پتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی کە بەرنامەی ئەزمونگەری (المنهج التجريبي) لە لێکۆڵینەوەی زانستی دۆزیتەوە و، پێشکەش ئەوروپای کردوە و، بەرنامەیەکیشە سەر لەبەری لەسەر تێبینی و تاقیکردنەوە و پەیوەندی هۆ بە ئەنجامەوە راوەستاوە! بەڵام-لەوکاتەی مامەڵە لەگەڵ سوننەتە بەرپاکانی خودادا دەکات- دڵی لە ئاست خواستی رەهای خودا داناخات کە هەرگیز هیچ کۆتێك سنوری بۆ دانانێ[1].

---

١ لەسەیر و سەمەرەکانی جاهیلیەتی هاوچەرخ کە ناتوانێ یا وا بانگەشە دەکا کە ناتوانێ لە بیروباوەڕی قەزا و قەدەر بەشێوە راستەکەی لەلای موسڵمانان تێبگات، ئەو هەر بەخۆی کەوتۆتە نێو دوبەرەکی لەنێوان بڕوای بەکاریگەری و نیجابیەتی مرۆڤ و، بڕوای ئەو شتە حەتمیانەی کە هیچ بون و ویستێکی راستەقینە بۆ مرۆڤ ناهێڵن، جا یا ئەوەتا عەقڵی بەو دوبەرەکیە داناشکێ یا هیچ بەربەستێك لەبونیدا نابینێ! لەکاتێك کە ئەم جاهیلیەتە ئاماژە بەبونی دوبەرەکی و پێچەوانەیی

ئەو شتەی کە ئەم عەقلیەتە زانستیە-لەهەمان کات- غەیبیەی جوێدەکاتــەوە، ئەوەیە کە غافڵگیر نابێ گەر بینی کە هۆکارە دیارەکان ئەنجامەکــە لێکنادەنــەوە، چونکە دەزانێ ئەوە بەقەدەرێکی خودا رویداوە و، ئــەوەی بەســەر هیتلــەر داهــات بەسەر ئەودا نایێ، کاتێك ئەو هۆکارانەی دەستەبەر کرد کە لەتوانای مرۆڤــدا بــو، بەڵام کە نائومێد بو خۆی کوشت و، ئەو ئەنجامەی پێ قبوڵنەکرا کە خودا لەپشــت هەمو هۆکارەکان تەقدیری کردبو!

* * *

ئەم باوەڕە ناوازەیە کە لەژیانی نەوەکانی یەکەمی ئــەم ئوممەتــە دامــەزرا و زۆر دەسکەوتی موعجیزە ئاسای دامەزراند.. لــەماوەی چــەند ســەدەیەك چــی بەســەر هات، وا کەوتە هەمان ئەو لێژییەی کە بوذی و هیندۆکی و رەبەنایەتی تێکەوتبو؟

چۆن گەیشتە تەمبەڵی و دانیشــتن و خۆدزینــەوە لەبەرپرسـیارێتی و پشــت لــە گۆڕانکاری کردن، کە لە کۆتایی دوچاری ئەو لاوازیە هزری و زانستی و ماددیــە و، ئەم دواکەوتنە ژیاریە بو، کە هێزەکانی خراپەی لەهەمو لایەکەوە بۆ خۆی راکێشــا تاوەکو هەوڵی لە بێخەوە هەڵکێشانی رەگەکانی ئیسلام بدەن لــەزەویدا و واقیعــی خراپی موسڵمانان بخەنە رو بۆ ئــەوەی خــەڵك لــەخودی ئیســلام دورخەنــەوە، بــەو بیانوەی گوایە ئەمە واقیعی ئیسلامە!

شێوەی بیروباوەڕ هەروەك گوتمان نەگۆڕابو.. بەڵام بێگومان کــرۆك و گەوهــەری گۆڕانکاریەکی گەورەی بەسەردا هاتبو.

---

دەکا نە بیروباوەڕی موسڵماندا! مەسەلەکەش لەحەقیقەتدا لە هەستی موسڵمان هاوســەنگیەکی پــڕ حەسانەوە و سرەوتە، وایلێدەکا هەرچی بوێ لەزەویدا دایبهێنێ و لە قەدەری خوداش نارخەیان بێ.

ئەوەی بەسەر هاتبو کە بەسەر (لا إله إلاّ الله) و پەرستنەکانی دیکەدا هـاتبو.. لەناوەڕۆکی ڕاستەقینەی بەتاڵکرابو و ببوە وێنەیەکی بێ مایە[1].

لەو میانەیەشدا بیروباوەڕی قەزا و قەدەر بوە جێباسـی کـەلامیی-کـە تـاخم و گروپـەکان لـەبارەی نـاکۆك بـون- و، وەك بەرنامەیـەکی پـەروەردەی ئیسـلامی نەمایەوە! بەڵکو بو بە کۆمەڵـە دۆزێکـی فەلسـەفی کـە زەیـن مـاندو دەبـێ بـۆ دۆزینەوەی شیکارەکانیان، ئوممەتیش پەروەردە نەدەکرا و کەسیش ئاوڕی لە بـەهای پەروەردەیی مەزنی بیروباوەڕی قەزا و قـەدەر لـە شـێوازە ئیسـلامیە دروسـتەکەی نەدەدایەوە! بەهەمان شێوەی کە بیروباوەڕی یەکتاپەرستی پێ بوە جێباسی کەلامی زەینی روت و سارد و سڕ، کـە نـەویژدانی ئـاینی دەبزوانـد و، نـە دەبـوە مایـەی رەفتارێکی کرداری و، سەرەڕای ئەمەش شتی جێگومانی لەدڵاندا دەچـاند پـتر لـە جێگیرکردنی بڕواو! خـەڵکیش ئـەوەیان وەك (بیروبـاوەڕ) وەردەگـرت. بەمشـێوەیە توێژەران[2] لە واقیعی زیندوی خەڵك و، لە داخوازیەکانی بانگـەواز و داخوازیـەکانی پەروەردە دادەبڕان و (کەلام) هەر چۆن بسوڕابا ئەوانیش ئاوا دەسوڕان!

دوای ئەوە قۆناغێك بەسەر (موسڵمانە هاوچەرخەکان) دادێ کە لـە بیروبـاوەڕی قەزا و قەدەر دادەشۆرێن هەروەك سەروەرانی ئەوروپاشیان پێشتر لێی داشـۆرابون و دەڵێن: دەمانەوێ واز لە عەقلیەتی غەیبی بێنین کە هۆی دواکەوتنمان بو و، دەبـێ عەقلیەتێکی زانستی پێشکەوتنخوازمان هەبێ! قەزا و قـەدەریش بونـی نیـە لـەو شوێنانە نەبێ کە بێ سەروبەری و نەفامی و داکەوتن[3] و دواکەوتنیان تێدایە، بەڵام لەهەر شوێنێکی کە سیستەم و زانست و پێشـکەوتن و نەخشەکێشـانی زانسـتی و

---

١ مایە: رصید.　　٢ توێژەر: دارس، باحث.　　٣ داکەوتن: انحطاط.

مێشکە ئەلکترۆنیەکان هەبن قەدەر بۆی نیە تێکەڵ بێ و، هەمو شتێك هەزار حیسابی بۆ کراوە؟!

ئەوانە بێئاگا دەبن لەمانای ئەو فەرموودەی خودای بەرز: **﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ**: جا وەختێ ئەو هەمو ئامۆژگاریانەیان کە کرابون لەبیر چوەوە، هەمو دەرگاکانی بەختەوەریمان بۆ کردنەوە هەتا کەوتنە خۆشی و شادی. **ئەوسا لەپڕ و نەکاوێك بەر توڕەیی خۆمان خستن و هەمو ناهومێد مانەوە.﴾** الأنعام ٤٤.

بەڵکو ئەوەش بێئاگا دەبن کە لەدیتنی بەرهەستەوە نزیکە لەو غەیبەی کە هێندەی نەماوە بێتە دی. بێئاگا دەبن لەو نەخۆشیانەی کە لە هیکرا دوچاری ئەو حیسابکار و نەخشەکێشانە دەبێتەوە کە وادەزانن بەحیسابەکانی خۆیان دەروازەی هەمو بوارێکیان لەقەدەری خوا داخستوە نەوەك تێکەڵ بەواقیعی کاروباریان بێ! نەخۆشیش لەهەمو جۆرێك: دەرونی و دەماری و عەقڵی و جەستەیی و ئاکاری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری.. ئەمانە هەموی لەحیسابباندا نەبون؟

وە ئایا نەخۆشیەکانی هەستەوەری[1] لەحیسابباندا بو؟

ئەدی نەخۆشی ئایدز لە حیسابباندا بو؟

ئەدی تاوانکاری هەرزەکاران لەحیسابباندا بو؟

وە ئایا بڵاوبونەوەی ریزپەڕی و سرکەرەکان[2] لە رۆژئاوا و ئەمەریکا لەحیسابباندا بو؟

---

١ هەستەوەری: حساسية. ٢ ریزپەڕی: شذوذ. سڕکەر: مخدر.

جا ئەمانە و هیدیکەش- نیشانەن بۆ غەیبێك کە هێندەی نـەماوە بەقـەدەری خوا وەدیبێ:

﴿حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ، فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَـوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: هەتا کەوتنە خۆشی و شادی، ئەوسا لـەپڕ و نەکاوێك بەر تووڕەیی خۆمان خستن و هەمو ناهومێد مانــەوە. ئیـتر ئەوسـا ئـەو کەسانەی پیشەیان هەر ناهەقی بو دوابڕاو بون و سپاس بۆ خوای راهێنــەری هـەمو دنیا..﴾الأنعام/٤٤-٤٥.

*   *   *

موسڵمانانیش ئەمڕۆ پێویستیان بەراستکردنەوەی چەمکی قەزا و قــەدەر هەیـە کەبەدرێژایی چەند سەدەیەك لەهەستیاندا لاسەنگ بوە، چونکە قــەزا و قـەدەر نـە ئەو سـلبیەتەیە کـە ئـەو سـەدانەی دوایـی داگرتبـو، ئـەو سەرسـام بونـەش نیـە بەهۆکارەکان کە هێندەی نەماوە جیهانی ئیسـلامی دابگـرێ لەگـەڵ ئـەو هێرشـە هزریەی لەجاهیلیێتی رۆژئاواوە دێ..

موسڵمانان پێویستیان بەگێڕانەوەی ئـەو هاوسـەنگیە ناوازەیـە هەیـە کـە ئـەو بیروباوەڕە لە شێوە راستەقینەکەی لەژیانی مرۆڤدا رایدەنواند و، پێویستیان بەوەیە کـە واز لـە لێکۆڵینـەوەی بێنـن بـەو شـێوەیەی راڕەوە کەلامیـەکان مێشـکی فـێرخوازانی شـەریعەت و توێژینـەوە ئیسـلامیەکانیان پێدەئـاخنن، تـاکو-وەکـو هەموشتێکی دیکە لەم ئاینەدا- ببێتە بەشێك لە بەرنامەی پەروەردەی ئیسـلامی، کە ئامانجەکەی بریتیە لەدەرخستنی (مرۆڤی چـاك) کـە بەرنامــەی پــەروەردگاریی لەواقیعی زەویدا وەدیدێنێ و، خودا بەوی قەدەری خۆی جێبەجێ دەکا:

﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا: هەر خودایە کە پێغەمبەری خۆی نارد و ڕێنوێنی و دینی ڕاستیشی ڕەگەڵ خست. **تا بەسەر هەمو دینێکا زاڵی بکا**، خواش بۆ ئاگاڵێبون بەسە.﴾الفتح/٢٨.

# چەمکی دنیا و ئاخیرەت

لەهەستی موسڵمانانی نــەوەکانی یەکــەم ئــەو جیاوازیــە زۆرە لــەنێوان دنیــا و ئاخیرەتدا نەبو کەنەوەکانی دوایین هەستیان پێکرد.

لە هەســتی پێشــینان کۆمەڵــە کردەوەیــەك نــەبون کــە تایبــەت بــن بــەدنیا و لەئاخیرەت دابڕابــن، کۆمەڵــە کردەوەیــەکیش تایبــەت بــن بــەئاخیرەت و لــەدونیا دابڕابن.

راستە کردەوەی وا هەن -هەر بەسروشت- مۆرکی روحییان بەسەردا زاڵــە، وەك نوێژ و نــزا و یــادەوەری و، دروشمــەکانی پەرســتن بەگشــتی و، هــەندێك کــردەوەی دیکــەش هــەن کــە مۆرکــی فیکریــان بەســەردا زاڵــە، وەك زانســتخوازی و تێــدا قوڵبونەوەی و، مشورگێڕی کاروبارەکانی ژیــان لــە سیاســەت و ئــابوری و شــەڕ و ئاشتی..تاد، کــردەوەش هــەن مۆرکــی هەســتیان بەســەردا زاڵــە، وەك خــواردن و خواردنەوە و پۆشاك و نشینگە و سێکس(جنس).. تاد.. بــەڵام ئەمــە لەلایەکــەوە کردەوەکان لە یەکتر جیاناکاتەوە، چونکە هەمو لە قەوارەیەکی مرۆڤانەی یــەکگرتو دەردەچن و، لەلایەکی دیکەشەوە هەندێکیان والێناکا بەپاڵفتەیی بۆ ئاخیرەت بن و لەدنیا بترازێن و، هەندێکیشیان بەپاڵفتەیی بۆ دنیا بێ و لە ئاخیرەت بترازێ.

چــەمکی راستودروســتی پەرســتن حوکمــی ژیــانی ئــەوانی دەکــرد و، حوکمــی تێروانینی دەکردن:

﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَـــهُ: بلّێ: من نوێژکـردنم و پێکـهێنانی ڕێوشـوێنی حـەج کـردنم و ژیـن و مـەرگم، بـۆ خودایە، کە هەرخۆی پەروەردگاری جیهانە، هیچ شەریکی نیە.﴾الأنعـــام/١٦٢-١٦٣.

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُـدُونِ: مـن هـەر بۆیـە جندۆکـە و مرۆڤـم وەدیهێنا، هەتاکو بمپەرستن.﴾الذاریات/٥٦.

لەم چەمکەدا ناکرێ دروشمەکانی پەرستن لەکردەوە جیا بکرێنـەوە یـا دنیـا لـە ئاخیرەت، بۆیە لە هەستی ئەواندا ژیان زنجیرەیەکی بەیەکتر پەیوەست بو بەشـەکانی دیکەی لێك دانەدەبڕان، لەو هەسـتەدا نوێـژ و نوسـك و، خـواردن و خواردنـەوە و سێکس و، جەنگین لە پێناو خودا داو، کۆشش بەدوای بژێویـدا و، زانسـتخوازی و، ئاوەدانکردنەوەی زەوی.. هەموی پەرستنن و، هەموی لەیەك کاتدا بـۆ دنیـا و بـۆ ئاخیرەتە، هەمو ئەو ساتانەی لە شەو و ڕۆژێکدا مرۆڤ تیایاندا هۆشـیارە و، هـەر کردەوەیەکی کـە ئـەنجامی دەدا و، -بـۆ خـودا دایبـەزاندوە- ئـەوە جۆرێکـە لـە جۆرەکانی پەرستن و، هەندێکیان بـەوانی دیکـەوە پەیوەسـتن و، بەبـەردەوامی لـە پەرستنێکەوە بۆ پەرستنێکی تر دەچێ، وەك وەدیهێنانی مەبەست لەبونی مـرۆڤ، کە هەمو بونەکەی بریتیە لە ڕوکردنە خوا.

ئەگەر دروشمەکانی پەرستن لە نوێژ و زەکات و ڕۆژی و حەج مۆرکێکـی ڕۆحیـان بەسەردا زاڵبێ، مانای وانیە تەنیا ئەمانە پەرستنن، ئەوەش ناگەیەنێ کە تەنیا بـۆ ئاخیرەتن و لەدنیا دابڕاون، چونکە هەریەکەیان داخوازیەکی هەیە دەبـێ لـە ژیـانی دنیادا وەدیبێنێ. نوێژ ڕێ لە فاحیشە و خراپەکاری دەگرێ و، زەکات دەرون و مـاڵ

پـاك دەكاتـەوە و، رۆژی راهێنانـە بـۆ پارێزكـاری و، حـەجیش بانگـەوازە بـۆ چاكەكاری.. بەمشێوەیە هەمویان لەیەككاتدا بۆ دنیا و بۆ ئاخیرەت دەبن.

ئەگەر كردەوەكانی دیكەش كە مرۆڤ لـە ژیـانی خۆیـدا ئـەنجامی دەدا خـاوەن مۆركێكی عەقڵی و هەستی زاڵ بن، ئەمە مانای وا نیە كە لە چوارچێوەی پەرستن دەرچون بەواتە فراوان و گشتگیرەكەی، مادام ئاراسـتەكەی بـۆ خودایـە و، پابـەند بونی تێدایە بەفەرمانـەكانی خـوا و، پاشـان بەتـەنیا بـۆ دنیـانین كـە لـەئاخیرەت دابڕابن.

لەسـەرجەم ژیانی مرۆڤ و، سەرجەم چالاكیەكانی لەسەر زەوی، پەرسـتن كـامڵ دەبێ كاتێك كە بەمەبەستی بونی وەدیدێنی و، بەبێ لێكدابڕان هەسـتی بـەدونیا و بەئاخیرەت دەگاتەوە یەك[1].

مەسەلەكان لە هەستی نەوەكانی یەكەمی موسڵمانان بەمجۆرە بون.

ئەوەی هەمو ژیانیانی پێكەوە دەبەستا و، نێوانی خۆشـدەكردن و، ئاراسـتەكەی یەكانگیر دەكردن، بریتی بو لە (لا إله إلاّ الله)، بەچەمكە هەرە مەزن و قوڵەكەی.

كاتێك (لا إله إلاّ الله) بریتی بێ لەو باوەڕە یەقینیـە بـە وەحدانیـەتی خـودای بەرز و. پاشان ئەو پابەند بونە راستەقینەبێ بەو بەرنامـەی ژیانـە گشـتگیرەی كـە لەلای خواوە دابەزیوە تاكو رێڕەوی مرۆڤ لە ژیانی دنیادا راسـتكاتەوە تـاكو پێـی بگاتە ئارامگەی خۆی لەئاخیرەتدا.. جا ئەو كاتە مەسەلە و فەرمانەكانی دیكـەی ئەم ئاینە لێكدی جودا نابنەوە، بەشەكانی ئەم پەیڕەو و بەرنامەیەش لەیەكتر جـودا نابنەوە![2]

---

١ بگەڕێوە (چەمكی پەرستن). ٢ بگەڕێوە بۆ (چەمكی لا اله الا الله).

کاتێك جاهیلیەت گەلە بتێکی کردبونە خواوەنـد و دەیپەرسـتن لەگـەڵ ئـەوەی بەزمانی خۆشیان دەیانگوت کە خودا پەروەردگاری پەروەردگارانە و، ئەوانیش بۆیە خواوەندەکانی دیکە دەپەرستن تاکو لەخودا نێزیکیان بکاتەوە! ژیانیان پەرتەوازە بو و کۆنەددبۆوە.

ئەوان بڕوایان بەئاخیرەت نەبو، بۆیە لە هەستی ئـەواندا هیـچ پەیوەندیـەك لـە نێوان دنیا و ئاخیرەتدا نەبو.

پـــەروەردگارە پەرســـتراوەکان زۆر بـــون، بۆیـــە پەرســـتنەکانیش جیاجیـــا و دابەشکراوبون.

دەمێك بتەکان دەپەرستران و ساتێك هۆز دەپەرسترا و، تاوێك دابـی بابوباپـیران دەپەرسـتران و، ماوەیـەك حـەز و ئارەزوەکـان دەپەرسـتران یـان هـەمو پێکـــەوە دەپەرســتران بەبێئــەوەی پــەیوەندی و پێکــەوە بەســترانێکیان لەهەســتاندا هــەبێ، سەعات بە سەعات ژیـــانی خۆیـــان دەژیـــان بێئـــەوەی ئامـــانجێکی راســـتەقینە یـــا مەبەستێکیان هەبێ:

﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلاَّ الدَّهْـــرُ: هـەروا گوتیان بێجگە لە ژینی دنیامان چیتر نیە، هەر دەمرین و دەژینەوە و هەر سروشـت دەمان مرێنێ.﴾الجاثية/٢٤.

مادام بەجۆرەش دەژیـــان ئـــەوا بـــەپێی ئـارەزوی ئـەو سـاتەی تێدابـون دەژیـان بێئەوەی حیساب بۆ شتی دیکە بکەن: (ئەمڕۆ شەرابە و سبەی فەرمانە)!!

پاشان پەرتەوازەیی مۆرك و سیمای ئەو جاهیلیەتە بو وەك هەمو جاهیلیەتێکی دیکە لە مێژودا، ئەگەرچی بە درێژایی مێژو و ئاست و دیاردەکانی پەرتەوازەیی لە

جاهیلیەتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازیش بون![1]

پاشان ئەو جاهیلیەتە بڕوای بە (لا إلـه إلاّ الله) هێنـا و بـووە وەدیـهێنراوێکی دیکە.. پارچە پەرتەوازەکانی لەیەکەیەکی گشتگردا کۆ دەکردەوە.

هۆزە دوژمنەکان لەگەڵ یەکتر کۆبونەوە تاکو بۆیەکـەمجار لـە مێـژوی خۆیـاندا (ئوممەت) پێك بێنن، چونکە هەر خـوا دەزانـێ چـەندیان بەسـەردا تێپـەڕیبو، کـە نەیاندەتوانی ئەم یەکبونە بسازێنن چونکە رەگەزی کۆکردنەوەیان تێدا نەبو!

هەروەها رەگەز و زمان و رۆشنبیری جیـاواز کۆبونـەوە و هـەموی لەکەموڵـەی یەك ئوممەتدا تاوانەوە، بەشێوەیەکی وا نە پێشتر نە پاشتر لەمێژودا نەبوە!

(نەفس)یش لەیەك یەکەی تاك ئاراستەدا کۆبوە.

نەفس بەو شێوەیە نەما کە لەساتی جەستەدا بەئاراستەیەك و، لەساتی عـەقڵدا بەئاراستەیەك، لەساتی رۆحیش بەئاراستەیەکی دیکەدا بڕوا.

مرۆڤ کە خودا وەدیهێناوە یەکەیەکی یەکانگیری و هەر لایەنێکی ئەوی دیکـە تـەواو دەکـات، لایـەنێکی تێـدا لەلایـەنێك جـودا نابێتـەوە و، بەپەرتـەوازەییش مومارەسەی ژیان ناکا! ئەو کات یەکانگیربونە سروشتیەکەی خـۆی لەدەسـتدا کـە خواوەندی لێك جودا بون و پەرستنی لێك جودا بۆوە. کە پەرستراویش بوە یـەك و، پەرستن بوە یەك و، پارچە پەرتەوازەکان یەکیانگرت و، خودا چۆنی وەدیـهێنابو بـۆ ئەو دۆخە گەڕایەوە و، بوەوە بەو یەکە گشتگیرەی کە (مرۆڤ)ی لێ پێك دێ.

رەفتاری مرۆڤیش لەسەر یەك بەرنامە بوە یەك..

---

[1] حیبیەتی هاوچەرخ لە هەمو جاهیلیەتەکان توندتـر یەکـەی مـرۆڤ و ئاراسـتەکانی ژیـانی لێـك ترازاندوە و دابڕی کردون. جا ئەمە خۆکوشتن و شێتبون و دڵەڕاوکێ و نەخۆشیەکانی دەرون و دەمار و هەستکردن بەوێڵی و سەرگەردانی تێدا زیادکردوە.

مرۆڤ چیدی نەیگوت: ئەمرۆ شەراب و سبەی فەرمان. بۆ جیاوازی لە نێوان ئەمرۆ و سبەیدا چیە؟ ئایا ئەمرۆ بۆ خواوەندێکە و سبەی بۆ خواوەندێك؟ یا هەر یەك خواوەندە ئەمرۆ و سبەینێ و سەرتاپای ژیان هەر بۆ ئەوە؟!

ئەوجا هەمو جۆرە جیاوازەکانی چالاکی کۆبونەوە هەتا یەك بەرنامە رێکیان بخا، ئەو بەرنامەیەش لەلای خودای تەنیا وەرگیراوە و، ئاراستەی ئەویش دەکرێ.

ژیانی موسڵمان هەموی: خواردن و خواردنەوەی و، کێشان و پێوانی و، فرۆشتن و کڕین و، نوێژ و کردەوەی و، شەڕ و ئاشتی.. کەوتنە بەر حوکمی یەك دەستور کە بریتی بو لە شەریعەتی خوا، حەرامەکەی ئەوەبو کە خوا حەرامی کردبو، حەڵاڵەکەشی ئەوەبو کە خوا حەڵاڵی کردبو و موباحەکەی ئەوە بوو کە خوا موباحی کردبو، موستەحەب لەلای بوە ئەوەی خوا خۆشی دەویست و، مەکروهی لەلابوە ئەوەی خوا رقی لێبو، ئەوجا پاشان ئاڕاستەکە بوە یەك ئاراستە هەر چەند مەسەلەکان لێك جیاواز بان و، هەر چەند موفرەداتەکانی جودابان یەك مۆرکی وەرگرت کە:

مۆرکی پابەندبونە بەوەی لەلای خوداوە هاتوە و، ئەمەش بوە سیمای گشتی ئەو (مرۆڤ)ە.

جا-بەپێی هەمو ئەمانە- رێگەی دنیا و رێگەی ئاخیرەت بو بەیەك..

چۆن ببنە دو رێگەی جیاواز؟

ئایا ئەمەیان بۆ خواوەندێکە و ئەویدیکە بۆ خواوەندێکی تر؟

ئایا ئە و خواوەندەی ژیانی دنیا بەشەریعەتی خۆی حوکم دەکا، جودایە لەو خواوەندەی کە لە رۆژی دوایی موحاسەبەی خەڵك دەکا و سزا و پاداشیان دەداتێ؟

ئایا لەسەر چ بنچینەیەك موحاسەبەیان دەکا و پاداش و سزایان پێدەدا؟

ئایا تەرازوی ژیانی ئاخیرەت جیاوازە لە تەرازوی ژیانی دنیا؟ ئایا دەبێ کردەوەك لە تەرازوی دنیادا جوان بێ و لەتەرازوی ئاخیرەتدا ناشیرین؟ یان لەتەرازو دنیا ناشرین بێ و لەتەرازوی ئاخیرەتدا جوان بێ؟

ئایا هەمان تەرازو و هەمان پێوەر نیە: ئەوەی لە دنیا چاك بێ ئەوا لە ئاخیرەتیش پاداشی چاکەیە و، ئەوەی خراپیش بێ لە دنیا سزاکەی ئەشکەنجەیە لە ئاخیرەت؟

﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ وَلاَ يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلاَ ذِلَّةٌ أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ، وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ مَا لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: بۆ ئەوانەی چاکە دەکەن چاکەی دەکەین و زیاتریش، تۆزی رەش و سوکایەتی نانیشێتە سەر روخسارییان. ئەوانە بەهەشتیەکانن تا هەتایە تیا دەبن.. ئەو کەسانەش کاری خراپیان کردوە، سزایان خراپەیەکی وەکو ئەوە و سوکایەتیش سەرباریانە و کەس لە خوایان ناپارێزێ.. ئیتر رویان چەند بەتلێك لە تاریکەشەو داپۆشیون، ئەمانە یاری ئاگرن تا هەتایە تیا دەبن.﴾یونس/٢٦-٢٧.

﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَه: سا هەرکەسێ بە سەنگایی مێرولەی هەرە وەردیلە، چاکەی هەبوبێ دەیبینێ، هەرکەسێکیش بە قورسایی مێرولەی هەرەوردیلە خراپەی بوبێ دەیبینێ.﴾الزلزلة/٧-٨.

﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ، وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ

يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُـــهِينٌ: ئـەم دەسـتورانە سـنورن خـوا دانـاوە هەركەسێكی بەرفەرمانی خـودا و پێغەمبەرەكـەی بـێ، دەينێرێتـە نـاو باغـاتێك جۆباريـــان بەبـــەردا دەڕوا و هـــەتا ســـەر هـــەر تيـــادەبن و لەوپـــەڕی بەختەوەريدان. ﴾النساء/١٣-١٤.

﴿أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُـوا الأَلْبَاب، الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَلاَ يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ، وَالَّذِينَ يَصِلُونَ مَا أَمَـــرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوءَ الْحِسَاب، وَالَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلاَنِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَـنَةِ السَّيِّئَةَ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ، جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَنْ صَلَحَ مِـــنْ آبَائِـــهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَالْمَلاَئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَاب، سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ بِمَـــا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ، وَالَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَـــا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ أُوْلَئِكَ لَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الـــدَّارِ: ئاخۆ كەسێ بڕوای وابێ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تـــۆ هاتۆتـە خـوارەوە هـەمو راستە، وەك ئەوەيە كە لەم بارە كوت و كوێرە؟ ئەم رامانە هەر بۆ خاوەن ئاوەزانـە. ئەو كەسانەی پەيمانی خوا پێك دێنن و تازە لێی پاشگەز نابنــەوە. ئـەو كەسـانەش كە هەودای نێوانی خۆيان دەگەڵ خودا، وەك خودا فەرمانی داوە، قوت ناكەن و لـە پەروەردگاريان دەترسن و لە حيساب كێشانی دژوار نيگەرانن. ئەو كەســانەش كـە لە راهی رەزای خودا خۆيان گرت و بەنهێنی و بە ئاشكرا لەو بەشەی ئێمــە پێمـان دان خێر دەكەن و بە چاكە خراپەكانيان دەشۆنەوە، دوارۆژی خۆش بۆ ئەوانە. خۆيان و باوانيان و ژنەكان و تۆرەمەشيان ئەوانــەی خـودا پەسـندين لـە باغـاتی دور لـە نەمان دەچنە ژوور و فرشتە لە هەمو لاوە دەچنە لايان. هەر لە سای هێمنيدا بــن.

چونکه ئێوه خۆڕاگر بون، پیرۆزتان بێ دوارۆژی رون. ئەو کەسانە کە پەیمانیان دا بە خودا و لە پاشان پاشگەز بونەوە و هەودای نێوان خۆ و خودای خۆیان پساند کە خۆی فەرمانی پێدابون نەیپسێنن و لە زەویدا بەدفەڕی دەکەن. لە بەهرەی خودا بێبەشن و دوارۆژی دژواریان هەیە.﴾الرعد١٩-٢٩.

بەڵێ! جا چۆن دنیا لە ئاخیرەت جیا دەبێتەوە و، دەبنە دورێگای لێك جودا؟!

نەخێر! هەر یەك رێگایە، سەرەتاکەی لەدنیایە و کۆتاییەکەی لە ئاخیرەتە.. رێگایەکە دولای هەیە، بەڵام ئاراستەکەی یەکگرتوە و روەو ئاخیرەتە..

لایەکی چاکەکاران دەیگرن و دەیانگەیەنێتە بەهەشت، لایەکەی دیکەش خراپەکاران دەیگرن و بەرەو ئەشکەنجەیان دەبا بەڵام رێگەکە یەکێکەوە لە نێوان دنیا و ئاخیرەتدا نەپچڕاوە.

﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ، فَرِيقًا هَدَى وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللَّهِ: وەك پێشتر ئێوەی دروست کرد، گشتتان بۆ لای ئەو دەچنەوە، هێندێکانی شارەزای رێگە کردوە و دەستەیێکیش هەر شیاوی گومڕابونن، کە ئەوانە لەبری خودا دەگەڵ شەیاتین بونە دۆست.﴾الأعراف/٢٩-٣٠

* * *

تەنانەت پەیوەندی دنیا بە ئاخیرەت لە هەستی موسڵمانانی یەکەمین گەیشتە رادەیەك ئەوان بەواقیع لەژیانی دنیادا دەژیان، بەڵام هەست و نەست و بیریان بەئاخیرەتەوە پەیوەست بو، وەکو ئەوەی لەبەر چاو و، لەبەر دەمیان ئامادەبێ ئاوا تێیدا دەژیان.

لەبەر توندی جەختکردنی قورئانی پیرۆز لەسەر زیندوبونەوە و پاداش و سزا و نێپێچانەوە و، لەبەر ئەو شەپۆڵە زیندەگیانەی لەپێشاندانی دیمەنەکانی رۆژی دوایی

لە قورئاندا هەیە، وای لێهات موسڵمانان بەهەست و ئەندێشەیان لە رۆژی دواییـــدا دەژیان وەك بڵێی دەرسات لەبەر چاویان بوبێ و روداوەکانی ژیـان بـن، بـەڵکو وەك بڵێـی دنیـا بەهـــەمو واقیعەکەیـــە رابردویـــەك بـــوە رویـــداوە و، ئاخـــیرەتیش بەروداوەکانیانەوە ئێستە ئامادەیە!

﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ، قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْـــفِقِينَ، فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ، إِنَّا كُنَّا مِنْ قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّـــهُ هُـــوَ الْـبَرُّ الرَّحِيمُ: رو لە یەکتر دەکەن و پێکەوە وتوێژیانە. دەڵێن: ئێمـــە لـە پێشـودا لـەناو کەس و کاری خۆمان نیگەران بوین. ئیتر خودا خۆی چاکـەی دەگـەڵ کردیـن و لـە ئازاری گڕەوهاڵاوی پارازتین. ئێمە پێشتر هاوارمان هەر لەو کـردوە، هـەر ئەویشـە خاوەن چاکەی دلۆڤان.﴾الطور/٢٥-٢٨.

جا بەبونی ئەو بڕوایە بەرۆژی دوایی کە هەتا پلەی یەقین چەسپاوە، لەگـەڵ ئـەو زیندەگیە لە پێشانداندا کە ویژدان لە قوڵاییەوە دەهەژێنێ، هەر یەکەیان لەو سـاتە دەژیا کە تێیدابو،-یەکسەر- لە پاداش یا سزاکەی رۆژی دواییشـدا دەژیـا! ئـەوەتا کردەوەیەك لەم چرکە لە ژیانی دنیادا ئـەنجام دەدا، پاشـان ئەگـەر کردەوەکـەی لـە تاعەتی خوابا شوێنی خۆی لە بەهەشت دەهاتە بەرچاو، یاخود وا کردەوەیـەك لـەم ساتەدا لەژیانی دنیـا ئـەنجام دەدا-یـا دەیـەوێ ئـەنجامی بـدا- ئـەوجا-بـەترس و دڵبەخۆسوتانەوە- سەیری شوێنی خۆی دەکرد لە ئاگری دۆزەخ، ئەگەر کردەوەکـەی یاخیبون بوایە لە خوا.

ئەوجا-زۆرینەی هەرەزۆری- کردەوەکانی ژیانی دونیایان چاك بو بەڵکو بۆ ئـەو ئاستە بەرز و باڵایە هەڵکشان کە بەموعجیزان دەچو..

فریشته نەبون، لێشیان داوانەکرابو لە مرۆڤایـەتی خۆیـان دەرچـن، بێجگـە لـە پێغەمبەران-علیهم الصلاه والسلام- هەمو مرۆڤێکیـش رەنگـە توشـی هەڵـەبێ، بەڵام-ئەگەر هەڵەیانکرد- هەر خێرا ژیوان دەبنەوە.

﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ، أُوْلَئِكَ جَزَاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ: ئەو کەسانەی هەرکاتێك کاری خـراپ دەکـەن، یـان ناحـەقی لـەخۆ دەکەن، خودا لەبیر نابەنەوە و لەبەری دەپاڕێنەوە، لە خەتاکانیان ببورێ، بێجگە لە خوداش کێ لە گوناهان دەبورێ؟ جـا ئەوانـە لەسـەر کـارێ کەزانیویانـە هەڵەیـە، پێداگر نین.. ئەوانە پاداشیان لەلای پەروەردگاریان لێبوردنە و بەهەشـتگەلێکە کـە جۆباران بە بەریاندا دەڕۆن و تاهەتایە هەر لەو بەهەشتە دەمێننەوە، چەندە جوانـە پاداشتی ئاکار چاکان.﴾آل عمران/١٣٥-١٣٦.

((كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٌ وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ: هـەمو ئـادەمیزادێك هەڵـە دەکا، چاکتری هەڵەکارانیش تۆبەکارانن)).[1]

ئەوجا لە هەستی ئەواندا یەك حسێبی پەیوەست بۆ دنیا و ئاخیرەت دەکرا نـەك دوحسێبی جودا!

* * *

ڕاستە دنیا لە قورئاندا زەم کراوە و، لەسەر زمانی پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لێکراوە و، ئامۆژگاری خەڵکی کردوە تاواز لە خۆشویستن و پەیوەستبون بـەدونیاوە

[1] پێشتر باسمانکرد.

بێنن.. بەڵام ئایا ئـەو ئاراسـتەکردنانە لـە قورئـان و فـەرمودەدا لـە چ بوارێکـدا هاتون؟

تەنیا لە دو بواراندا هاتون: کاتێك دنیا -واتە خۆشویستن و پێوەپەیوەست بونی- دەبێتە بەربەست لەنێوان خەڵك و نێوان بـڕوا بـون بـەخودا و بـەرۆژی دوایـی، یـا دەبێتە بەربەست لەنێوان خەڵك و جیهاد لەپێناو خودا:

﴿وَفَرِحُوا بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ مَتَاعٌ: ئەوان بە ژینـی سـەر دنیـا دڵیـان خۆشـە، ژینـی دنیـاش لـەچاو ژیـانی ئاخـیرەت رابواردنێکـی هندکە.﴾الرعد/٢٦.

﴿إِنَّ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءَنَا وَرَضُوا بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاطْمَأَنُّوا بِهَا وَالَّذِينَ هُـمْ عَنْ آيَاتِنَا غَافِلُونَ، أُولَئِكَ مَأْوَاهُمُ النَّارُ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ: ئەوکەسانەی دیـداری ئێمەیان ناوێ و بەژینی دنیا رازین و لەو بارەوە خاترجەمن، ئەوانـەش ئاگایـان لـە بەڵگەکانمان نیە. لە سۆنگەی کردەوەکانیان ئاگر دەبێتە جێگەیان.﴾یونس/٨.

﴿وَوَيْلٌ لِلْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ، الَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ الْحَيَـاةَ الدُّنْيَـا عَلَـى الآخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا أُولَئِكَ فِي ضَلاَلٍ بَعِيـدٍ: واوەیـلا بۆ خوانەناسان لە جەزرەبەی زۆر توندوتیژ، ئەوانەی ژینی دونیایان لە هی ئاخـیرەت پێباشترە، دەبنە لەمپـەر لـەڕای خـودا و گەرەکیانـە خواروخێـچ بـێ، ئەوانـە لـە گومڕاییدا زۆر پێوەچون.﴾ابراهیم/٢-٣.

﴿وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيـمٌ، ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِـرَةِ وَأَنَّ اللَّـهَ لاَ يَـهْدِي الْقَـوْمَ الْكَافِرِينَ: بەڵام کەسێ بە کوفرەکەی دڵی خۆش بێ، بـەر توڕەیـی خـوا کـەوتون و ئازاری زۆر دژوار دەدرێن.. چونکە ئەمانە گوزەرانی سەر دونیایـان لـە دوارۆژ پـتر

خۆش دەوێ، دیارە خوداش گرۆی خودانەناسان شارەزا ناکا.﴾النحل/١٠٦-١٠٧.

ئەم نمونانە و هیتریش لەبارەی خۆشویستنی دنیاوە هاتون کە خەڵك لە بڕوا بـون بەخوا و بەرۆژی دوایی دور دەخەنەوە.

بەڵام خۆشویستنی دنیا کە مرۆڤ لە جیـهاد کـردن لـەپێناو خـودا بەنـەفس و بەماڵ دور دەخاتەوە، لەمجۆرە ئایەتانەی دەربارە هاتوە:

﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْـوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّـهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَـوْمَ الْفَاسِقِينَ: بڵێ ئەگەر باب و کوڕ و برا و ژن و خزمەکانتان و ئەو ماڵـەی پـەیداتان کردوە و کـەل وپـەلی بازرگـانی کـە دەترسـن لـەبرەو کـەوێ و خانوبـەرەی رنـد و دڵخۆشکەرەی خۆتان پێ لە خودا و پێغەمبەر و جیهادکردن لـەرێی خـوادا گرنـگ تر، چاوەنۆڕ بن تا فەرمان لە خوداوە دێ، ئەوانەی لەڕێلادەرن، خودا هیدایـەتیان نادا.﴾التوبة/٢٤.

﴿وَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ آمِنُوا بِاللَّهِ وَجَاهِدُوا مَعَ رَسُـولِهِ اسْـتَأْذَنَكَ أُولُـوا الطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا ذَرْنَا نَكُنْ مَعَ الْقَاعِدِينَ، رَضُوا بِأَنْ يَكُونُوا مَـعَ الْخَوَالِـفِ وَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لاَ يَفْقَهُونَ: هەرکات سورەتێك دێتە خوار کە باوەڕ بـەخوا بهێنن و لەتەك پێغەمبەرەکەیدا بچنە جیهاد، خاوەن دەسـتەڵاتەکانیان دێـن ئـیزن لەتۆ دەخوازن و ئێژن واز لە ئێمە بێنە، با ئێمەش لەماڵ بمێنین، وەك خانەنشینانی تـر.. بـەوە رازی بـون وەك بـەجێماوەکان بـن، مۆریـان بەسـەر دڵەوەیـە هیـچ تێ ناگەن.﴾التوبة/٨٦-٨٧.

﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللَّهِ وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَالُوا لاَ تَنفِرُوا فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ: ئەوانەی بەوە دڵخۆشن کە لە ماڵەخۆیان مان و لە هاوڕێبون دەگەڵ پێغەمبەری خودا خۆیان بوارد و نەیانویست کە ماڵ و گیانیان لە ڕاهی خودا بەخت کەن و دەیانگوت: لەم گەرمایەدا دەرمەچن. بڵێ: ئەگەر تێگەیشتنتان هەبوایە، خۆ ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە.﴾التوبة/٨١.

ئەوانەی لەهەموو ئەو ئایەتانەدا باسیانکراوە یا تەواو بێبڕوان، یان دوڕون، کە بەڕواڵەت لە دەغەڵی و بۆ ڕیاکاری خۆیان بە موسڵمان پێشاندەدەن بەلام لەناخی دەرونیشیاندا بڕوادارنین، جا ئەوانە لە هەرە ژێرەوەی ئاگری دۆزەخن و، لە حوکمی خوادا کافرن:

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا: دیارە ئەوکەسانەی دوڕون، وان لە قاتی هەرە بەرەژێرەوەی دۆژەخ. تۆ ناتوانی یاریدەیان بۆ پەیداکەی.﴾النساء/١٤٥.

﴿وَمَا مَنَعَهُمْ أَنْ تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَاتُهُمْ إِلاَّ أَنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ وَلاَ يَأْتُونَ الصَّلاَةَ إِلاَّ وَهُمْ كُسَالَى وَلاَ يُنفِقُونَ إِلاَّ وَهُمْ كَارِهُونَ، فَلاَ تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ: بۆیەش هەرچی بەختی بکەن، خودا لێیان قبوڵ ناکا، چونکە ئەوان حاشایان کرد لە خودا و پێغەمبەرەکەی. نوێژەکانیان بە تەمبەڵی بەجێدێنن و ئەو ماڵەش کەوا دەیبەخشن، زۆر بە نابەدڵی دەیدەن.. سەیرت نەیە لە دارایی و زار و زیچێ کە هەیانە، خوا دەیەوێ لە دنیادا بەمانە ئازاریان دا و هەر بە خوانەناسی بمرن.﴾التوبة/٥٤-٥٥.

لەم دو بوارەشدا دونیا لەبەر هەندێك هۆی ئاشكرا زەم كراوە كە لە ئایەتـەكاندا رونكراونەتەوە..

بەڵام حەقیقەتی هەڵوێست لەم دو بوارەدا چیە؟

حەقیقەتی هەڵوێست ئەوەیە كە لێرەدا دنیا لە هەستی خاوەنەكەی لە ئاخـیرەت جودایە، جا یا لەبەر ئەوەی هەر لەبنەڕەتەوە بڕوای پێ نیـە، یـا بـاوەڕێكی لاوازی نادیار و تێكەڵی پێ هەیە، كە وێنەیەكی ئاشكرای لەهەستیدا دروسـت ناكـا و، - ئینجا- كار لە فیكر و هەست و رەفتاری واقیعی ناكا.

لەهەستی ویدا دۆزەكە بەمشێوەیە: بەهەشتێكە بـەڵێنی پێـدراوە-كـە بـەخۆی باوەڕی پێ نیە، یا ئاستی بون و نەبونی بڕواكـەی یەكسـانە- ئـەركی بـە نـەفس و بەماڵی تێدایە، لە هەستی ویدا بریتیە لە بێبەشبون لە خۆشی، چونكە نایەوێ بـەو هێندە وازبێنێ كە خودا موبـاحی كـردوە، بـەڵكو دەیـەوێ لەگـەڵ ئارەزوەكـانیدا داكشێ و، ئـامێری (رێكخـەر) بـەكار ناهێنـێ كـە خـودا پێـی بەخشـیوە هـەتا دەسبەسەر ئارەزوەكانی دابگرێ و رێكیان بخا، لەبەرامبەریشدا رابوردنێكـی هەیـە كە خۆی تا ئەوپەڕی تێیكـەوتوە و، پێـی دەگوتـرێ كـە ئـەو رابواردنـەی بـەمجۆرە بەهەشتی لێ حەرام دەكات.

كاتێك دۆزەكە وایلێهات و، هەڵبژاردنەكە كەوتە نێوان بەهەشتی بەڵێن پێـدراو لەگەڵ بێبەشبون لەو رابواردن و چێژە لەرادەبەدەرەی و، لە نێوان رابواردنـی سنور بەزێن لەگەڵ بێبەشبون لە بەهەشتی ئاخیرەتێكی بەڵێندراو، لێرەدا دنیای هەڵبژارد و بەچاكتری دانا.

﴿فَأَمَّا مَنْ طَغَى، وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى﴾: جـا هەركەسـێ كـە سـەربزێوی كـردوە، ژیـنـی دنیـای بـژاردوە. دیـارە كـە دۆزەخ

جێیەتی.﴾النازعات/٣٧-٣٩.

﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، وَالآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى: بەڵام ئێوە ژینی دنیا هەڵدەبژێرن، کەچی لە ئاخیرەت باشتر و بەپێزتر هەیە.﴾الاعلى/١٦-١٧.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الأنعام وَالنَّارُ مَثْوًى لَهُمْ: ئەوانەی بڕواداریش نین، لەدنیادا رای‌دەبوێرن و دەلەوەڕێن، وەك لەوەڕانی ئاژەڵ و جێگەیان لە ئاگردایە.﴾محمد/١٢.

ئەوەی هەڵبژارد کە چێژ لە رابواردنە لەرادەبەدەرەکانی بەر دەستی وەرگرێ، چونکە یا لەبنەڕەتدا بڕوای بەئاخیرەت نەبو و، ئەو ئەشکەنجەی گەفی پێلێدەکرا لای ئەو خەیاڵ بو و راستەقینە نەبو، یا لەبەر ئەوەی بڕوای بەرۆژی دوایی لاواز بو، ئەوجا ئەو ئەشکەنجەیەی لەخەیاڵی ویدا نادیار بو، لە هەستی ویدا سوکتر بو لەو ئازارە نێزیکەی بەبێبەشبونی لەو خۆشیانە دەیدیت.

لەهەردو باریشدا حاڵەتێکی ناهەموار هەبو، پێوانەکان لەهەستی خاوەنەکەی شپرزە دەبون، لەبەر ئەوەی تەنیا بڕوای بەو شتانە هەبو کە هەستی پەی پێ دەبردن[1] و! بێئاگا دەبو لەو دەلالەتە مەعنەویانەی هەستەکانی پەیان پێ دەبرد:

﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لاَ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَئِكَ كَالأنعام بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ: دڵیان هەیە و پێی تێناگەن. چاویان هەیە و پێی نابینن، گوێیان هەیە و پێی نابیستن. ئەوانە وەکو ئاژەڵن. بگرە لەوان گومڕاترن. ئاگایان لەهیچ شت نیە.﴾الأعراف/١٧٩.

---

١ ئەمە بەسیفەتێکی تایبەت سیمای بەرجەستەی جاهیلیەتی هاوچەرخە، ئەگەر چی ئەم کەموکوڕیە لە فریشکدا دەدرێتە پاڵ (زانست) و داخوازیەکانی! وەك بڵێی دەبێ زانست قەوارەی مرۆڤ هەڵگێڕێتەوە!

یاخود وەکو شەو کوێرێك بو کە تەنیا دیمەنە نزیکەکانی لەبەر چاو دەردەکەوێ، بۆیە هەر ئەمان کاریگەریەکی ئاشکرایان لەسەر ئەندامەکانی وەرگرتنی دەبێ، کەچی دیمەنە دورەکان لەبەر چاوی تێکەڵ و نادیار و تێکهەڵکێشراو دەبن کە کاریگەریان لەسەر ئەو ئامێرە ئاشکرا نابێ:

﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَانِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ، وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ: هەرکەس لەراست یادی خوا حەز دەکات کوێرایی دابێت، هەمدەمێکی شەیتانی لیْ پەیدا دەکەین، ئیتر هەر ئەو هاودەمە لە رێگە هەڵەیان دەکەن، لاشیان وایە راستەڕێیان دیوەتەوە.﴾الزخرف/٣٦-٣٧.

* * *

بەڵام لە هەستی مرۆڤی رێکوپێکدا دۆزەکە تەواو جیاوازە..

مرۆڤی رێکوپێك-هەر لەسەرەتادا- رۆحی خۆی لە ئاست جیهانی غەیبدا داناخا و، خۆی تەنیا لەقاوغی پەی پێبردنی هەستەکانیدا گرمۆڵە ناکا، چونکە خودای وەدیهێنەر بۆ ئەوەی لە ئەنجامدانی ئەرکی جێنیشیندا-کە بۆ هەندێ وەدیهێناوە- یاریدەی بدا دو توانای بەرامبەریەکی پێبەخشیوە، بەهەر یەکێکیان لایەنێکی ئەرکی جێنشینی ئەنجامداوە و، بەهەردوکیان پێکەوە هاوسەنگی وەدەستدێنێ، جا نە لێرە نە لەوێ هاوسەنگیەکەی لەدەست نادا. لایەنێکیان بڕوا بونە بەو شتانەی هەستیان پێدەکرێ و دوەمیش بڕوابونە بەغەیب و، بەتوانای یەکەم مامەڵە لەگەڵ واقیعی بەرهەستی نزیکدا دەکات، لەگەڵ ئەو گەردونە دیەی دەوروبەری، جا تایبەتمەندێتیەکانی مادە دەناسێتەوە و، لەپێناو چاکردنی حاڵی خۆی لەسەر زەوی زانستەکەی لە وەدەسخستنی ئەو وزانە خەرج دەکات کە

خودا لە ئاسمانەکان و زەویدا بۆی رامکردوە و، بەتوانای دوەمیش مامەڵــە لەگـەڵ ئەو راستەقینانە دەکات کە هەستی پەیان پـێ نابـات-هەرچـەند پـەی بـە شـونی هەبونیان دەبات- و مرۆڤ فریشــکی گرتـوە بـە بڕوابـون پێیانـەوە و، مامەڵـە و هەڵسوکەوت لەگەڵیان و، وابەستەبون پێیانەوە گرتوە، وەك حەقیقەتی پەرستراوێتی و، حەقیقەتی پێغەمبەرایــەتی و سروشــی خودایــی و، حەقیقــەتی زندوکردنــەوە و پاداش و سزا، تا لایەنەکی دیکە ئـەنجام بـدا-کـە لەراسـتیدا گرنگـترە- و بریتیـە لەدامەزراندنی ئاوەدانکردنەوەی مادی زەوی بەپێی بەرنامەی پەروەردگار کە تــەنیا ئاوەدانکردنەوەیەکی مادی نابێ و، تەنیا لە داخوازیەکانی جەســتە و خۆشـیەکانی کۆ نابێتەوە، بەڵکو بەرز دەبێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە (ژیار)ێك بــەواتای راسـتەقینەی ژیار، واتە ئاوەدانکردنەوەیەك بەها بەرزەکان دەوریان داوە و، روی بەئاراستەیە کـە شایستەی (مرۆڤ)ە، کە خودا لە چەنگە قوڕێکی زەوی وەدیهێناوە و لەگەڵ فویەك لەروحی خودا و، داخوازی فوە روحیەکەش تیایدا بەو بەهایانەوە نەبێ وەدینایێ و، مرۆڤ دور لەمانە بەنقومی لەنێو قوڕدا دەمێنێتەوە و ناتوانێ لێــی بەرزبێتــەوە و خۆی لێ دابڕێ، چونکە لەنەفسی خۆیدا ئامرازی بەرزبونەوە و فڕین لەکار دەخا..

جا ئەم مرۆڤە رێکوپێکە-کە لەپێکهاتەی لە نێوان چنگە قوڕێك و فوە روحێـك دا هاوسەنگە و، سیستەمی ژیانی لەبەرنامەی پەروەردگار وەرگرتـوە- لەهەسـتیدا دۆزەکە بەجۆرێکی جیاواز وێنا دەبێ..

لەژیانی دنیادا بڕە خۆشیەك هەیە کە خودا موباحی کردوە.. هـەر لـەو کاتــەوە موباحی کردوە کە ئادەم و ژنەکەی بۆ سەر زەوی دابەزیون:

﴿وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ:

گوتمان دابەزنە خوارەوە خۆتان دوژمنی خۆتانن، تا ماوەیــەکی دیـاریکراو، لەســەر

زەمین رای ببوێرن. ﴾البقرة/٣٦.

ئەو بڕەی خودا بەزانایی و دانایی خۆی دیاریکردوە، خودای بەرز بەخۆی دەزانێ کە لەگەڵ قەوارەی مرۆڤدا گونجاوە و، یارمەتی دەدات بۆ گێڕانی ڕۆڵی جێنشینی لە زەویدا بێئەوەی ئەو قەوارەیە تێك بشکێنێ یا تێکیدا و، لەهەمانکاتیش ئەو تاقیکردنەوەی تێدا دەردەکەوێ کە مرۆڤی بۆ وەدیهێناوە، چونکە خودا قەوارەی مرۆڤی وا وەدیهێناوە کە ئارەزوەکانی لا خۆشەویست بێ:

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأنعام وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا: ئارەزوی ژنان کردن و کوڕی زۆر پەیداکردن و دەستکەوتنی کۆمای زلی زیو و زێڕان و ڕەوە ئەسپی بە دروشم و وڵسات و زەوی کێڵانێ، بۆ مەردم ڕازاوەتەوە و لە ژیانی دنیایەدا مایەی خۆشین. ﴾آل عمران/١٤.

لەهەمانکاتدا خودا سنورەکانی داناون:

﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا: ئەمانە سنوری خودان نەچن تخونیان بکەون. ﴾البقرة/١٨٧.

﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا: ئەمانەن سنوری خودان، لە سنوری خوا دەرمەچن. ﴾البقرة/٢٢٩.

لە میهری خۆشیەتی کە ئەو سنورانەی بۆ دیاریکردوە کە خودا دەزانێ ئەو بڕە خۆشی و ڕابواردنە دابین دەکەن، بێئەوەی قەوارەی مرۆڤ تێکبدەن، بەڵام خاڵی تاقیکردنەوە بریتیە لە ڕازاندنەوە و ئارایشتدانی ئارەزوەکان بە شێوەیەك مرۆڤ حەز لە زیادبونیان بکات، پابەندکردنیشی -لەهەمان کات- بەو بڕەی ڕێی پێدراوە و ڕێگە پێنەدانی کە بیانبەزێنێ ئەگەر چی نەفسیشی پتری بوێ..

بەڵام خوا کە ئەو برە خۆشڕابواردنەی بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ دیاریکردوە-خوا بـۆ خۆی دەوڵەمەندە- وازی لە مرۆڤ نەهێناوە تاکو بەبێبەشبون ئـازار بکێشـێ، لـە نێوان خۆشەویستی ئارەزوەکان کـە بـۆی رازاوەتـەوە، لەگـەڵ ئـەو کۆتانـەی بـۆی دانراون-هەر چەند بۆ بەرژەوەندی ئەویشن- بەڵکو ئامرازێکی یەکجار بەسودی پـێ بەخشیوە، کە کاریگەری مەزنی هەیە، دەتوانی پێگەی ئارەزوەکـانی بـۆ رێکخا- بەبێ ئەوەی هەسـت بـەچزوی بێبەشـی بکـات، بـەڵکو هەسـت-لـە رێگـای ئـەو ئامرازەوە- بە بەرزبونەوە و توانایی دەکات..

بەرزبونەوە لە ئارەزو هەڵڕشتن و، توانا لەرێکخسـتن، جـا ئـەو هەسـتە مەزنـە ئەوەی بۆ قەرەبو دەکاتەوە کە لە سەرەتادا هەست بەبێبەشی دەکات، تا لـێڕادێ و چیدی هەستی پێناکا..

ئەو ئامرازە مەزنەش (دڵ) یان (عەقڵ)[1]ە:

﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُـمُ السَّـمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُـمْ تَشْـكُرُونَ: خـودا ئێـوەی لـە پزدانـی دایکتانـەوە وەدەرخست، کەچی هیچو نەدەزانی چاو و گوێچکە و دڵی دانێ، بەشـکو شـوکرانە بژێر بن. ﴾النحل/٧٨.

﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْـمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لاَ تَعْمَى الأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّـدُورِ: ئـاخۆ هێشـتا بەزەویدا نەگەڕاون تا ببن بە خاوەن دڵان و گوێچکەگەلێ کە پێی تێبگەن و ببیستن؟ لە راستیدا چاو کۆر نابن، ئەو دڵانە کوێر دەبن کە جێیان لەناو سیەکانە﴾الحج/٤٦

---

١ ئەم وشانە لەعەرەبیدا (القلب، العقـل، الفـؤاد) هاومانـا دێـن، لـە قورئانیشـدا (القلـب و الفـؤاد) بەواتای عەقڵ هاتون.

خاڵی تاقیکردنەوەش لەهەموو مەسـەلەکەدا بریتیـە لـەوەی ئایـا مـرۆڤ ئـەو ئامرازە مەزنە بەکاردەهێنێ کە خـودا پێـی بەخشـیوە، تـا پێگـەی ئارەزووەکـانی ڕێکبخا، کە بەم ڕێکخستنەش بۆ ئاستی شایستە بەرز دەبێتەوە و، (ژیـار) بـەواتا ڕاستەقینەکەی دادەمەزرێنێ و ڕۆڵی جێنشینی پێگەیشتو(راشدة) وەدەستدێنێ و.. لەسەرەوەی هەمو ئەوانەش لە ئاخیرەتدا پاداشی شایستە وەردەگـرێ. لەبەهەشـتدا کە ((**فِيهَا مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَـرٍ**: شـتی وای تێدایـە کـە نـەچاو دیویـەتی و نـەگوێ بیسـتویەتی و نەبەسـەر دڵـی کەسـێکدا ڕەتبوە.)).[1] یان ئـەو ئـامرازە مەزنـە لەلایـەك دادەنـێ و، وە دوای ئارەزووەکـانی دەکـەوێ، جـا دادەبـەزێ و دەشـکێتەوە و، خـۆی وەکـو تـاك و وەك کۆمـەڵ تێکدەشکێنێ جا چ زوبـێ چ درەنـگ و، (ژیـار)ی ڕاسـتەقینەی شایسـتەی خـۆی دانامـەزرێنێ و، خیلافـەتی پێگەیشـتو لەسـەر زەوی وەدیـهناهێنێ و، سـەرەڕای ئەمانەش هەموی دوچاری سزایەکی ترسناك دەبێتەوە کە نە گیان نە جەستە خـۆی لەبەر ناگرن:

**﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَـاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا، وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُـوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا لَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلاًّ ظَلِيـلاً﴾**: ئەوکەسـانەی لـە نیشـانەکانی ئێمـە حاشـا دەکەن، لەدوارۆژدا بەئاگر دەیان سوتێنین هەتا پێستیان داپلۆخا، پێستی تریـان بـۆ دەگۆڕین تا ئازار پتر بچێژن. خودا خاوەن دەستەڵاتی لەکارزانە. ئەو کەسانەش کـە بونە خاوەنی بڕوا و ئاکاری چاك ڕەچاو دەکەن دەیانبەینە باغـاتی وا جۆباریـان بـە

---

[1] متفق عليه.

بەردا دەڕوا و هەتا سەر هەر تیا دەبن ، ژنانی پـاك لـە گشـت عـەیب و سـێبەری پڕیان دەدەینێ.﴾النساء/٥٦-٥٨.

جـا ئەگـەر دۆزەکـە لـە هەسـتی مرۆڤێکـی ڕێکوپێکـدا ئـاوابو، ئـەوا ئــەو هەڵوێستەی دانایی دەیخوازێ و لەگەڵ ئەو (دڵ)ەدا کۆك دەبێ کە خودا پێی داوە و، بەبڕی ڕێپێدراوی رابواردن وازدێنێ و بۆ ئەو شتانەی خـوا حـەرامی کـردون سـنور نابەزێنێ و، لە ئاخیرەتیش بەهەشت و ڕەزامەندی خودا وەدەستدێنێ.

مەسەلەکەش لە هەستی نەوەکانی یەکەمدا کە لەسەر چاوگە بێگەردەکانی ئـەم ئاینە پەروەردە بوبون بەمشێوەیە بوە، کتێبی خوا و سونەتی پێغەمبەرەکـەی ﷺ و، دنیا و ئاخیرەتیش-بەپێی ئەمە- لەهەستی ئەواندا یەك ڕێگە و یەك حیساب بو:

﴿وَ ابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِرَةَ وَلاَ تَنسَ نَصِيبَكَ مِنْ الدُّنْيَا: بەوەی خـودا بەتۆی داوە بـە شـوێن مـاڵی ئاخیرەتـەوە بـە، بەشـی خۆشـت لـەم دنیایـە لـەبیر مەکە.﴾القصص/٧٧.

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ: خودایە کە ئەم زەمینەی بۆ کەوی کردون، شانەوشان لە زەویدا بگـەڕێن و لە بژێوەکەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە.﴾الملك/١٥.

* * *

بەڵام ئــەو هاوســەنگیە جوانــەی کـە ئیسـلام لـەدەرونی مـرۆڤ دایمـەزراندبو، نەوەکانی یەکەمیش بەو شێوە جوانە هێنابویانە دی، کە مێژو هۆشـی پێـبردوە و، کاریگەریەکی واشی لـە واقیعـی مرۆڤـدا هـەبوە کـە هیـچ کاریگەریـەکی دیکـە لەمێژودا لەگەڵی هاوتەریب نارِوا..

ئەم هاوسەنگیە جوانە لە پاش ئەو نەوانەی یەکەم تێکچو، هـەر چـەند ئـەمجارە

ئەو تێکچونە تەواو لەئاراستەیەکی بەرامبەری ئەوە رویدا کە جاهیلیەتی عـــەرەبی تێیدابو..

لە جاهیلیەتی عەرەبیدا کەموکوڕی بریتی بو لە جیابونەوەی دنیا و ئاخیرەت لە هەستی خەڵکیدا، چونکە بڕوایان بە ئاخیرەت و بەزیندوبونـــەوە و بـەپاداش و سـزا نەبو، لەپاش ئەمەش ژیانی دنیایان دەخستە پێشەوە و بەچاکتریان دادەنـا؛ کـەچی ئەمجارە جودابونەوەی دنیا بو لە ئاخیرەت لەهەستی خەڵکیدا لەبەر بەگچکە گرتن و بەکەمگرتنی ژیانی دنیـا و، لەپاشـاندا ئاخیرەتیـان بـەچاکتر دادەنـا و دەیانخسـتە پێشەوە!

لەیەکەم تێڕوانیندا ئەمە بەبڕوای راستەقینە دێتــە بـەرچاو! کـە ئـەو ئەرکـەی پیاوی بڕوادار دەبێ بۆی تێبکۆشێ، کاتێك کە پێشی دەگا، گەیشـتۆتە لوتکەیـەك کە هیچ لوتکەیەکی دیکەی لەدوانیە و بەرزترین شتی ئەم ئاینەی وەدیهێناوە..

گومانی تێدانیە هەر ئەمەشە بەخەیاڵی ئەوان کەساندا هـــاتوە کـە ئاخیرەتیـان خستۆتە پێش دنیا، بەو شـێوەیەی سـۆفیگەری پێشکەشـی کـرد، کـەبۆ چـەندین سەدەی درێژ بەدرێژایی خاکی ئیسلام راکشابو، تا ئێسـتاکەش شـونەکانی[1] لـێرە و لەوێ بەجێماون..

ئەدی خوا نیە دەفەرموێ:

﴿فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَـــا إِلاَّ مَتَــاعُ الْغُرُورِ: کێ لە ئاگر گلاکرێ و ببرێتە نێو بەهەشتەوە، دەیباتەوە و بەختەوەرە، ئەم **ژیانەی سەر دنیایە تەنیا بنەمای فریوە.**﴾آل عمران/١٨٥.

ئەدی ئەویش لە (بنـــەمای فریـو-متـاع الغـرور) دورناکەوێتــەوە و، بەخانـەی

---

١ شون: اثر.

ئاخیرەت پەیوەست نابێ کە ئەویٚ ژیانی راستەقینەیە ئەگەر ئەوان بزانن.[1] بەمجۆرە بۆ خۆی و نابێتە سەرکەوتوی راستەقینە و، وەدیهێنەری راستەقینەی کرۆکی دین و، بەراستیش نابێتە چاکترین نمونە؟!

بەڵام لەکاتی وردبونەوە، هەندێك لایەنی مەسەلەکە دەردەکەون کە لەیەکەم تێروانیندا بزرن.

بەڵێ.. ئەوان مەبەستیان بەم کارە روی خودابو!

نەخێر.. ئەو رێگەیان نەگرتبو کە خوا فەرزی کردوە!

لێرەشدا باسی هورێنەکانی سۆفیگەری و، باسی وەحدەی وجود و، باسی حولول، لارێبونە بیروباوەڕیە هاوشێوەکان ناکەین..

هەروەها باسی پەرستنی مەرقەدان و پیاوچاکان ناکەین، لەگەڵ ئەو بیدعە و ئەفسانە و داستانانەی دەربارەیان بڵاوبونەوە و، دانانی پێناو[2] لەنێوان بەندان و خوای گەورە، لە کاتێکدا ئەم ئاینە هاتوە تا هەمو پێناوێك رەتکاتەوە و، دڵی مرۆڤی لێ ئازاد بکا و، راستەوخۆ بەبێ پێناو و هاوبەش پەیوەندیەکەی لەگەڵ خودا گرێداوە:

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِي: هەرکاتێك عەبدەکانم لەمەڕ من لەتۆ دەپرسن، من نزیکم، هەرکەس هانام وەبەر بێنێ، بێوەرامی ناهێڵمەوە.﴾البقرة/١٨٦.

---

١ لە سورەتی عەنکەبوت، ئایەتی ٦٤ داهاتوە ﴿وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ: ژیانی ئەم دنیایە تەنیا گاڵتە و گەمەیە و خانەی ئاخیرەتیش ژیانی راستەقینەیە ئەگەر ئەوان بزانن.﴾.

٢ پێناو: وسیط

ئێستا باسی تێکـڕای ئـەم لاڕێبونانـە ناکـەین لەگـەڵ ئـەو هاوبەشپەرسـتیەی تێیانکەوتوە، چونکە بـواری قسـەکردنی ئێسـتامان بریتیـە لـە (چـەمکی دنیـا و ئاخیرەت)، بۆیە لێرەدا باسی ئەو گەندەڵیانــە دەکـەین کـە سـۆفیزم بەشـێوەیەکی تایبەت خستویەتیە ئەم بوارە.

سۆفیەکان زۆر پشتیان بەو ئایەتانە بەستبو کە لە زەمی دنیـا هـاتبون، لەگـەڵ ئەو فەرموودانەی نەفرەتیان لەدنیا کردوە.[1]

هەروەها پشتیان بەحاڵەتی دنیانەویستەکان(زهاد)ی نێو هـاوەڵانی پێغەمبـەری خوا ﷺ بەستبو، کەوازیان لە خۆشیەکانی دنیا هێنابو و بەهیچ شتێکی پەیوەسـت نەبون.

هـەروەها زۆر پشـتیان بـەوە بەسـتبو کـە خۆهەڵواسـین بـەدنیا دەبێتـە هـۆی گوناهکاری لە ژیانی بڕواداردا ئەمــەش پـەروەردگاری لێ تـوڕە دەکـا و، دوچـاری ئەشکەنجەی ئاخیرەتی دەکات، گوتیشیان: تاکە ڕێگەی دورکەوتنــەوە لـە گوناحـان بەکەم زانینی دونیا و بێز لێبونەوەیەتی، لەگەڵ چونەدەر لە ئارایشت و جوانیەکـەی و، لێ دورکەوتنەوەی بەپێی توانا.

هەرچی ئایەتەکان-هەروەك گوتمان- لەبارەی بێبڕوا و دوڕوەکانەوە هاتون..

ڕاستە کە بڕوادار بەشێکی بەردەکەوێ ئەگەر کەوتە نێو هــەندێك لـەو شـتانەی بێبڕوای تێدەکەون-ئەگەر چی بەوەش کافر نابێ مادام بنــەمای بـڕوای پاراسـتوە- هەروەك لەم ئایەتەدا هاتوە کە بڕواداران دەدوێنێ:

---

١ هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ، مَلْعُونٌ مَا فِيهَا، إِلاَّ ذِكْرَ اللَّهِ، أَوْ عَالِمٌ أَوْ مُتَعَلِّمٌ: دنیـا نـەفرەتلێکراوە، ئـەوەی تێشـی دایـە نـەفرەت لێکـراوە، بێجگـە لـەیادی خـوا یـا زانـا یـا زانستخوازێك.)) رواه ابن ماجه والترمذي.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُمْ بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ، إِلاَّ تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئًا وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: **ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! چیتانە کە پێتان دەڵێن** وەدەر کەون بۆ جیهاد لەرای خوادا، تەمەڵن و لەجێی خۆ نابزون؟ ئاخۆ ژیانی دنیاتان لە ئاخیرەتێ پێ خۆشترە؟! گوزەرانی سەر دونیایە بەرانبەر بە گوزەرانی ئاخیرەتتان شتێکی زۆر کەم بایەخە. **ئەگەر نەڕۆنە جیهاد، لەخواوە توشی جەزرەبەی بەژان دێن و دەستەیەکی تازەبابەت دەخاتە شوێنەکەی ئێوە و لەم** بارەوە هیچ زیانکێکی پێناگەیەنن.. خوا بۆ هەمو شت توانایە.﴾التوبة/٣٨-٣٩.

عومەریش ﷺ بەردەوام دەترسا نەوەك ئەم فەرمودانەی خوای بەرز بیگرنەوە: ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا: خۆشی خۆتان لە دنیادا دەرباز کرد و بەباشی بەهرەتان لێبرد.﴾الاحقاف/٢٠. وە کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنْ النَّعِيمِ: لەپاشان هەر لەو رۆژەدا دەربارەی خۆشی دنیاوە لێتان دەپرسن.﴾التکاثر/٨.

هەرچەند دەشیزانی ئەم ئایەتانە لە بارەی بێبڕوایانەوە هاتون.

ئەمە راستە..

ئەو پەیوەست بونەش بەدنیا، کە دەبێتە هۆی بێئاگابون لە ئاخیرەت، مەسەلەیەکە خودا نە لە بڕوادار و نە لەبێبڕوای قبوڵ ناکا، ئەگەر چی سزای ئەم و ئەویش جودابێ..

بەڵام ئەمە هەموی شتێکە و، کردنی دنیا و ئاخیرەتیش بە دو سەربازگەی بەرامبەر یەکتر کە ئەگەر مرۆڤ روی لە یەکێکیان کرد-یەکسەر- لەوەی دیکە دادەبڕێ و، پاشان دەبێ هەڵبژاردنێکیان لەنێواندا سازدەی هەتا یەکێکیان

هەڵبژێری و ئەوی دیکە فڕێدەی.. ئەمەش مەسەلەیەکی جیاوازە کە هیچ پاڵپشتی لە ئاینی خوادا نیە!

با گوێ بدەینە فەرموودەی پەروەردگار[1]:

﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِرَةَ وَلاَ تَنسَ نَصِيبَكَ مِنْ الدُّنْيَا: بەوەی خـودا بەتۆی داوە بە شـوێن خانـەی ئاخیرەتـەوە بـە، بەشـی خۆشـت لـەم دنیایـە لـەبیر مەکە.﴾القصص/٧٧.

هەروەها کە خودا دەفەرموێ:

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ: خودایە کە ئەم زەمینەی بۆ کەوی کردون، شانەوشان لە زەویدا بگـەڕێن و لە بژێوەکەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە.﴾الملك/١٥.

وە کە دەفەرموێ:

﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِيـنَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَـةِ: بڵـێ: کێیـە جلکـی جـوان و خشـڵ (ئارایشت و رازاندنەوە) و بژێوی پاکژی کە خوا بە عەبدەکانی خۆی رەوا دیـوە لای وایە کە ناڕەوایە؟ بڵێ: ئەمانە شایانی ئەو کەسانەن کە لە ژیانی دنیادا بڕوایان بـە خوا هێناوە، رۆژی دواییش هەر تایبەتی بەخۆیانە.﴾الأعراف/٣٢.

هەروەها کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((ألاَ إنِّي أعْبَدُكُم لِلَّهِ وَأَخْشَـاكُم لَهُ، وَلَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأَقُومُ وَأَنَامُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَـنْ سُـنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي: من لەهەموتان پتر بـەندەی خـوام و لەهـەموان زیـاتر لیێ دەترسـێم،

---

[1] ئەمە دەربارەی قەومی قارونە، بەڵام ئاهەنگەکە وادەگەیەنێ کە لەلای خـودا رەزامـەندی وەدەسـت هێناوە.

بەلاّم من رۆژی دەگرم و بێڕۆژوش دەبم و، شەوان هەڵدەستم و دەشنوم و، ژنیش دەهێنم، ئەوەی سونەتی منیش واز لێبێنێ لەمن نیە))[1].

هەڵوەستەیەکی تایبەتی لە ئاست ئەو ئایەتە دەوەستین کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ..﴾.

باسی ئارایشت لەم بوارەدا دەلالەتێکی تایبەتی هەیە، چونکە ئارایشت جوانیە، جوانیش شتێکی لە پێویست زیادەیە، کەواتە ئەوەی خودای بەرز و کاربەجێ بۆ بەندەکانی رێی پێداوە تەنیا ئەو زەرورەتە نیە کە بە هەرشێوەیەك بێ پارێزگاری لە ژیان بکا، بەڵکو شتێکە لەزەرورەت زیاترە، دەگاتە پلەی جوانی، لە قورئانیشدا چەندین ئاماژە بۆ (جوانی) هەن کە هەمان دەلالەت هەڵدەگرن:

﴿أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاء مَاء فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا: یا ئەو خودایە چاترە کە ئاسمانەکان و زەمینی وەدی هێنا و لە حەواوە ئاوی بۆ ئێوە ناردوە؟ گەلێك باخچەی بەدیمەنمان بە ئاوەکەی شین کردوە، کە خۆتان نەتاندەتوانی دارەکانی بەرهەم بێنن.﴾النمل/٦٠.

﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ النَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انظُرُواْ إِلِى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ: هەر خۆیەتی لە حەواوە ئاوێکی بۆ ئێوە باراند، هەمو روەکمان پێڕواند، هەتا لە سەوزەگیاکەوە دەنك و کەڵوی سواری یەك و لە

---

[1] متفق علیه.

کلوکی دارخورماوە هێشوی پڕ و شۆڕەوە بو دەگەڵ باغاتێك لە رەز و زەیتون و بنە هەناری هاووێنە و لەیەك جیامان بەرهەم هێنا، وەختێ میوەمان پێدەگا سەیری بکەن. کە لەواندا گەلێك نیشانەی خودا هەن بۆ کەسانی کە بڕوایان بەخوا هەیە.﴾[1] الأنعام/٩٩.

﴿وَالأنعام خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ، وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ: وڵساتیشی هەر بۆ ئێوە بەرهەم هێنا، کە گەرمایی و بەهرەیان بۆ ئێوە تێدا و لێشیان دەخۆن، لاتان جوان و رازاوەن، کاتێك دەیانبەن بۆ لەوەڕ و کاتێکیش دەیانهێننەوە.﴾النحل/٥-٦.

هەرچی فەرموودەی پێغەمبەریشە ﷺ ئەوا بڕیاردەدا کە ئەو پەرستنەی خودا بۆ بەندەکانی خۆی لێی رازیە، لەخۆ قەدەغەکردنی یەکجارەکی خۆشیەکانی زەوی و تەواو پشت تێکردنی لەخۆ ناگرێ، ئەم لەخۆگرتنەش دەربڕینێکی راست نیە بۆ راستگۆیی پەرستن و لەخوا ترسان، چونکە لە هەموو خەڵك بەندە تر و لە هەمو خەڵك لەخواترستر کە پێغەمبەرە ﷺ ئەوە ناکا و، فەرمانی پێناکا، بەڵکو هەر کەسێکی ئەم کارانە بکا وای دادەنێ کە وازی لە سونەتی وی هێناوە، و پێغەمبەریش ﷺ ئاگاداری دەکاتەوە کە لەرێ دەرچوە: ((فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي: ئەوەی واز لە سونەتی من بێنێ لەمن نیە.))

هەرچی ئەو دنیا نەویستانەشن کە سۆفیەکان بیانویان پێ دەهێننەوە ئەوان لەسەر رێگایەکی دیکەن جیایە لەرێگەی سۆفییان!

---

١ لەم ئایەتەدا تەنیا ئاماژە بەو نیعمەتانە ناکرێ کە سود بە مرۆڤ دەگەیەنن، بەڵکو بەرەو ئەو جوانیە بێ هاوتایەش ئاراستە دەکرێ کە لە ئەفراندنی بێوێنەی خوادا هەیە و، خودی ئەو جوانیەش یەکێکە لە نیشانەکانی خودا و مایەی بڕواهێنانی مرۆڤن.

رەنگە لەیەکەم تێڕوانیندا هەندێك لایەنی روکەش لەنێوان زاهید و سۆفیدا پێك بچن.

هەردوکیان وازیان لە خۆشی و رابواردن هێناوە و، زۆربـەی کـات لێـی دورن و، هەردوکیان رویان داوەتە جۆرەکانی پەرستن کە دەرفەتی رابواردنـی نەهێشـتون بـە خۆشیە موباحەکان..

بەڵێ.. بەڵام لەپاش ئەوە لێـك جیادەبنـەوە و! هێنـدەی نامێنـێ جیابونـەوەی نێوانیان تەواو بیانکاتە پێچەوانە!

لەجۆری ئەو پەرستنە لێك جودا دەبنەوە کـە هەریەکـەیان روی تێدەکـا.. واتـە لەراستیدا ئەوان لە (چەمکی پەرستن)دا لێك جودا دەبنەوە و، پاشـان لەبەرنامـەی ژیان و بەرنامەی رەفتاردا لێك دادەبڕێن.

لە خۆ قەدەغەکردنی هەندێك لە ئارەزوان لەسەرەتادا بڕیارێکی بـەهێزی دەوێ، بۆ بنیاتی ئەو (بەربەست)ەی کە لەروی ئەو ئارەزوانەدا دەوەستێ، پاشان خودی ئەم لەخۆگرتنەش، کاتێك لەڕوی شەپۆلی هـەڵچوی ئارەزوەکـان دەوەسـتێ، وزەیـەکی مەزن لەدەروندا کۆدەکاتەوە، کە لە خودی خۆیدا بـەرزە و، رو لـە ئاسـتی بـەرز و باڵاتر دەکات و، لەو ئاسـتە باڵایانـەوە هەڵدەکشـێ، هـەروەکو بەربەسـت لـەروی شەپۆلی ئاو دەوەستێ و بەشێکی لیٚ گل دەداتەوە، جا ئاستەکەی بـەرز دەبێتـەوە، تاکو دەگاتە ئاستانێك کە شەپۆڵەکە لەرێچکەی رەسەنی خۆیدا نەیاندەگەیشتێ..

تا ئێرە ئەو (کردارە دەرونیەی) کە لە زوهد و، لە سوفیزم دروست دەبـن، پێـك دەچن و.. لەدەرونی زاهید و سۆفیدا وزەیـەکی دەرونـی مـەزنی ئاسـت بـەرز کـۆ دەبێتەوە، کە دەتوانێ بەرەو هەندێك ئاسۆ بچێ کە هـەرگیز خـاوەنی ئـەو دەرونـە نایگاتێ کە لەگەڵ ئارەزوەکاندا دادەکشێ..

پاشان ئاسۆكان جیادەبنەوە..

هەرچی زاهیدانی نەوەی یەکەمن، لەسەروی هەموشیانەوە سەروەری زاهید و دنیا نەویستان ﷺ سروشتی ئاسۆكانیان پێ ناساندوین کە بەهۆی خۆگرتنیان لە خۆشیەکانی زەوی بۆی بەرز بونەتەوە..

جیهاد کردن لەپێناو خودا، جیهادکردن تا ناوی خودا بەرزبێ، جیهاد کردن بۆ ئەوەی ئاین هەموی بۆ خوا بێ. جیهاد کردن بۆ بەرپاکردنی دادگەری پەروەردگار لەواقیعی زەویدا. جیهاد کردن بۆ بەرپاکردنی کۆمەڵگەیەکی نمونەیی کە لە جیهانی واقیعدا ئەو شتانە بێنێتە دی کە خەڵك لە جیهانی میسالدا بەخەیاڵیان دادێ، ئەو ئیجابیەتە مەزنەی کە واقیعی خواروخێچ دەگۆرێ و، لەباتی وی واقیعێکی رێکوپێك دادەمەزرێنێ، فەرمان بەچاکە و نەهی لەخراپە، کە دو پەیامی ئەم ئوممەتەن کە خودا دەریخستوە تا ببێتە چاکترین ئوممەت:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرتان هەڵدا، فەرمان بە چاکە دەدەن و رێ لە ناڕەوا دەبەستن، باوەڕیشتان بەخوا هەیە.﴾آل عمران/١١٠.

ئاسۆ گەلێکی بەرز و باڵا، ئەو وزەیە هەڵگیراوەی تێدا دەتەقێتەوە کە دنیا نەویستی بەرزی کردۆتەوە، جا لەجیهانی واقیعدا بنیاتێکی باڵا بەرز دادەمەزرێنێ کە چاوان گەش دەکاتەوە، جا روناکی بەزەویدا پەخش دەبێ و، ئەوەندەی خودا بیەوێ لەتاریکییەکانی مرۆڤایەتی رۆشندەکاتەوە و.. لە ماوەی نیو سەدەدا روناکی وا تەشەنەی کرد، لە زەریاوە لەرۆژئاوا تا ئەودیوی هیند لە رۆژهەڵاتی گرتەوە، نەهیچ بەربەستێك روبەڕوی دەوەستا و، نە تاریکی لەروی رادەوەستا.

ئەمەو، زاهیدانیش-لەسەروی هەموشیان پێغەمبەری خوا ﷺ - خۆشـــییان لـە خۆیان حەرام نەدەکرد، بەڵکو بەسەر خۆشیاندا بەرز دەبونەوە، جا چیدی لە جیـــهاد لەو ئاسۆ بەرز و باڵایانەی کە جیهادیان تێـدا دەکـرد خـەریکی نـەدەکردن و، لـەو ئامانجە بەرزانەش غافڵی نەدەکردن کە بە وزە ئیجابیەکەی خۆیان هــەوڵیاندەدا تـا لە جیهانی واقیعدا بەدی بێنن.

کاتێك عائیشە-رەزای خـوای لێ بــێ-ی خـێزانی پێغەمبــەر ﷺ پێغەمبــەر ﷺ دەبینێ کە لەسەر عەباکەی خۆی لەسەر خاکێکی وشکدا دەنوێ، دڵی بۆ دەسوتێ، بۆیە عەبایەکەی دوقەد دەکاتەوە تا بۆ جەستەی پیرۆزی نەرمتر بێ، پێغەمبـــەر ﷺ توڕە دەبێ و فەرمانی پێدەدا تا وەکـو خـۆی لێ بکاتــەوە، بـۆ ئـەوەی لـە ئاسـتە بەرزەکەی لێبڕان بۆ خودا بمێنێتەوە و، ئەو (نەرمیە) ڕێژەییـــە، لەگلدانـەوەی هـەمو وزە و توانای بۆ جیهاد لەپێناو خودا خەریکی نەکات، لەگەڵ ئەمەشدا هەر بەخۆی بو ﷺ فەرموی: ((وَلَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأَقُومُ وَأَنَامُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِـــبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي: بەڵام من ڕۆژی دەگرم و بێرۆژوش دەبم و، شەوان هەڵدەســتم و دەشنوم و، ژنیش دەهێنم، ئەوەی واز لە سونەتی منی بێنێ لەمن نیە)).[1]

ئەدی صۆفیەکان چییان بەو وزە مەزنە کرد کە بەرزبونەوە بەســەر خۆشـیەکاندا لە نەفسی وان دروستی کرد ؟!

لەجۆرە جیهادێکی دیکە خەرجیانکرد.. جیهادی شــەیتان لـەناو دەرونـەکاندا، لەپێناو ئەوەشدا هەمو ئایەتـەکانی جیـهادیان تـەئویلکرد کـە لـە کتێبـی خـوادا هاتون، تەنانەت ئەوانەش کە زۆر بە وشەی ڕاشکاوانە باسی کوشـــتار و ڕەقـەکاری لەگەڵ بێبڕوا و دوڕواندا دەکەن!

---

١ متفق علیە.

بێگومان فەرمان بەجیهادی شەیتان دراوە.. دەرەنجامێکی ئاساییشە گەر بڵێین: ئەو نەوە ناوازەیەی کە لەجیهانی واقیعدا ئەو نمونە بەرزانەیان هێنایە دی، جیهادی شەیتانیشیان کرد و بەگــەورەترین شـێوە لـەمێژودا بەسـەریدا سـەرکەوتن، بـەڵام جەنگی خۆیان لەگەڵ شەیتاندا نەکردە دوا کــار و پیشــە.. تەنانــەت پــاش ئـەوەی بەشایەدی خوای شارەزا و لێزان دەسەڵاتی لەدەرونی ئەواندا کۆتایی پێهات:

﴿إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، إِنَّمَا سُــــلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ: شەیتان هیچ دەسەڵات و زۆرێکی نیە بە سەر ئەوانەوە کە بونە خاوەن باوەڕ و خۆیان بە پەروەردگاریان ئەســپاردوە، ئـەو هەر بەسەر ئەوانەدا دەستی دەڕوا، کە خۆیان کردۆتــە دۆســتی و شــەریك بــۆ خـوا پەیدا دەکەن.﴾النحل/٩٩-١٠٠.

ئەمەش وەسفێکە بۆ هەمو بڕواداران راستە، بــەڵام بەسـیفەتێکی تایبــەت بــۆ ئەوانەی کە خودا شایەدی بڕواهەبونی بۆ داون:

﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْـــهِ مِـــنْ رَبِّـــهِ وَالْمُؤْمِنُــونَ: ئـەم پێغەمبـەرە و بڕوادارانیش هەموو بڕوایان بەو شتە هێناوە کە لەلایەن پەروەردگاریانــەوە هاتۆتـە خوار.﴾البقرة/٢٨٥.

﴿أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْــرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّـــهِ أَلاَ إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمْ الْمُفْلِحُونَ: کە ئەمانە خودا بڕوای لە دڵیان جێگیر کــردوە و بەهێزێکی تایبەتی خۆی یاری کردون، دەیــان نێرێتــە باغــاتێك جۆباریـان بەبـەردا دەڕوا و هەتا سەر هەر لەوێ دەبن. خودایان لێ رازیبوە و ئەوانیش لە خودا رازین. ئەوانە کۆمەڵەی خودان. باش بزانن کە هەر کۆمەڵی خودا رزگارن.﴾المجادلة/٢٢.

بەڵکو جەنگەکەیان دژی شەیتان و سەرکەوتنیان بەسەریدا بریتی بو لەو پێگەیەی کە هەنگاویان تێدا هەڵدێنا بۆ بنیاتنان.. بۆ جیهاد.. بۆ فەرمان بەچاکە و بەرهەڵستی لە خراپە.. بۆ بەرپاکردنی دادگەری پەروەردگار لە زەویدا.. بۆ لێدانی قەڵاکانی هاوبەشپەرستی و دامەزراندنی قەڵاکانی بڕوا.. بۆ نەهێشتنی تاغوتان و بەرپاکردنی حوکمی خوا.. بۆ دامەزراندنی هێزێك کە دوژمنانی خوا بترسێنێ..

نەیاندەتوانی هیچ شتێك لەمانە ئەنجام بدەن ئەگەر بەجیهادی شەیتان لەناخی دەرونی خۆیانرا دەستیان پێنەکردبا، یا ئەگەر شەڕیان لەگەڵ شەیتاندا بەهەڵپەرسێردراوی بمابایەوە و یەکجاری بەسەریدا سەرنەکەوتبان.. بەڵام ئەوان هەرگیز لەلای ئەو جەنگەیان دژی شەیتان رانەوەستان تا بڵێن: ئێرەمان مەبەستە و ئەمە کۆتایی کارمانە!

* * *

لەشەڕی دژی شەیتاندا مەسەلەیەکی دیکەش هەیە سەرنج رادەکێشێ.

رێگەی سۆفیان لە شەڕیان لەدژی شەیتان بریتی بو لە کوشتنی (نەفس) کە شەیتان تیایدا دەحەوێتەوە، تاکو شوێنێك نەدۆزێتەوە و بڕوا! کەچی جێ حەوانەوەی شەیتان ئەو ئارەزوانەن کە بۆ مرۆڤ رازێنراونەتەوە، شەیتان بەردەوام فویان لێدەکا تا گڕ دەگرن، جا خاوەنەکەی ناتوانێ بیانکوژێنێتەوە و گڕ و بڵێسەیان زیاد دەبێ! بەڵام ئەگەر ئارەزوەکان مردن و شەیتان شوێنێکی لەدەروندا دەستنەکەوت و، نەیتوانی رۆڵی خۆی ئەنجام بدا ئەوجا:

﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ: لەراستەڕێیان دەردەخەم و دڵیان پڕ دەکەم لە ئاوات و بۆخۆم فەرمانیان پێدەدەم..﴾النساء/١١٩.

﴿وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي الأَمْوَالِ وَالأَولاَدِ وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُوراً: هەرکامێ تۆ پێی دەوێری بانگی بکە و دنەی بدە و بە سوار و پیادەی خۆتەوە بگە سەری و ببە هاوبەش لە ماڵ و زارۆڵەکانیان. بەڵێن بدە وان، بەڵێنی شەیتان تەنیا هەر خەڵەتاندنە.﴾الاسراء/٦٤.

بۆیە سۆفی هەر (جیهاد) دەکا و لەپێناو تێکۆشانەکەش بەرگەی ناخۆشیان دەگرێ، تا لەکۆتاییدا سەردەکەوێ و ئارەزوەکانی دەکوژێ، بۆ ئەوەی شەیتان بڕوا و وازی لێبێنێ!

بەڵام زاهید لە شەڕی دژە شەیتاندا ڕێگەکەی بریتی نیە لە (کوشتنی نەفس) بە کوشتنی ئارەزوەکان.

بەڵکو ڕێگەکەی کە لە بەرنامەی پەروەردگارەوە وەریدەگرێ، بریتیە لە (قایمکردنی نەفس) بەپێی توانا دژی فریودانی شەیتان، لەگەڵ هێشتنەوەی دەرون بەزیندوێتی لە پێناو ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەپێی داخوازی بەرنامەی پەروەردگار و. لە پێناو جیهادکردن لەڕێی خودا.

ئەو هاندەرانەی خوا لە دەرونی مرۆڤدا وەدیهێناون، هەر لەو گۆڕەی داینەناون، بەڵکو دانانیان لەلایەن خودای گەورەوە مەبەستێکی تێدایە.

خودا بۆیە مرۆڤی وەدیهێناوە تا ببێتە جێنشین لەسەر زەوی و، ئاوەدانکردنەوەشی پێ ڕاسپاردوە:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً: ئەو کاتەی پەروەردگاری تۆ بە فریشتانی ڕاگەیاند: من دەمەوێ بریکارێك لەسەرزەمین دیاری بکەم.﴾البقرة/٣٠.

﴿هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا: ئەو لەم خاکەی وەدیهێنان و ویستی ئاوەدانی بکەن. ﴾هود/٦١.

هەر لەبەر حیکمەتێکی دیاریکراویش خودا مرۆڤی لەچنگە قوڕێك زەوی وەدیهێناوە، پاشان لەروحی خۆی فوی پێدا کردوە و، وەك فریشتان لە روناکیەکی باڵاوتەی وەدینەهێناون!

﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ، فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ: کاتێ کە پەروەردگاری تۆ فریشتەکانی راگەیاند، وا خەریکم مرۆهێك لەقوڕ چێ بکەم، هەرکات لەشیم تەواوکرد و لەگیانی خۆم پێداکرد هەموتان سوژدەی بۆ بەرن. ﴾ص/٧١-٧٢.

لەگەڵ چەنگە قوڕەکەدا ئەو ئارەزوە رازاوانە لەدەرونی مرۆڤدا پەیدابون:

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأنعام وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا: ئارەزوی ژنان کردن و کوڕی زۆر پەیداکردن و دەستکەوتنی کۆمای زلی زیو و زێڕان و رەوە ئەسپی بە دروشم و وڵسات و زەوی کێڵانێ، بۆ مەردم رازاوەتەوە و لە ژیانی دنیایەدا مایەی خۆشین. ﴾آل عمران/١٤.

بەڵام بەفوە باڵاکە هەر قوڕێکی تاریك نەما و، رابواردنیش وەك چێژێکی ئەستوری بەرهەست لەشێوەی رابواردنی ئاژەڵاندا نەما. بەڵکو-هێشتا هەر قوڕ بو- شەفافیەتێکی روحی وەرگرت کە لە تاریکی و نوتەکی قوڕ دەبیاراست و، بەها و مەبدەو و ئامانج و ئاسۆی شایستەی (مرۆڤ) تێیدا پرشنگی دەدا.

که خودا ڕێزی لێناوه و بەرزی کردۆتەوه:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً: ئێمه ڕێزمان له تۆرەمەی ئادەم گرت و له وشکانی و زەریادا هەڵمان گرتن. ڕۆزی پاکژمان پێداون له چاو زۆر له خەلقی خۆمان زۆر پتر قەدرمان گرتون.﴾الاسراء/٧٠.

خودای وەدیهێنەری شارەزا دەزانی ئەو (ئارەزوانە) یا بڵێ (هاندەرانە) بۆ بونی مرۆڤ زەروریـن، تاکو کار و بەرهەم و دەسکەوت و چالاکی و بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی هەبێت -که داخوازی جێنشینین لەسەر زەوی- بۆ ئەوەی ڕێگر و بەربەست-که زۆرن- لەبەردەم وەدیهێنانی ڕۆڵی داواکراو له مرۆڤ نەوەستن.

• هەروەك خودای بەرز دەزانێ که ئەو هاندەرانه دەبێ ڕێکخەریان هەبێت هەتا له ئەرکی ڕێکوپێکی خۆیان نەکەون و نەبنه کاولکاری بۆ مرۆڤ.

بەرنامەی پەروەردگاریش ئەو هاوسەنگیه داواکراوه دروستدەکا، که ئەو ئارەزوانه ڕێکدەخات بێئەوەی بیانکوژێ و، بێئەوەی لەهەمان کات بەبەرەڵڵایی لێیان گەرێ تا بەربەستەکان بشکێنن.

ڕاستیشه که ئەو (هاندەرانە)یا بڵێ (ئارەزوانە) خاڵی تاقیکردنەوەن له ژیانی مرۆڤ:

﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً: هەرچی لەم سەر زەمینەیه ئێمه کردمان بە ئارایشت تا بیانئەزموین[1] کامەیان کارچاکتر دەبن.﴾الکهف/٧.

---

[1] بیانئەزموین: تاقیان بکەینەوه.

ئەمەش بریتی‌یە لەو لایەنەی کە سۆفیزم بەدیکرد و جەختی لەسەر کـرد.. کـە دیتی مرۆڤ لە لایەنی ئارەزوەکانیەوە دەکەوێتە ناو تاقیکردنەوە، جا ئەگەر توانـی لەناوی ببا و بیکوژێ ئەوا لە تاقیکردنەوەکەی سەرکەوتوە..

بـەڵام حیکمـەتی لـە وەدیـهێنانی ئـەو ئارەزوانـەی پشـتگوێ خسـت، لەگـەڵ زەرورەتی زیندوهێشتنەوەی لـە دەرونـی مـرۆڤ و زەرورەتـی ڕێکخسـتنی بـەپێی توانای مرۆڤ.. هەروەك بەرنامەی پەروەردگار بڕیاری لەســەر دەدات کـە لەلایـەن خواوە دابەزیوە و پێغەمبەری خوا ﷺ رونیکردۆتەوە:

((أَلاَ إِنِّي أَعْبَدُكُم لِلَّهِ وَأَخْشَاكُم لَهُ، وَلَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِـــرُ وَأَقُـــومُ وَأَنَـــامُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ: من لەهەموتان پتر بەندەی خوام و لەهەموان زیاتر لیٚ دەترسێم، بەڵام من ڕۆژی دەگرم و بێرۆژوش دەبم و، هەڵدەستم و دەنوم و ژنیش دەهێنم)).[1]

کاتێك ئەم حیکمەتەیان پشتگوێ خست ئەنجامەکەی چی بو؟!

مرۆڤ ناتوانێ ببێتە روناهیەکی پاڵاوتە هەروەك سۆفیەکان لەجیهادی گەورەیان دژی ئارەزوەکان حەزی لێدەکەن!

لەهەمان کاتیش ئایا مرۆڤ ئەو پەرستنەی ئــەنجامداوە کـە لێـی داواکـراوە-و بەباڵای خۆی هەڵبڕاوە[2]-. ئەگەر بەهۆی کوشـتنی جەسـتە و مراندنـی ئارەزوەکـان بگاتە رونی نورانیەتی رۆحی؟!

کەس نکوڵی ناکا کە سوفی راستەقینە[3] بە وەرزشی روحی دەگاتە ئاسۆ گەلێکی رون کە روحی سوکەڵەبوی دابڕاو لە قورسایی جەسـتەی تێـدا هـەڵدەفرێ، کـە لـە کێشکردنی ئارەزوەکان رەهابوە، جا دەگاتە جیهانگەلێکی وا کەسێك نایگاتێ کــە

---

١ متفق علیه. ٢ بگەڕێوە بۆ (چەمکی پەرستن).

٣ واتە راستگۆی دنیا نەویست، نەك فاڵچی پسپۆڕ.

بەقورەوە نوساوە و، لە ئارەزوەکاندا نقوم بوە..

لەلایەکی دیکەوە سۆفی دەکەوێتە سرپونێکی بەتام و وادەزانێ کە (گەیشتوە).. جا لێرەڕا کار ناکا! چونکە کاروکردەوە و ئامرازی گەیشتنی مرۆڤی (ئاسایی)ن. وا ئەویش بەڕاستی گەیشتوە، کەواتە چ ئاتاجی ئامرازە! چونکە کەسێك بۆ ئامراز هەولدەدا کە هێشتا (نەگەیشتوە).. بەلام ئەوانەی گەیشتون.. هێندەیان بەسە کە گەیشتون!

بەمجۆرە چەندین فاکتەر لەدەرونی سۆفیدا یەکدەگرنەوە کە لە کردەوەی واقیعی ژیان دوری دەخەنەوە.. دوری دەخەنەوە لەو (جیهاد)ەی کە زاهیدێك بۆ بەرپاکردنی بەرنامەی خوا لەسەر زەوی ئەنجامیدەدا.. تاکو وشەی خودا بەرزبی.. بۆ ئەوەی ئاین هەموی بۆ خوابێ.. بۆ تێکشکاندنی ناڕەواو لەنێو بردن و، جێگیر کردنی رەوا و بەرزکردنەوەی.. بۆ بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوە.. بۆ زۆرکردن و گەشەپێدان.. بۆ ئامادەکردنی هێزێك بۆ تۆقاندنی دوژمنی خوا..

فاکتەری یەکەم بریتیە لە تێڕوانینی بۆ دنیا -کە لەهەستی ویدا لە ئاخیرەت جوایەزە- کە زیندانێکە هەولدەدا لێی دەرباز بێ، بەڕەهابونی رۆح کە لە قورئاسی جەستە رزگاربوە و، پەیوەندی بەنوری خودایی و بەئاخیرەتەوە کردوە- کە لەهەستی ئەودا لەدنیا دابڕاوە..

جا کاتێك دنیا زیندان دەبێ.. ئایا هەرگیز زیندانی بۆ ئاوەدانکردنەوەی زیندانەکەی تێدەکۆشێ، لەکاتێك ئەو دەردەسەریەی لەدەست دەبینێ؟!

بەلکو بیری خۆی لێ لادەدا و.. گوێی ناداتێ چی لێتێکچوە یا روخاوە و..هەولنادا شتێکی لێ چاکاتەوە.. لەکاتێکدا کە چاوەڕێی ئەو رۆژەیە لەدەستی دەرباز بی!

فاکتەری دوەمیش نەمانی (خولیا/رغبة)یە.. بەهۆی نەمانی ئەو (هاندەرانەی) خولیاکان دەبزوێنن..

مرۆڤ کە (خولیا)ی خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و نشینگە و سێکسی هەیە.. یا (خولیا)ی هێز.. یا (خولیا)ی مولکداری.. یا (خولیا)ی زانست.. یا (خولیا)ی زاڵبون.. یا (خولیا)ی پلە و پایە.. یا (خولیا)ی پێشکەوتن.. یا (خولیا)ی بنیاتنانی هەستی یا مەعنەوی هەیە.. جا دەجولێ.. دەجولێ تا ئەو شتانە وەدیبێنێ کە خولیاکان لە دەرونیدا فیتی دەدەن، بەچاوپۆشین لەوەی کە بەرزبن یا نزم، رێك بن یا لاری، پابەند بن یا سنوربەزێن..

بەڵام کاتێك خەمی وەرزشی رۆحی بوە کوشتنی خولیاکان تا دەرونیان لێ (رزگار) بکەن.. بۆچی بجولێ؟ بۆچی تێبکۆشێ؟ لەکاتێکدا کە لە هەمو دنیا هیچی نەوێ.. ئەگەر شتێکیش داوا بکا، هەر هێندەی دەوێ کە ژیانی بپارێزێ.. بەکەمترین بڕی بژێویش کە ژیانی بپارێزێ؟!

فاکتەری سێیەمیش ئەو درەوشانەوە رۆحیانەن، یا گەر دەتەوێ بڵێ ئەو بەڵگەی وا لەخاوەنەکەی دەکا وابزانێ (گەیشتوە).. یا بڵێ لەزەتی ئەو فەنایەی کە بون دەسازێنێ!

بەهەرچی ناوت برد.. بریتیە لەهەستێك نیگای رەزامەندی و تێربون بەدەرون دەبەخشێ.

تێربون بەوەی کە بەردەستە و.. نەبونی خولیای شتێکی دیکە! یا ئەگەر خولیاشی هەبو ئەوا خولیای (پایەی) بەرزتر دەبێ.. بۆیە وەرزشێکی روحی زیاتر ئەنجامدەدا.. زیاتر نەفس دەکوژێ هەتا بژی.. زیاتر فەنابون هەتا وجود بێتەدی!

جا کاتێك ئەو سێ فاکتەرە کۆ دەبنەوە، لەپاڵ ئەو چەمکە سلبیەی بیروبـاوەڕی قەزا و قەدەر، کە هەوڵی گۆڕینی هیچ شتێك نادا لەوانەی هـەن-هەرچـەند خـراپ بێ- چونکە بەقـەدەری خـوا هاتۆتـە بـون و! هـەوڵی گۆڕینیشـی لـەدیدی ئـەودا بەیاخیبون لەقەدەری خوا دادەنرێ..

کاتێك ئەوفاکتەرانە هـەموی لـەدەرونی سـوفیدا کۆدەبنـەوە، چ شـتێك هەیـە هانیبدا مل بەشەپۆلی بێئامانی ژیانەوە بنێ؟!-ئەگەر بشجولێ- ئەوا ئەو پەڕی بۆ هەندێ دەجوڵێ تاخۆی لە لێشاوەکە لادا، بۆ ئەوەی بەئاشتی لەسەر زەویدا بژی!

* * *

لە کۆتاییشدا-هەروەك باسمانکرد- سۆفیگەری پشت بەفیتنەی دنیـا دەبەسـتێ کە دەبێتە هۆی کەوتنە نێو گوناهان، تەنیا بەکوشتنی ئارەزوەکانیش دەکرێ خـۆی لێ بپارێزێ، تا لە خلیسکەکانی شەیتان دوربکەوێتەوە..

لـەم بوارەشـدا گـەلێك ئاراسـتەکردنی قورئـانی دەدۆزنـەوە، لەگـەڵ زۆر لـە ڕێنماییەکانی پێغەمبەرﷺ:

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلاَ تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلاَ يَغُرَّنَّكُم بِاللَّـهِ الْغَرُورُ: ئەی خەڵکینە! بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، ژیانی دنیا نەکا بتاخەڵەتێنێ و نەکا شەیتان بە بەخشندەیی خوداتان فریو بدا.﴾فاطر/٥.

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لاَ يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ وَلاَ مَوْلُـودٌ هُوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئًا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلاَ تَغُرَّنَّكُمْ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلاَ يَغُرَّنَّكُـمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ: ئەی خەڵکینە! دەبێ لە پـەروەردگارتان ترسـتان هـەبێ، ترسـی ئـەو ڕۆژەشتان هەبێ کـە هیـچ بـاوکێك ئۆبـاڵی منداڵـی خۆشـی لەسـەر نیـە و هیـچ

منداڵێکیش بۆ بابی سودی نابێ. بەڵێنی خودا هەر راستە و نابێ هەرگیز ژینی دنیا فریوتاندا، نەشچن شەیتان بە بەخشندەیی خودا فریوتان بدا.﴾لقمان/٣٣.

﴿وَاضْرِبْ لَهُمْ مَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاء أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاء فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِرًا: نمونەیەکیان لە ژینی سەر دنیایە بۆ بێنەوە وەك ئاوێکە لە حەواوە دامان باراند. هەمو تەرزە روەکێکی بەرهەم هێنا، سەرەنجامیش بو بە پوش و با بژگاندی خوا بەسەر هەمو شتاندا توانای هەیە.﴾الکهف/٤٥.

﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الأَمْوَالِ وَالأَوْلادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا وَفِي الآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ: بزانن، ژینی دنیایە هەر گەمە و بادی هەوایە و بۆ خۆ جوان نیشان دان و خۆ لەسەر یەکتر ڕانان و فرەبونی منداڵ و داراییتانە و وەك چناوێك بەهۆی بارانە شین بوە و وەرزێری پێخەنی بوە و بەرەبەرە وشك دەبێ و دەبینێ زەرد هەڵگەڕاوە و لەدواییدا بوەتە کاوکۆتی بەربا. لەولاش ئازاری دژوار و لێخۆشبون و ڕەزامەندی خودا هەیە. ژینی دنیا هەر مایەی خەڵەتاندنە و چی تر نیە.﴾الحدید/٢٠.

((فَوَاللَّهِ مَا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ، وَلَكِنْ أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ عَلَيْكُمُ الدُّنْيَا كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا، وَتُلْهِيَكُمْ كَمَا أَلْهَتْهُمْ: سوێند بەخوا ترسی هەژاریم لێتان نیە. بەڵام دەترسێم دونیاتان بۆ

بکرێتەوە هەروەك بۆ ئەوانەی پێش ئێوە کرابۆوە، جا وەك ئـەوان کێبڕکێی لەسـەر بکەن و، چۆن ئەوانی خافڵاند ئێوەش بخافڵێنێ)).[1]

لە ئەبوذەر ﷺ هـاتوە، دەڵـێ: لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ دەڕۆیشـتم لـە حـەڕڕەی مەدینەدا کەوتینە بەرامبەر کێوی ئوحود، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەی ئەبوذەر!

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی: ((مَا يَسُرُّنِي أَنَّ عِنْدِي مِثْلَ أُحُـــدٍ هَذَا ذَهَبًا تَمْضِي عَلَيَّ ثَالِثَةٌ وَعِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ، إِلَّا شَيْئًا أَرْصُدُهُ لِدَيْنٍ، إِلَّا أَنْ أَقُولَ بِهِ فِي عِبَادِ اللَّهِ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا-عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَمِنْ خَلْفِهِ- ثُـــمَّ مَشَى ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الأَكْثَرِينَ هُمْ الْمُقِلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَّا مَنْ قَالَ هَكَذَا وَهَكَـــذَا وَهَكَذَا-عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَمِنْ خَلْفِهِ- وَقَلِيلٌ مَا هُمْ: پێم خۆش نیە هێنـدەی ئەم کێوی ئوحودە زێڕم هەبێ و سێم بەسـەردا تێپـەڕێ و دینـارێکم لا بمێنێتـەوە، تەنیا شتێك کەبۆ قەرداری دامنابێ، مەگەر لەنێو بـەندەکانی خـودا ئـاوا و ئـاواو ئاوای لێبکەم بەلای ڕاست و بەلای چەپ و بۆ پشتە خۆی- پاشان ڕۆیشـت ئینجـا فەرموی: زۆربەی خەڵکی لە ڕۆژی ئاخیرەتدا کەمیان هەیـە مەگـەر ئەوانـە ئـاواو ئاواو ئاوایان گوت، بـەلای ڕاسـت و بـەلای چـەپ و بـۆ پشـتە خـۆی، ئەوانـەش کەمن)).[2]

هاوەڵانیش ئـەم ئاگاداریانـەیان لـە کتێبـی دابـەزیوی خـوا و، لـە فـەرمودەی پێغەمبەر ﷺ گوێ لێبو و، دڵیان لێی پڕبو، بەیەقینیش زانیـان کـە خۆشـی دنیـا بەسـەر دەچـێ و، ئاخـیرەتیش خۆشـی ڕاستەقینەیەکە شایسـتەیە مـرۆڤ بـۆی مکوڕبێ، جا خۆیان لەگەڵێك خۆشیەکانی زەوی پاراست..

---

١ أخرجه البخاري.

٢ أخرجه البخاري.

بەڵام-هەر وەکو باسمان کرد- ئەو زوهدە ئیجابیە دەسپێشخەرە بنیاتنەرە بو کە خاوەنەکەی بەرەو جیهاد و روبوروبونەوە هاندەدا، نەك بەرەو لەناوخۆدا گرمۆڵەبون، -هەر وەکو پێشتر باسمانکرد- ئەو زوهدە بو کە دەرونی دژی فیتنە قایم دەکرد نەك ئەوەی دەرون دەکوژێ بۆ خۆپاراستن لە فیتنە!

ئـەم ئاگاداریانــە بــۆ وەبیرهێنانــەوەن، تــاکو خــەڵك بــەدنیا هەڵنەخەڵــەتێن و ئاخیرەت لەبیر نەکەن، بۆ قەدەغەکردنی مومارەسەی ژیانیش لەدنیادا نەهاتون، یــا بۆ قەدەغەکردنی جوڵە و چالاکی و کارکردن تیایدا..

ئەو ئاگاداركردنەوانە پتر لەکۆمەڵێك لافیتە دەچن کە خــەڵك لــەترکزە ئاگــادار دەکەنەوە لەرێگا خلیسکەکان.. نەك بۆ ئــەوەی واز لــە رۆیشــتن بێنــن! بــەڵکو بــۆ ئەوەی ئاگایان لێبێ نەخلیسکێن!

جا ئەگەر خەڵکێك هاتن و گوتیان: بەم رێیەدا نارۆین چونکە لافیتەی تێدا هەن لە خلیسکان ئاگادارمان دەکەنەوە، بێگومان ئاگاداریەکەیان لەرادە دەرچون تــاوای لێکردون دانیشن! ئەوەی متمانەشــی بــەخۆی هــەبێ بــەرێگا دا دەڕوا و هــەوڵدەدا نەخلیسکێ، ئەوەی بشترسێ واز لە رۆیشتن دێنێ!

سەیری ئەم فەرمودەیەش بکە لە فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ: ((**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا فَتَسْتَغْفِرُوا لَذَهَبَ اللَّهُ بِكُمْ وَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ فَيَغْفِرُ اللَّهُ لَهُمْ**: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگــەر گونــاە نەکــەن و داوای لێخۆشبون نەکەن خودا ئێوە لادەبــا و خــەڵکانێك دێنــێ گونــاە بکــەن جــا داوای لێخۆشبون بکەن و خوداش لێیان خۆشدەبێ.))[1]

ئایا ئەمە هاندانە بۆ گوناح کردن؟!

---

[1] أخرجه مسلم.

بێگومان نەخێر!

کاری پێغەمبەرێك نیە لەلای خودا ناردرابێ کە خەڵکی بۆ گوناح کردن هانبْدا، لەکاتێکدا هەر بەخۆی بانگەوازی خەڵکی دەکا تـا تاعـەتی خـوا بکـەن و-بـەپێی توانا- لە گوناهان دورکەونەوە!

بەڵکو ئەمە هاندانە بۆ کارکردن!

چونکە کاتێك مرۆڤ مومارەسەی کردەوەیك دەکـا لـەواقیعی ژیـاندا مەحالـە توشی گوناهان بێ!

((كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٌ..: هەمو ئادەمیزادێك دەکەوێتە هەڵەوە.))[1]

جا ئەو کاتە رێگەی ئـەو بـڕوادارەی کـە لـەواقیعی ژیـاندا کـار دەکـا پاشـان دەکەوێتە نێو گوناهێك، ئەوە دەبێ کە داوای لێخۆشبون بکات:

﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِـهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُـمْ يَعْلَمُـونَ، أُولَئِـكَ جَزَاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَنِعْـمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ: ئەو کەسانەی هەرکاتێك کاری خـراپ دەکـەن، یـان ناحـەقی لـەخۆ دەکەن، خودا لەبیر نابەنەوە و لەبەری دەپاڕێنەوە، لە خەتاکانیان ببورێ، بێجگە لە خوداش کێ لە گوناهان دەبورێ؟ جـا ئەوانـە لەسـەر کـارێ کەزانیویانـە هەڵەیـە، پێداگر نین.. ئەوانە پاداشیان لەلای پەروەردگاریان لێبوردنە و بەهەشـتگەلێکە کـە جۆباران بە بەریاندا دەڕۆن و تاهەتایە هەر لەو بەهەشتە دەمێننەوە، چەندە جوانـە پاداشتی ئاکار چاکان.﴾آل عمران/١٣٥-١٣٦.

---

[1] پێشتر باسمان کرد

ئەوەی هەرگیز گوناهیش ناکات-ئەگەر قەت مرۆڤی واهەبێ- ئەو کەسەیە کە هەرگیز کردەوەیەك ناکاو! گوناهی هەرە گەورەی-بێئەوەی ئاگاداربێ- ئەوەیە کە هیچ کار و کردەوەیەك ئەنجام نادا!! ئەمەش لەتەرازودا گوناهێکی گەورەیە، چونکە کەموکوڕیەکە لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی بەسەر مرۆڤ فەرزکراوەن!

زیرەکی بەوە نیە مرۆڤ سەبەتێکی پڕ لەسەر سەری هەڵگرێ پاشان بەبێ جوڵە دانیشێ و یەك جوڵە نەکا نەوەك شتێکی ناو سەبەتەکەی لێ بەربێتەوە! چونکە هەر چەند هەوڵدا و بەرگەی ناخۆشیان بگرێ لەودانیشتنە بێجوڵەی دا ئەوا لەو جوڵەیە کەوتوە کە لێی داواکراوە!

﴿كَلاَّ لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ: بەڵام نەخێر! بەچی فەرمانی پێداوە، هێشتا بەجێی نەهێناوە.!﴾عبس/٢٣.

بەڵکو زیرەکی بەوەیە کە ئەو جوڵەیەی لێی داواکراوە ئەنجامی بدا و سەبەتەکەش لەسەر سەربێ و نەکەوێتە سەر زەوی و، شتەکانی نێوی پەرتوبلاو نەبنەوە! ئەگەر-پاش هەوڵدان و، نیەتی باش- شتێکیشی لێ بەربۆوە، لێرەدا خودای بەرز لێخۆشبونی خۆی دەبەخشێتە ئەو کەسەی کە لە کاروباردا خەمسارد نەبوە و، بەربونەوەی ئەو شتەی لێی کەوتوە، بەکەمی نەزانیوە و، پێگیری لە کردەوەکەی نەکردوە، بەڵکو هەر خێرا یادەوەری کردوە وداوای لێخۆشبونی کردوە.

لێرەدا میهر و بەزەیی خودا بۆ مرۆڤ دەردەکەوێ تەنانەت ئەوکاتەی گوناهباریشە، مادام ئەو کردەوەیە ئەنجامدەدا کە لێی داواکراوە و، مادام لەکاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکان توشی هەڵە بوە، نەك لەکاتی دانیشتن و پشتێکردنی ئەرکەکان!

هەروەها مەزنێتی بەرنامەی پەروەردگار لەهەڵسوکەوتی لەگەڵ (مرۆڤ) داردەکەوێ..

-لەبەرنامەی پەروەردگاردا- لە مرۆڤ داوانەکراوە خولیاکانی بکوژێ هەتا لە ئەنجامدانی گوناهان سەلامەت دەرچێ-لەراستیشدا هەرگیز سەلامەت نابێ!- چونکە ئەو خولیا کوشتنە گەلێك لایەنی لە ئەرکی جێنشینی لەکار دەخا کە خوا مرۆڤی بۆ وەدیهێناوە.

بەڵکو لێی داواکراوە کە کار بکا و بجوڵێ-لەهەمو بوارە رێپێدراو و بەردەستەکان- تاکو بەپێی بەرنامەی خوا زەوی ئاوەدانکاتەوەو لەکاتێکدا کە بەپێی توانا بۆ خودا پارێزکارە:

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا: دەبێ لەخودا بترسن تا دەتوانن پارێزکار و گوێرادێر و بەرفەرمان بن.﴾التغابن/١٦.

ئەوجا زەوی پڕ چالاکی و جوڵە و، گەشە و هێز دەبێ، لەگەڵ پاکیەکی وا کە لەتوانای مرۆڤدا بێ.. ئەمەش (چاکسازی زەوی)ە هەروەك لە قورئاندا هاتوە:

﴿وَلاَ تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا: خراپەش مەکەن لەم زەمینەدا دوای باش بونی.﴾الأعراف/٥٦.

ئەوجا کێشە لەواقیعی زەویدا رودەدا، بۆ چاککردنەوەی زەوی ئەگەر گەندکاران گەندەڵیان کرد:

﴿وَلَوْلاَ دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ: ئەگەر خودا هێندێکانی لەو ئاپۆرە بەهێندێکیان تەرت و تونا نەکردایە. ئەم زەمینە خراببو! بەلام خودا چاکەی لەسەر هەمو خەڵکی دنیا هەیە.﴾البقرة/٢٥١.

﴿وَلَوْلاَ دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ: ئەگەر خودا هێندێکانی بە هێندێکانی راونەنابا. دێرو کلێسا و کەنشت و مزگەوتەکان کە لەواندا زۆر ناوی خودا دەبرێ. وێران دەکران. خوا دەهانای ئەوانە دێ کە یاریدەی خودا دەدەن دیاریشە خوا زۆر بەهێز و دەستەلاتە.﴾الحج/٤٠.

بەجۆرە تاکی موسڵمان و ئوممەتی موسڵمان بە ئەرکی خۆیان هەڵدەستن لە زەویدا و.. تا خەڵکیش لەسەر زەویدا مابن ئەو ئەرکە کۆتایی نایێ.

بەمجۆرە تاکی موسڵمان و ئوممەتی موسڵمان (پەرستن)ی داواکراویان بەجێگەیاندوە و-لەچوارچێوەی فراوان و گشتگیرەکەی- خودا چۆنی دەوێ ئاوا مەبەستی وجودی مرۆڤیان وەدیهێناوە..

هەرچی (زاهیدەکان)یشن ئەوا مەسەلەکەیان لەسەر ئاستی (چاکەکاری/احسان) ئەنجامداوە:

((قَالَ: وَمَا الإِحْسَانُ؟ قَالَ: الإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ: فەرموی: ئەدی چاکەکاری؟ فەرموی: چاکەکاری ئەوەیە کە خودا وا بپەرستی وەك بڵێی ببینی، چونکە تۆش نەیبینی ئەو دەتبینێ.))[1]

کەچی سۆفی رویاندابوە نوێژ و رۆژی و (زیکر کردن) و.. گوتیان: ئەمانە ئەو کردەوانەن بۆ ئاخیرەت داواکراون.. بەلام مەسەلەکانی (دنیا) بۆ ئێمە پێویست نیە خۆمانی لێبدەین، چونکە ئەمە ئەو فیتنەیە کە دەمانخاتە تەڵە و داوی شەیتان!

پاشان..!

---

١ لە فەرمودەی جبریلەوە، رواه الشیخان.

لەرۆیشتن و گەڕان بەزەویدا و کۆششی بەدوای بژێوی دورکەوتنەوە و، ژیانی مەمرە و مەژیەیان هەڵبژارد.

لەزانستی دنیایی وەك نوژداری و گەردونناسی و ماتماتیك و ئەندازە و فیزیا و کیمیا دورکەوتنەوە.. چونکە ئەمانە بەدونیای فانیەوە پەیوەستن!

دورکەوتنەوە لە پێشکەوتنی مادی چونکە ئارایشتی ژیانی دنیایە و مایەی بەهیلاك چونە!

دورکەوتنەوە لەزۆرانبازی ناحەق و هەوڵی لەناوبردنی، چونکە خودا چۆنی ویستبێ وابەندەکانی وەدیهێناون، ئەگەر شتێکی دیکەشی گەرەك با ئەوەی دەکرد و، هەر کاتێکیش بیەوێ لەلای خۆیەوە گۆڕانکاری دروستدەکا و هۆکاریشی بۆ دەخولقێنێ..

ئەنجامیش ئەو کارەساتە بو کە توشی جیهانی ئیسلامی هات لە هەژاری و نەزانی و نەخۆشی و، لاوازی و پاشکەوتن لەهەمو گۆڕەپانێکدا!

باری ئاینیش بەم شێوازە راستنابێتەوە و، حاڵی ئومەتیش هەروەها، ناشتوانێ پەیامی هەرە گەورەی خۆی بەجێبگەیەنێ کە خوا ئەسپاردەی کردوە و، بریتیە لەوەی کە ببێتە رێوان[1] و پێشەنگی هەمو مرۆڤایەتی:

﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا: بەو ئاوایە ئێمە ئێوەمان کردوّتە ئومەتێکی هەڵبژاردە، تا ئاگاو لە مەردم هەبێ و پێغەمبەریش چاوەدێریتان لیبکا.﴾البقرة/١٤٣.

جا دەبێ حاڵی ئومەتێك چۆن بێ کە هەر هەموی دانیشتبن و هەموی هەژاربن و، هەموی نەزان و هەمو نەخۆشبن؟!

---

١ رێوان: هادی.

کاتێك هەمو مرۆڤێك بۆ بژێوی تێدەکۆشێ بەو بڕەی کە تەنیا بەشی ژیانی مەمرە و مەژی دەکا، و دەوڵەت (زیادە) لەکوێ بێنێ تا لە پێناو خوا خەرجی کا و ئەم فەرمانەی پەروەردگاری پێ وەدیبێنێ:

﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ: تا بۆتان دەکرێ چەك و جبەخانەی شەڕ و ئەسپی سواری پەیدا بکەن، دوژمنی پێ بترسێنن، کە دوژمنانی خوداشن.﴾الأنفال/٦٠.

کاتێك زانستێکی زەوی و، پێشکەوتنێکی مادی نەبێت، چۆن هێز بۆ تۆقاندنی دوژمنان ئامادە دەکەی؟

کاتێك نەخۆشی بڵاوبێتەوە و چارەی نەکرێ، لەبەر نا شارەزایی لە نوژداری لە لایەکەوە و، لەتەمبەڵیش بۆ چارەسەرکردن لە لایەکی دیکە بەناوی خۆدانە دەست قەدەری خوا و پێ رازی بونی، چۆن ئەو جەستە بەهێزانە پەیدا دەبن کەچەك لە دژی دوژمنان هەڵگرن؟

نەخێر!-تەنیا- ئەم فەرمانەی پەروەردگار سەرەڕای زۆر فەرمانی دیکەی پەروەردگار بەرنامەیەکی دیکەی ژیانی زۆر جیاواز تری دەوێ.

وا دەخوازێ کە خەڵك رو لە زانستی دنیایی بکەن تا تێیدا زاڵ دەبن و، لە دوژمنان زاناتر دەبن و، هەوڵدەن بۆ پێشکەوتنی مادی و بەسەر دوژمناندا سەرکەون و،ماڵێکی زۆریان لەبەر دەستدابێ، تا ئەو هێزەی پێ دامەزرێنن کە بۆ زاڵبون بەسەر دوژمنان پێویستە..

هەروەها (بەرهەم)ێکی زۆریان لەهەمو بوار و هەمو گۆڕەپانێکدا هەبێ.

راستە زوهد لە خۆشیەکانی ژیانی دنیا لوتکەی رەفتاری ئیمانیە و بەرزترین پایەیە کە بڕوادار بیگاتێ..

بەڵام زوهد لە خۆشیەکان ڕێگەی بەرهەم هێنان ناگرێ!

بڕواداری ڕاستەقینە بە ئەو پەڕی تاقەتی خۆی لەو بوارەی کاری تێدا دەکا بەرهەم دێنێ، پاشان بۆ خۆی کەمترین بڕی شتی باش بەکاردێنێ و، ئەوی دیکەی لە پێناو خودا دەبەخشێت و، بەو شێوەیەش کۆمەڵگە دەستەبەری یەکتر دەبن و پێکەوە پەیوەست دەبن، ئەوانەی توانایان هەیە تیایدا بێتواناکان هەڵدەگرن و، ئاستی ژیانی خەڵکیش لێك نزیك دەبێتەوە نە دەوڵەمەندیەکی سنور بەزێن دەبینێ و نە هەژاریەکی تێکشکێنەر.. ئەوجا دەوڵەت ئەو مایەیەی دەستدەکەوێ کە بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام هاوکاری دەکا و، پەیامەکەشی پێ ڕاناگەیەنرێ ئەگەر بەهێز و شکۆدار نەبێ و، دوژمنان لە هێزی نەترسن..

* * *

نامانەوێ زوڵمیش لە سۆفیگەری بکەین و، گوناهی لاوازی پاشکەوتنی بەتەنیا بخەینەمل، کە هانی دوژمنانی دا لەهەمو لایەکەوە هێرش بێنن، تاکو ئەو ئاگاداریەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەم ئومەتە بێتەدی:

((يُوشِكُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمُ الأُمَمُ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ عَلَى قَصْعَتِهَا. قَالوا: أَمِنْ قِلَّةٍ نحن يَوْمَئِذٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُم غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ: هێندەی نەماوە کە ئومەتەکانی دیکە بێنە سەرتان وەکو ئەو بخۆرانەی دەچنە سەر لەگەنی نانخواردن.. گوتیان: ئایا لەبەر کەمی ژمارەمان لەو ڕۆژیدا، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: نەخێر ئەو ڕۆژی ئێوە زۆرن، بەڵام وەکو ئاومالکی سێلاو وان))[1].

---

١ أخرجه أحمد وأبوداود.

چونکە هزری ئیرجائیش لەگەڵ سۆفیگەری دابو، لەپاڵ کەڵەگایی سیاسی و، خۆ دزینەوە لە ئەرکەکان و، بیدعە و تاوان و لاڕێبونی دیکە.[1] هەروەها سۆفیەکان هی وایان تێدابوە کە بەشمشێرەکەی بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەواز شەڕیکردوە و، سەرکردایەتی سوپا و لەشکرانی کردوە بۆ شەڕی دوژمنان، هی وای تێدابوە بەرامبەر دەسەڵاتداری زۆردار راوەستاوە تا لەستەمکاری و زوڵمکردنی خەڵك بیگێڕێتەوە.. ئەوانە لەراستیدا زاهید بون ئەگەر چی بەگەڵ سۆفیان خراون..

هەروەك پیاوانی سۆفیگەری و تاخمەکانیان بون کە رەشوکی خەڵکیان بەوابەستەیی بەئاینی خواوە هێشتەوە-سەرەڕای بیدعە و لاڕێبونیان- کاتێك زانا دەگمەن ببون و خەڵکی رەمەکیش لە سۆفیگەری بترازێ دەرگایەکی دیکە نەبو پێی لە ئاین بچنە ژور.[2]

هەروەها هەر ئەوان بون کە هەندێکیان لە یەکدیگری ئوممەتی موسڵمان پاراست لە کاتێکدا کە سیاسەت و شەڕ لێکی دابڕین و، دەوڵەتانی رکابەر لەسەر زاڵبون و دەسەڵات بەشبەشیانکرد..

بەڵام هەمو ئەو هەوڵەی بەخشیان هەڵەی ئەو بەرنامەیان لەسەر رەشناکاتەوە کە بوە هۆی گەندەڵبونی چەمکەکان:

جوداکردنەوەی دنیا لە ئاخیرەت و، دانانیان لەباری بەرامبەری و پێچەوانەی، بەشێوەیەك مامەڵە کردن لەگەڵ یەکێکیان وەك بەربەستی مامەڵە کردنی ئەوی دیکەی لێهاتبو..

---

١ گەر دەتەوێ بڕوانە (خط الانحراف) لە کتێبی (واقعنا المعاصر).

٢ لەراستیدا بونی سۆفیگەری و بونی زانایان دو رێژەی پێچەوانەن، هەرچەند زانا زۆربن، سۆفیگەری بەری تەنگ دەبی، ئەگەر زاناش دەگمەن بون سۆفیگەری بڵاودەبێتەوە!

هەروەها کۆکردنەوەی پەرستن لە دروشمەکانی پەرستن و، جەختکردن لەسەریان و، پشتگوێ خستنی چەمکی گشتگیری پەرستن، کە هەمو چالاکیەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە..

نە ئەوەیان لە ئیسلامە و.. نە ئەمەیان لە ئیسلامە!

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چوە ناو مەدینە فەرمانی دروستکردنی مزگەوتی دا.. پاشان روی هاوەڵانی لەبازاڕ کرد.. لەکاتێکدا کە بازاڕ لەدەست جولەکاندابو و، توانایەکی ئابوریان تێدا هەبو کە لەسەر سو خۆری و بەناڕەوا خواردنی ماڵی خەڵکی دامەزرابو، ئایا زاهیدی مەزن ﷺ فەرمانی بە هاوەڵە زاهیدەکانی دا کە زوهدیان لەمەسەلە ئابوریەکاندا هەبێ تاکو لە ئاخیرەت سەرکەون و، دەسەڵاتی ئابوریش بۆ جولەکان لێگەڕێن، تا توانای گەندەڵکاریان لەزەویدا زیادبێ؟!

ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵان کە هەوڵدەن دەسەڵاتی ئابوری لە جولەکان بستێنن مەسەلەیەکە دەلالەتی خۆی هەیە..

چونکە کە دەستی بەبنیاتنانی مزگەوت کرد، ئەو شوێنە بو کە نوێژی تێدا ئەنجام دەدرا و بانگەوازی بەرپابونی ئوممەتی (لا إله إلاّ الله)ی باڵا دەست بو لە زەویدا و.. ئەو شوێنە بو کە ئوممەتی تێدا لەسەر ڕێنوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردە بو و، تیایدا قەزاوەتی لەنێوان موسڵماناندا دەکرد و، سیاسەتیان تێدا بڕیار دەدا، لەگەڵ شەڕ و ئاشتیان و.. بازاڕیش ئەو شوێنەبو کە ژیانی ئابوری تێدا بەرپا دەبو کە ژیانی ئوممەتی مسڵمان لەسەر دادەمەزرێ:

﴿أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا: ماڵی خۆتان کە خوا کردویەتە مایەی گوزەرانتان.﴾النساء/٥.

ئەمانەش هەردو دەبێ هەبن، تا قەوارەی ئەو ئوممەتــە تــەواوبێ کــە بــۆ چاکــە بانگەواز دەکا و فەرمان بەچاکە دەکا و بەرهەڵستی لە خراپە دەکــا و، ســەرکەوتن وەدەستدێنێ:

﴿وَلْتَكُنْ مِنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِــالْمَعْرُوفِ وَيَنْــهَوْنَ عَــنِ الْمُنْكَرِ: دەبێ لەنێو ئێوەدا کۆمەڵێك بن، فەرمان بەچاکــە بــدەن و رێ لــە خراپــە ببەستن.﴾آل عمران/١٠٤.

بەڵام دەرهاوێشتنی لایەنی پەرستن کە خوا بەسەر مرۆڤی فەرز کردوە-بریتیە لە دروشمەکانی پەرستن- و بانگەشەی ئەوەی کە هەر ئەوان بەتەنیا مایەی سەرکەوتنن لە ئاخیرەت و، پشتگوێ خستنی لایەنەکەی دیکەی پەرستن بەبانگەشەی ئەوەی کە لایــەنێکی خاکیــە و بــەژیانی دنیــا پەیوەســتە و، پشــتگوێ خســتنی مایــەی نزیکبونەوەیە لەخوا.. گرنگــترین ئــەو شــتانەی وازیــان لێــهێنا، کــە ترســناکترین کاریگەری لە ژیانی ئوممەتدا هەبو، بریتی بو لە داخــوازی راســتەقینەی (لا إلــه إلاّ الله)! یا بەشێوەیەکی دیکە بڵێ: داخوازی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایــەتی (لا إلــه إلاّ الله).

# بەندی پێنجەم

## چەمکی ژیارو ئاوەدانکردنەوەی زەوی

# چەمکی ژیار و ئاوەدانکردنەوەی زەوی

کاتێك ئوممەت کەوتە نێو ئەو هەمو کەچڕۆیین و لاڕێبونانە: بەتالکردنی (لا إلـە إلاّ الله) لە داخوازیە راستەقینەکانی و، گۆڕینی بۆ وشەیەکی سەر زارەکـی، بـەبێ دەلالەت و مایەیەکی واقیعی و، گەمارۆدانی چەمکی پەرستن تەنیا لە دروشمەکانی پەرستن و، گۆڕانی بیر و باوەڕی قەزا و قەدەر بۆ سلبیەت و وازهێنـان لـەوەرگرتنی هۆکارەکان، دەسبەرداربون لە رۆڵی ئیجابیانەی مرۆڤ لەسەر زەوی و، بەرامبەر بە یەکترڕاگرتنی دنیا و ئاخیرەت و لیّ هەڵبژاردنیان، پاشـان هـەڵبژاردنی ئاخـیرەت و پشتگوێخستن و بەلاوەنانی دنیا..

کاتێ ئەم هەمو لاڕێبونانە لە ژیانی ئوممەتدا رویدا، کەواتــە سـەیر نیـە ئەگـەر تێگەیشتن لە چەمکی ژیاریش لاسـەنگ بـێ و بایـەخ بـە ئاوەدانکردنـەوەی زەوی نەدا.

تێگەیشتنی نەوەکانی یەکەم بـۆ ژیـار لـەروحی ئیسـلامەوە هـەڵقولابوو، وەك هەمو شتێکی ئەم دینە بێوێنە و ناوازەبو.

جا ئەگەر ئەو جاهیلیەتەش هەبوبن کە هاوچەرخی هاتنە دی ئیسلام بوبـن، یـا پێشتر یا پاشـتر هـاتبن جـەختیان لەسـەر لایـەنی روحـی ژیـار کردبـێ و دنیایـان خستبێتە پشتگوێ و، بایەخیان بەئاوەدانکردنەوەی ماددی زەوی نـەدابێ، چونکـە ئاوەدانکردنەوە هـەندێ مەسـەلەی وا بـون کـە بەهەسـتەوە نوسـابون و، لـە چێـژ

وەرگرتنی جەستە نێزیکتر بون و، جەستەش لای ئەوان نەفرەتلێکراوە و بەکەم و پیس دادەنرێ..

ئەگەر جاهیلیەتی دیکەی هاوچەرخی هاتنە دنیای ئیسلام و پێشتر و پاشتر جەختیان دەکردە سەر لایەنی ماددی ژیار و، ئاخیرەتیان پشتگوێ خستبو و، بایەخیان بەجیهانی رۆح نەدەدا، لەبەر ئەوەی مەسەلی تایبەتی و تاکەکەسین و پەیوەندیان بەواقیعی کرداریەوە نیە، بەلکو-زۆر جارانیش- بەرێگری رەهابونی ژیار وەسف دەکرا(!) جا ئەو جاهیلیەتانە تەواو رویانکردە جیهانی هەست و جیهانی ماددە، بە هەمو بلیمەتی خۆیان داهێنانیان تێدا ئەنجام دەدا و، هەمو وزەی خۆیان هەلدەرشتە ناوی، بەچاوپۆشین لەبەها و مەبدەئەکان..

بەلاّم ئیسلام-کە لەلای خودای کارزان و شارەزا دابەزیوە، کە وەدیهێنەری مرۆڤە و چاك دەزانێ حالّی چۆنە و چی پێویستە و، دەیزانی چی چاکی دەکا و چی بەکەلّك دێ- ئیسلام ئەو بەرنامە گشتگیر و تەواوەیە کە هیچ لایەك لەلایەکانی مرۆڤ پشتگوێ ناخا و، لایەنێك لەسەر حیسابی لایەنێکی دیکە تێر ناکا و، وەلاّمی ئەو فرچکە پاکە دەداتەوە وەك چۆن خودا خولّقاندویەتی:

﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ، فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ: کاتێ کە پەروەردگاری تۆ فریشتەکانی راگەیاند، وا خەریکم مرۆڤێك لەقورِ چێ بکەم، هەرکاتێك لەشیم تەواوکرد و لەگیانی خۆم فوم پێداکرد هەموتان سوژدەی بۆ بەرن.﴾ص/٧١-٧٢.

ئەم پێکهاتە مرۆڤانە یەکدیگرە، چونکە قورِەکەی تێدا لە فوی گیان جیاناکرێتەوە و، فوی گیان لە چنگە قورِەکە جیاناکرێتەوە، چەمکێکی زندوی گشتگیری بۆ جیهانی جەستە و جیهانی گیان تێدایە و، دەبێ واقیعێکی کرداریشی

هەبێ هەمان سیمای گشتگیری و یەکانگیریەکەی تێدابێ کە لەپێکهاتەی (مرۆڤ)دا ڕەنگ دەداتەوە.

بەرنامەی پەروەردگاریشە کە وێنەی هێلەکانی ئەم واقیعە زندوە دەکێشێ و وێنە وردەکاریەکانیشی دەکێشێ.

گشتگیری و یەکانگیری و هاوسەنگی[1] دیارترین سیماکانی بەرنامەی پەروەردگارن.

گشتیگری بۆ هەمو لایەنەکانی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤایەتی و، پەیوەستکردن و یەکانگیری توند و تۆڵ لە نێوانیان و، ڕاگرتنی هاوسەنگی نێوان لایەنە جیاجیاکانی.

ئەوەش مەزنێتی ئیسلامە و، هەر ئەوەشە لە بەرنامەکانی جاهیلیەتی جودا دەکاتەوە کە بەدور لەبیروباوەڕێکی ڕاستودروست حوکمی ژیانی خەڵك دەکەن، واتا دور لە (لا إله إلاّ الله). ئەم ئایەتە پیرۆزەش دەیانگرێتەوە:

﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ: ئاخۆ ئەوان حوكمی جاهیلیەتیان دەوێ! دەوجا لەلای ئەو کەسانەی وا لە بڕوای خۆیانا هیچ شك و گومانێکیان نیە، کامە حوکم لە حوکمی خوا چاترە.﴾المائدة/٥٠.

حوکمی خوداش تەنیا لە جێبەجێکردنی حەدەکان کورت هەڵنایێ، هەروەك حوکمی جاهیلیەتیش تەنیا لەو یاسایانەدا کورت نابێتەوە کە خەڵکی لەدادگاکاندا حوکمیان دەبەنە بەر.. بەڵکو حوکمی خودا هەمو گچکە و گەورەیەك لە ژیانی مرۆڤ دەگرێتە خۆ، جا ئەو شتە بگاتە لای قازی یان نەیگاتێ، بەڵکو ئەگەر کردەوەیەکی ئاشکرابێ یا نیازێکی ناخی ویژدان، وەکو یەکن، بەهەمان شێوە

---

[1] گشتگیری: شمول.          یەکانگیری: ترابط.          هاوسەنگی: توازن.

حوكمی جاهیلیەتیش تەنیا لەو یاسایانەدا كورت هەڵنایێ كـە حوكمـی سـەرپێچی كردن و سوكە تاوان و تاوانان دەكات، یا مامەڵەی شارستانی و مامەڵـە بازرگـانی و.. تاد رێكدەخات.. بەڵكو ئەمیش بەهەمانشێوە رێكخراو و دامـــەزراو و هـزر و بیر و رەفتار و هەست و سۆزە، هەموشی بەدور لە (لا إله إلاّ الله) بەرپایـــە و دورە لەهەڵێنجان لەبەرنامەی خوا.

پاشان ژیار و ئاوەدانكردنەوەی زەوی پەیوەندیەكی پتەوی هەیـــە بـە (لا إلـه إلاّ الله) و، ئەو بەرنامەیەوە هەیە كە لەلای خوا دابەزیوە هەتا حوكمی ژیان بكا.

* * *

چەمكی ئیسلامی بۆ ژیار بریتیە لە چەمكی پەرستن..

بریتیە لە هێنانەدی مەبەستی بونی مرۆڤ كە خوای بەرز لەم ئایەتە سـنورداری كردوە:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ: مـن هـەر بۆیـە جندۆكـە و مرۆڤـم دروست كرد، هەتاكو بمپەرستن.﴾الذاريات/٥٦.

ئەمە مەبەستە و.. ئەویش پێوەرە.

وەدیهێنانی مەبەستی بونی[1] مرۆڤیش لەواقیعدا ژیاری لێ دێتە بەرهەم و، ئـەو پێوەرەیـە كـە هەڵكشـان و داكشـان و، سـەقامگیری و لارێبونـی ژیارەكـەی پـێ راستدەكرێتەوە.

سەقامگیری و لارێبونی ژیارەكەی پێ راستدەكرێتەوە.

كاتێك تێروانینیش بۆ مەبەستی بونی مـرۆڤ دەگـۆڕێ، تـێڕوانین بـۆ ژیـاریش دەگۆڕێ، هەروەها تێڕوانین بۆ مێژوش دەگۆڕێ.

---

[1] بون: وجود

کاتێك مەبەستی بونی مرۆڤ بریتی بێ لەتونا بون (فەنابون) لە بونەوەری هەرە مەزن، هەروەکو (نێرڤانا) دەڵێ، یا رزگـاربون بـێ لـەکۆتی جەسـتە و رەهـاکردنی گیان بێ تاکو لەگەڵ وەدیهێنەر ببێتە یەك.. ژیار دەبێتە وەدیهێنانی جیهانی گیان لەسەر حسابی جەستە و، لەسەر حسابی لایەنی مادی لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی.

بەڵام کاتێك مەبەستی بونی مرۆڤیش رابواردن بێ بەو چێژانەی لەزەویدا هـەن، بەچاوپۆشین لەو بەهایانەی هاوەڵی ئەو چێژەن لە حەڵاڵ و حەرام و، چاکـە و خراپـە و، کردەوەی مەردانــە و نامەردانـە و، بەرزبونـەوە و دابـەزین.. ژیـاریش دەبێتـە ئاوەدانکردنەوەی ماددی زەوی کـە بریتیـە لـە ئاسـانکردن و رازاندنـەوەی ژیـانی زەمینی و، روکردنە رابواردن و چێژەکـانی، لەهـەمانکات دەبێتـە هـەوڵی زاڵبـون بەسەر کەسانی دیکەدا تـاکو بـۆ خـۆی بـڕی زۆرتـری رابواردنـی بەرکـەوێ و، لـە هەمانکاتیش دەبێتە هەوڵی ملکەچ کردنی کەسانی تر بەهێز و چەوساندنەوە، جـا بەهێزی ماددی بێ یا هێزی عەسکەری یا هێزی سیاسی یا هێزی ئابوری یا هـێزی زانستی یا هەمویان پێکەوە..

بەڵام کاتێك مەبەست پەرستنی خوا بێ-بەواتا فراوان و گشـتگیرەکەی پەرسـتن کە پێشتر رونمانکردەوە[1]- ئەو کاتە چەمکی ژیـار لـەو دو چەمکـەی پێشـو جـودا دەبـێ، راڤـەکردنی مێـژوش بەهەمانشـێوە، چونکـە پێـوەر لێکدانـەوەی لەسـەر رادەوەستێ و، بریتیە لەوەی مرۆڤ چەند مەبەستی بونی خۆی وەدیدێنـێ و، چـەند سەرکەوتوە یا ژێرکەوتوە لە هێنانەدی ئەم بونە.

❊ ❊ ❊

[1] بگەڕێوە بۆ (چەمکی پەرستن).

پێشتر لەبەشی چەمکی پەرستندا ئەوەمان رونکردەوە کە خودا -لە میهرەبانی خۆی- چالاکیە سروشتی‌یەکانی مرۆڤی لەهەمو بارەکاندا: جەستەیی و عەقلی و رۆحی کردۆتە پەرستن مادام مرۆڤ بەم کارانە رو لە خوا بکا و، تیایاندا لەبەرنامەی خوا هەلێنجیٚ، بەلکو -خودای بەرز- ئەو چالاکیەی کردۆتە پەرستنی داواکراو لە مرۆڤ، کە مەبەستی بونی مرۆڤ لەبەجێهێنانی کۆبۆتەوە.

هەر خودی ئەم چالاکیەش ژیار دادەمەزرێنیٚ و.. ژیاریش بریتیە لە دەسکەوت و بەروبومی ئەو چالاکیە مرۆڤانەیە لەبوارە جیاجیاکاندا.

کاتێك لەمەسەلەکەش ورد دەبینەوە دەزانین هەمو چالاکیەکانی جەستە یا عەقلٚ یا گیان ژیار پێکناهێنن، یا نابنە بەشێك لە ژیار-ئەم مەسەلەیەش بەلگەنەویستێکی ئاشکرایە- بەلکو تەنیا چالاکی ئامانجدارە کە دەبێتە ئەو جۆرە پێکهێنەرە، کە ئامانجی وەدیهێنانی مەبەستی بونی مرۆڤە.

بۆ نمونە بەسەر خاکدا رۆیشتن یا زەوی هەلکۆلین بە خودی خۆیان نابنە چالاکی ژیاری، بەلام رۆیشتن بۆ ئامانجێك، بۆ نمونە بەئامانجی دۆزینەوەی شوێنە ونەکانی زەوی بۆ نیشتەجێبون و ئاوەدانکردنەوە و، هەلکۆلین بۆ هێنانەدەری گەنجینەکانی زەوی و سازکردنی بۆ هەمان ئاوەدانکردنەوە، ئا ئەمەیە دەکریٚ ژیار پێکبێنی، یان ببێتە بەشێکی ژیار.

چالاکی عەقلٚ و چالاکی گیانیش بەهەمانشێوە، هەتاکو ژیار پێك بێنن مەرجە ئامانجیان هەبیٚ و، لەهەمان کاتیش ئامانجەکەیان ئاراستەی روە و وەدیهێنانی مەبەستی بونی مرۆڤ بیٚ، نەك بەپێچەوانەی ئەم ئاراستەیە.

جا لێرەوە دەتوانین -بەمتمانەوە- بلێین ئەو دەسکەوتە ماددی یا عەقلی (یا هەندیٚ جار روحی)انەی کە جاهیلیەتەکان بەرهەمیان دێنا ژیارێکی راستەقینە

نیه، ئەگەر چی هەندێ جار ناوازە و گەورە دێنــە بـەرچاو، یـان لەیەکـەم چرکـەدا چاومان لە مۆلەقە رادەگرن، چونکە ئەم مەرجە بنچینەییەی ونکردوە کـە چـالاکی مرۆڤ و دەسکەوتەکانی مرۆڤ دەکەنە ژیار کە ئەویش بریتیە لەوەی ئامانجــەکانی روە و وەدیهێنانی مەبەسـتی بونـی مــرۆڤ ئاراســتەکرابن، نــەك پێچەوانـەی ئـەو ئاراستەیە.

تەنیا وەدیهێنانی لایەنی گیــانی مــرۆڤ، لەسـەر حیسـابی لایـەنی هەسـتی و ماددی و بەدورلێیانەوە، مەبەستی بونی مرۆڤ بەتــەواوی و بـەپێی رونکردنـەوەی بەرنامەی پەروەردگار نایەنێتــە دی و، وەدیـهێنانی لایـەنی هەسـتی و مـاددی لـە مرۆڤ و ژیانی مرۆڤیش لەســەر حیسـابی لایـەنی گیـانی و بـەدور لێـی، دیسـان مەبەستی بونی مرۆڤ نایەنێتەدی، بەڵکو بەرەو داڕوخان و وێرانــی دەبـا.. پاشـان هەردوکیان وەك چەمکی راست و دروســتی ژیــار، ژیـار پێکنـاهێنن، یـا (ژیـاری جاهیلی) پێکدێنن ئەگەر ئەم دەربڕینە راستبێ.

هەروەك کۆبونەوەی هەردولا پێکڕا بەڵام بەبێ هەبونی بنەمای دروست-هەروەك لە جاهیلیەتی فیرعەونی رویدا کە جیهانی مادده و جیهانی گیانی گرتبۆوە، بــەڵام بنەمای بــەخواکردنی فیرعــەون و پەرسـتنی بێجگـە لـەخوا بەهـەمان شـێوەژیار پێکناهێنـێ بەچەمکـە راستودروسـتەکەی، یـاخود-هـەروەك پێشـتر باسـمانکرد-ژیارێکی جاهیلی پێکدێنێ ئەگەر ئەم زاراوەیەمان قبولّ بێ.

بەڵکو ژیاری راستەقینە بریتیە لەوەدیهێنانی دروستی مەبەسـتی بونـی مـرۆڤ لەسەر زەوی کە لەم ئایەتە پیرۆزە دیاریکردوە: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنــــسَ إِلاَّ لِيَعْبُــدُونِ: مـــن هـــەر بۆیـــە جندۆکـــە و مرۆڤــم دروســت کــرد، هـــەتاکو بمپەرستن. ﴾الذاريات/٥٦.

ئەم ئایەتە پیرۆزەش راڤەی[1] دەکا ﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَاي وَمَمَــاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ: بڵێ: من نوێژکردنم و پێکهێنانی رێوشوێنی حەج کردنم و ژین و مەرگم، بۆ خودایە، کە راهێنەری دنیایە هەر خۆیەتی، هیچ شەریکی نیە.﴾الأنعام/١٦٢-١٦٣. ئەمەش لە چەمکی ئیسلامی شتێکی سەرتاپاگیرە و هەمو چالاکیەکی ئامانجداری مرۆڤ دەگرێتەوە.

نوێژ و نوسك، بەمەدلولە راستەقینەکەیان و، داخوازیە راستەقینەکەیان، بەشێکن لە چەمکی ئیسلامی بۆ ژیار.[2]

بەرپاکردنی شەریعەتی خواش لەسەر زەوی و حوکم بەوەی خوا دایبەزاندوە، کە داخوازی راستەوخۆیە بۆ (لا إله إلاّ الله) بەشێکە لە چەمکی ئیسلامی بۆ ژیار.

بەرپاکردنی دادگەری پەروەردگاریش لەسەر زەوی هەروەك خودا ویستویەتی روبدا و، ئەم ئومەتەی بۆ هەڵسەنگاندن دەرخستوە و، لەمیانەی رێپێشاندان و ئامادەکردنیشی بۆ هەڵگرتنی ئەم راسپاردە گەورەیە خودای مەزن پێی فەرمو: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِنْ يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَاللَّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا وَإِنْ تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بە یەکسانی و بێجیاوازی بەکاری مەردم رابگەن و بۆ خوداش شایەتی بدەن. هەرچەندە شایەتی دان و بەزیانی خۆتان و دایك و بابتان و خزمانیشتان بێ گەر شایەتی بۆ دراوان دارا بن یاخۆ هەژار بن، خوا بۆ ئەوان دڵسۆزترە. مەکەونە شوێن ئارەزوەکان نەوەك لەرێگە لابدەن. ئەگەر زمان بخەنە لا، یا خۆتان لە

---

١ راڤە: تەفسیر.

٢ بگەڕێوە بۆ (چەمکی پەرستن).

ـ یەتی‌دان بدزنــەوە. لــە هــەر کــاریٚ ئێـوە دەیکــەن خــوا هەمیشــە
ـ گەدارە. ﴾النساء/١٣٥. و هەروەها فەرموی: ﴿**يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِــينَ**
**لَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْــرَبُ**
**لِلتَّقْوَى**: ئەی گەلی خاوەن بـاوەڕان! بـۆ خـوا راسـت و بێخـەوش بـن و هەقانـەت
ـ یەتی دەن. دوژمنی و قینی دەستەیێك هەڵتان نەنێ بە هەقانەت رەفتار نەکـەن.
ـە یەکسانی و بێ جیاوازی لەگەڵ خەڵکا رەفتار کردن دەبێتە هۆی پـتر نزیکەنـەوە
ـون بە پارێزگاری. ﴾المائدة/٨. جـا بـەرپاکردنی دادگـەری پـەروەردگار بەمشـێوەیە
ـەشێکە لە چەمکی ئیسلامی بۆ ژیار.

دامەزراندنی ژیانیش بـەتێکڕایی-بەهـەمو ئـەو رەنگـە چالاکیانـەی تێیـدان-
ـەسەر بنەمایەکی ئاکاریانەیە کـە تەوەرەکـەی خۆپـارێزی و ترسـی خوایـی.. جـا
ـیاسـەت ئاکـارێکی دەبـێ کەلەسـەر حوکمـی کاربەدەسـت بەشـەریعەتی خـــوا
ـ دەوەستێ، لەگەڵ گوێڕایەڵی ئومـەت بـۆ کاربەدەسـتان لـەو فەرمانانـەی بـەپێی
ـەریعەتی خـوا دەریاندەکـا و، ئامۆژگـاریخوازی لـە خـودا و پێغەمبەرەکـەی و،
فەرمان بەچاکە و بەرهەڵستی لە خراپە و، هاوکاری لەسەر کاری چاکە و خۆپارێزی
و. هاریکار نەبون لەسەر خراپەکاری و دوژمنداری و، کارکردن بەپێی شورا کـەخوا
فەرمانی پێکردوە و.. ئابوریش ئاکاری دەبێ کە رادەوستێتە سـەر پابـەندبون بـەو
شتانەی خودا حەڵاڵی کردون و، حەرامکردنی ئەو شتانەی خوا حەرامی کردون وەك
ـیبا وماڵداکردن(الاحتكار) و فرتوفێڵ و تالان و برۆ و، دزی و دەستبەسـەرداگرتن
و. خواردنـی مـاڵی کرێگرتـە و، بەناهـەق خواردنـی مـاڵی خـەڵکی، هـــەروەها
ـ دەوەستێتە سەر پاکژکردنەوەی ماڵ بەزەکاتدان و، ماڵبەخشین لە پێناوی خــوا و،
ـیە خەرجنەکردن و مـــاڵ بـە فیڕۆنـەدان لـە گونـاح و تـاوان و.. پەیوەندیـەکانی

کۆمەڵگەی خاوەن ئاکاریش رادەوەستێتە سەر خۆشەویستی و دەسبارگرتن و، هاریکاریبون لەسەر چاکە و خۆپارێزی و، حەرامکردنی خوێن و ناموس و ماڵ و، رق و کینە هەڵنەگرتن و لەخەڵکی خۆشبون و، وازهێنان لەقسە و قسەڵۆك و غەیبەت و قسە هێنان و بردن و جاسوسی و روانینە شەرمگەکان و.. پەیوەندیەکانی خێزانیش ئەخلاقی دەبێ.. پەیوەندی نێوان هەردو رەگەزیش ئەخلاقی دەبێ.. دامەزراندنی تێکڕای ژیان لەسەر ئەم بنەما ئاکاریە بەشێکە لە چەمکی ئیسلامی بۆ ژیار.

وەفاداری لە بەڵێننامەکان، جا چ گرێبەندی[1] تاکە کەس یا پەیماننامە و رێککەوتنە نێو دەوڵەتیەکان بێ، بەشێکە لە چەمکی ئیسلامی بۆ ژیار.

زانستخوازیش، جا زانستی ئاینی خوا و ئەحکامەکانی بێ، یا زانستی بەسوننەتەکانی خوا لەگەردون (تایبەتمەندیەکانی مادە)، کە یاریدەدەری بۆ پاڵاوتنی ئەوەی خودا بۆ مرۆڤی رامکردوە[2] لە وزەکانی ئاسمانەکان و زەوی و، بەکارهێنانی لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی و، زانست لە سوننەتەکانی خوا لەژیانی مرۆڤدا، کە کۆمەڵگەیەکی چاکی لەسەر بنیات دەنرێ، یان زانست بەمێژوی مرۆڤایەتی و قۆناغەکانی رێنوێن بون و گومرابونی، لەگەڵ دەرەنجامی هەریەکەیان لە واقیعی ژیانی مرۆڤایەتی.. ئەم زانستە بەجیاوازی لق و ئاراستەکانی بەشێکە لە چەمکی ئیسلامی بۆ ژیار.

هەروەها دامەزراندنی هونەری پاك، کە ئاوڕ لەگەردون و لەژیانی مرۆڤ لە جوانی بداتەوە و بە بەجێهێنانی جوان گوزارشی لێ بکات.. هونەرێك داوێنپیسی

---

١ بەڵێننامە: مواثیق. گرێبەندی: عقد.

٢ رامکردن: تسخیر.

نەڕازێنێتەوە چونکە داوێنپیسی جوانی نیە بەڵکو داڕوخان و دابەزینە و، هــەروەها ساتی لاوازی نەڕازێنێتەوە، چونکە ئەو ساتە جوانـــی نیــە بــەڵکو ســاتی دابــڕان و بێناگاییە لە پەیبردن بە مەبەستی بونی مرۆڤ، یا ساتی کەموکوڕیە لە هێنانــەدی ئەو بونە و، لاڕێبون و ریزپەڕیش ئارایش نەکا چونکە ئەمەش جوانی نیــە، بــەڵکو نەشازێکە لە جوانی رەویتەوە و، ئارایشتی شــەیتان پەرستی و پەرستنی حـەز و ئارەزوەکان نەکات چونکە جوانی نیە، بەڵکو داشکانی ئەو مرۆڤەیە کە خودا رێـزی لێگرتوە و بەچاکتری داناوە و، ویستویەتی لە هەمو بەندایەتیەکی ساختە ئازاد بـێ کە قەوارەکەی دادەماڵێ و زەلیلی دەکا.. دامەزراندنی ئەمجۆرە هونەرانــە بەشـێکە لە تێگەیشتن و چەمکی ئیسلامی بۆ ژیار.[1]

ئەمە هەموی هەر شتێکیش هەمان ئەم ئاراستەیەی هەبێ، بریتــین لــە لایــەنی مەعنەوی ژیار لە چەمکە ئیسلامیەکەیدا.

ئینجا ژیاری مرۆڤایەتی لایەنێکی مادیشــی هەیــە کــە چەمکــە ئیسـلامیەکە دەیگرێتە خۆ، ئەمەشیان لایەنێکی گەورە و مەزنە.

ئەگەر مرۆڤ بــۆ پەرســتنی خــودا وەدیــهێنرابێ، ئــەوا ئاوەدانکردنــەوەی زەوی لایەکە لە چەمکی فراوان و سەرتاپاگیری پەرســتن، کــە جێنشــینی مــرۆڤ لەســەر زەوی دێنێتە دی.

**﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّــي جَــاعِلٌ فِــي الأَرْضِ خَلِيفَــةً**: ئــەو کاتــەی پەروەردگاری تۆ بە فریشتانی راگەیاند: من دەمەوێ بریکارێك لەسەرزەمین دیــاری بکەم.﴾البقرة/٣٠.

---

١ ئەگەر دەتەوێ بگەڕێوە بۆ (منهج الفن الاسلامی).

﴿هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنْ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا: ئەو لەم خاكەی وەدیهێنان و ویستی ئاوەدانی بکەن.﴾هود/٦١.

ئەگەر بەرپاکردنی (لا إله إلاّ الله) لە زەویدا، واتە نەهێشتنی هاوبەشپەرستی و جێگرتنی یەکتاپەرستی و، بەرپاکردنی دادگەری پەروەردگار و ئاکارەکانی بڕوامان بە لایەنێکی (ئاوەدانکردنەوە) دانا، چونکە زەوی لەژێر ساباتی بڕوا نەبێ کە لە لاڕێبوون و گەندەڵی و خراپە دەپارێزێ، بەراستی ئاوەدان نابێتەوە.. ئەوا لایەنەکەی دیکەشی ئاوەدانکردنەوەی ماددیە، بە پوختە و پاڵاوتەکردنی وزەگەلی ئاسمانەکان و زەوی و رامکردنیان بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ.

ئەم لایەنەی ئاوەدانکردنەوەش زەحمەتکێشانێکی زەینی و ماسولکەیی دەوێ تابەدی بێ، ئاتاجی زانینی تایبەتمەندیەکانی ماددە و سوننەتەکانی پەروەردگارە کە خودا ئەم گەردونەی پێ بەڕێوە دەبا {کە لە جاهیلیەتی هاوچەرخدا بە (یاسا سروشتیەکان) ناوی دەبەن}[1]. پاشان خستنە گەڕی ئەم زانیاریە لەبواری پیادەکردن لە فیزیا و کیمیا و نوژداری و ئەندازە و زانستەکانی دیکە..

جا کاتێك جاهیلیەتی هاوچەرخ ئەم لایەنە بەژیار دادەنێ یان بە گرنگترین شتێك لە ژیار و بە بەرجەستەترین دەسکەوتەکانی مرۆڤی دادەنێ، ئیسلام یەك مەرج دادەنێ بۆ ئەوەی ئەم دەسکەوتانە بخاتە نێو مەدلولی ژیارەوە، ئەویش ئەمەیە کە دەبێ هەموی بەپێی بەرنامەی پەروەردگار راوەستابێ و، لە داخوازیەکانی لانەدا..

دەرهێنان و پوختەکردنی وزەکانی گەردون-لەگەڵ ئەوەی پێویستە- گرنگترین شت نیە کە مرۆڤ لەسەر زەوی ئەنجامی بدا، ئەگەر پێی بگاتە مانگ یا

---

١ لەو کاتەی جاهیلیەتی هاوچەرخ کوفری بەخودا کرد و، سروشتی لە جیاتی پەرست!

مەریخیش.. بەڵکو لەمە گرنگتر بریتیە لەو مەبەستەی لە پشتیەتی و، ئەو شێوازەی پێی ئەنجامدەدرێ و، ئەو بەرنامەی کە بەڕێوەی دەبا.

کاتێك دەڵێین: (گرنگترین) خەڵکانێك هەن واتێدەگەن ئێمە دەڵێین: (لەجیاتی)! واتە ئێمە بەها مەعنەویەکان لە جیاتی بەها ماددیەکان دادەنێین! ئەوەی عاقڵیش بێ وانالێ! چونکە بەها مەعنەویەکان بەتەنیا زگە برسیەکان تێر ناکەن ئەگەر نان نەبو و، ترومبێل و شەمەندەفەر و فڕۆکەش بەڕێدا نابەن ئەگەر سوتەمەنی نەبو و، تۆپ و زرێپۆش و موشەکیش دروست ناکەن ئەگەر کارگە و ئامراز نەبو.

ئەوە بەڵگەنەویستێکە نایەوێ مرۆڤ باسی بکا.. بەڵام بەڵگەنەویستێکی لە بەرامبەردا هەیە لەو کەمتر ئاشکرا نیە و، بایەخیشی کەمتر نیە، ئەگەر چی جاهیلیەتەکانیش بەتایبەتی جاهیلیەتی هاوچەرخ زۆر مشتومڕیان لەسەر کردوە، ئەویش ئەمەیە کە نان و سوتەمەنی و کارگە و ئامراز و ترومبێل و شەمەندەفەر و موشەك و زرێپۆش و تۆپ نە بەتەنیا ژیار دروست دەکەن و، نە مرۆڤی شارستان و نە ئاوەدانکرنەوەیەکی راستەقینەی زەوی، چونکە بەتەنیا- بەبێ (بەهاکان) دەبێتە مایەی وێرانی!

جا ئەمەیە کە جاهیلیەتی هاوچەرخ باوەڕی پێناکا یان نایەوێ باوەڕی پێ بکا سەرەڕای ئەو هەمو ئاگادار کردنەوانەی لەهەمو لایەکەوە دەوری خۆی داوە و، ئەو شپرزەبون و سەرلێتێکچونەی کەوتۆتە ریزەکانی!

مرۆڤ-بەهەمو ئەو بەروبومە مادیەوە کە بەرهەمی دێنێ- رەنگە بۆ ژێری ژێرانەوە دابەزێ ئەگەر دەسبەرداری بەهاکان بو کە مرۆڤ دەکەنە مرۆڤ و لە ئاستی ئاژەڵان بەرزی دەکەنەوە..

جاهیلیەتی هاوچەرخیش ناونیشان و بەڵگەی راستیەتی..

ئەم جاهیلیەتە گەورەترین بڕ (زانستی)ی لەبەر دەستە کە مرۆڤایەتی دیبێتـــی، لەگەڵ گەورەترین بڕ بەرهەمی ماددی لە مێـــژوودا. هـەروەك هێنــدەی داهێنــان و ئاسانکاری مادی لەبەر دەستە هەرگیز بۆ نەوەیەك لـــە نـەوەکانی مرۆڤایـەتی کـۆ نەبۆتەوە..

ئێستا یەك دوگمە داگرتن گەلێك شتی سەرسوڕهێن ئـــەنجامدەدا.. ئـامرازێکی گـەورە و گـران وەگـەڕ دەخـا، یـا هەواڵـەکانی جیـهانت بـەدەنگ و وێنــــە بـــۆ دەگوازێتەوە.. یا بەبۆشایی ئاسماندا بەرەو مانگ یا مەریخت دەبـا، بـەڵێ.. بـەڵام کوا (مرۆڤ) لە کوێیە؟!

یا بەرەڵڵای سەماگە و مـەیخانەکانە، یا لەنێو ئارەزوی سیکسییێکی نزمدا نقـوم بوە، یا تاوانکارێکە دەستدرێژی دەکاتە سەر مرۆڤێکی ئارام، یا کەوتوتـە یـەکێك لە شێتخانەکان، یا هاموشۆی سەردانگەیەکی دەرونی دەکا، یا توشی سـەرگەردانی و دڵە راوکێ بوە کە مێشك و دەماری تێکدەدەن و ئاسودەیی وێران دەکەن..

دۆزەکەش هەر بریتی نیە لە هەبونی (چەند حاڵەتێك) لەنێو هـەمویان، چونکـە هیچ کۆمەڵگەیەکی زەوی نیە، ئـەو بەهایانـەی لەسـەری دەژی جـا هـەرچی بـن، لەمجۆرە حاڵەتانەی تێدا نەبێ، بەڵام دۆزەکە بریتیە لە ڕێژەی ترسـناکی زیـاد بونـی ئەم حاڵەتانە کە وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیان لێهاتوە، پاشان بریتین لـە سیمای بەرجەستەی جاهیلیەتی سەدەی بیستەمیش!

* * *

جا کەواتە ئەمە چەمکی ئیسلامیە بۆ ژیار .. ژیـاری (مـرۆڤ)ی جێنشـین لـە سەر زەوی، کە لە چنگە قوڕێك و فوویوکی روحی خـوا وەدیـهێنراوە، مـرۆڤ ئـەو ئاژەڵە داروینیە نیە کە-بەحوکمی پێکهاتەی- هەمو بەها و ئاکـار و مەبدەئـەکان

ڕەتدەکاتەوە، ئەو خوداوەندە ساختەیەش نیە کـە شـوێن ئارەزوەکـانی دەکـەوێ و، جەور و ستەمی لەزەوی پێ دەکات و خۆی بەزلتر دەزانێ لە بەندایەتی خوا.

جا لەسەر بنچینەی ئەم چەمکە ژیارێکی ئیسلامی ناوازە لە مێژودا دامەزرا.

-کە لەدایکبو- بەمەزنترین بڕی بەهاکان لە مێـژوی مرۆڤایـەتی هاتەکایـەوە، لەگەڵ کەمترین بڕی دیاردە ماددیەکان لەهەر ژیارێکی مێژو: کۆمەڵە خێوەتێـك و چەند خانویەکی قوڕ و، ڕەزی دار خورما و، وڵاخ و حوشتر و مەڕ و، تیر و شیر!

و-بەو شێوەیەی- یەکێك بو لە موعجیزەکانی مێژو!

چونکە هیچ مرۆڤێـك بۆینـاچێ ئـەو بـڕە لـە ئـاوەدانی مـادی زەوی، ژیـارێك دابمەزرێنێ، چ جای ئـەو ژیـارە بـەرز و بـاڵا و ناوازەیـە، بـەڵام شـەپۆلی مـەزنی بەهاکان، کە لە مێژودا هاوشێوەی نیە، پیادە کرا و لە وێنەی واقیعێـك، نـەك لـە وێنـەی دروشـم و پـەندی هەڵواسـراو لـە بۆشـایی، ئـەوەبو ئـــەو کەموکوڕیـــەی ئاوەدانکردنەوەی مادی پڕ کردەوە و، داپۆشی، چاکترین ئوممەتی هێنا بەرهـەم کـە بۆ خەڵکی دەرخرابێ.

لەگەڵ ئەوەی ئەمە دوایین وێنەی ئەو ژیارە نەبو، بەڵکو تەنیا (لەدایکبون) بـو، بەڵام هەڵوەستەیەك لـەدیار ئـەو وێنـە ناوازەیـە دەکـەین کـە مرۆڤایـەتی بینـی. هەڵوەستەیەك وەڵامی ئەم پرســیارە بداتـەوە: ئایـا کامـە لایـەنی ژیـار دەتوانـێ کەموکوڕی لە لایەنەکەی دی داپۆشێ و جێی بگرێتەوە (کاتێك بەهەر هۆیـــەك لـە هۆیەکان کەموکوڕیەکی تێدابێ): ئایا لایەنی مەعنەوییە-لایـەنی بـەهاکان- یـان لایەنی بەرهەستی مادیە؟!

ئەزمونە ئیسلامیە ناوازەکە-لە بەرامبەر جاهیلیەتی هاوچـەرخدا- وەرامێکـی گردەبڕی ئەم پرسیارە دەداتەوە، شەپۆلی مەزنی بەهاکان توانی قەرەبوی دواکەوتنە

مادديەکـە بکاتـەوە و، باشـترین نـەوە دەربخـا کـە مرۆڤایـەتی بەخۆیـەوە دیـوە، بەشایەدی خوا و شایەدی پێغەمبەرەکەی ﷺ، لە کاتێکدا لە جاهیلیەتی هاوچـەرخ شەپۆلی مەزنی بەرهـەمی مـاددی و زانسـتی و تەکنـەلۆجی نـەیتوانی قـەرەبوی پاشکەوتنی روحی و مەعنـەوی و ئاکـاری بکاتـەوە و، خراپـترین جاهیلیـەتی لـە مێژودا هێناوەتە ئاراوە.

بەڵام وێنەی (لەدایکبون) دواین وێنە نەبو، نەشدەبو ببێتە دواین وێنە.

ئەم لەدایکبونە هەمو رەگەزەکانی گەشەکردن و هێزی تێـدا شـاراوەبو کـە لـە دواییدا بەرجەستە بون.

چونکە ئەم لە دایکبونە بێهاوتایە بو کە ئەم ئوممەتەی هاندا بەدوای (زانسـت)دا بگەرێ لەهەمو سەرچاوەکانیدا و، وایلێکرد زمانی یۆنانی و لاتینی فێر بێ، لەگەڵ هەمو زمانێکی زانستی ئەو سەردەمە، تاکو لێیانەوە وەرگێڕێ، ئینجـا لەپاشـاندا بزوتنەوە زانستیەکەی خۆی دامەزرێنێ، کە-دواتر- بزوتنەوەی هاوچەرخی زانسـتی ئەوروپای لەسەر دامەزرا، بەو شتانەی لە فێرگەکانی موسڵمانانەوە فێری بون.

هەر ئەمیش بو پاڵی بەم ئوممەتەوە نا تا ئاواکردنـەوەی مـاددی و رێکخراوەیـی لەزەوی ئەنجامدا، بەشێوەیەك کە شارە ئیسلامیەکان شایەدی بۆ دەدەن لەگەڵ ئـەو پیشەسـازی و بازرگـانی و جوڵـە و بزاڤـەی تێیـاندابو، هـەروەها سیسـتەمەکانی بەڕێوەبردن و دادگایی و حیسبە و سیستەمەکانی فـێرکردن و سیسـتەمی وەقـف و رێکخراوە جەنگیەکان و دیوانی زۆر لێکراوان و دیوانی بنیاتنان و.. تاد..تاد.

هەر ئەمەش بـو هـانی ئـەم ئوممەتـەی دا هـەتا نادیارەکـانی زەوی وەدۆزێ و، نەخشە بکێشێ و شوێنەکان دیاری بکا، لـە یـەکێك لـە بزاڤـە هـەرە گـەورەکانی دۆزینەوەی جوگرافی لە مێژودا، کە لەپاشان بزاڤەکانی دۆزینەوەی ئەوروپی لەسـەر

ـﺘﻐـﻪﻛﺎﻧﻲ ﺩﺍﻣـﻪﺯﺭﺍﻥ، ﺑـﻪ ﺑﺰﻭﺗﻨـﻪﻭﻩﻛﺎﻧﻲ ﻓﺎﺳـــﻜﯚ ﺩﺍ ﮔﺎﻣـــﺎ ﻭ، ﻛﯚﻟﯚﻣﺒـــﺲ ﻭ، ـﺎ ﺟﻪﻻﻧﻴﺸﻪﻭﻩ.

ﻫﻪﺭ ﺋﻪﻭﻳﺶ ﺑﻮ ﻛﻪﻟﻪﭘﻮﺭﻳﻜﻲ ﻫﺰﺭﻱ ﻣﻪﺯﻧﻲ ﺩﺍﻣﻪﺯﺭﺍﻧﺪ ﻛـﻪ ﻧـﻪﻭﻩ ﻫﺎﻭﭼﻪﺭﺧـﻪﻛﺎﻧﻲ ـﻪﺭﺍﺳﻴﻤﻪﻛﺮﺩ: ﻛﻪ ﭼﯚﻥ ﺑﻪﻡ ﺭﻩﺳﻪﻧﺎﻳﻪﺗﻲ ﻭ ﺑﻪﻡ ﻓﺮﻩﻳﻲ ﻭ ﺑﻪﻡ ﻗﻮﻟﻴﻪ ﻫﺎﺗﯚﺗﻪ ﻛﺎﻳﻪﻭﻩ.

ﻫﻪﺭ ﺋﻪﻣﻴﺶ ﺑﻮ ﻛﻪ ﻫﻮﻧﻪﺭﮔﻪﻟﻴﻜﻲ ﻟﻪ ﻭﻳﮋﻩ ﻭ ﻟﻪ ﺑﻴﻨﺎﺳﺎﺯﻱ ﻭ ﺟﯚﺭﻩﻛـﺎﻧﻲ ﺩﻳﻜـﻪﻱ ﻫﻮﻧﻪﺭ ﺩﺍﻣﻪﺯﺭﺍﻧﺪ..

ﺑﻪﻻﻡ ﮔﺮﻧﮕﺘﺮﻳﻦ ﺷﺖ ﻛﻪ ﺋﻪﻭ ﮊﻳﺎﺭﻩﻱ ﺟـﻮﺩﺍ ﺩﻩﻛـﺮﺩﻩﻭﻩ، ﺋـﻪﻭﻩﺑﻮ ﻛـﻪ ﺑـﻪﻭ ﻫـﻪﻣﻮ ﻛﺎﺭﻩﻱ ﻟﻪ ﺋﺎﻭﻩﺩﺍﻧﻜﺮﺩﻧﻪﻭﻩﻱ ﺯﻩﻭﻱ ﺋﻪﻧﺠﺎﻣﻴﺪﺍ ﻫﻪﺭ ﻟـــﻪ ﺳـﺎﻳﻪ ﻭ ﺳـﻴﺒﻪﺭﻱ ﺑﻴﺮﻭﺑـﺎﻭﻩﺭﻱ ﺭ ـﺴﺖ ﺩﺍ ﺑـﻮ، ﺑـﻪﻟﻜﻮ ﻟـﻪ ﭘﻴﮕﻪﻛﺎﻧﻴـﻪﻭﻩ ﻫـﻪﻧﮕﺎﻭﻱ ﻫـــﻪﻟﺪﻳﻨﺎ، ﻫـــﻪﺭ ﺧـــﺎﻛﻴﻜﻲ ـﺎﻭﻩﺩﺍﻧﺪﻩﻛﺮﺩﻩﻭﻩ ﻭ ﺑﻨﻴـﺎﺗﻲ ﺩﻩﻧـﺎ ﺑـﺮﻭﺍﻱ ﺑـــﻪﺧﻮﺍ ﻭ ﺑـــﻪ ﺭﯚﮊﻱ ﺩﻭﺍﻳـــﻲ ﻫـــﻪﺑﻮ ﻭ، : ﺧﻮﺍﺯﻳﻪﻛﺎﻧﻲ ﺑﺮﻭﺍﺑﻮﻥ ﺑﻪ ﺧﻮﺍ ﻭ ﺑـــﻪ ﺭﯚﮊﻱ ﺩﻭﺍﻳـﻲ ﺩﻩﻫﻴﻨـﺎ ﺩﻱ ﻟـﻪ ﺑـﻪﻫﺎ ﻭ ﺋﺎﻛـﺎﺭ ﻭ ـﻪﺑﺪﻩﻧﻪﻛﺎﻥ، ﺑﻪﺑﻲ ﺋﻪﻭﻩﻱ ﻟﻪ ﻫﻪﺳﺘﻲ ﻭﻱ ﺩﮊﺍﻳﻪﺗﻴـــﻪﻙ ﻟـﻪ ﻧﻴـﻮﺍﻥ ﺋﺎﻭﻩﺩﺍﻧﻜﺮﺩﻧـﻪﻭﻩ ﻭ : ﺧﻮﺍﺯﻳﻪﻛﺎﻧﻲ ﺑﺮﻭﺍﺩﺍ ﺩﺭﻭﺳﺖ ﺑﻲ.

* * *

ﺋﻪﮔﻪﺭ ﺋﻪﻡ ﮊﻳﺎﺭﻩ ﻟﻪ ﭘﺎﺷﺎﻧﺪﺍ ﺗﻮﺷﻲ ﺧﯚﺷﺮﺍﺑﻮﺍﺭﺩﻥ[1] ﺑﻮ ﺋﻪﻭﻩ ﺳﻪﺭﻩﺗﺎﻱ ﻻﺳﻪﻧﮕﻲ ﺑـﻮ ـﻪ ﻣﻴﮋﻭﻱ ﺋﻪﻡ ﺋﻮﻣﻤﻪﺗﻪ ﻭ ﺳﻪﺭﻩﺗﺎﻱ ﺑﻪﺭﺗﻪﺳﻜﺒﻮﻧﻪﻭﻩﺵ ﺑﻮ..

ﺋﻪﻭﻩﺵ ﮔﺮﻓﺘﻴﻜﻪ ﻟﻪ ﮔﺮﻓﺘﻪﻛﺎﻧﻲ ﻗﻪﻭﺍﺭﻩﻱ ﻣﺮﯚﭪ ﻭ ﮊﻳﺎﻧﻲ ﻣﺮﯚﭪ ﻛﻪ ﻟـــﻴﺮﻩﺩﺍ ﺑـﻮﺍﺭ ـﻴﻪ ﻟﻴﻲ ﺑﺪﻭﻳﻴﻦ، ﻭ ﺋﻪﮔﻪﺭ ﭼﻲ ﺑﻪﺳﻪﺭ ﭼﻠﻲ ﻟﻪ ﺑـﻮﺍﺭﻱ ﺑﺎﺳـﻜﺮﺩﻧﻲ (ﭼـﻪﻣﻜﻲ) ﮊﻳـﺎﺭ ﻭ ـﺎﻭﻩﺩﺍﻧﻜﺮﺩﻧﻪﻭﻩﻱ ﺯﻩﻭﻱ ﺑﺎﺳﻴﻜﻤﺎﻥ ﻟﻴﻮﻩ ﻛﺮﺩ..

---

[1] ﺧﯚﺷﺮﺍﺑﻮﺍﺭﺩﻥ: ﺗﺮﻑ

ئوممەتەکان کە دامەزرانیان دەستپێدەکەن عەزیمەتیان کۆیە و ورەیان مشتومالکراوە وتواناییان زۆرە، چونکە روبەروی بەرەنگاریەکی زۆر دەبنەوە و، روبەروبونەوە و رکابەرێتیش دەبنە هۆی مشتومالکردنی ورە و وروژاندنی توانا و کۆکردنەوەی عەزیمەت و، چەند نەوەیەك تێدەپەڕن تا (داهێنان)ەکە تەواو دەبێ بەشێوەیەك کە وجودی دێنێتە دی و دەیچەسپێنێ و بالادەستی دەکات و بەسەر رکابەرەکان زالدەبێ.. جا ئەو کاتە جۆرێك ئارخەیانی دێتە دی بەرامبەر ئەو شتانەی کە هاتونە دەست و داهێنراون ئەمەش جۆرە خاوبونەوەیەکی لەگەلدا دەبێ، لەگەل ورە دابەزین و، روکردنە ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی و بەتایبەتی لەگەل زۆری داهاتە مالیەکان کە زۆربەی جار لەگەل سەرکەوتنی مادیدا پێکەوە دێن..

کاتێك خۆشڕابواردن دەستپێدەکا داروخانیش دەستپێدەکا..

شتە ترسناکەکان دێن و ئوممەتیش بە خۆشڕابواردن و، بە خۆشی نێزیکی دنیاوە خەریکە، گوێ ناداتە ئەو ترکزەیەی لێی نزیك دەکەوێتەوە، بەهێزی خۆی خەلەتاوە، یا لە هۆکارەکانی هەسانەوە و تەندروستی و بەزەویەوە دەنوسێ و پالدەکەوێ و، ئاگادار کەرەوەکان لە خۆی دور دەخاتەوە!

ئەوجا سونەتی پەروەردگار لەوێرانکردنی رابوێرەران دێتە دی:

﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا: هەرکە ویستمان شارێك قڕکەین، دەولەمەنە خۆشڕابوێرەکانی وان، دنە دەدەین بۆ بەدفەڕی و خراپکاری و لە ئاکاما ئازاریان بۆ شایستە دەبێ ئەوساکە تێکی دەهاڕین.﴾الاسراء/١٦.

ـسونەتەکانی پەروەردگاریش لەگـەڵ کەسـێك لەوەدیـهێنراوان خاترانـە ناکـات، هەرچەند بەخۆشیان شتی واهەڵبەستن گوایە خاتریان دەگیرێ.

﴿وَقَالَت الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُمْ بِذُنُوبِكُـمْ بَلْ أَنْتُمْ بَشَرٌ مِمَّنْ خَلَقَ: جولەکەکان و فەلەکان گوتیـان ئێمـە ئـەولاد و دۆسـتانی خوداین. بڵێ ئەدی چۆن لەسەر گوناهتان ئازارتان دەدا؟ نەخێر ئێوەش هەر مرۆڤن، وەکو خەڵکی دی کە خودا دروستی کردون.﴾المائدة/١٨.

سونەتی پەروەردگاریش بەهەمانشێوە بەسـەر ئوممـەتی-ئیسـلامیدا پیـادە بـوە کاتێك روی دا رابواردن و پاڵدانە زەوی، چونکە سونەتەکانی خوا ناگۆڕێن:

﴿فَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَحْوِيـلاً: قـەت نـابینی رێ و شوێنی خوا بگۆڕدرێ و جێبەجێ بێ﴾فاطر/٤٣.

جـا لەلایەکـەوە خۆشـــڕابواردنێکی بکـوژ، لەگـەڵ-یـا بەشـوێنکەوتنی-کاردانەوەیەکی ترسـناك لەلایەکـەی دیکـەوە، کـە بریتـی بـو لـە خۆمـاتکردن و پشتکردنە ئاوەدانکردنەوەی مادی زەوی و وەرگرتنـی هۆکارەکـانی هـێزی مـادی، بەهەنجەتی ئەوەی کە دونیا نەفرەتلێکراوە چونکە خەڵك لە ئاخیرەت دور دەخاتەوە.

بەم شێوەیە ژیارەکە لەیەکاتدا لە هەردو لاوە دادەڕوخا:

لایـەنی روحـی و مەعنـەوی-لایـەنی بـەها و ئاکـار و مەبدەئـەکان- کـە خۆشڕابواردنی نابەجێ گەندەڵی دەکرد، لایەنی مادی بەرهەستیش کـە سـۆفیگەری گەندەڵی دەکرد کاتێك پشتی کردبوە ئاوەدانکردنەوەی زەوی..

نە ئەو خۆشڕابواردنە لە ئوممەتی ئیسلامیەوە قبوڵ دەکرێ و، نە رێگەی راسـتی راستکردنەوەشـی بریتیـە لـە خۆمـاتکردن و پشـتکردنە ئاوەدانکردنـەوەی زەوی، ئەمانە هەردوکیان لە هۆیەکانی لاوازیـی بـون کـە دوژمنـانی ئوممـەتی ئیسـلامی

تامەزرۆ کـرد، جـا لـە رۆژهـەڵات و رۆژئـاواوە هـاتن هـەوڵی لـەناوبردنی دینـی خوایاندا.

شەپۆلێکی بەرتەسك بوونەوە لە هەمو گۆڕەپانێکدا رویدا..

گۆڕەپانی هرز و زانست، گۆڕەپانی وێژە و هونەر، گۆڕەپانی سیاسەت و ئـابوری و جەنگ، گۆڕەپانی بەرهەمـهێنانی مـادی پیشەسـازی و کشـتوکاڵی، گۆڕەپـانی رەفتاری بە ئاکار.. هەروەها -لەپێش هەمو شتێك- لەبواری بیروباوەڕی راست، لـە چەمکی پەرستن و چەمکی (لا إله إلاّ الله).[1]

ئەم واقیعەش چەند سەدەیەك بەردەوام بو، جیهانی ئیسـلامیش رۆژبـەرۆژ پـتر رۆدەچو، دوژمنەکانیشی لەسەر حیسابی وی بەهێز دەبـون و، لـەداکۆکی کردنـەوە بەرەو هێرش بردن دەچون، هەر رۆژەی پارچەیەکیان لە جیهانی ئیسلامی دادەبـڕی، زەلیلیان دەکرد و دەیانکردە کۆیلە و، هەوڵیان دەدا ئیسلامی تێدا لەناو ببەن..

پاشان جیهانی ئیسلامی بەهۆی ئەو کۆستە خەبەری بۆوە، کاتێك دیتی هـەمو شتێك لەناوەوەی دادەڕوخێ و دەکەوێتە چنگ دوژمنان.

داڕوخانیش ئەنجامێکی سروشتی ئەو هەمو لاڕێبونانە بو کە بەدرێژایی‌سەدەکان رویاندا.

ئەوبەتاڵیەی توشی چەمکی (لا إله إلاّ الله) بو، ئەو بەتاڵیەی توشـی چـەمکی پەرستن بـو، ئـەو سـلبیەتە دەسـتلەخۆبەرداوە نەخۆشـە، پشـتکردنە ئامرازەکـانی هێزیش کە خودا فەرمانی داوە بۆ دوژمنانی خوای ئامادە بکەن.

بەڵام کۆستی هەرە گەورە -کە لـە توندیەکـەیدا هاوتـەریبی بەتالییـەکان بـو- دۆڕانێکی توندی نـاوەکی دروسـتکرد کـە هێشـتا (موسـڵمانانی هاوچـەرخ) لێـی

---

[1] ئەگەر دەتەوێ بگەڕێوە بۆ (خط الانحراف) لە کتێبی (واقعنا المعاصر).

هەڵنەستاونەتەوە، تەنیا ئەوانە نەبێ کە بۆ حەقیقەتی ئەم ئاینە گەڕاونەتەوە و، لە جیهانی واقیعدا مومارەسەی ئەو حەقیقەتانەیان کردوە.. بریتی بــو لــەو دۆڕاندنــە رۆحیەی لە دەرونیاندا زێی ئەوەی خۆشــکرد کــە هێرشــی هــزری بــەبێ گفتوگــۆ و تێرامان و بیرلێکردنەوە قبوڵ بکەن..

لە نێوان ئەو چەمکانەی کە هێرشی فیکری بەسەقەتی خستیە دڵ و مێشــکیان چەمکی ژیار و ئاوەدانکردنەوەی زەوی بو.

-بەهۆی هێرشی فیکری- وایان لــە ئەندێشــە دا چەســپا کــە بۆیــە دواکــەوتون چونکە موسڵمان بون!

ئەم خەیاڵەش چەند لە راستەقینەوە دورە! چونکە ئــەو رۆژەی تێیــدا دواکــەوتن لەهەموو رۆژێك دورتربون لە ئیسلام! دورکەوتنەوەشیان لە حەقیقــەتی ئیســلام بــو کە بوە هۆی ئەو پاشکەوتنە شەرمەزارکەرەیان.[1]

بــەڵام ئــەم خەیاڵــە وای لێکــردن بــــەدوای چارەســـەردا بگــەڕێن نــەك لــە ئیسلامەکەیان-کە لێی داشۆرابون- بەڵکو لە ژیاری رۆژئاوا... واتە لە جاهیلیەتی هاوچەرخ!

جاهیلیەتی هاوچەرخیش پێی گوتن: کە ژیــار بریتیــە لــە پێشــکەوتنی مــادی وزانستی و تەکنەلۆجی و، رێخۆشکردنە مادیەکانیش ئەو ئەرکە لادەبەن کە لەسەر شانی مرۆڤ بو تا ئامێر هەڵیبگرێ و، ئەو ئێش و ئازارەی هەشــیبو بــەداودەرمان نایهێڵێ!

هەروەها ئەو جاهیلیەتە پێی گوتن-بەزمانی حاڵ ئەگەر بە قســەش نکوڵــی لێ بکات- کە بەهاوئاکار و مەبدەئەکان قسەی زیادن و لەحیساب دەرکراون!

---

١ ئەگەر حەز دەکی بگەڕێوە بۆ (اثار الاحراف) لە (واقعنا المعاصر).

ئەوجا (موسڵمانە هاوچەرخەکان) دەستیانکرد بە شارستانبون و ژیـار وەرگرتـن و! هەستان تۆزێ دواکـەوتن لـە خۆیـان دابتـەکێنن و، هـەوڵدەن لەچـەند سـاڵێك قەرەبوی پاشکەوتنی چەند سەدەیەك بکەنەوە!

بەپێی بەرنامەی رۆژئاوا ژیاریـان دادەمـەزراند و، خۆیـان لـە بەرنامـەی خـوا دادەرنی و لێی دەرەوینەوە.

دەستیان پێکرد هەندێك هۆکارەکانی هێزی مـادی وەرگـرن-هەرچـەند سـارد و سڕی و تەمبەڵیشیان پێـوە دیـار بـو- لـە کـاتێکدا تـا چەناگـە لـە بـەفیڕۆدان و خۆشڕابواردنی رۆژئاواییدا نقوم بـون، لـە وێنـەی مـاڵی نـوێ و، نوێنـی نـەرم و، ترومبێل و فرۆکـە و، تـەندور و سـەلاجەوە و، جلوبـەرگی ئـاڵوواڵا و.. شـەراب و قومار و، بەرەڵاییەکی سێکسی بەناوی (رەهابون)!

لە گەندەڵبونە ئاکاریەکانیش گەرێ کە هەمو دانی پێدادەنێـن کـە گەندەڵییـە، ئەگەر چی لەناخی دەرونیشیاندا پێی دڵخۆشن و، هەمیشە حـەزیان لـە زیـاترە و، چاویـان بڕیوەتـە ئـەو رۆژەی دەبێتـە (دراوی کـارپێکراو)، هـەتا-بـەناوی ژیـار و پێشکەوتن- هەر پیسی و پوخڵیەکی کە دەرونیان بیەوێ مومارەسەی بکەن..

لایەنە راستەقینەکەی پێشکەوتنی مادی وەرگرە کە چاویـان تێبڕیوە: کـرداری پیشەسازی و، زۆرکردنی بەرهەم و، بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان و، زۆری بەکاربردنی کارەبا(!)

نرخی ئەم هەموە چیە بەبێ بەها و بەبێ مەبدەئو بێ ئاکـار؟! بـەبێ (ئیسـلام) نرخی چیە، کە خۆیان لیْ دارنیوە و فڕێیانداوە؟!

وا دەزانن بەمە لە زەبونی و سوك بونیان لەنێو خەڵکی دەچنە دەرێ؟!

ـا گـوێ بدەنـە وتـاری مێژونوسـی هاوچـەرخ (توینبـی) دەربـارەی تورکیـای ـەت تورك:

{تورکەکان بەگۆڕینی دەستوری خۆیان وازیان نەهێنا (کـە شـتێکی تاڕادەیـەك ـانایە لـە بـواری چاکسـازی دەسـتوریدا)، بـەڵکو کۆمـاری تورکـی تـازە زاو، : کۆکیکاری ئاینی ئیسلامی-واتە خەلیفە-ی لابرد و پۆستەکەی-واتە خیلافـەت- ـەهێشت و پیاوانی ئـاینی ئیسـلامی چەککرد و، رێکخراوەکـانی شـیکردنەوە و، حیجابی لەسەر ئافرەتانی موسڵمان داکەند و، دژایـەتی هـەمو شـتێکی کـرد کـە حیجاب بۆی دەبێتە رەمز و، زۆری لە پیاوان کـرد شـەپقە لەسـەر کـەن کـە رێـی نوێژکردنی ئیسلامی تـەقلیدیان لێدەگـرێ، بەتایبـەتی لـە سـوژدەدا، شـەریعەتی ئیسلامیشی بەتەواوی گسکدا[1] و، یاسای شارستانی سویسری وەرگـرت پاشـئەوەی بـۆ تورکـی وەریگـێڕا و، یاسـای تاوانـەکانی ئیتاڵیشـی پیـادەکرد و، ئەمـەش بەفەرزکردنی ئەو دویاسایە بو پاش دەنگدان لەسەریان لە ئەنجومەنی نیشـتمانی و، پیتە عەرەبیەکانی بەپیتی لاتینی گۆڕی و، ئەمەش مەسـەلەیە نایەتـەدی مەگـەر بەفڕێدانی گەورەترین بەشی کەلەپوری ئەدەبی عوسمانی کۆن..

چاودێری رۆژئاوایی دەبێ ئاگای لە سـنوری لیاقـەت بـێ و هەڵـەکاری نـەکا و گاڵتە بەکەس نەکا، چونکە ئەوەی (لاساییکارە) تورکەکان دەیانەوێ ئەنجامی بدەن بریتیە لە گۆڕینی نیشتمان و هاوڵاتیەکانیان لـەوەی تێیـدان، بـۆ حاڵـەتێك ئێمـە بەخۆمـان-هەر لەساتی پێکگەیشتنی رۆژئاوا و ئیسلامەوە- رەخنـەیان لێدەگریـن

---

١ (الدکتور نبیل صبحی) وەرگێڕ، لەپەراوێزدا لەبارەی ئەم واژەیە دا دەڵێ (ئەمە دەربڕینی دانـەری.. ئەدیبە!!).

که هەر بەسروشت تێیاندا نیە، جاوا ئەوان هەوڵیانداوە-هەرچەند درەنگیش بێ- وێنەیەکی هاوشێوەی دەوڵەتێکی ڕۆژئاوایی و گەلێکی ڕۆژئاوایی‌ی دابمەزرێنن.

کاتێك بەتەواوی پەی بەو ئامانجە دەبەین کە کاریان بۆ کردوە، تەنیا دەتوانین بەسەرسوڕمانەوە بپرسین: ئایا ئەو ئامانجە بەڕاستی دەبێتە بیانو بۆ ئەو هەمو هەوڵەی کە لەکێشەکەیان خەرجیانکرد بۆ بەئامانج گەیشتن؟؟؟

بەڵگە نەویستە کە ئێمە ئەو تورکیە تەقلیدیە موسڵمانە (بەحەماسەتە)مان خۆشنەدەویست کە ڕقی ئێمەی دەوروژاند کاتێك لە هەورازەوە وای تەماشا دەکردین کە ئێمە فەرەنگی زەندیقین! ئەو تورکە ستایشی خواشی دەکرد کە وەك ئێمەی لێنەکردوە، لەبەر ئەوەی تورکی تەقلیدی کۆنیش خۆی لە قوڕێکی تایبەت دادەنا، ویستمان لەو روحە بەرزەی دابشکێنین، بەهۆی بێزراو کردنی ئەو (قوڕە تایبەتە) و، ناومان لێنا (تورکی هیچ).. تا لەم دواییە توانیمان چەکە دەرونیەکەی تێکبشکێنین و، هانماندا بۆ ئەوەی ئەو شۆڕشە (لاساییە) ئەنجامبدا کە ئێستا وا لەبەر چاوی ئێمە ئیستیهلاکی کردوە

ئێستاش پاشئەوەی بابای تورك بەهاندان و چاودێری ئێمە گۆڕا و، پاشئەوەی وایلێهات لە هەمو ئامرازێك دەگەڕێ تا خۆی وەك ئێمە و گەلانی ڕۆژئاوای دەوروبەری لێبکا.. ئێمە ئێستا هەست بەتەنگی و شەرمەزاری دەکەین، بەڵکو ڕەنگە هەست بەتوڕەیی و کینەش بکەین.. تورکیش دەتوانی وەڵامان بداتەوە بەوەی کە هەر شتێك بکا لەدیدی ئێمەدا هەڵەیە، ئەویش-تورکیەکە- دەتوانێ بەشێك لە کتێبی پیرۆزی ئێمە بەبەر گوێماندا هەڵێنێ، کە دەڵێ:

(لەگەڵ ئێوە فومان لە هەمبانان کرد و سەماتان نەکرد، لەگەڵ ئێوە دڵتەنگ بوین و سەماتان نەکرد، لەگەڵ ئێوە دڵتەنگ بوین و ئێوە نەگریان)!

بەهەر حاڵ رەنگە رەخنەگرتنمان لە توركان رەق و نەشیاوبێ.. بەڵام هیچ كینەیەكی لەگەڵدا نیە و، لە بابەتەكەش بەدەر نیە، دەبێ كەلەپوری ژیاری چ قازانجێك بكا ئەگەر هەوڵی توركان بەفیڕۆ نەڕۆیی؟ واتە گریمان ئەگەر وەگ پێویست سەركەوتن؟؟ ئەمەش خاڵێكە دو خاڵی لاوازی رەسەن لە بزوتنەوەی (لاساییكاران) دەردەخا:

یەكەمیان: بزوتنەوەی لاساییكار شوێنكەوتەیە و داهێنەر و تازەگەر نیە، بۆیە لەحاڵەتی-گریمان- سەركەوتنیدا تەنیا بڕی بەرهەمە پیشەسازیەكان زیاد دەكا كە ئامێر لە كۆمەڵگا لاساییكارەكان بەرهەمی دێنن، لەباتی ڕەهاكردنی هەندێك وزەی داهێنەر لە دەرونی مرۆڤدا.

دوەمیان: لە حاڵەتی ئەو سەركەوتنە-گریمانە- كزۆڵەدا، كە دوا ڕادەیە (لاساییكاران) بتوانن بیگەنێ، ئەوا دەربازبونێك-تەنیا دەربازبون- بۆ كەمینەیەكی كەم دێتە دی لە هەر كۆمەڵگەیەكی كە (لاساكردنەوە) هەڵبژێرێ.. چارەنوسی زۆرینەش: بریتیە لە گەورەكردنی ژمارەی پرۆلتیاریای ژیاری لاساییكار[1]} (مەبەستی ئەوانەیە كە دەبنە بەندەی ژیاری رۆژئاوا)!

ئەمە تانە و تەشەری راشكاوو، پێخۆشبونێكی ئاشكرای خاچپەرستانە، بەوانەی خودی خۆیان گوم كردوە و، لە هەمانكات لە ئاست پێشكەشكردنی شتی رەسەن بۆ مرۆڤایەتی كەنەفتن.

---

١ لە كتێبێكی وەرگێڕدراوەوە بەناونیشانی (الاسلام..الغرب..والمستقبل) كە وەرگێڕاوی دو موحازەرەی (توینبی)ە كە لە ساڵانی ١٩٤٧و ١٩٥٢ داویەتی، وەرگێڕان د.نبیل صالح، دارالعربیة للطباعة و النشر و التوزیع، بیروت ط١٣٨٩ه-١٩٦٩م، ص٥٠-٥٣. (هەڵبژاردە).

موسڵمانی راستەقینەش زۆرێکی زۆریان پێیە تا لە جاهیلیەتی سەدەی بیستەم بیدەنە مرۆڤایەتی گومرا..

با لەکوێوە دەیانەوێ ئاوەدانکردنەوەی مادی زەوی وەربگرن، بەڵام با لەسەر بەرنامەی پەروەردگار دایمەزرێنن، تا ژیارێکی راستەقینەی رەسەن بنیات بنێن کە شایستەی ئەم ناوەیە.

با زانست و پێشکەوتنی مادی و تەکنەلۆجی وەربگرن، بەڵام با دیاریبکەن ئەم هەموە بۆچی بەکاردەهێنن..

لەبەندایەتی زەلیل بۆ ئارەزوەکان؟ لە نقوم بون لە ژیانی دنیا تارادەی لە بیرکردنی ئاخیرەت؟ لە پەرستنی شەیتان لە جیاتی پەرستنی خوا؟

لەو کاتەدا نە خۆیان لە سوکی وزەلیلی دەرباز دەکەن و، نە دەتوانن مرۆڤایەتی لەوێڵی و سەرگەردانی رزگار بکەن..

بەڵام کاتێ بۆ بەرپاکردنی بەرنامەی پەروەردگار بەکاری دێنن؟.. بۆ گێڕانەوەی شەریعەتی خوا تا حوکمی زەوی بکا؟.. بۆ بەرپاکردنی دادگەری پەروەردگار هەر وەکو خودا دەیەوێ؟ لەبەرپاکردنی ژیان لەسەر بنەمای ئاکار لە سیاسەت و ئابوری و پەیوەندیەکانی کۆمەڵگە و پەیوەندیەکانی خێزان و پەیوەندیەکانی نێوان هەردو رەگەز و فیکر و ئەدەب و هونەر..؟ بە دەستەواژەیەکی دیکە؛ مەبەستی وجودی مرۆڤ وەدی دێنن؟ (لا إلـه إلاّ الله) لـە جیـهانی واقیعدا وەدی دێنن؟ چەمکی راستودروستی پەرستن وەدی دێنن؟

ئەو کاتە خۆیان رزگار دەکەن لەوەی بەسەریان هاتوە و، دەستی دەربازبونیش بۆ مرۆڤایەتی گومرا و وێڵ درێژ دەکەن کە بەدوای رێی دەرباز بون دەگەرێ.

ئەمەش لای خوا زەحمەت نیە:

﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِـــي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمْ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّـهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا: خوا بەوانەی لـەئێوە بڕوایـان هەیە و ئاکار چاکن، بەڵێنی دا: لەم زەمینە دەیانکاتە جێگەنشین، هــەروەکو چـۆن ئەوانەی بەر لەوانی کردە جێنشین، دینەکەشیان-کە خۆی پەســەندی کـردوە- هـەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی، تا تەنیا من بپەرستن، هیــچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن.﴾النور/٥٥.

﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُــولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا: بەو ئاوایە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئۆمەتێکی هەڵبژاردە، تا ئاگاو لە مەردم هەبێ و پێغەمبەریش چاوەدێریتان لێبکا.﴾البقرة/١٤٣.

﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ: ئەوانەی وا ئەگەر لەم زەمینەدا دایمـەزرێنین. نوێژکەر و زەکات دەرن و فەرمان بە چاکە دەدەن و بـەر لـە کـاری خـراپ دەگـرن، سەرەنجامی هەمو کاریش هەر بۆ خوایە.﴾الحج/٤١.

# بەندی شەشەم

# چەند تیشکێک بۆ سەر ئایینە

# چەند تێبینیێك بۆ سەر ئاینده

لەوەی تێپەڕی لەم كتێبەدا هەندێك چەمكی سـەرەكی ئیسلامان خسـتە رو و، رونمانكردەوە كە لەهەستی نەوەی یەكـەمدا چـۆن بـو كـە ئاینیـان راسـتەوخۆ لـە پێغەمبەری خـوا ﷺ وەرگرتبـو و، لەبـەر چـاوی وی پـەروەردە بوبـون، نـەوەكانی دواتریش كە لەسەرچاوەكانی روناكی نێزیك بون.. لەگەلّ باسـی چۆنیـەتی گۆڕانـی ترسناكی ئەو چەمكانە و دەرچونیان لە وێنـە راسـت و دروسـتەكەیان لـە هەسـتی نەوەكانی دواییندا.. سەرەتای باسی كاریگـەری ئـەو گۆرانكاریانـە بەسـەر ژیـانی موسڵمانانـدا و چۆنیەتیەكەی، كە لەو ترۆپكەی هێنانە خوار كە تێیدابـون بـۆ ئـەو نزمیانەی ئەمڕۆ كە تێیدا دەژین وەك ئاومالكی سێلاوی.

پرسیارێكی سروشتیش لەپاش ئەم خستنە ڕوە دێتە ئاراوە.. ئەدی پاشان؟!

ئەدی پاشنەوەی مەسـەلەكان گەیشـتنە ئـەم شـێوەیە و، ئوممـەت بـەمجۆرە لـە حەقیقەتی ئیسلام دوركەوتەوە؟!

قەدەری خوا وەلامی ئەم پرسیارەی خستە ئەستۆ كە (رابونی ئیسلامی) هێنایە بون:

﴿وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ: خوا لەسەر كاری خـۆی زاڵە، بەڵام زۆربەی ئەم خەلكە هیچ لێنەزانن.﴾یوسف/٢١.

رابونی ئیسلامیش قەدەری باڵا دەستی خودایە، كـە خـودا بـۆ ئـەوە تـەقدیری كردوە هەتا ئەم ئوممەتەی لەو حاڵەتە وێڵی و سەرگەردانیەوە پێ بێنێتەدەر كـەتێی

کەوتوە و، وەکو ئاومالکی سێلاوێی لێکردوە، جا بیخاتە سەر راستەرێ و، رەگ داکوتان بۆ جارێکی یکە و، ئەنجامدانی رۆلێکی نوێ لە ژیانیدا، کە خۆی پێ لەو سوکی و زەبونی و پەرتەوازەیی و وێلیە، رزگار کا کە تێی کەوتوە و، لەهەمانکات تروسکە روناکیەك بۆ مرۆڤایەتی دەربخا، بەلکو بۆ رێگا رێنوێن دەبێ![1]

بەلام رێگەی بەردەم خودی رابونیش پڕ تەگەرەیە، پڕ درك و دالە، پڕ کۆسپە، پڕاوپڕ درندەی کێوین کە رێبواران هەلدەلوشن تا یەك بەیەك لەناویان بەرن، چونکە چاك دەزانن ئەگەر ئەمرۆ لەناویان نەبەن، سبەینێ رێگەیان لێدەگرن!

بەلام مزگێنیەکان-هەروەك لە کتێبی (واقعنا المعاصر) ئاماژەم پێکردوە- لە رێگرەکان پترن، قەدەری خواش بەرەو مەبەستی خۆی دەروا و هیچ شتێك لەرێی ناوەستێ!

﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا إِنَّهُمْ لاَ يُعْجِزُونَ: خوانەناسان وا بیرنەبەن وەپێش کەوتون. ئەوان ئێمە نابەزێنن﴾الأنفال/٥٩.

بەلام رابون پێویستی بەوە هەیە کە کۆسپەکانی رێگە بناسێ هەتا ساتمە نەکا و، تەگەرەکان بناسێ بۆ ئەوەی کەرستەی پێویستی بۆ ئامادە بکات. هەروەها دەبێ سروشتی ئەو درندە کێویانە بزانێ، تا بزانێ چۆن لەگەلیاندا بجەنگێ و، بوار و گۆرەپانەکانیشی بناسێ، تاکو لەهەمانکات وای بەخەیالدا نەیێ کە رەنگە هەندێك لەو درندانە لە ئاست موسلمانان لە هەندێکیان بەبەزەیی ترن، یا رەنگە هەندێکیان رێ بەرێبوارانی رێگەکە بدات!

هەروەها پێش هەموو شتێك دەبێ بزانێ کەرەستەی سەرکەوتن لەو جەنگە توندە دا چیە کە لە نێوان خۆی و دوژمنانی خوا بەرپا دەبێ و، بیەوێ یا نەیەوێ

---

[1] ئەگەر دەتەوێ بگەرێوە بۆ (الصحوة الاسلامية) و (نظرة في المستقبل) لە کتێبی (واقعنا المعاصر).

هەردەبێ گەڕی تێبئالێ، چونکە ئەو دوژمنانە بەهیچ جۆرێك لە رابونی ئیسلامی رازی نابن و، واز لە کوشتاری ناهێنن:

﴿وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ: ئەم جولەکانە و فەلانە تا نەچیە سەر دینی ئەوان هەرگیز خۆشیان لەتۆ نایەو لێت رازی نابن.﴾البقرة/١٢٠.

﴿وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا: ئەوان دەستتان لیٚبەرنادەن، هەر دەگەڵ ئێوە بەشەڕ دێن هەتا ئەگەر بۆیان بلوێ ئێوە لە دینەکەی خۆتان وەرگێڕن.﴾البقرة/٢١٧.

* * *

لەسەرەتادا دەبێ رابون پەی بەوە ببا کە جەنگەکە جەنگی ئەم کۆمەڵە یا ئەوی دیکە نیە و، جەنگی ئەم دوژمنە یان ئەوێهێ نیە.. بەڵکو جەنگی سەرجەم ئوممەتی ئیسلامیە لەگەڵ تێکڕای دوژمنانی.. دوژمنداریەکە هەر لەبنەڕەتدا لە نێوان دوژمنانی خوا و ئیسلامدا بەرپایە، دوژمنان لەهەر کوێیەك بن و، ئیسلامیش لەهەر کوێیەك بێ.

داخوازی ئەمەش ئەوەیە کە بزانی سەرکەوتن تەواو نابێ و وەدی نایێ و جەنگ لە نێوان دوژمنان و لە نێوان تاخم و پێرە ئیسلامیە تاك و تەراکان لێرە و لەوێ هەر بەرپایە، کە دڕندەکان بەتەنیا غافڵگیریان دەکەن و بەبالاّ دەستیەوە لەناویان دەبەن.. بەڵکو -بەیاریدەی خودا- ئەوکاتە وەدیدێ کە شەڕەکە دەبێتە جەنگی (ئوممەتی ئیسلامی) بەبەرفراوانی خۆیەوە، بەرامبەر ئەو دوژمنانەی کە لە هەمو شتێکدا پارچەپارچەن و، بۆ جەنگی موسڵمانان یەك پارچەن، هەر چەند لەهەمو بارێکی دیکەدا لێکجودا بن!

کاتێکیش دەڵێین ئوممەت بەبەرفراوانیەکـەی هـەندێك خـەڵك وا گومـان دەبـەن مەبەسـت هـەمو تاکێکـە لـە تاکـەکانی، کـە ئەمـەش مەحاڵـە! چونکـە هیــچ کۆمەڵگەیەك لەمێژودا نیە-چ جای ئوممەتێك کـە ئـەمڕۆ ژمـارەی دەگاتـە هـەزار ملیۆن مرۆڤ- کە هەموی وەك دڵی یەك پیاو وابن و، لەیـەك ئاسـتی بـەرزی، یـا توندوتۆڵی، یا روله خێرکردن دابن..

تەنانەت خودی کۆمەڵگەی پێغەمبەریش وانەبو، هەروەك لە زیاتر لە شوێنێکی ئەم کتێبە رونمانکردۆتەوە..

بـەڵام مەبەسـتمان ئەوەیـە کـە بنکەیـەکی پۆڵایـین[1] -وەك ئـەو بنکەیـەی لــە کۆمەڵگەی پێغەمبەرﷺ دا هەبو- دروستبێ کە هێز و خۆراگری ئەوەندە هەبێ کـە بڕوا لاوازەکان و، تەگەرە پەیداکەران و، لەسەرخۆکان و لەشگرانەکان و، دوڕوەکـان لەگەڵ خۆی هەڵگرێ و هەمویان بـەرەو ئامـانجی خـۆی ببـا. هـەروەك ئـەو بنکـە پۆڵایینەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر چاوی خۆی پەروەردەی کردن و، هــەبونی ئـەم هەمو جۆرانەی دیکە نەبونە ڕێگر لەبەردەم سەرکەوتنی گردە بڕ بەسـەر دوژمنـانی خودا.

*    *    *

هەروەها دەبێ رابون چاك بزانێ کە جەنگەکە تەنیا جەنگێك نیـە لـە نێـوان دو کۆمەڵە مرۆڤ، یا لەنێو گەلێك و گـەلێکی دیکـە، یـا لـەنێوان جـۆرە چـەکێك و جۆرێکی دی.. بەڵکو لە پێش هەمو ئەمانە-لە هـەموانیش گرنگـتر- جەنگـە لـە نێوان بیروبـاوەڕێك و بیروبـاوەڕێکی دیکـە و، بەرنامیـەکی ژیـان و بەرنامەیـەکی دیکە.

---

١ بنکەی پۆڵایین: قاعدة صلبة.

بیروباوەڕێك كە بڕوای بە خوا و بەرۆژی ئاخیرەت هەیە، لەگەڵ بیروباوەڕێك كە خواوەندی تر دەكەنە هاوبەش لەبڕوابون بەخوا یا هەر لەبنەڕەتدا نكوڵی بونی خوا دەكەن.. بەرنامەیەكی ژیانیش كە لەسەر بیروباوەڕی یەكتاپەرستی دامەزراوە و لەگەڵی كۆك و گونجاوە و، لەو سەرچاوە پەروەردگاریەوە هەڵێنجراوە كە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیوە، لەگەڵ بەرنامەیەك لەسەر هاوبەشپەرستی و بێباوەڕی دامەزراوە و دەگەڵی كۆك و گونجاوە، لەهەر سەرچاوەیەك وەرگیراوە بێجگە لە سروشی پەروەردگار..

داخوازی ئەوەش ئەوەیە كە سەركەوتن وەدینایە تاكو بیروباوەڕ لە دەرونی خاوەنانی پاك و پاڵاوتە دەبێ وە لەهەمو رەگەز و ماكێك رزگار دەبێ كە پەڕیوەتەوە ناوی، جا ئەو رەگەزە غەوارانە[1] تا هەر قوڵاییەك چوبن و، ئەو زەمەنەش هەرچەندی خایاندبێ كە لەگەڵ بیروباوەڕی خەڵكدا تێكەڵبون.

جاهیلیەت هەرگیز وەك ئەمڕۆ بەتێكڕایی و یەكانگیری بەرامبەر بیروباوەڕی یەكتاپەرستی نەوەستاوە، لەیەك جاری دیكە بترازێ، لەسەردەمی ناردرانی موحەممەد ﷺ و یەكەمین سەردەمی ئیسلام.. لەگەڵ ئەو جیاوازیەی پێشكەوتنی زانستی و، پێشكەوتنی تەكنەلۆجی و، ئامرازەكانی گواستنەوە و ئامرازەكانی راگەیاندن هێناویانەتە ئارا، كە وایكردوە ئەو تۆپەڵانەی دژیئیسلام كۆبونەتەوە پتر پێكەوە پەیوەست بن و، زیاتر یەكدیگر و، دڕندانەتر بن.

بەڵام كرۆكی جەنگەكە وەك خۆیەتی و نەگۆڕاوە..

جەنگی یەكتاپەرستی و هاوبەشپەرستی.. جەنگی ئیسلام و جاهیلیەت.

---

١ غەوارە: دخیل.

ئیسلامیش-پاش باڵا دەستبون لەزەویدا- روبەڕوی گەلێك دژایەتی جاهیلیەت بۆوە، جارێك لەگەڵ خاچپەرستان و، جارێك لەگەڵ تەتەرەکان و، پێشتریش جارێك لەگەڵ جولەکەکان.. بەڵام لە دوجار بترازێ هەرگیز لەروی هەمو جاهیلیەتی سەر زەوی پێکەوە رانەوەستاوە: یەکەمیان کاتی ناردنی موحەممەدﷺ و سەردەمی یەکەمی ئیسلام و، دوەمیش لەم سەردەمەی ئێستادا.

ئەمەش وەك ئاماژەمان پێکرد وا دەخوازێ کە بیروباوڕ لە دەرونی خاوەنانیدا بێگەردبێ و، بڕوا بون پێی چەسپاو بێ، بەو بیروباوەڕە بۆ خوا لێبڕاوبێ، هەروەك لە یەکەم روبەروبونەوەدا وابو، هەتاکو ببێتە هاوکوفی ئەو جاهیلیەتەی لەبەرامبەری وەستاوە، سەرەڕای ئەوەش لە کۆتاییدا بەسەریدا سەرکەوتنی.

*　　*　　*

مەسەلەی سێیەم کە دەبێ رابون چاك پەی پێ ببا.. ئەوەیە کە ئەم جاهیلیەتەی ئەمڕۆ روبەڕوی ئیسلام دەبێتەوە لە ترۆپکی ژیاری مادیدایە و، لە لوتکەی سەراسیمە بونیەتی بەو ژیارەوە و، موسڵمانانیش لەم بوارە یەکجار دواکەوتون..

داخوازی ئەمەش ئەوەیە کە موسڵمانان روبەروی ئەو ژیارە ببنەوە بەهەمانشێوەی کە موسڵمانانی یەکەم روبەڕوی ژیاری فارسی و بیزەنتی بونەوە، کە لەلوتکەی باڵا دەستی مادی دابون.. واتە بەو بەها ژیاریانەی تەواو پێچەوانە و بەرامبەرن لەگەڵ ژیاری جاهیلی.

لەو کاتەی روبەڕوبونەوەی یەکەم لە نێوان ئیسلام و جاهیلیەتدا رویدا، موسڵمانان تەواو لە کەرەستەکانی ژیاری مادی و رێکخستنەکانی بێبەش بون، لە کاتێکدا هەردو دەوڵەتە (مەزنەکە)ی ئەوێ رۆژێ-فارس و بیزەنتە- لەیەکێك لە

لوتکەکانی ژیاری مادی و رێکخراوەیی دابون کە پێش ئەوان کەسێك لە مێژودا پێی نەگەیشتبو..

لەگەڵ ئەمەشدا ئیسلام سەرکەوت..

هەر بەهۆی سونەتە ئاساییەکان سەرکەوت، نەك بەسونەتێکی نا ئاسایی و لەرادەبەدەر.. ئەگەر چی هەموو هەر بەقەدەری خوا رودەدەن.

لە سونەتی خوادایە کاتێك حەق بزر بێ، ناحەق با دەخوا و فشوفۆڵ دەبێ، کە حەقیش هات ناحەق پوچ دەبێتەوە..

﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا: بڵێ ئەوا حەق هات و ناهەق نەما، دیارە ناهەق لە نەمانە.﴾الاسراء/٨١.

لەسونەتە ئاساییەکانی خوداش وایە کە حەق و ناحەق پاڵپاڵانێ بکەن بۆ ئەوەی زەوی لەگەندەڵی قوتار بکرێ:

﴿وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ: ئەگەر خودا هێندێکانی لەو ئاپۆرە بەهێندێکیان تەرت و تونا نەکردایە. ئەم زەمینە خراببو! بەڵام خودا چاکەی لەسەر هەمو خەڵکی دنیا هەیە.﴾البقرة/٢٥١.

هەر لە سونەتی خودا دایە کە حەق سەربازانێکی هەبێ بڕوایان پێهەبێ، چونکە ئەو حەقەی سەربازی نەبێ سەرناکەوێ و، دەبێ ئەوسەربازانەش بۆ خودا دڵڕاست بن و، لەسەر بیروباوڕیش پەیوەست بن و، دڵیان لەسەری هۆگر و کۆك بێ:

﴿هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ، وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مَا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَكِنَّ اللّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ: مەبەستە کە خودات دەگەڵە هەر ئەویش هاتە هاواری خۆت و خاوەن باوەڕان و

یاریدەی دان. بە دڵ وانی کردە هۆگری یەکتری. ئەگەر هەرچی لەم سەرزەمینەدا هەیە، هەموت بەخت بکردایە، نەت دەتوانی وا لێکیان کۆبکەیتەوە، بەڵام خودا وا لێکی کردون بە هۆگر هەر خۆی خاوەن دەستەڵاتی لە کارزانە.﴾الأنفال٦٢-٦٣.

دەبێ ئەو سەربازانەش لە پشت بەخوا بەستندا راستگۆ بن:

﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ: ئەی پێغەمبەر! بۆ تۆ باوەڕدارانێ شوێنت کەوتون، خودا بەسە.﴾الأنفال/٦٤.

دەبێ لەپێناو خودا موجاهید بن و، ئەگەر جیهاد هاتە گۆڕێ بەئارامەوە بجەنگن و چاویان لە پاداشی خوا بێ:

﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَفْقَهُونَ، الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ: ئەی پێغەمبەر! هانەی باوەڕداران بدە بچنە جیهاد. ئەگەر ئێوە بیست کەس بن و خۆڕاگر بن، هێزتان بەدوسەد کەس دەشکێ، ئەگەر سەد کەستان خۆڕاگر بن، بەئیزنی خوا دو هەزار کەس لە خوانەناسان رادەنێن. چونکە ئەوان کەسانێکی بێئاوەزن. ئێستا خودا کە دەزانێ ورە و تواناتان کەم بوە کاری بۆ هاسان تر کردن، ئەگەر ئێوە سەد کەس بن و خۆڕاگر بن، دەرەقەتی دوسەتان دێن، خۆ ئەگەر ئێوە هەزاری خۆڕاگر بن، بەئیزنی خوا، دەرۆستی دوهەزاریان دێن، خوا دەگەڵ خۆڕاگرانە.﴾الأنفال/٦٥-٦٦.

هەروەها لە سونەتە ئاساییەکانی خودا ئەوەیە کە ناهەقی فشوفۆڵ بەهێزی مادی خۆی-کاتێك حەق گوم دەبێ- هیچ رەسانەیەتیەکی نیە چونکە ناڕەوایە،

لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ماوەیەك لە زەویدا باڵا دەست دەبێ لەبەر حیکمەتێك کە خـودا دەیەوێ و، بەسونەتێك کە خودا دەیگێڕێ:

﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَـا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ، فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: جا وەختێ ئەو هەمو ئامۆژگاریانـەیان کـە کرابـون، لـەبیرەوە چـو، هەمو دەرگای بەختەوەریمان بۆ کردنەوە هەتا کەوتنە خۆشی و شادی. ئەوسا لەپڕ و نەکاوێك بەر توڕەیی خۆمان خستن و هـەمو نـاهومێد مانـەوە. ئیـتر ئەوسـا ئـەو کەسانەی پیشەیان هەر ناهەقی بو. دوابڕاو بون و سـپاس بـۆ خـوای پـەروەردگاری هەمو دنیا.﴾الأنعام/٤٤-٤٥.

جا ئەگەر حەق هات و-کە بۆ خۆی خاوەن رەسەنایەتیە- کۆڵەگە راگرەکانی بـۆ پێکهاتن، کە بریتین لە ئەو سەربازانە باوەڕیان پێ هەیە و، لەبڕواکانیاندا دڵڕاسـتن، موجاهیدی ئارامگرن و چاو لە پاداشتی خودان، ئەوا بـەو رەسـەنایەتیەی هەیـەتی سەردەکەوێ، ئەگەرچی ژمارەی سەربازەکانی کـەمتر و کەرەستەشـی کـەمتر بـێ، چونکە هەڵگری ئەو بەها رەسەنانەیە کە خودا مانەوە و گونجاویی بۆ نوسیون:

﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّـاسَ فَيَمْكُـثُ فِـي الأَرْضِ: جا کەفەکە لەناو دەچێ و هەر ئەو شـتەی کـە بـۆ مـەردم سـود و بـەهرەی هەیـە دەمێنێتەوە.﴾الرعد/١٧.

﴿كَتَبَ اللَّهُ لأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيـزٌ: خـودا خـۆی بڕیـاری داوە بێگومانـە مـن و پێغەمبـەرەکانم سـەردەکەوین خـوا توانـای بەدەستەڵاتە.﴾المجادلة/٢١.

﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِي الصَّالِحُونَ: له زەبوردا کە لە پاش تەورات بو نوسیمان ئەم زەمینە هەر بۆ عەبدە هێژاکانی ئێمە دەمێنێ.﴾الأنبياء/١٠٥.

﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ، إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ، وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ: بێگومان پێشتریش قسەکانی ئێمە سەبارەت بە عەبدە ناردراوەکانمان بە خەڵکی راگەیەنراوە، کە هەر ئەوان یاری دەدرێن، دیاریشە هەر سوپای ئێمە سەر دەکەوێ.﴾الصافات/١٧١-١٧٣.

ئەوە و-سونەتە هاوشێوە ئاساییەکان- لە زانستی خوادا بڕیاری سەرکەوتنی ئیسلامیان دا لەیەکەم روبەروبونەوەی لەگەڵ هەردو دەوڵەتە (مەزنەکەی) ئەوان رۆژان، سەرەڕای هەمو ئەو جاهیلیەتانەی لەو سەردەمەدا بەرپابون و.. هێزی مادی داپڵۆسێن و، بەتاڵ لە (بەهاکان)، بەتاڵ لە (حەق)، رەسەنایەتیەکی نەبو کە لە زاڵبونی ئیسلام بیپارێزێ، جا وشەی پەروەردگارت بەراستگۆیی و دادگەری هاتە جێ و وشەکانیشی بگۆڕیان نیە، بۆیە حەق سەرکەوت و ناحەق تێچو و لەبیرکرا..

ئەمڕۆکەش جاهیلیەت-بەهەردو دەوڵەتە (مەزنەکەیەوە)- بەهەمان هەڵوێست رادەوەستێ.

ترۆپکێك لە پێشکەوتنی مادی و پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆجی، کە کەسی دیکە پێشتر نەیگەیشتۆتێ..

بەڵام بێ رەسەنایەتی..

چونکە رەسەنایەتی بریتیە لە حەق..

جا ئەگەر مـــرۆڤ لـەدابی جاهیلیـەتی هاوچـەرخدا ئـاژەڵێك بـێ وەك دارویـن دەیـەوێ، یـا -لەهـەمانكاتدا- لـە خـەیاڵی خـۆی ببێتـە خواوەندێكـــی زۆرداری سنوربەزێنی لەخۆبایی خۆ بەزلزان لە ئاست پەرستنی خودا..

هەردوكیان هیچ سایەی حەقیان تێدانیە.. ئەوجا هیچ رەسەنایەتیەكیشیان تێـدا نیە..

كاتێك ژیاریش ژیاری (چەنگە قورێك) بێ و پەیوەندی لەگـەڵ (فـوی رۆح)ەكـە پچڕابێ، ئەوە ژیارێكی نارەسەنە، چونكە چەنگە قورەكە بەجیا لە فوە رۆحەكە لــە حەقیقەتدا بونی نیە و، هەر بنیاتێكی لەسەر بنچینەی هەبونیشی دابمەزرێ، ئــەوە پێچەوانەی حەقە و، پاشان رەسەنایەتیشی تێدا نیە..

ئەمەش ئەوە رەتناكاتەوە كە ئەم ژیارە ناكۆك لەگەڵ حەقە دەسكەوتی گەورە و بەسودی هەبێت، وەك دەسكەوتە زانسـتی و رێكخراوەییـەكان؛ چونكـە ئەمـە لـە بەخششی پەروەردگارن و بۆ هەمو مرۆڤێك رێیان پێدراوە بەبڕوادار و بێبڕوایانـەوە، هەمو جاهیلیەتەكانی مێژوش پشكیان تێدا هەبوە:

﴿كُلاً نُمِدُّ هَؤُلاَء وَهَؤُلاَءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّـــكَ مَحْظُـــوراً: هەمو لایان لە خەڵاتی پەروەردگارت بێبەش ناكــەین، خـەڵاتی پـەروەردگاری تـۆ هیچ لەمپەری لەبەر نیە.﴾الاسراء/٢٠.

هەروەها ئەوەش رەتناكاتەوە كە هەندێك هزر و بەها هــەبن نـرخ و سـودێكیان هەبێ، چونكە دەرونی مرۆڤ پاك لە پاك نابێتــە شـەڕخواز هـەر چـەند لـە حـەق دوركەوێتەوە و، هیچ كۆمەڵــە كەسـێكیش لـە جاهیلیەتـەكاندا سـەد لەسـەد بـۆ شەڕخوازی یەكلانابنەوە بەشایەدی پێغەمبەری خوا ﷺ.

((خِيَارُكُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُكُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقُهُوا:.. چاكترینتان له جاهیلیەت چاكترینتان لەئیسلام ئەگەر زانستستیان هەبێ.))[1]

بەڵام لە كۆتاییدا عیبرەت- لەم زۆرانبازی حەق و ناحەقدا- بە دەسكەوتە مادیەكان نیە هەر چەند گەورە و بەسود بن و بەو هزر و بەها لاوەكیانەش نین كە رەنگە لە جاهیلیەتەكاندا هەبن.. بەڵكو عیبرەت بەو بنچینەیەیە كە بنیاتەكەی لەسەر دادەمەزرێ.

بێگومان هەریەك لە جاهیلیەتی فارسی و جاهیلیەتی رۆمانی دەسكەوت و داهێنانی مادی و رێكخراوەیی گەورە و بەسودیان هەبو، گومانیش لەوەدا نیە كە هەندێك بەها و هەندێك هزری بەسود لەهەردو جاهیلیەتەكاندا هەبون..

بەڵام ئەمە هەموی ئەو دو جاهیلیەتەی نەپاراست لەوەی كە بەرامبەر ئیسلام دابرِوخێن، ئەو ئیسلامەی هەموی لەسەر بنچینەیەكی دروست و ساغ دامەزراوە، مەبەستی راستەقینەی بونی مرۆڤ وەدیدێنێ كە پەرستنی خوایە، بەواتا فراوان و گشتگیرەكەی پەرستن كە پێشتر رونمانكردەوە[2]، لەگەڵ كەمی ژمارە و كەمی كەرەستەی موسڵمانان لەو رۆژیدا و، سەرەرای بێبەشی لە دەسكەوتە مادی ورێكخراوەییەكان، بێجگە لە برێكی كەم كە هەر ئەوەتە باسدەكرێ.

ئەوەش-وەك رونمانكردەوە- سونەتێكی ئاساییە، بەواتای هەر كاتێك بنەما و رەگەزەكانی هاتنە دی-بەقەدەری خوا- بۆخۆی دێتە دی، روبەروبونەوەش بەداخوازیەكانی ئەنجام دەدرێ.

لە لای جاهیلیەتیش هەمو رەگەزەكان و بنەماكان بەرپان.. هێزێكی مادی گەورە و، بۆشاییەكی گەورە لە جیهانی بەهاكان و مەبدەء و ئاكاردا..

---

١ أخرجه مسلم .

٢ بگەرِیوە بۆ (چەمكی پەرستن).

سونەتی ئاساییش بۆ ئەوەی بێتە دی-کە هەمو جارێك بەقەدەری خوا دێتەدی-وا دەخوازێ کە موسڵمانان لە روبەڕوبونەوەدابن و مەرجەکـەیان جێبـەجێبکردبێ، هـەروەکو موسـڵمانان لەیەکـەم روبەڕوبونـەوەدایاندا، ئـەوجا-بەقـــەدەری خـــوا-سەرکەوتن دێتە دی هەروەکو یەکەمجار هاتە دی و، روی زەوی دەگۆڕدرێ هـــەروەکو پێشتر گۆڕا..

لای منیش- گومان لەبەڵێنی خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ دا نیە.. کە ئەوە هەر رودەدات.

بەڵام رابون دەبێ بگاتە مەرجی سەرکەوتن لەو روبەڕوبونەوەیەدا..

موسڵمانان لە پێشکەوتنی زانستی و مـادی و تەکنـەلۆجی و رێکخراوەیـی لـە مکاتەدا بەپێش جاهیلیەتی هاوچەرخ ناکەون. بەڵام-لەگـەڵ ئەوەشـدا- شـتێکیان هەیە کە نەجاهیلیەتی ئـەمڕۆ و نـە هـی سـبەی و نـەهی هیـچ کـاتێك نیـەتی.. بیروباوەڕی راست و بەرنامەی راستیان هەیـە.. ئـەو بەرنامـە گشـتگیر و تـەواو و هاوسەنگ و پێکوە بەستراوەی، کە خودای زانا و کاربەجێ دایبەزاندوە هـەتا زەوی پێ چاك بکا و، ژیانی خەڵکیشی پێ چاك بکا.

جا کاتێك لە خودی خۆیاندا بیروباوەڕی دروست وەدیدێنن، سونەتەکە بەقەدەری خودا رێدەکا و، ئیسلام لەروبەڕوبونەوەی ئێستای لەگەڵ جاهیلیەتدا سـەردەکەوێ.. و روی زەوی گۆڕانی بەسەردادێ.

بەڵام دەبێ بیروبـــاوەڕ لەوپـەڕی بێگـەردی و، ئەوپـەڕی جوانـی و، ئـەو پـەڕی رازاوەییدا بێ، تاکو لە واقیعی زەویدا ئەو جیاوازیە راستەقینەیە رویدات کە خەڵك لەوێنە سەرنجڕاکێشەکەی دەکەوێتـە بەردەسـتیان-هـەروەك یەکـەمجار رویـدا- جـا بەپیریەوە دەچن و دەچنە ژێر سایە و سـێبەری.. بەرنامەکـەش-بـەو بـەها بـەرز و

ئاکـاره بـالاّ و راسـتی و قولـّی رەگـاژۆ بـــون و بـــالاّ دەســـتی و، گشـــتگیری و هاوسەنگیەی لە خۆی گرتــون- نمونــەی مرۆڤانــەی بــەرز وەدیدێنــێ، تــا جیـاوازی مەزنی نێوان ئیسلام و جاهیلیەت لە جیهانی واقیعدا بۆ خەڵك بەرجەستە بکــات، هەروەك یەکەمجار رویدا، جا خەڵك بەرنامەکەیان خۆشدەوێ و دەچنە نێوی.

لەو کاتەدا بەشایستەیی حەق سەردەکەوێ-بـەپێی سـونەتەکانی خـوا- چونکـە بەڕاستی لێوەشاوەیی خۆی دەسەلمێنێ و، رۆڵێکـــی راســتەقینەی دەبــێ لــە ژیــانی خەڵکدا چونکە بەراستی ئەو شتانە بەخەڵك دەبەخشێ کــە لەراسـتیدا پێویسـتیان پێی هەیە، ئەگەر هەستیش بەو پێویستە نەکەن کاتێك لەسەر لێشێواوی خۆیـان دا سەرسوڕماو و سەراسیمە بون، تەنانەت ئەگەر ئەو چاکە و ڕێنوێنیەش لەســەرەتادا ڕەتکەنەوە هەروەکو خەڵکی هەمو جاهیلیــەتێك.. بــەڵام فریشـکی مـرۆڤ ڕێــزی دەزانێ، کاتێك دەبینێ لە جیهانی واقیعدا پیادە کــراوە-بـەو وێنــە نــازدارەی کــە واقیــع و میســالی تێـدا تێکــەڵ دەبێــت- لــەو کاتــەدا خــەڵك هەسـت دەکــەن چ کەموکوڕیەکیان تێدایە و، بەرەو کامل بون هەڵپە دەکەن..

ئەوەی پتر لەبەرنامــەی پــەروەردگار ئارخـەیانیان دەکـا و وا دەکـا زیـاتر روی تێبکەن، کــاتێك دەبینــین-لــە میانــەی تاقیکردنەوەیــەکی واقیعــی- کــە ئیســلام پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆجی و ڕێکخراوەییان تێکنادا، بــەڵکو تــەنیا لەســەر بنچینەیەکی ئیمانی راستودروسـت دایدەمــەزرێنێ و، (ئاکــار)ی پێدەبەخشــێ کــە جاهیلیەت لێی دەستێنێ و، ئەو (رۆح)ەی پێدەبەخشێ کــە دەیکاتــە داهێنــانێکی شایستەی (مرۆڤ).

* * *

لەبەر ئەو هەموە دەبێ رابون تەواو قەدری مەسەلەکە بزانێ و، وزەی پێویستی بداتێ بۆ جێبەجێ کردنی..

ئەمە مەسەلەیەکی بەراستیە و بەراستی مەسەلەکە ترسناکە..

ئەمە گەشتێکی نزیك نیە و.. کارێکی تایبەت بەوانە نیە لە خودی خۆیاندا..

مەسەلەی ئوممەتی ئیسلامیە بەتەواوی و.. هەروەها مەسەلەی مرۆڤایەتیشە، هی هەر کەسێکی بیەوێ راستەرێ بێ..

مەسەلەی دەربازبونی (مرۆڤ) لەو قورە شینەی ئەمڕۆ وا خۆی تێوەردەدا، کە (موسڵمانان) ملیان بەرەو ئەوێ نا-یا دوژمنانیان بەرەو ئەوێیان هاژوشتن- کاتێك لە بیروباوەڕی خۆیان بەپاشکەوتن و، جا وازیان لە خودێتی خۆیان هێنا و، وەك ئاومالکی سێلاویان لێ هات.[1]

مەسەلەکە بەراستیە.. توانای پەراوێزی پەرتەوازە بەشی ناکەن و، هەولێکی بەش ناکا کە تەنیا بۆ مومارەسەکردنی ئیسلام بێ لەهەر ئاستێك لە ئاستەکان.

مەسەلەیەکە پێویستی بەهەمو وزەکان هەیە پێکەوە و.. موحتاجی هەولی هەلکشان بەرەو ئەو لوتکەیە کە موسڵمانان یەکەمجار سەریکەوتن، کاتێك بەهابەرزەکان و، مومارەسە کردنی بەرزی ئەو بەهایانە، قەرەبوی هەمو جیاوازیە مادیەکانی کردەوە لە نێوان موسڵمانان و دوژمنەکانیان و، سەرکەوتنی بۆ خاوەن بەها بەرز و رەسەنەکان نوسی بەسەرخاوەنی نارەوای فشوفۆڵ بەهێزی مادی و بلیمەتی رێکخستن.

*   *   *

---

١ گەر ویستت بڕوانە (خط الانحراف) و (اثار الانحراف) لە کتێبی (واقعنا المعاصر).

(رابون) لەهەمو ولاتێکی ئیسلامیدا دەبێ بنچینەی پتەو لەسەر ئاستێکی بالا دروست بکا، ئەوجا جەماوەر بانگەواز بکا..

رونکردنەوەی بەرنامەی پەروەردەی پێویست بۆ بنیاتنانی بنکەی پۆلایین لەسەر ئەو ئاستە بالایە و، ئەو بەرنامەی بانگەوازەی کە ئاراستەی خەلك دەکرێ، لێرە دانیە.[1]

بەلام ئێمە لێرە ئاماژە بەمەسەلەیەکی بنچینەیی دەکەین، جا بۆ بنیاتنانی بنکەی پۆلایین بێ یا بۆ بانگەوازی جەماوەر.. ئەویش ئەوەیە کە هەردەبێ چەمکەکان راستبکرێنەوە.. دەنا چۆن بنکە لەسەر چەمکی هەلەی ئیسلام بنیات دەنرێ؟!

چۆن بنکەی پۆلایین لەسەر ئەو هزرە ئیرجائیە بنیات دەنرێ کە دەلێ: بڕوا بەراستدانان و دانپێداهێنانە؟! کردەوەش ناکەوێتە نێو ئاوەرۆکی بڕوا؟ هەر کەسێکی بشلێ (لا إله إلاّ الله) ئەوە بڕوادارە ئەگەر چی یەك کردەوەشی لە کردەوەکانی ئیسلامی ئەنجام نەدابێ؟!

چۆن بنکەی پۆلایین لەسەر چەمکێکی کەموکوڕ بۆ پەرستن دادەمەزرێ کە هەموی تەنیا لە دروشمەکانی پەرستن کۆبکاتەوە و، هەمو کاروکردەوەیەك لە بازنەی پەرستن بێنێتە دەر و، ئاکار بێنێتە دەر و، ژیان دابەش بکا بۆ (ساتێك بۆ دلت و ساتێك بۆ پەروەردگارت)، جا ساتی دلّ دەبێ بە فشە و گالتەوگەپ و، ساتی پەروەردگاریش تەنیا دەبێتە بەجێگەیاندنی دروشمەکان بەبێ داخوازی واقیعی لە رەفتاری خەلکدا؟!

---

[1] بەنیازین بەئیزنی خوا- نامیلکەیەك لەم بابەتە دەرکەین بەناونیشانی (كيف ندعوا الناس).

هەروەها چۆن لەسەر بیروباوەڕێکی سلبی شەرمەزارکەری دەست لەخۆ بەرداوی قەزا و قەدەر دادەمەزرێ کە هۆکارەکان وەرناگرن؟

چۆن لەسەر تێڕوانینێکی هەڵە بنیات دەنرێ کە دنیا و ئاخیرەت لێك جودا دەکاتەوە و بەرەفتار لادەداتە لایەك جا بۆ حسێبی دنیا بێت یان ئاخیرەت؟

چۆن لەسەر پشتگوێ خستنی ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەپێی داخوازی بەرنامەی تەواو و هەمە لایەنی پەروەردگار، بنیات دەنرێ، کە ژیارێکی شایستەی مرۆڤ دادەمەزرێنێ.

ئەو جۆرە بنچینەیەش لەم زۆرانبازیە بەهێزە لەگەڵ جاهیلیەتدا چ بکا و چی بەخەڵك دەبەخشێ هەتا هاتنە ناو حەقیان لەلاخۆشەویست بکا؟!

هەروەها بانگەوازی ئاراستەکراو بۆ جەماوەریش بە هەمان شێوە، بۆئەوەی ببنە پاڵپشتێك بۆ بنکە پۆڵایینەکە لەباتی ئەوەی ببنە بار لەسەرشانیدا.

ئەی هەر لەبنەڕەتدا بۆ بانگەواز دەکەین ئەگەر هیچ شتێکمان لەچەمکە چەوتەکانی خەڵکی نەگۆڕی؟!

بۆ کامە ئامانج بانگیان دەکەین ئەگەر پێمانگوتن بڕوا هێنان هەر بەڕاست دانان و دانپێدانانە و، هەر کردەوەیەك ناکەوێتە بەر ناوەڕۆکی ئیمان و، هەر کەسێکی بشڵێ (لا إله إلاّ الله) ئەوە بڕوادارە، ئەگەر یەك کردەوەشی لە کردەوەکانی ئیسلام ئەنجام نەدابێ؟!

ئایا بانگیان دەکەین هەتا ئەو هۆکارانەیان تێدا بچەسپێنین کە بوە هۆی وێڵ و سەرگەردان بونیان و، کردیانی بە ئاومالکی وەك هی لافاوێ؟ جا ئەوەی تێی کەوتون لە هاوبەشپەرستی بیروباوەڕ لە ڕێگەی پەرستنی وەلی و گۆڕ و شێخان، یا هاوبەشپەرستی شوێنکەوتن، بەشوێنکەوتنی غەیری ئەوەی خوا دایبەزاندوە و،

داناني مرۆڤ-یاسادانەران لەلای خۆیانەوە- وەك پەروەردگاری بێجگە لە خوا؟

یاخود بۆ ئەوە بانگیان دەکەین تاکو ئەوەی لەدەرونیاندا هەیە بیگۆڕن هەتا خودا گۆڕانکاریان بۆ بکا؟!

* * *

لەهەمو بارەکاندا هەر دەبێ چەمکەکان راستبکرێنەوە.

کە بەراستی چەمکەکانیش راستدەکرێنەوە و، بنکەیەکی پۆلایین لەسەر ئەو چەمکە راستودروستانە پەروەردە دەبن، جەماوەری بڕواداری هۆشیاریش پاڵپشتیان دەبێ کە لەجیهانی واقیعدا مومارسەی ئیسلام دەکەن.. ئەو کاتە ئەو بەڵێنە دێتە دی کە پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی پێداوە:

((تَكُونُ النُّبُوَّةُ فِيكُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةٌ عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا عَاضًّا فَيَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا جَبْرِيَّةً فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةً عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ:.. پێغەمبەرایەتیتان تێدا دەمێنێ ئەوەندەی خودا بیەوێ بمێنێ، پاشان کە خواستی بەرزی بکاتەوە و هەڵیگرێ، هەڵیدەگرێ، ئەوجا خیلافەتێك دێتە ئارا لەسەر بەرنامەی پێغەمبەر، ئەوەندەی خوا خواستی لێبێ دەمێنێتەوە، پاشان کە خودا ویستی هەڵیگرێ، هەڵیدەگرێ، ئەوجا پاشایەتیەکی جەبری دێت چەندی خوا بیەوێ دەمێنێ، پاشان کەویستی هەڵیدەگرێ، پاشان خیلافەتێك دێتەوە بەپێی بەرنامەی پێغەمبەرﷺ.))[1]

---

[1] رواه الإمام أحمد عن حذيفة بن اليمان.

جا لەو کاتەدا روی زەوی دەگۆرێ..

ئیسلامیش خولێکی تازەی بۆ دێتە دی، خەڵکی تیایدا لە تاریکی بـۆ رونـاکی دێنەوە دەرێ و، لە پەرستنی بەندان بۆ پەرستنی خودا و، لە بەرتەسـکی دنیـا بـۆ بەرفراوانی دنیا و ئاخیرەت..

﴿الْمُؤْمِنُونَ، بِنَصْرِ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ اللَّهِ يَنصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيـزُ الرَّحِيـمُ: ئەوێ رۆژێ باوەڕداران کەیفێ دەکەن، بە یاریدە لە خوداوە خودا حەزکا یـاریدە بـە هەرکەس دەدا. هەر خۆی خاوەن دەستەڵاتە و دلۆڤانە.﴾الروم/٤-٥.

# پاشبەند

## ( چەمکانێك دەبێ راست بکرێنەوە )

ئەنجامی گشت هزر و فەلسەفەکان دوای تێپەڕکردنی چەندین سەردەم و سەدە و نەوە و قۆناغی جۆربەجۆر و بەڕێکردنی هەزاران هەزار شەڕەقسە و نوسین و لێکدانەوە و تاووتوێکردن و خۆبەرجەستەکردنیان لە دەیان چەشن لە قوتابخانە و ڕێباز و بزاڤ و تەنانەت ژیاریشدا لەوەدا یەك دەگرنەوە کە هەر هەمویان شێوە ژیانێکی دیاریکراو بۆ مرۆڤایەتی یان کۆمەڵە مرۆڤێك بنیات دەنێن، کە هەر شێوە ژیانێك لەم شێوە ژیانانە خێوی پێناس و بنەما و ڕەگەز و سنور و تایبەتمەندێتی و تێڕوانینی خۆیەتی و مرۆڤەکانیش بەو شێوە ژیانە دەژین و دەگوزەرێن.

بێگومان هزر و فەلسەفەکان تا گەیشتونە ئەو قۆناغەی شێوە ژیانێك وەئەنجام بێنن گەلێك لە بیرو ئەندێشەی مرۆڤایەتیان ماندو کردوە و قوربانیەکی گەلی گەورەشیان بە تەواوی مرۆڤایەتی ژماردوە، بە تایبەتی لەو بوارەی کە تا چەمکێکیان ساغ کردۆتەوە چۆن چۆنی بێت بۆ ئەوەی بنەماکانی شێوە ژیانی لەسەر بینا بکرێ، ئەوا هەر مەپرسە چ کۆششێکی زەبەلاح و چ تێشکان و جەنجاڵیەکی ناوەتەوە. جا کە شێوە ژیانەکەشی هێناوەتە دی، هەمدیسان مرۆڤایەتی بە دەردی وێرانی بردوە، لەبەر ئەوەی هەمیشە کۆمەڵە لایەنێکی

لەپێناو گەشە و پێشکەوتنی لایەنەکانی تر کردۆتە قوربانی کە سەرەنجام هاوسەنگی مرۆڤانەی مرۆڤی شێواندوە.

بەڵام ئیسلام کە دوایین پەیامی خوایە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی سەرزەمین، رێگایەکی تایبەت و دانسقەی تایبەت بەخۆی هەیە لە بنیاتنانی ئەو شێوە ژیانەی مەبەستیەتی. ئیسلام لەمەوە دەست پێدەکات کە بابەتی هەرە سەرەکی هەوڵەکانی بریتیە لە (مرۆڤ). مرۆڤ دادەرێژێتەوە و سەر لەنوێ کۆمەڵێك تێروانین و چەمك و هزری تازەی پێدەبەخشێ، کە ئەمەی دابین کرد ئیتر شێوەژیان و کۆمەڵگە و ژیار و هەر شتێکی تری مرۆڤانە و تایبەت بە مرۆڤ زۆر بە ئاسانی و دور لە ئاڵۆزی و بێ ئەو هەمو سەرێشە و هەدەردانەی کۆششی درێژخایەتی مرۆڤایەتی و بێ ئەو هەمو چاوەڕوانکردنەی کە چەندین سەدە بخایەنێ، بەڵکو بەهۆی ئەو وزە زەبەلاحەی کە لە ئەنجامی تەقینەوەی مرۆڤایەتی مرۆڤەوە پەیدا دەبێ، ئەو وزەیەی کە هەر لەو ساتەی مرۆڤ هاوئاهەنگ و تەبا بو لەگەڵ مەبەستی وجودی گەردون لەدایك دەبێ؛ دێنەدی و وەدەست دەخرێن.

من پێم وایە ئەمە یەکێکە لەو هۆیە سەرەکیانەی کە کۆمەڵگەی ئیسلامی لە زەمەنێکی کورتدا دەتوانێ و توانیویەتی بێتە دی و ئەوپەڕی بەختەوەریش بۆ مرۆڤایەتی دابن بکات.

وتەکانی من وای لێ نەفامرێتەوە کە ئیسلام تەنها ئەوەندەی پێیە و تەنها رەچاوی (تاك) دەکات و ئیتر (تاك) بە هەمو شتێ دابنێ، چونکە ئیسلام لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ دەکاتە میحوەری سەرەکی رابونەوە و بنیاتنان، کۆمەڵگەی مرۆڤیش بە هەمان شێوە بە مرۆڤێکی گەورە دادەنێ لەو روەی کە کۆمەڵگە کۆمەڵگەی مرۆڤە نەك هی بەرد و ئاسن. کەواتە چۆن مرۆڤ لە ژیاندایە و گەشە دەکات و

ڕۆژانە داخوازی و بنەمای تازەی هەیە کە ئەمانە سیفەتی ژیانن، بە هەمان شێوە کۆمەڵگەش دەژێت و دەخوازێ و بنەما و تایبەتمەندیەکانی خۆی هەیە. جا لە ئیسلامدا هەمو ئەم شتانە هاوکات و بەوپەڕی هەماهەنگیەوە ڕەچاویان کراوە.

ئیسلام پڕۆژەیەکی گەورە و فرەوان و هەمەلایەن و راستەقینەی پێیە بۆ بنیاتنانی مرۆڤ و کۆمەڵگە و وڵات و ژیار، بەڵام ئەم پڕۆژەیە پێویستی بە (تەفعیل) کردنەوە هەیە. ئەم تەفعیلکردنەوەیەش هەڵبەت کارێکی فرە مەزن و سەختە و پێویستە میکانیزمێکی راستەقینەی بۆ بدۆزرێتەوە تا پرۆسێسی تەفعیلکردنەکە بە رێی راستی خۆی بڕوات و ئەنجامی خوازراو وەدەست بێنێ.

تەفعیلکردنەوەکە دەبێ لە هەمو روێکەوە بێ؛ لە روی تێڕوانین و چەمك و تێگەیشتنەوە پڕۆژەیەکی بەرفرەوانی سەرتاسەری هەبێ کە لەسەر بنەمای چەندین تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە ساغ کرابێتەوە، لەروی ئامراز و کەرەستەکانەوە دەبێ نەوپەڕی پێشکەوتن و سەردەمانەیی بەخۆوە گرتبێ، چونکە ئەمڕۆ سەردەمەکەی ئێمە سەردەمی تەکنۆلۆجیا و پێشکەوتنی زانستیە.. ئەو تەکنۆلۆجیایەی کە گەورەترین جیاکەرەوەی نێوان سەردەمەکەی ئێمە و تەواوی سەردەمەکانی ترە. کەواتە هەر ئامراز و میکانیزێك زانستیانە نەبێ و پێشکەوتوو نەبێ، لەم سەردەمە جێی نابێتەوە و خزمەت بە هەوڵ و کۆششەکان ناکات و ئامانجەکان ناهێنێتە دی.

گشت ئەو هەوڵانەی کە لەپێناو ناساندنی تێڕوانینی ئیسلامی و دیاریکردنی بنەما و سنورەکانی تاك و کۆمەڵگە و ژیار و دەوڵەتی ئیسلامیەوە دراون، یان نوشوێنی بنیاتنانەوە و دارشتنی ئیسلامیانەیان رەنگرێژ کردوە... یا هەر هەوڵێك چ بە نوسین و نیشان دان و بڵاوکردنەوە چ بە کار و کردەوە، چ بە هەر

شێوەیەکی تر دراون؛ پێموایە خزمەتیان پێشـکەش کـردوە و سـەرپاکی هەوڵـەکان وەك ئەو شەپۆلە جۆراوجۆرانەی نێو یەك دەریا وان کە دەریاکـە لـە مـەنگ بـون و مردن رزگار دەکەن.

دیارە لەم سەردەمەشدا گەلێ کەڵەپیاوی زانا و فرەزان بەکاری تەفعیلکردنـەوەی ئەم پرۆژەیە هەڵساون.. بە نمونە پێشەوا حەسەن بەننا-رەحمەتی خـوای لێبـێ- تـا ئێستاکەش ئاسەواری تەفعیلکردنەوەکەی هەر لە برەودایە و لەبواری کۆمـەڵکاریی ئیسلامیانەدا تەجدیدێکی گـەورەی پێشـکەش کـردوە.. سـەید قوتـب لـە بـواری تێڕوانین و راستکردنەوەی چەمکەکان تەجدیدێکی کاریگەر و نەمری تۆمار کـردوە. دیارە کە محمد قوتبیش درێژەپێدەری رونکردنەوەکانی ئەو موجەددیدە مەزنەیە کـە لە هەندێ شوێن تەنها هێڵی گشتی یـان بەشـێوە باسـێکی سـەرەکیانە هزرەکـانی خستوەتە روو و بواری وردکردنەوەی نەبوە، ئەو (محمد قوتـب) وردی کردونەتـەوە و راڤەی کردون یان چەند ئیزافەیەکی خستۆتە سەریان و بـەرگێکی تـازەتری بەبـەردا کردون یان چەندین لێکدانەوە و چەمکی نوێی رەگەڵ داون و بە تێروتەسەلی باسـی کردون.

هەر بۆ نمونە گەلێك لەو بابەت و چەمکانەی لەم پەرتوکەدا-چـەمکانێك دەبـێ راست بکرێنەوە- باسی کردون؛ بریتین لـەو بابەتانـەی کـە سـید قوتـب تـەجدیدی کردونەتەوە و لە نوسراوەکانی-بە تایبەتی لە في ظلال القرآن دا- باسی کردون.

هەڵبەت پێناسی محمد قوتب گەلێ گەورترە لەوەی کە ئێمە وا بە سادەیی باسـی لێوە بکەین، بەڵام من لێرەدا هەر مەبەستم ئەوە بوە کە ئامـاژە بـە لایـەنێك لـە لایەنە روناکەکانی محمد قوتب بکەم، ئەگینا ئەو بیریار و لێکۆڵـەرە بـەرزە گـەلێك خزمەتی تری پێشکەش بـە نەتـەوەی ئیسـلامی کـردوە، بـە تایبـەتی لـە بـواری

تاوتوێکردنی رابردوی بزاڤە کاریگەرەکانی جیـــهانی ئیسـلامی لــە روی هـزرەوە و هەڵسەنگاندنی واقیعی ئێستای موسڵمانان و بەرپەرچدانەوە و شیکردنەوەی رێبـــاز و هزرە نەفامییەکانی جیهان کــە جیـهانی ئیسـلامییان تێکشـێواندوە، هـەروەها لـەبارەی دارِشـتنەوەی هێڵـە گشـتی و سـنورە هـزری و بەرنامەیـەکانی کـــاری ئیسلامیدا خاوەنی قەڵەم و رونیایەکی تایبەتی خۆیـەتی. محمد قوتـب دەنگێکـی هزری هەرە دیار و شەکاوەی جیهانی ئیســلامییە و پێموایــە هیـچ کـەس ناتوانـێ خۆی لیٚ بەهرەمەند نەکات کــە مەبەسـتی بـێ لـە تەفعیلکردنـەوەی ئـەو پـرۆژە مەزنەی پەیامی ئیسلام بەشدار بێ.

*　*　*

## چەمکی ( لا الە الا اللە ):

هەڵبەت ئـەو چەمکانــەی کـە پێویسـتە راسـت کرێنـەوە گـەلیٚ زۆرن و گـەلیٚ توێژینەوەکاری گەورەگەورەشیان گەرەکە تا راست دەکرێنەوە، بەڵام نوســەر لـێرەدا هەمو چەمکەکانی تاوتوێ نەکردوە، چونکە ئەم کارە لــە توانـای تـاکێك بـەدەرە، بەڵکو وەك خۆی دەڵێ: ئەم کتێبەش هەوڵێکی بچوکە بۆ راسـتکردنەوەی هـەندێك لە چەمکە ئیسـلامی‌یەکان. نوسـەر پێیوایـە هـەر هـەوڵێك بـدرێ بێئـەوەی ئـەم چەمکە راستکراوانەی لەگەڵدا بـێ، ئـەوا بێهودەیـە و ناتوانـێ کۆمەڵگـە بنیـات نێتەوە: هەر هــەوڵێك تـەنیا بـۆ راسـتکردنەوەی رەفتـار بـدرێ-لەگـەڵ مانـەوەی چەمکـەکان بـە لارێیـی- بەرهـەمی تـەواو نابەخشـێ و، ئومـەت لـەو نسـکۆیە دەرناهێنێ کە لەم سەردەمەدا تێیکەوتوە. بۆ ئـەم مەبەسـتەش نمونـە بـەو کـرد و کۆشە زەبەللاحە دێنێتەوە کە ساڵەهایە بزاڤی بانگـــەوازی ئیسـلامی لـە جیـهانی ئیسلامیدا داویەتی کەچی ئاکامێکی خوازراوی وەدینەهێناوە، تەنانەت کـە باسـی

بەکارهێنانی ئـــامراز و کەرەســـتەکانی وەکـو راگـەیاندن و بنیاتنـانی قوتابخانـە و یانەکانیش دەکات، ئەو پرسیارە دەکات کە، چ لــە دەزگاکـانی راگـەیاندن پـەخش بکـرێ یـان چ لـە قوتابخانـەکان بخوێندرێـن، لەمەشـدا دیسـان دەگەڕێتـەوە سـەر چەمکەکان و پێیوایە دەبێ ئەوانیش دوای راستکردنەوەی چەمکەکان رۆڵی خۆیـان وەرگرن.

لە تاووتوێکردنی چەمکە بـەرفرەوان و گـەورە و مەزنەکـەی (لا الـه الا الله)دا بەدرێژی باسەکان دەخاتە روو و چەندین رونکردنەوەی گرنگ و پێویست و لەبیرکراو رادەنوێنێ. ئەوە رون دەکاتەوە کە وشەی (لا اله الا الله) چەندین داخوازی هەیـە و بێ بەرپابونی ئەم داخوازیانە لە چـەمکی راسـتەقینەی خـۆی دادەمـاڵدرێ و هـەر تەنـها وەك وشـەیەکی سـەر زارانـی لیٚ دەمێنێتـەوە، نـەك وەك بەرنامەیـەکی تێروتەسەلی ژیان و بەڕێوەچون. کە نەفامێتیش بەو هـەمو توندوتیژیـەوە لـە دژی بانگەوازەکەی ئیسلام وەستاوە لەبەر ئەوە نەبوە کە خەڵك بەسەرزارەکی دەڵێـن (لا الە الا الله)، بەڵکو لەبەر ئـەو داخـوازی و ئەرکـە پـیرۆز و بەرفرەوانـەی بـوە کـە سەرلەبەری ژیان دەگۆڕێت و لە هەمو روێکەوە چەمك و تێڕوانین و هەڵسـوکەوت و رەوشتی تازە و شێوەژیانی تایبەتی بەرپا دەکات.

هەر لە باسی ئەم چەمکەدا باسی چەند داخوازیـەکی سـەرەکی و گرنگـی ئـەم وشـەیە دەکـات کـە ئوممـەتی ئیسـلامی تـەواو تـەواو لێیـان دورکەوتونەتـەوە و پشتگوێیان خستون، یان هەر لە سەرەتاوە لێی تێنەگەیشـتون. نوسـەر دەڵـێ: جـا دەبێ داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) لە فەرمایشتەکانی خودا و پێغەمبەرﷺ وەبـیر خۆمان بێنینەوە بەو شێوەیەی چۆن نەوەی یەکەم هۆشیان پێداشکابو:

داخوازی یەکەمی بریتیە لە یەکتاپەرستی پەروەردگاریتی و پەرستراویتی، لەگەڵ یەکتاپەرستی ناو و سیفەتەکان (واتە یەکتاپەرستی باوەڕ).

داخوازی دوەمیشی بریتیە لە ئاراستەکردنی پەرستن بۆ خودای تەنیا و بێهاوەڵ (واتە یەکتاپەرستی پەرستن).

د اخوازی سێیەمیش بریتیە لە تەنیا حوکم بردنە بەر شەریعەتی خودا بێجگە لە هەمو شەریعەتەکانی دیکە (واتە یەکتاپەرستی حاکمیەت).

باس لەوە دەکات کە چۆن نەوە لەدوای نەوە چەمکی (لا الە الا الله) بچوك و بچوکتر کراوەتەوە و چەمکەکانی وەکو حاکمیەتی خوای لێداماڵێندراوە و ئەرکی گۆڕین و بنیاتنانی مورجیئەکان هەر لەو کاتەی پەیدابون تاکو ئێستاش چ کاریگەرێکیان لەم بچوك و تەسککردنەوەیەدا هەبوە، چونکە ئەوان پێناسەی (بڕوا)یان بە بەراستدانان و دانپیانان دەکرد و کردەوەیان لە پێناسەکە هەڵبواردبو. جا لێرەدا نوسەر بەشێوەیەکی هزری و وتوێژێکی لۆجیکانە و فیقهییانە باگۆیان دەداتەوە و تەمومژیان دەڕەوێنێتەوە لە وتوێژە لۆجیك ئامێزەکەیدا سێ روانگە دەخاتە بەر باسەوە و دەپرسێ:

یەکەم: ئایا ئەم ئاینە دەتوانێ بگاتە ئەو ئامانجانەی کە بۆیان دابەزیوە، ئەگەر هەمو داخوازیەکان تەنیا هەر بەڕاستدانان و دانپێداهێنان بن؟!...

دودم: ئایا ئەوەی پێغەمبەری خواﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی لە پیادەکردنی داخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله) ئەنجامیان دەدا، لەخۆڕا بەخشینێك بو و ئەرکی سەرشانیان نەبو؟!.

سێیەم: ئایا لە واقیعی دەرونی مرۆڤدا دەگونجێ کە مرۆڤ بڕوا بە شتێك بێنێ پاشان سەرپاکی رەفتارە واقیعییەکەشی لە داخوازیەکانی ئەم بڕوایە جودابێ؟!

مەسەلەیەکی تر کە زۆر بە جوان و ڕێکی ڕون دەکاتەوە کە بەراستی لەلای زۆر کەسدا تەنانەت ئەوانەش کە توانێکی بالآیان لەبواری هزری ئیسلامیدا هەیە هەر بە ئیشکال ماوەتەوە. مەسەلەکەش ئەوەیە کاتێك سەید قوتب کۆمەڵگەی موسڵمانانی بە کۆمەڵگەیەکی نەفامی لە قەڵەم داوە کە ئاشکرایە بە چ بەرفرەوانیەك باسی لەم بەنەفامێتی کردنە کردوە، دوای ئەویش کە چۆن محمد قوتب درێژەی پێداوە، تەنانەت پەرتوکێکیشی بەناوی (نەفامێتی سەدەی بیستەم) داناوە.

لێرەدا کەسانێك هەبونە و ئێستاش هەن تانە لە هزری سەید دەگرن و دەڵێن کۆمەڵگەی تەکفیر کردوە، یان موسڵمانانی ئەم کۆمەڵگەیەی تەکفیر کردوە و زۆر تانەو تەشەر و تاوانبارکردنی لەم چەشنە.. بەڵام لەم پەرتوکەدا لە چەمکی (لا الـه الا الله)دا محمد قوتب زۆر بە درێژی و بە شێوەیەکی هزری و فیقهیانەوە باسی ئەم مەسەلەیەی کردوە و رونی کردۆتەوە کە ئەم بە نەفامێتی کردنە چ واتایەکی هەڵگرتوە و چۆن ئەم تانە و تەشەرانە بە ناڕاست دەردەکەون، بەڵکو تێنەگەیشتنن بەرامبەر بە هزری سەید قوتب.

رونکردنەوە و شیکردنەوەکانی بەمجۆرەیە کە دەڵێ: (کۆمەڵگە) تەنیا کۆمەڵە تاکێك نیە، بەڵکو ئەو (سیستەم)ەشە کە ئەو تاکانە دەبەستێتەوەو، لە میانەیدا مامەڵە لەگەڵ یەکتر دەکەن و، پەیوەندیەکانی خۆیانی لەسەر دادەمەزرێنن.

کەواتە لێرەدا ئەم بە نەفامێتی کردنە وەك هێڵێکی گشتی ئیمانی لێدێت کە دەبێتە بنەمایەك بۆ جیاکردنەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە کۆمەڵگاکانی تر، رەتکردنەوەیەکی گشتیانەیە بۆ تەواوی رەوشەکە. پێموایە سەید قوتب پتر لەسەر سیستەم و پێکهاتە و شێرازەی گرێدەری کۆمەڵگە و ئەو شێوە حوکمکردنەی

لەسەر کۆمەڵگە پەیڕەو دەکرێ دواوە و جەختی لەسەر نەفامێتیەکەی کردوە، نــەك لەسەر تاك تاکەکانی کۆمەڵگە.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا محمد قوتب چوەتــە ســەر مەســەلەی تــاك تاکــەکانیش و ئەویشی زۆر بەجوانی و بە بەڵگەی قورئان و فەرمودە و وتەی زانایــانی پێشـینەوە رونی کردۆتەوە کە کۆمەڵگەی موسڵمانان لەبەر ئــەوەی مەنهــەج و سیســتەمێکی نائیسلامی تاکەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و نەریت و رەفتار و بنەما و بەهاکان و تێڕوانینــەکانی کۆمەڵگــەی دیــاری دەکــات و لەبــەر ئــەوەی کـــە دەســـەڵاتێکی نائیسلامی حوکمیان[1] بەسەردا دەکات، بۆیە کۆمەڵگەیەکی نەفامییــە، ئەگــەرچی زۆرینەی تاکەکانی موسڵمانیش بن جا موســڵمانی مولتــەزیم بــن یــا گوناهکــار و بێدین بن یا لــە دیــن تێنەگەیشـتوبن، ئــەوانی تریــش تێیــاندا هەیــە بێبڕوایــەکی ئاشکرایە و بڕوای بە ئیسلام نیە، .. دەڵێ:

کاتێك ئێمە بــەو کۆمەڵگەیانــەی ئــەمڕۆ لەســەر خــاکی ئیســلامیدا[2] دەژیــن، دەڵێین (کۆمەڵگەی جاهیلی)، ئەو کەسانەی وا گومان دەبەن کە ئێمە مەبەســتمان بەمە ئەوەیە کە خەڵکەکەی موسڵمان نین، یا بنەڕەت لەنێو ئەواندا کوفــرە مەگــەر شتێکی دیکەیان لێ دەرکەوێ.. لێرەدا ئێمە بەوکەسانە دەڵێین-هــەروەك لەشــوێنی

---

[1] کە ســەید قوتــب باســی حاکمیــەتی خــوا دەکــات، هــەر تەنــها مەبەســتی لــە دەرکردنــی یاســا و ئەحکامەکان نیە، بەڵکو تەواوی ژیانی مرۆڤی پــێ مەبەســتە کــە بــە گوێــرەی مەنهــەجی خــواوە هەڵســوڕێ و بیناکرابێ.

٢ هەمو ئەو خاکەی رۆژێك ئیسلام حوکمی کردوەو پاشان حوکمی شەریعەتی خوای لەســەر نــەماوە و یاســاکانی جاهیلی حوکمیان تێداکردوە دەڵێــین (خــاکی ئیســلامی). حوکمــی زانایــانیش دەربــارەی ئەوەیە کە خەڵکەکەی لێیان داواکــراوە کــە بیگێڕنــەوە بــەر حوکمــی ئیســلامی تــا هــەتایێ ئــەو ئەرکەشیان لەسەر شان لاناچێ.

دیکەش گوتومانە- کە حوکمی کۆمەڵگە بۆ تاکتاکەی خەڵکی ناپەڕێتەوە بەڵکو ئەمە بە حوکم دەچێ لەبارەی دەڤەرێك داخوا خانەی کوفرە یا خانەی ئیسلام. زانایانیش کۆڕان لەسەر ئەوەی کە وەسفی وڵاتێك بە خانەی کوفر یا خانەی ئیسلام پەیوەندی بە بیروباوەڕی خەڵکانی نیشتەجێی ئەو وڵاتەوە نیە، بەڵکو پەیوەستە بە زاڵبونی حوکمەکان تیایدا، جا ئەو خاکەی شەریعەتی خوا حوکمڕانی دەکا خانەی ئیسلامە جا بیروباوەڕی نیشتەجێکانی هەرچۆن بێ، ئەو خاکەش کە شەریعەتێکی غەیری شەریعەتی خوا حوکمی دەکا خانەی کوفرە، جا با بیروباوەڕی دانیشتوانەکانی هەرچۆن بێ... لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەی موسڵمان ئەو کۆمەڵگەیە کە شەریعەتی خوا حوکمی دەکا و، تێڕوانینی ئیسلام و چەمکەکانی ئیسلام و ئاداب و شێوازەکانی رەفتاری حوکمی دەکەن، بەچاوپۆشین لە بیروباوەڕی خەڵکەکەی. کۆمەڵگەی جاهیلیش ئەو کۆمەڵگەیە کە شەریعەتی خوا حوکمی ناکا و، تێڕوانینەکانی ئیسلام و چەمك و ئاداب و شێوازەکانی رەفتاری حوکمی ناکەن، بەچاوپۆشین لە بیروباوەڕی خەڵکەکەی و، لە حوکمی خوا دەربارەیان لە قیامەت ئایا دەچنە بەهەشت یان دەچنە دۆزەخ..

لەبارەی کۆمەڵگەشەوە دەڵێ: بەڵام کۆمەڵگە -وەك رونمانکردەوە- حوکمێکی دیکەی هەیە.. (کۆمەڵگە) تەنیا کۆمەڵە تاکێك نیە، بەڵکو ئەو (سیستەم)ەشە کە ئەو تاکانە دەبەستێتەوەو، لە میانەیدا مامەڵە لەگەڵ یەکتر دەکەن و، پەیوەندیەکانی خۆیانی لەسەر دادەمەزرێنن.

جا ئایا دەتوانین-بەپێی ئەم رێسایە- بڵێین: ئەم کۆمەڵگەیانەی ئەمڕۆ لە ئارادان کۆمەڵگەی ئیسلامین؟! ئایا ئەو سیستەمەی حوکمیان دەکا ئیسلامیە؟ بە شەریعەت و بەرنامە و ئاراستەکردنەکانی؟ ئایا ئەوەی سنور بۆ پەیوەندیەکانیان

دادەنێ و دایاندەمەزرێنێ ئیسلامە؟ ئایا ئەوەی تێڕوانینەکانیان پێکدەهێنێ و بەرنامەکانی فێرکردن و بەرنامەکانی راگەیاندن و شێوازەکانی رەفتاریان وێنەدەکێشێ ئیسلامە؟

لێرەدا خاڵێکی زۆر گرنگ هەیە کە ئەویش حوکم بەسەر خەڵکیدانە، پێموایە سەید قوتب گەلێك بە فرەوانتر ئەم هزرەی خۆی رانواندوە. وەك لەو تەسككردنەوەیەی کە هەندێ کەس سنورداری دەکەن و خۆیان پێ دەکەنە حاکم لەسەر تەکفیری تاك تاکەکانی خەڵکی.

ئەو تاووتوێکردن و دەرەنجام و وتانەی سەید رایگەیاندون هزرن، هزر بەشێوە فراوان و هەمەلایەنەکەیەوە، بەڵام جێی داخە کە ئەوانەی هەر لە روکەشەوە بەم هزرە زەبەللاحە ئاشنا دەبن، هەر ئەوەندەی لێ وەردەگرن کە مێشکی خۆیان لەباریدا هەیە وەریگرێ، ئیتر لێرەوە کارەساتەکە پەیدا دەبێ، کارەساتی تەسکرکردنەوە و تەوزیفکردنی هزری بەرهەراوی سەید بەپێی تێگەیشتنی سنوردار و مێشکی بچوکی ئەوانەی کە بە ساکاریەوە هزرەکە وەردەگرن و هەرسی ناکەن و بەم سادەییەشەوە لە ئەرزی واقیعدا پراکتیزەی دەکەن.. بەڵام چ پراکتیزەکردنێك..

تەنانەت محمد قوتب بە بێزاری دەربڕینەوە لەو جۆرە سنوردارکردنانە دەڵێ:

لەجێگای دیکەش ئەوەمان دوپاتکردۆتەوە کە دۆزی ئێمە بریتی نیە لە حوکم دەرکردن دژی خەڵکی[1]! و ئامانجمان مەسەلەیەکی دیکەیە، کە زۆر دورتر و، زۆر

---

١ بڕوانە (قضية الحكم على الناس) لە بەشی (الصحوة الإسلامية) لە کتێبی (واقعنا المعاصر)، کە بە درێژی باسی ئەو هۆکارانەم کردوە کە واملێدەکا لەم قۆناغە باس لەو مەسەلەیە نەکەم و هەمو توانام بۆ کرداری رونکردنەوەو فێرکردن تەرخان بکەم بێ ئیزیك بونەوە لە دەرکردنی حوکم لەسەر خەڵکی.

ترسناکترە-بەتێڕوانینی خۆمان- لە هەوڵی حوکم دەکردرن بەسەر ئەم نەوەیەی خەڵکی!

*  *  *

## چەمکی پەرستن:

ئێمە بە ئامانجی پەرستن خولقێنراوین، بۆیە زۆر گرنگە لە چەمکە راستەقینەکەی ئەم پەرستنە بگەین و بزانین چۆن دێتەدی و سنور و داخوازیەکانی چین. ئەو کەسی ژیانی خۆی بەپێی رێوشوێنی پەرستنی خواوە رەنگرێژ بکات و کار و بەرنامەکەی بە گوێرەی بنەما و داخوازیەکانی ئەمەوە بینا بکات، ئەوا ئەوپەڕی ئازادی وەدەست دێنێ و لە هەمو جۆرە دیلی و بەندایەتیەکی ماددی و مەعنەوی رزگاری دەبێ، مرۆڤ کە سەری تەنها بۆ خوا دانەواند مانای ئەوەیە لە تەواوی ژیانیدا مل-لە غیری خوا- بۆ هیچ کەس دانانوێنێ و ئازادی و رەهایی راستەقینەی خۆی لەدەست نادات. بەڵام ئەمرۆ چەمکی راستەقینەی پەرستن بە یەکجاری تارێنراوە و ئاسەواری ون کراوە و گۆڕانکاریەکی زۆر و لاڕێبونێکی ترسناکی لە هەست و تێڕوانینی موسڵمانانەوە توش هاتوە.

بەڵام نوسەر لێرەدا تۆز و خۆڵی نیشتویساڵەهای ساڵی سەر ئەم چەمکە دادەوەشێنێ و تەمومژە خەستەکەی دەرەوێنێتەوە و روە راستەقینە گەشاوەکەی ئەم چەمکە مەزنە وەدەر دەخاتەوە و موسڵمانان لە لاڕێبونەکان هوشیار دەکاتەوە.

نوسەر لاڕێبونەکان دەستنیشان دەکات کە نەوە لەدوای نەوە لەپاش سەردەمی راشدینەوە هێدی هێدی رویان داوە و چەمکەکەیان لە روی راستەقینەی خۆی وێڵ کردوە و وایان لێکردوە تەنها لە ئەنجامدانی دروشمە پەرستنکاریەکان(الشعائر التعبدية )ی وەکو نوێژ و رۆژو و زەکات و حەج کورت هەڵێنرێت و سەرلەبەری ژیان

و کردەوەکان لەم چەمکە وەدورخرێنەوە. نوسەر بــۆ راســتکردنەوەی ئــەم لارێبونــە ترسناکە پشت بە بەڵگــە قورئــانی و بەڵگــەی تێگەیشــتنی راســتەقینەی یــاوەران دێنێتەوە. هەروەها ئەوەش رون دەکاتەوە کە ئەم جۆرە پێناسەکردنەی (پەرستن) کە بریتی بێ لە ئەنجامدانی دروشمەکانی پەرستن، هەر شایەن بە فریشتانە کە خوا بــەو چەشنە خەڵقی کردون کــە لەگــەڵیدا بگونجێــن. بــەڵام مــرۆڤ کــە لــە قــوڕ و فــو خوڵقێنراوە، لەباریدا نیە سەرتاپای ژیــانی، هــەر لــەو ســاتەی لــەدایك دەبــێ تــا ئەوساتەی دەمرێ بەردەوام لە ئەنجامدانی دروشمەکانی پەرســتنکاریدا بێــت. ئەمــە لەلایەك، لەلایەکی تر مادەم مرۆڤیش بۆ پەرستنی خوا وەدیهێنراوە، کەواتە دەبــێ ژیانی مرۆڤ بە تەواوی جموجۆڵــە جەســتەیی و عــەقڵی و روحــی و نەفســییەکانی بریتی بێ لەو پەرستنە. بەو مەرجەی ئەو مرۆڤە موسڵمان بوبێ و ژیانەکەی خــۆی بەپێی بەرنامەی خواوە بەرێوە ببات. هەرچی دروشمەکانی پەرستنیشن بریتــین لــەو پەرستنە دیاریکراو و خەست و تێر و پڕەی کە گرنگی و تایبەتمــەندی و ئــەحکامی تایبەتیان هەن و وەك هەوێن و توێشوی بەردەوامی و پتەوی پەیوەندی بڕوادارانە بە پەروەردگاریانەوە، ئەمە جگە لەو هەمو بەروبومــە پــڕ بەرەکەتانــەی کــە دەیخەنــە ژیانی بڕوادارانەوە کە نوسەر زۆری لەبارەوە باسکردون.

نوسەر لارێبونێکی تر دەستنیشان دەکات کە ئەویش جیاکردنەوەی کردەوەیە لە پەرستن کە هەڵبەت کاریگەرێکی هەمیشەیی زۆر گەورە و نێگەتیڤانە و ترســناکی لەسەر کۆمەڵگەی موسڵمانان جێهێشتوە و دینداریی راســتەقینەی لێ شێواندون. نوسەر چوار هۆ دەخاتە روو کە مایەی ئەم جیاکردنەوەیە بون و دەڵێ:

بەڵام ئەو کەڵەگاییە سیاسیەی ئومەویــەکان لــە کــاتێکی زوی ژیــانی ئومــەتی ئیسلامدا دەستیان پێکرد، لەگەڵ ئەو خۆدزینەوە بەرەبەرەییەی لەبەر ئەرکــەکان و،

سوفیگەرێتی کە هەندێك باری تایبەت لە ژیانی ئوممەتدا دروستی کرد و، هێزی ئیرجائی کە بڕوای-ئەوەی خەڵکی پێ دەچێتە بەهەشت- تەنیا لە بەراست دانان و دانپێدانان کورت هەڵێنان.. هەموو ئەو فاکتەرانە پێکەوە پەرستنیان لە هەستی خەڵکدا تەنیا لە دروشمەکانی پەرستندا کۆکردەوە و ئیسلام لە هەستی خەڵکدا پتر لەوە نزیك بۆوە کە ببێتە مومارەسەکردنێکی تاکەکەسی کە هەر مرۆڤێك بەتەنێ پێی هەڵدەستێ.

دەرهاویشتنی کردەوە لە پەرستن زەبرێکی کوشندەی لە نەتەوەی ئیسلامی داوە و وایکردوە موسڵمانان دەسەڵاتیان لاواز ببێ و لە ناوەوە توشی داهێزران بن و لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا گرفت و ئاڵۆزی و چەرمەسەری رویان تێبکات. نوسەر دەڵێ:

چونکە ئەو رۆژەی ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ: تا بۆتان دەکرێ چەك و جبەخانەی شەڕ و ئەسپی سواری پەیداکەن.﴾الأنفال/٦٠. پەرستن بو، کەس نەیدەوێرا خاکی موسڵمانان داگیر کاو خێروبێرەکانی بڕفێنێ!.

ئەو رۆژەی ((طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ: زانستخوازین فەرز-ە-)) بو، دواکەوتنی زانستی لە گۆڕێ نەبو، بەڵکو ئوممەتی ئیسلامی ئوممەتی زانست بوو، کە ئەوروپا لە فێرگە و زانکۆکانیان فێربون.

ئەو رۆژەی ﴿فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ: شانەوشان لە زەویدا بگەڕێن و لە بژێوەکەی بخۆن.﴾الملك/١٥. پەرستن بو، کۆمەڵگە ئیسلامیەکانیش دەوڵەمەندترین کۆمەڵگاکانی سەر زەوی بون!

ئەو رۆژەی ((كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ: هەموتان شوانن و هەمووتان لەرەعیەتەکەتان بەرپرسن)) پەرستن بوو، کاربەدەستیش هەستی بەوە

دەکرد شوانە و بەرپرسە لە رەعیەتەکەی، هەژاران لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا کێشـە و دۆزێکیان نەبو، چونکە چارەسەری پەروەردگار بۆ کێشەی هەژاری لە کۆمەڵگـەی ئیسلامیدا وەك خودا پەرستنێك پیادە دەکرا!

ئەو رۆژەی ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ پەرستن بو، ئـافرەتی موسـڵمان دۆزێکـی نەبو! چونکە هەمو مافەکانی کە خوا فەرمانی پێدابـێ بـۆی دابـین دەکـرا و پێـی دەدرا، وەك تاعەتێك و، پەرستن بۆ خوا!

لارێبونێکـی تـر لـەبارەی ئـەم چەمکـەوە (چـەمکی پەرسـتن) دابڕانـدن و جیاکردنەوەی خورەوشتە لە پەرستن. خورەوشت لە ئیسلامدا پێناس و تایبەتمـەندی و بنەما و شرۆڤەی تایبەتی خۆی هەیە، کە بەداخـەوە وێـڕای ئـەم لارێبونـەی کـە خورەوشتیان لە ئامێزی پەرسـتن بەرهـەڵدا کـردوە، تەنانـەت لـە خـودی چـەمکی خورەوشتیشەوە لارێبونێکـی گـەورە رویـداوە و زۆر لـە چـەمکی راسـتەقینەی ون کراوە.

خورەوشت لـە ئیسـلامدا پێناسـەیەکی جیـاوازی هەیـە وەك لـەو پێناسـەیەی ئەوروپا دەیکات، ئەو بنەمایەی ئیسلام بیناى خورەوشتی لەسـەر کـردوە جیـاوازە لەگەڵ هی ئەوروپا.

نوسەر لەم بارەیەوە دەڵێ:

ئـەوروپا -لـە بیروبـاوەڕی ئێمـە- ئوممـەتێکی خـاوەن ئاکـارێکی راسـتەقینەی رەسەن نیە.. ئـەو ئاکارانـەی لەهەڵسـوکەوتی رۆژانـەیدا هەیـە، ئاکـارێکی سـود گەراییە، ئامانجەکەی تەنیا دەسخستنی سودە لە ژیانی دنیادا.

هەروەها دەڵێ:

کەچی لــە ئیســلامدا -لەوێنــە راســتەقینەکەی- ئاکــار بریتــی بــو لــە بــەهای راستەقینە و رەسەن، چونکە ئامانجەکەی دەسکەوتنی قازانجی مادی نەبو و، لەسەر ئەو قازانجەش دانەمەزرابو، بەڵکو ئامانجەکەی وەفــاداری بــو بــۆ ئــەو (پەیمانــە)ی لەگەڵ خودا بەستراوە، هەروەها لەسەر (پەرستن)ی خواش دامــەزرابو، هــەروەك لــە هــەمانکات کۆمەڵــە بەهایــەکی ژیــاری رەســـــەنیش بــــون چونکـــە مۆرکێکـــی (مرۆڤایەتی)یان هەڵگرتبو و، بە رەگەزێك یا بە رەنگێك تایبەت نەبو، بەڵکو ئــەو ئاکارە لە (مرۆڤ) دەردەچو وەك مرۆڤێکی-بڕوادار- و ئاراستەی (مـــرۆڤ) دەکـرا تەنانەت ئەگەر بڕواداریش نەبوایە بەو شتانەی موسڵمانان بڕوایان پێی هەبو.

لــە نــەوەکانی دواییــدا وەك چــۆن داخوازیــەکان لـــە چـــەمکی لا الــە الا الله سڕاونەتەوە و لەنێو براون، ئاوەهاش داخوازیەکانی چەمکی پەرستن لەپەك خـراون و تەسك کراونەتەوە و دورخراون. کە بێگومان ئەم لاڕێبونە وایکــردوە رێــژە و جــۆری گونــاە و تــاوان و نســکۆ و لاڕێبونــەکان لــە کۆمەڵگــەی موســڵمانان زۆر بـــــن و ئەهمیەتێکی ئەوتۆیان پــێ نــەدرێ و هەســت و بیرکردنــەوەیان بەســەر دوو لایــەن دابەش بێ، ئەو لایەنەی کە دروشمەکانی پەرستنی تێدا ئــەنجام دەدەن و لایەنەکــەی تریش کە خۆیان بە ئازاد دەبیننەوە لەو کاتەی دروشمەکان ئەنجام نادەن.. وەك بڵێــی ئیتر تەواو لە بازنەی پەرستن دەردەچن بۆ بازنەی ژیانی ئاسایی!.

نوسەر دەڵێ:

کــاتێك چــەمکی پەرســتن تەســك بــۆوە لــەنێو نــەوەکانی پاشــین و تــەنیا لـــە دروشمەکان خڕبۆوە و لە بازنەی پەرســـتنی چــالاکی کــرداری رۆژانــە دەرچــوو، جــا چالاکی سیاسی یا کۆمەڵایەتی یا ئابوری بــێ.. هــەروەها ئاکارەکــانی (لا إلــە إلاّ الله)شی لیّ دەرهاوێشــترا، گونــاح زۆر بــون و گوناهکــارانیش زۆر و، بــەڕێوەچونی

کۆمەڵگەش شڵەژا و، لاڕێبون و زۆرداری تێدا زۆر بو و، پتر لە جارێك کەوتە نێو نسکۆ و شپرزەبون و تێکشکانی گەورە..

هەڵەیەکی گەورەتر بەرامبەر بە هەردوو چەمکی (لا الە الا الله) و پەرستن ئەوەیە کە دوو زاراوەی لێك ترازاویان بۆ ئەم دوو چەمکە بڕیارداوە کە ئەم دابەشکاریی و ترازاندنە بوەتە مایەی تێکشێواندنی تێڕوانینی راستەقینەی ئیسلامی لەبارەی چەمکەکانەوە. بێگومان زانایان کە ئەم جیاکردنەوانەیان کردوە لەبەر مەبەستە زانستی و ئەحکامییەکان بون، نەك بە مەبەستی لەبەریەك هەڵوەشاندنەوە و ترازاندنی بنەما تێڕوانین ئامێزەکانیان کە پاشان وای لێهات.

نوسەر دەڵێ:

کاتێك هزری ئیرجائی بیروباوەڕی یەکتاپەرستی کورتکردەوە و، لە هەمو نێوەڕۆکە زیندوەکەی بەتاڵی کرد و تەنیا لە بەڕاستدانان کۆی کردەوە بەمەبەستی رزگاربون لە قیامەتێ و دانپێدانانیش بۆ رزگاربون لە دنیادا.. ئەوا لایەنی هەرەگەورەی (پەرستن)ی راستەقینە کە خودا بەسەر بەندانیدا فەرز کردوە کورژ بو[1] و، پاشماوەکەش-ئەگەر بە تەواوترین شێوازیش جێبەجێ‌کرا- هێشتا لە تێرکردنی واتای راستەقینەی پەرستن کەموکوڕی دەبێ کە خودا ئافەریدانی بۆ وەدیهێناوە.

* *

## چەمکی قەزاوقەدەر

هەرکەسێك بەوردی بیر لە شێرازە و پێکهاتە و هەڵسوڕانی ئەم گەردونە بەرفرەوان و بێمەودایە بکاتەوە، چاری نیە دەبێ بڕوایەکی زۆر پتەو بە

---

[1] کورژبون: تقلص.

قەزاوقەدەری خواوە بێنیێ. وەك چۆن دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە ئـەم گەردونـە لـە خۆڕا نەهاتۆتە دی و دەبێ وەدیهێنەرێك هێنابێتیە بون، کە بیر لەو هەمو چۆنیەتـە ئالۆزەی بەڕێوەچونی ئەم گەردونەش دەکاتـەوە کـە بـە چ سـەیر و سـەمەرەیەکەوە بەڕێوە دەچێ و چۆن لـەنێو ئـەم هـەمو ملیـار و ملیارەهـا گریـان و شـێمانەیەی بەڕێوەچون و وێرانبوندا توانیوێتی بەشێوەیەکی ئەوپەڕی رێکوپێکی و سەلامەتی و بێکەموکورتیەوە بەڕێوە بچێ؛ چاری نیە دەبێ بڕوا بـە قەزاوقـەدەری خـوا بێنـێ. تەنانەت ئەگەر بیر لە هۆ و هۆکارەکانی ژیان و مەرگی یەك تاقە مرۆڤ بکەینەوە، ئەوا زنجیرە هۆ و هۆکارێکی نەبڕاوە و پەیوەست بە زنجیرە بێکۆتاکـانی تـری هـۆ و هۆکارەکانی تـرەوە بەشـدارن لـە بڕیـاردانی ئـەم لەدایکبونـە یـان مردنـەی تاقـە مرۆڤەکە.

هەر بۆ نمونە چەند ئەگەر و شیمانەی بێکوتا هەبون تا ئەم ژن و پیاوە دەبـن بـە دایك و باوکی؟ چەند ئەگەر و شێمانە هەبون تا ئەم منداڵە بژی یان نـەژی؟ چـەند ئەگەر و شێمانە هەبون تا ئەم منداڵە گەورە بێ یان بمرێ؟، چەند ئەگەر و شێمانەی بێبڕانەوە هەبون تا ئەم مرۆڤە بەو چۆنیەتە بمرێ کە دەمرێ!؟... ئیتر بـەم شـێوەیە هەموو جولە و نەجولە و بیرکردنەوە و کردن و نەکردنـەکان هەریەکـەیان هـەڵگری زنجیرەیەك هۆ و هۆکارێکی لەبن نەهاتون، هاوکات لەگـەڵ هەریـەك لـەم شـتانەدا هەمو شتە بێپایانەکانی تری ئـەم گەردونـە بـە هـەڵگرتنی زنجـیرە هـۆ و هۆکـارە بێئەژمارەکانیانەوە لەسەری کاردەکەن و رەنگە زنجیرە هۆ و هۆکاری لەبن نـەهاتوی وا هەبن هاوکات بن، هەبن لەپاش بن و هێشتا نەگەیشتبنە ئاستی ئـەو و هەشـبن لە پێشتر بن وەك شەپۆڵەکانی ئاو بە نیسبەت یەکتریەوە.. ئیتر ئەو هەمو ملیـار و ملیارەها و ملیاری بێئەژمار لە ئەگەر و شێمانەی دەرەنجامەکان کە وەك تۆڕێکـی

تێکچرژاو و تێکئالاوی بێسنور و بێکۆتایین..!! ئا لەنێو ئەم تۆڕەدا ژیان و مــەرگی تاقە مرۆڤێك، یان هەر شتێکی تر لەم گەردون و سەرزەمینەدا روبدات، کێ هەیــە ئەم روداو و دەرەنجام و هۆ و هۆکارانە رێك بخات، ئەگەر بە ئیرادە و زانست و توانا و دەسەڵاتی بێسنوری پەروەردگاری وەدیهێنەر نەبێ، چ شتێ هەیە بەڕێوەیان ببات ئەگەر قەزاوقەدەری خوای باڵادەست نەبێ؟!!.

ئەگەر هێڵکاریەك بۆ ئەم قسانەی سەرەوە بکێشین، بەمجۆرە دەبێ:



**تیرەکــان بریتــین لـــە زنجیرەیـــــەکی بێکۆتـــای هـــــۆ و هۆکارەکــان، بازنـــە بچوکە ناوبۆشــەکان دەرەنجامــەکانی تـــر بن کە ئەوانیش هەر بێکۆتـــــان و لــــــە ژمـــاردن نایـــــەن، بازنــە ناوپڕەکـــەش بریتی بێ لە دەرەنجامێك بۆ زنجیرە هۆ و هۆکـــارێکی بێکۆتـــایی و بـــۆ نمونــە بـــا لەدایکبونی مرۆڤێك بێ.**

ئیتر هەرچی دار و دەوەنی دنیایە بیکەیتــە قەڵــەم و هــەرچی روبــار و دەریــا و ئۆقیانوسەکانی زەمینە و هەزاران هەزار ئەوەندەش بێنـــی بیکەیتــە مەرەکــەب و بتەوێ کۆتایی بەم تۆڕە لەبن نەهاتوە بێنی کۆتایی نایەت.

هەڵبەت هەمو هۆ و هۆکار و دەرەنجامەکانی ئەم تۆڕە بێسنور و بێکۆتایە گۆڕاون و هەمیشە لەباری گۆڕان دان.

بۆ نمونە تۆ کە دوعایەك دەکەی تا بەڵایەکی دیاریکراوت لەسەر لاچێ (کە دوعاکە هۆیە و لاچونی بەڵاکەش دەرەنجامە)، لێرەدا دوو دەرەنجام دێتە پێشەوە: یان لادەچێ یان لاناچێ، کەواتە ئەگەر لاچێ ئەوا سەرلەبەری ئەم تۆڕە بەشێوەیەکی تر هەڵدەکەوێ، ئەگەر لاش نەچێ ئەوا بەشێوەیەکی[1] تر... ئیتر بیر لەوە بکەوە هەمو هۆ و هۆکار و دەرەنجامەکان هەردەم لە گۆڕان دان و هەمیشە مایەی وەدیهێنەری تۆڕی جۆراوجۆرن... کەواتە هەمو ساتێ و هەمیشە ژمارەیەکی بێکۆتا لەو تۆڕە بێکۆتایە وەدی دێ کە سەرەنجام ئەوانیش وەکو هۆ و هۆکار و دەرەنجامە بێسنورەکان زنجیرەی تۆڕی بێسنور دێننە ئاراوە... سبحان الله، ئەم هەمو هاوسەنگیە لە توانی کێدایە ئەگەر خوا بە قەزاوقەدەرەکەیەوە رێکی نەخستبێ.

ئا لێرەدا گەورەیی ئەم ئایەتەمان بۆ دەردەکەوێ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾.

بەڵێ.. **قەزاوقەدەر بەرنامەیەکی خواییە بۆ هەڵسوڕاندن و بەڕێوەچونی گەردون.** بڕوابون بەم بەرنامەیە مرۆڤی بڕوادار لە چەندین ئاڵۆزی و ترس و دودڵی رزگار دەکات و دڵنیاییەکی گەورە دەخاتە دڵیەوە و هێزێکی بزوێنەر و پاڵنەرێکی

---

[1] لێرەدا دەردەکەوێ کە هەر گۆڕانێك چ کاریگەری و ئەنجامێکی لێدەکەوێتەوە و چۆن کار لە هاوسەنگی ئەم تۆڕە ئاڵۆز و بێکۆتایە دەکات چەند کارێکی نەستەم و قورسە، جگە لەمە ژمارەی گۆڕاوەکانیش بێکۆتان و بێئەژمارن.. بەڵام خوا لە قورئاندا فەرمویەتی ﴿إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾.

به تەوژم و روحیەتێکی زیندو و وەرچەرخێنەری پێ دەبەخشێ.. بەڵام بەداخەوە ئەم چەمکەش (چەمکی قەزاوقەدەر) بە مەرەدی چەمکەکانی تر چووە و گەلێك لارێبون و نافامیدەیی دەرهەق کراوە.. کە نوسەر لەم پەرتوکەدا راستیان دەکاتەوە و حەقیقەتەکەی دەخاتەوە روو..

قەزاوقەدەر بە چەمکە راستەقینەکەی بریتیە لە گوڕ و تینێکی هاندەرانەی گەورە و کاریگەر و روحییەتێکی بزوێنەر لە بڕواداران دەسازێنێ. هەروەکو یاوەرانیش وابون و بەهۆی بڕواکەیانەوە ئەوپەڕی کۆشش و هەوڵیان لە ژیان دا و هەرگیز بەهۆی قەزاوقەدەرەوە دەستیان بەخۆدا بەرنەداوە و وازیان لە هەوڵدان نەهێنا.. یاوەران بە روێکی سلبی و تاریکەوە لە قەزاوقەدەریان نەدەڕوانی و بڵێن جا ئەگەر هەمو شتێ بڕابێتەوە بۆچی کار بکەین؛ چونکە ئەوان دەیانزانی بونی ئەوان و کارەکانیان فاکتەرێکی کاریگەر و زندو و حسێب بۆکراوە لە بڕیارە قەدەریەکاندا، ئەگەر نا چ جیاوازیەك لەنێوان مرۆڤ و داروبەرد دا هەیە و مرۆڤ لە کوێوە ئەو تازیاری و باڵاییەی خوا پێی بەخشیوە؛ بەباڵا دەبڕێ!.. ئاشکرایە چونکە ئەو فاکتەرێکی کارایە لە گۆڕانکاریە قەدەریەکاندا و ئەو ئیرادە و ئەو کردەوەی کە ئەوان ئەنجامی دەدەن بەشدارن لە داڕشتنی قەزاوقەدەری لەدێرین بڕیار لەسەر دراوی لای خودا. یاوەران بەم روە روناك و ئیجابیەوە لە قەزاوقەدەریان روانیوە کە لە حەقیقەتەکەیدا هەیە.

نوسەر دەڵێ:

ئەم چەمکە لەهەستی یەکەمین نەوەکانی ئەم ئومەتە هێزێکی پاڵنەری بنیاتنەری جوڵێنەر بو، بەقەد ئەوەی لە هەستی نەوەکانی دوایین هێزێکی سلبی روخێنەری شەرمەزارکەر بو، کاتێك چەمکی قەزا و قەدەر لە هەستی ئەم نەوەیەدا

لە وێنە ڕاست و دروستەکەی خۆی لایدا کە نەوەکانی پێشین پێی ژیاون و بنیاتیـان ناوە و ئاوەدانیان کردۆتەوە و پێی جولاون..

هەستکردن بە بەرپرسێتی پێچەوانە نیە لەگـەڵ چـەمکی قەزاوقـەدەر، بـەڵکو هاندەریەتی، ئەو کاتەی مرۆڤ لە ڕاستەقینەی قەزاوقەدەر تێگەیی و زانی ڕوداو و دیاردە نابەڵەدەکانی نێو کۆمەڵگە بـەهۆی کەمتەرخـەمی کەسـانێکەوە بـوە کـە هەوڵی گۆڕانکارییان نەداوە کە ئەمەش بەشێکە لە قەزاوقەدەر، یەکسەر ئەو خـۆی بەرپرس دەبینێتـەوە و هـەوڵ دەدا گۆڕانکاریـەکان بخاتـە ئەسـتۆوە، کـە ئەمـەش پەیڕەوکردنە لە جۆرە قەزاوقەدەرێك.

خوا ژیانی دنیای وا هێناوەتە دی کە مایەی ئـەزموناندن و تاقیکردنـەوە بـێ. خۆدزینەوە لە بەرپرسێتی هەڵوێستێکی بێبڕواکانە، چونکە بە چەمکی هەڵـەوە لـە ژیان دەڕوانن، بۆ نمونە کە هەژاران بە کڵۆڵی و برسیەتی و ئاتاجیەوە دەبینن خۆیان لـەم مەسـەلەیە دەردەوێـژن و ئـەرکی بەرپرسـێتی لەسـەر خـۆ لادەدەن و تۆبـاڵ دەخەنەوە سەر خوا!. خوا لە ئایەتێکدا ئەم هەڵوێستەیان دەستنیشان دەکات کە لە فامێکی ناکامی نافامیدە لە ئامانجی وەدیهاتنی ژیانەوە هەڵقولاوە، دەفەرموێ:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنُطْعِمُ مَنْ لَوْ يَشَاءُ اللَّهُ أَطْعَمَهُ إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ فِي ضَلاَلٍ مُبِينٍ﴾يس/٤٧.

نوسەر لەم بارەوە کە یاوەران هەستەکەیان چۆن بوە دەڵێ:

هەروەها لە هەستی موسـڵمانی یەکـەم وابـو کـە بـڕوا بـون بەقـەزا و قـەدەر بەرپرسێتی لە کارەکان لەکارناخا و کاتێك هەڵە ئەنجام بدا دوچاری سزادان دەبێ.

مەسەلەیەکی تر کە نوسەر ڕونی دەکاتەوە ئەوەیە کە مرۆڤ لە هـەمو بـارێکدا هەر لەنێو بازنەی قەزاوقەدەردایە و لێی دەرناچێ، گـەر کـار بکـات یـان نـەکات،

هەولّبدا یان نەدات، واقیعێکی خراپ و وێران لە ئارادابێ یـان بـاش و ئـاوەدان... هەمو ورد و درشتێك هەر لە ئـامێزی قەزاوقـەدەردان و لێـی دەرنـاچن، وتەکـەی ئیمامی عومەرﷺ لەم بارەیەوە زۆر بەناوبانگە کە گوتویەتی: ((لە قەدەری خـواوە هەلّدێم بۆ قەدەری خوا)).

جا یەکێك کە ببینێ واقیعێکی نابەدڵ هاتۆتە ئاراوە و هەولّی گۆڕینـی نـەدات بە بیانوی ئەوەی کە قەزاوقـەدەر وەدیهێنەریـەتی؛ فـامێکی زۆر نابەجێیـە ئەگـەر واش تێنەگات کە هەر بە قەزاوقەدەریشەوە واقیعـە ناهەموارەکـە دێتـە گۆڕیـن و هەولّی گۆڕینی ئەویش هەر لە ئامێزی قەزاوقەدەرەوەیە کـە واقیعـە ناهەموارەکـە لادەدات. نوسەر لەم بارەوە باسی یاوەران دەکات کە لە شکسنخواردنەکەی شـەڕی بەدردا هەلّوێستیان چۆن بوە و دەلّێ:

ئەوانە ئەو کەسانەن کە بەقەدەری خودا دۆڕاندیان (ئەگەر چـی لەهـەمان کـات هۆیەکەی لەلای خۆیانەوە بێ) دەلّێن: (حســبنا الله ونعـم الوكيـل). ئـەوان پشـت بەخوا دەبەستن تاکو لە واقیعە خراپەکەدا بەرەو واقیعێکی نوێ دەرچن و، قــەدەری پێشوی خوداش رێی ئەوەیان لێناگرێ کە روەو قەدەرێکی نوێ هــەنگاو بنێـن! جا ئەگەر یەکەم قەدەری خــوا بـەهۆی هەلّـەی خۆیانـەوە توشـیانهاتبێ، ئـەوا ئـەوان چاودەبڕنە قەدەرێکی دیکەی خودا بەهۆی کردەوەیــەك کـە بـەو هیوایـە ئـەنجامی دەدەن.

قەزاوقەدەر هاوسەنگیەکی زۆر ناسك و جوان دەخاتە هەست و بڕوای مرۆڤەوە.. هاوسەنگیەك لەنێوان دەسەلاّتی و ئیرادەی خـوا و، توانـا و ویسـت و کردەوەکـانی مرۆڤدا، بە تەنیا لە هیچیان ناڕوانێ تا توشـی ئاسـەوارە سـلبیەکانی هـەردو بـار

نەبێ، بەڵکو هەردولا بەوپەڕی راستەقینە و وردەکاریەوە بەیەکــەوە گــرێ دەدات و دەبێتە مایەی وەدیهاتنی بڕوایەکی راستەقینەی ئیجابی و بنیاتنەرانە.

نمونە بە ئەوروپا دێنێتەوە کە چۆن لەم هاوسەنگیە بێبەشــن و نــەیانتوانیوە لــە هەست و بیروباوەڕەکەیانەوە شوێن پێی بۆ بکەنەوە.

مــرۆڤ لــە ئــەروپای ســەدەکانی نێوەڕاســتەوە تــەواو تــەواو دارزێـــنرابو و وا تێدەگەیشت ئەم واقیعە پڕ ســتەم و ناهــەموارەی کــە هەیــە حەتمیــە و ئــەو هیــچ دەسەڵاتێکی بۆ نەماوەتەوە کە بیگۆڕێ، کــەچی دوای پێشــکەوتنە زانســتیەکەیان توشی دەردی پێچەوانە بون و واتێدەگەن کە ئیتر مرۆڤ هەمو شتێکە و ئەو بریتیە لە نوسەری قەدەر و هیچ قەدەرێك نیە لەسەروی مرۆڤەوە بێ.

ئا لێرەدا هاوسەنگیە ورد و جوانەکەی بیروباوەڕی ئیسلامی وەدەر دەکەوێ کــە نوسەر لەبارەیەوە دەڵێ:

بیروباوەڕی قەزا و قەدەر بەوێنە راستودروستەکەی لە ئیسلام، لــەنێوان ئــەو دو لایە پێچەوانەیە دێتەدی، بڕیاری زاڵبونی ســەرتاپاگیری خــودا دەدا بەســەر هــەمو ئەوشتانەی لە گەردون و لە ژیانی مرۆڤدا رو دەدەن و، لەهــەمانکات کاریگــەرێتی مرۆڤ ناسڕێتەوە و، کردەوە ناسڕێتەوە و، وەرگرتنی هۆکارەکانیش ناسڕێتەوە.

لەهاوسەنگیەکی تەواودا موسڵمان بڕوا دێنێ کە هەرچی لەگەردون و لە ژیــانی خۆیدا ڕوودەدا قەدەرێکی بڕیار دراوە لەلایــەن خــوداوە، پێشــنەوەی کــە بەڕاســتی لەواقیعی مرۆڤدا روبدا... لەهەمانکاتیشدا بڕوا بەوە دێنێ کە دەبێ کــار بکــا و، هۆکارەکان وەرگرێ و، هــەر قــەدەرێکیش روبــدا بــەو هۆکارانــەوە پەیوەســتە کــە وەریاندەگرێ (یا وازیان لێدێنــێ و وەریاننــاگرێ)، لەگــەڵ جــۆری ئــەو کردەوانــەی ئەنجامیان دەدا.

نوسەر لە دەستنیشانکردنی لاڕێبونێکی تـر لـەبارەی چـەمکی قەزاوقـەدەرەوە ئەوە دەستنیشان دەکات کە بڕوای قەزاوقەدەر لەلای نەوەکانی پاشیندا ببوە بابەتی چەند تۆژینەوەیـەکی کەلامناسـانەیی و وەك بەرنامەیـەکی پـەروەردەی ئیسـلامی نەمایەوە.

لەمبارەیەوە دەڵێ:

لەو میانەیەشدا بیروباوەڕی قەزا و قەدەر بوە جێباسـی کـەلامیی-کـە تـاخم و گروپـەکان لـەبارەی نـاکۆك بـون- و، وەك بەرنامەیـەکی پـەروەردەی ئیسـلامی نەمایەوە! بەڵکو بو بە کۆمەڵـە دۆزێکـی فەلسـەفی کـە زەیـن مـاندو دەبێ بـۆ دۆزینەوەی شیکارەکانیان، ئومەتیش پەروەردە نەدەکرا و کەسیش ئاوڕی لە بـەهای پەروەردەیی مەزنی بیروباوەڕی قەزا و قـەدەر لـە شـێوازە ئیسـلامیە دروسـتەکەی نەدەدایەوە! بەهەمان شێوەی کە بیروباوەڕی یەکتاپەرستی پێ بوە جێباسی کەلامی زەینی روت و سارد و سڕ، کـە نـەویژدانی ئـاینی دەبزوانـد و، نـە دەبـوە مایـەی رەفتارێکی کرداری و، سەرەڕای ئەمەش شتی جێگومانی لەدڵاندا دەچـاند پـتر لـە جێگیرکردنی بڕواو! خـەڵکیش ئـەوەیان وەك (بیروبـاوەڕ) وەردەگـرت. بەمشـێوەیە توێژەران[1] لە واقیعی زیندوی خەڵك و، لە داخوازیەکانی بانگـەواز و داخوازیـەکانی پەروەردە دادەبڕان و (کەلام) هەر چۆن بسوڕابا ئەوانیش ئاوا دەسوڕان!

* * *

---

١ توێژەر: دارس، باحث.

## چەمکی دنیا و ئاخیرەت

چەمکێکی تر کە نوسەر لەم پەرتوکەدا تاوتوێی دەکات و روی راستەقینەکەی وەدەردەخات و لارێبونەکانی دەرهەقی کراوە دەستنیشان دەکات بریتیە لە چەمکی دونیا و ئاخیرەت.

لە سەرەتادا ئەوە رون دەکاتەوە کە ئەگەر چی هەندێ کردەوە هەن مۆرکی روحییان بەسەردا زاڵە و هەندێکی تر مۆرکی هزری و هەندێکی تریش مۆرکی هەستی. بەڵام ئەم مۆرك جیاوازیانە نابنە مایەی جیابونەوەی کردەوەکانی لە یەکتری، چونکە هەمویان لە قەوارەیەکی یەکگرتوی پێکەوەبەستراوی مرۆڤانەیی سەرچاوە دەگرن. ئەوەش رون دەکاتەوە کە دونیا و ئاخیرەت لە هەستی یاوەراندا ئەڵقەیەکی بەیەکەوە بەستراوی لێك نەترازاو بوو. ئەوان بەسای بیروباوەڕە راستەقینەکەیانەوە پارچەپارچەیی و پەرش و بڵاوێتی قەوارەی خودی خۆیانیان کۆکردەوە و ئەو ساتانەیان تێپەڕاند کە جەستە بە روکارێك و عەقڵ بە روکارێکی تر و روحیش بە روکارێکی لەوان جیا هەنگاویان هەڵدەگرت، چونکە وەك نوسەر دەڵێ:

مرۆڤ کە خودا وەدیهێناوە یەکەیەکی یەکانگیری و هەر لایەنێکی ئەوی دیکە تەواو دەکات، لایەنێکی تێدا لەلایەنێك جودا نابێتەوە و، بەپەرتەوازەییش مومارەسەی ژیان ناکا! ئەو کات یەکانگیربونە سروشتیەکەی خۆی لەدەستدا کە خواوەندی لێك جودا بون و پەرستنی لێك جودا بۆوە.

نوسەر لە شوێنێکی تردا باس لەوە دەکات کە دنیا و ئاخیرەت دوو رێگەی لێك جودایان نیە، بەڵکو هەر یەك رێگایە، سەرەتاکەی لەدنیایە و کۆتاییەکەی لە ئاخیرەتە.. رێگایەکە دولای هەیە، بەڵام ئاڕاستەکەی یەکگرتوە و روەو ئاخیرەتە..

لایـەکی چاکـەکاران دەیگـرن و دەیانگەیەنێتـە بەهەشــــت، لایەکــەی دیکــەش خراپەکاران دەیگرن و بەرەو ئەشکەنجەیان دەبا بەڵام ڕێگەکە یەکێکــەوە لـە نێـوان دنیا و ئاخیرەتدا نەپچڕاوە.

ئەم یەکانگیریەی نێوان دنیا و ئاخیرەت لەلای موسڵمانانی پێشینەوە گەیشتبوە رادەیەکی هێنــدە تۆکمــە و قــایم و تێکچـڕژاوی وا کـە بـەواقیع لـەژیانی دنیــادا دەژیان، بەڵام هەست و نەست و بیریان بەئاخیرەتەوە پەیوەســت بـو، وەکـو ئـەوەی لەبەر چاو و، لەبەر دەمیان ئامادەبێ ئاوا تێیدا دەژیان.

بەم جۆرە تێڕوانینەوە توانیان بگەنە ئاستە هەرە بەرزەکان و کاری وا بکەن کــە بە موعجیزان بچن.

بێگومان ڕاپەڕین و ڕابونەوە یان دامرکانەوە و داڕمانی کۆمەڵگا یـان تەنانـەت هەمو هەڵوێستە بنیاتنەر و روخێنەرەکان لە کانگای هزر و چـەمك و بیروبـاوەڕەوە سەرچاوە هەڵدەبەستن. بە واتایەکی تر بیرکردنەوە منداڵدانی کردەوەکانـە. جـا بـەم پێیـە هـەر بیرکردنەوەیـەکی هەڵـە کـارێکی ناهـەمواری لێ لـەدایك دەبـێ، بــە پێچەوانەشەوە هەر بیرکردنەوەیەکی ڕاست مایەی بونی کردەوەی ڕاسـت و روناکـە. بەڵام کۆمەڵگەی موسڵمانان بە داخێکی زۆرەوە لە ئەنجامی بیرکردنــەوە هەڵـەکانی بەرامبەر بەم چەمکە زەبرێکی گەلێك کوشـندەیان لـە نـەوەکانی موسـڵمانان دا و مێژوێکی بەتاڵ لە پێشکەوتنی زانستیان بۆ ئومەتی ئیســلامی بینـا کـرد کـە تـا ئێستاش و بەردەوامیش باجێکی گەورە و ترسناکی بەم ئومەتە داناوە و دادەنێ!.

نوسەر زۆر چاك و بەوردی پەنجە دەخاتە سەر هۆیەکانی دروستبونی ئـەم جـۆرە بیرکردنەوەیەی کە وای لە موسڵمانان کرد لەم پێشکەوتنە بێبەش بن. باســی ئـەوە دەکات کە ڕاستە لە قورئان و فەرموداندا زەمی دنیا کراوە و بەکەم نرخێنراوە و لە

بایەخی کەم کراوەتەوە، بەڵام ئەم زەم و کەمنرخاندنە لە ئەنجامی دو حاڵەتەوە تەرکیزیان خراوەتە سەر، کە ئەوانیش وەکو دەڵێن:

تەنیا لە دو بوارانـدا هـاتون: کـاتێك دنیـا-واتـە خۆشویسـتن و پێوەپەیوەسـت بونی- دەبێتە بەربەست لەنێوان خەڵك و نێوان بڕوا بون بەخودا و بەڕۆژی دوایی، یا دەبێتە بەربەست لەنێوان خەڵك و جیهاد لەپێناو خودا.

بـەڵام تەشـەنەکردنی ئـەم بێنـرخ کردنـــە بـــۆ تـــەواوی دنیـــا و پێکهاتـــە و وردەکاریەکانی ژیـــان کـــە دەیـــان ئایـــەتی تـــر هـــەن بـــە واجـــب و زەروری دادەنێـــن موسڵمانان بایەخیان پێبدەن؛ کاریگەرێکی گەلێ سلبی خستە سەر تـــەواوی ژیـــانی ئومەتی ئیسلامیەوە.. تا وای لێهات جیابونەوەیەکی ئێجگـار تـرازاو و دژ بەیـەك لەنێوان دنیا و ئاخیرەت لـە عەقڵیـەتی گشـتی کۆمەڵگـەی ئیسـلامی بـەرپابوو، عـەقڵیەتێك کە هاوسەنگی و بەیەکەوە گرێدانەکەی نێوان دنیا و ئاخیرەتی ون کـرد و لاڕێ بوو، لاڕێبونەکەش بۆیە رون نەدەبۆوە چونکە دنیا بێبایەخ کرابو و ئاخیرەت کرابوە تاکە مەبەستی هەوڵدان، واتە دینداری ببـــوە دژایـەتیکردنی دنیـا لـەپێناو ئاخیرەت!!.. کە ئەمە عەقڵیەتێکی سۆفیگەرانەیە و رێبـازی سـۆفیەکان و رێبـەرە سۆفیەکانیش کاریگەری سەرەکی بون لە دروست کردنی ئەم عەقڵیەتەدا.

ئەم جۆرە عەقڵیەتە سۆفیگەرییە بوە مایەی بێبەشکردنی مێـژو و کۆمەڵگـەی ئیسلامی لە پێشکەوتنە زانستیەکان کە بەداخەوە پاشـان ئـەوروپا پێـی گەیشـت. هەڵبەت گەلێ هۆ هەن بۆ پێشنەکەوتنی موسڵمانان لەروی زانسـتـە کرداریـەکان و وەدینـەهێنانی تەکنـەلۆجیادا، بـەڵام ئـەم دابڕانـەی نێـوان دنیـا و ئاخـیرەت و هەڵبژاردنی ئاخیرەت بە تەنها و پشت هەڵکردن لە دونیا بە یـەکجارەکی هۆیـەکی هـەرە سـەرەکی بـو، عـەقڵیـەتی گشـتی کۆمەڵگـەی ئیسـلامی وای لێـهات کـە

ئاسودەبونی خۆی تەنها لە کردە تایبەتەکانی سەر بە ئاخیرەت ببینێتەوە و ئەو مەسەلەیە لە عەقڵیەتەکەیدا باری کرد کە پێیانوابێ باری هەمواری ژیانی دنیاش مایەی پتر دینداری کردن بێ و بەشێکی پێکنەر بێ لە دروستکردنی ئاسودەییەکەدا. بە واتایەکی تر پێناسەی ئاسودەبونی مرۆڤ و بەدەستهێنانی بەختەوەری مرۆڤایەتی تەنها لەلایەنی روحی دەبینرا و لایەنی ماددی فەرامۆش کرابو، بۆیە لە ئەنجامدا کۆمەڵگەی ئیسلامی بوە خاوەنی هەزاران هەزار پەرتوکی جۆراوجۆر لەبارەی مەسەلە مەعنەوی و روحیەکانەوە، کەچی ئەو کتێبانەی کە لەبارەی زانستە کرداریەکانەوەن بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، هەر بۆیەش کۆمەڵگەی موسڵمانان نەبوە خاوەنی رێنیسانسێکی زانستی و تەکنولۆجی. هەرچەندە لەزۆر لایەنی ژیاندا پێشکەوتنی بەخۆیەوە دی، بەڵام بەپێی پێویست نەبون و نەبونە بزوێنەری کۆمەڵگە.

بەڵام لەلای ئەوروپیەکان کار بەجۆرێکی تر گوزەری دەکرد، ئەوان هەر لە مێژەوە لەسەردەمی ئەپیکورۆسەوە مشتومڕیان لەو بارەوە کردوە کە ئاسودەیی چیە و چۆن وەدی دێ[1].. تا لە ئەنجامدا گەیشتنە ئەو تیۆرەی کە پێی وایە ئاسودەیی تەنها بریتیە لە چێژە ماددیە بەرهەست و بەردەستەکان. ئەم تیۆرە بە درێژایی مێژو مایەوە و بینای گەلێ پێشکەوتنی ماددییانەی لەسەر کرا، جا ئەو رۆژەی کە بە یەکجاری لە دەسەڵاتی کەنیسە(کە دەسەڵاتێکی سەپاوی هەڵەی ئاینی لارێ و روحی دژ بە زانست بو) خۆیان راپسکاند و رزگاربون، ئیتر لەگەڵ دەیان هۆکاری تر رێنیسانسێکی یەك لایەنەی ماددیانە هەڵایسا و ئەو ئەوروپایەی

---

[1] بۆ زیاتر بگەڕێوە بۆ پەرتوکەکەی أبو الحسن الندوی بەناوی: بە داروخانی موسڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت.

لێکەوتەوە کە ئێستا بوەتە خاوەنی ژیارێکی یەك لایەنەی ماددی و خاوەن تەکنۆلۆجیایەکی پێشکەوتو.

چەمکی راستەقینەی پەیامی ئیسلام هەردوو چەمکی دنیا و ئاخیرەت بەیەکەوە گرێ دەدا و ئاسودەیی لە هەردوو لایەنی دنیا و ماددی و هەروەها ئاخیرەت و روحیدا دەبینێ، بۆیە ئەگەر ئەم چەمکە بە راستەقینەیی خۆی لە عەقڵیەتی کۆمەڵگای ئیسلامی مابایەوە و پێی وابوایە کە ئاسودەیی لە هەردوو روەوە دابین دەبن و تەواوکەری یەکترین، ئەوا چۆن ئێستاکە کۆمەڵگەی ئیسلامی خاوەنی گەورەترین کلتوری روحی و مەعنەویە، ئاوەهاش خاوەنی گەورەترین بەرهەمی زانستی پراکتیکی دەبوو و دەستپێشخەر تر دەبوو لە وەدیهێنانی تەکنەلۆجیا پێشکەوتوەکەدا و ژیارێکی وای بنیات دەنا کە تەواوی پێشکەوتنی روحی و بەهاکان و تەواوی پێشکەوتنی ماددی و تەکنەلۆجیشی تێدا دەبوو.. بە واتایەکی تر کۆمەڵگەیەکی ستاندەر و ژیارێکی ستاندەری بنیات دەنا.. بەلاّم بەداخەوە کە ئێستا خاوەنی ژیارێکی وایە کە لە هەردوو لایەن وێرانە.

نوسەر کە باسی سۆفیگەرەکان و کاریگەریەکەیان دەکات بەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامی لە شوێنێکدا دەڵێ:

لەزانستی دنیایی وەك نوژداری و گەردونناسی و ماتماتیك و ئەندازە و فیزیا و کیمیا دورکەوتنەوە.. چونکە ئەمانە بەدونیای فانیەوە پەیوەستن! دورکەوتنەوە لە پێشکەوتنی مادی چونکە ئارایشتی ژیانی دنیایە و مایەی بەهیلاك چونە!

نوسەر باسی هاوسەنگی راستەقینە دەکات لە هەستی موسڵمانانی راستەقینەدا و دەڵێ:

چونکە خودای وەدیهێنەر بۆ ئەوەی لە ئەنجامدانی ئەرکی جێنیشیندا -کە بۆ هەندێی وەدیهێناوە- یاریدەی بدا دو توانای بەرامبەریەکی پێبەخشیوە، بەهەر یەکێکیان لایەنێکی ئەرکی جێنشینی ئەنجامداوە و، بەهەردوکیان پێکەوە هاوسەنگی وەدەستدێنێ، جا نە لێرە نە لەوێ هاوسەنگیەکەی لەدەست نادا. لایەنێکیان بڕوا بونە بەو شتانەی هەستیان پێدەکرێ و دوەمیش بڕوابونە بەغەیب. بەتوانای یەکەم مامەڵە لەگەڵ واقیعی بەرهەستی نێزیکدا دەکات... بەتوانای دوەمیش مامەڵە لەگەڵ ئەو راستەقینانە دەکات کە هەستی پەیان پێ نابات- هەرچەند پەی بە شونی هەبونیان دەبات-.

هەروەها باسی ئەوە دەکات کە خوای گەورە جۆرە مەتاعێکی دیاریکراوی زەروری بە مرۆڤ بەخشیوە کە پێویستە مرۆڤ لە سنوری خۆی چێژ لەم مەتاعانە وەرگرێ، بۆ هەڵپەهەڵپی نەفسیش کە دەیەوێ پتر لە سنوری خۆی چێژ لە مەتاعەکان وەرگرێ، پێویستە کۆنترۆڵی رێکخستن بخاتە کار و خۆی لەبەردەم ئەم تاقیکردنەوەیە راگرێ کە خوا پێی تاقی دەکاتەوە، جا وەك چۆن پێویستە ئەم مەتاعانە لە سنوری خۆیاندا بێ زێدەڕیی پەیڕەویان لێبکرێ و لێدەرچونیان تاوانە و خەتەرناکە، بەهەمان شێوەش لەناوبردن و داپلۆسین و کوشتنی ئارەزوە فرچکیەکانی مرۆڤیش تاوانە و کاریگەری ترسناك دێننە ئاراوە.

نوسەر دەڵێ:

لە میهری خۆشیەتی کە ئەو سنورانەی بۆ دیاریکردوە کە خودا دەزانێ ئەو برە خۆشی و رابواردنە دابین دەکەن، بێئەوەی قەوارەی مرۆڤ تێکبدەن، بەڵام خاڵی تاقیکردنەوە بریتیە لە رازاندنەوە و ئارایشتدانی ئارەزوەکان بە شێوەیەك مرۆڤ

حەز لە زیادبونیان بکات، پابەندکردنیشی-لەهەمان کات- بەو برەی ڕێی پێدراوە و، ڕێگە پێنەدانی کە بیانبەزێنێ ئەگەر چی نەفسیشی پێی بوێ..

لەبارەی تێکشێواندنی هاوسەنگیەکەشەوە کە دنیایان تێدا کوشتوە و ئاخیرەتیان هەڵبژاردوە، دەڵێ:

گومانی تێدانیە هەر ئەمەشە بەخەیاڵی ئەوان کەساندا هاتوە کە ئاخیرەتیان خستۆتە پێش دنیا، بەو شێوەیەی سۆفیگەری پێشکەشی کرد، کەبۆ چەندین سەدەی درێژ بەدرێژایی خاکی ئیسلام ڕاکشابو، تا ئێستاکەش شونەکانی[1] لێرە و لەوێ بەجێماون..

پاشان زۆر بەوردی لایەنە سایکۆلۆجیەکەی سۆفیگەرێتی شی دەکاتەوە کە بۆچی ئارەزوەکانیان دەکوشت و چ لێکدانەوەیەك ئەنگێزەیان بوە، هەروەها باسی جیاوازی نێوان سۆفیگەرێتی و زوهد و بەرهەمەکانیان دەکات. یەك لەم جیاوازیانە ئەوەیە کە سۆفیگەران ویستویانە ئارەزوەکانی دەرونی خۆیان بکوژن تا توشی گوناه نەبن، هەر بۆیەشە دورەپەرێزییان کردوە لە هەموو کارە پەیوەستەکان بە دنیاوە یان پەیوەست بە دنیا و ئاخیرەتەوە و ڕویان تەنها لەو کارانە کردوە کە پەیوەستن بە ئاخیرەتەوە!.

بەڵام زوهد دەرون بەهێز دەکات و پەرژینێکی پتەوی بۆ دابین دەکات-نەك دەرونەکە بکوژێ- تا بەڵکو لە گوناهان بپارێزرێ.

---

١ شون: اثر.

نوسەر لەم بارەیەوە دەڵێ:

سۆفیگەری پشت بەفیتنەی دنیا دەبەستێ کە دەبێتە هۆی کەوتنە نێو گوناهان، تەنیا بەکوشتنی ئارەزوەکانیش دەکرێ خۆی لێ بپارێزێ، تا لە خلیسکەکانی شەیتان دوربکەوێتەوە..

هەڵبەت ئەم وریاکردنەوانە و بێنرخ و ترسناك نیشاندانی دنیا بەم مەبەستەوە هاتون کە وەك نیشانەکانی سەر ڕێگا بن کە پێت رادەگەیەنێ چۆن چۆنی بەرێگادا برۆیت و خۆت لە کۆسپ و کەند و هەڵدێر و شوێنە مەترسیدارەکان بپارێزی، نەك بە مەبەستی تەریکەدنیا بون و پشت هەڵکردن لە دنیادا، چونکە ئەم جۆرە چەمکە لەگەڵ چەمکی ئاوەدانکردنەوەی سەرزەمین دژ و پێچەوانەیە و لەگەڵ ئەم هەمو کۆششە زەبەلاحەش یەك ناگرێتەوە کە موسڵمانان بۆ فتوحات و سازکردنی ژیانی دنیا تەرخانیان کردوە.

* * *

## چەمکی ژیار و ئاوەدانکردنەوە:

ئەمرۆ ململانێی ژیارەکان بۆتە واقیعێکی بەرهەست و رۆژانە ئاسەوارەکانی وەدیار دەکەون، بۆیە ئێمەی موسڵمان زۆر گرنگە تێگەیشتنێکی تەواو لەبارەی ژیارەکەمانەوە وەرگرین و بنەما و شێواز و رەگەز و تایبەتمەندییەکانی بناسین و بزانین بە چ رێرەو و روکارێك بەرەو پێشەوە دەچێت و هەڵگری چ جۆرە ئامانجێکە.. تا بەڵکو بتوانین لەبەردەم ئەم ململانێیەی هاتۆتە ئاراوە خۆڕابگرین و قەوارەکەی خۆمان بپارێزیان و توشی توانەوە نەبین، هەروەها تا بەرچاومان لە مەیدانی ئەم ململانێیەدا رون بێ بزانین لە کام بوار و زەمینەدا ململانێ بکەین و لەکام بواریشدا تەفاعولێکی پۆزەتیڤانە بێنینە ئاراوە و پەیامەکەمانی تێدا رانوێنین.

کاتی خۆی لە سەرەتای بڵاوبونەوەی پەیامی ئیسلام بەڕوی جیهاندا، ژیارە تازە لەدایکبوەکەی ئیسلام لەگەڵ گەورەترین دو ژیاری جیهانی ئەو کات کە ژیاری رۆم و ژیاری فارسەکان بو؛ روبەڕوبوەوە و سەرکەوتنێکی بێوێنەی لە مێژودا تۆمار کرد. بەڵام ئەوکات ژیاری ئیسلامی خاوەن تەوژم و دەسەڵاتێکی بەهێز و کاریگەر بوو و ئەو دەیویست باڵادەست بێ و باڵی بەزەیی بەسەر جیهاندا راهێڵێ، هەرچەندە دوو ژیارەکەی رۆم و فارس خاوەنی مێژویەکی دێرینتر و دەسەڵاتێکی ماددیانەی بەهێزتریش بون. ئاشکرایە کە ئەنجامی ململانێکە بە سەرکەوتنی ژیاری ئیسلامی تەواوبو.

بەڵام ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە ژیاری رۆژئاوا خاوەنی هێز و دەسەڵاتە و ئەو دەیەوێ سەرلەبەری جیهان و بەتایبەتی جیهانی ئیسلامی رامالێ و خۆی بەسەر تەواوی ژیاری ئیسلامی بسەپێنێ و لە خۆیدا بتوێنێتەوە.. ململانێکە لەوپەڕی جدیەت و توندیدایە و ژیارەکەی ئێمە کەوتۆتە حاڵەتی بەرگری و داکۆکی لەخۆکردنەوە و ژیارەکەی ئەوروپاش حاڵەتی هێرش و رامالینی وەرگرتوە، ئەمەش وەك وتمان هۆیەکەی بۆ ئەو دەسەڵات و هێزە دەگەڕێتەوە کە ئەوان هەیانە و ئێمە نیمانە.

ژیاری تازە لەدایکبوی ئیسلامی لە ململانێی یەکەمیدا ئەگەرچی لەروی بەرهەمە ماددیەکانەوە پاشکەوتووتر بو و خاوەنی کۆمەڵە رەشماڵێك و چەند خانوێکی قوڕ و چەند بیستانێکی دارخورما و چەند رەوە ئەسپ و مێگەلە مەڕ و حوشترێك و شیر و تیر بوو، بەڵام چونکە خاوەنی چەمکە راستەقینەکان و لێشاوێك لە بەهای بەرزی بێوێنە بو؛ توانی لە مەیدانی ئەم ململانێیەدا سەرکەوتنێکی سەیر و سەمەرە وەدەست بێنێ و پەیامەکەی خۆی بەسەر جیهان رابنوێنێ. کەچی

ئەمڕۆ لە ململانێی ئەم سەردەمەدا ژیاری ئیسلامی گشت چەمکەکانی شێوێنراوە و لە واتا راستەقینەکەیان داشۆراون و بەهابەرزەکان مرێنراون و روناکیان دامرکاوەتەوە، بۆیە لەم روەوە ناتوانێ حاڵەتی هێرش وەرگرێ، بەڵکو تەنانەت ناتوانێ لە مەیدانیشدا خۆی راگرێ و هەر زوو توشی توانەوە دەبێ.

کەواتە بونی ئەم دو فاکتەرە-فاکتەری تەوژم و دەسەڵات کە بەهۆی تەفعیلکردنەوەی ئیسلام لە ژیاندا دێتە دی، هەروەها فاکتەری تەواوێتی و راستەقینەیی چەمکەکان- گرنگیەکی گەلێ گەورەیان لە دیاریکردنی سەرەجام و چارەنوسی ئەم ململانێیەدا هەیە.

نوسەر بۆ راستکردنەوەی چەمکی ژیار گەلێ خاڵی گرنگ دەخاتە رو کە باسی ئاوازەیی ژیارەکەی ئیسلام و پێناسی ژیاری راستەقینەی مرۆڤایەتی و چەند هۆیەکی داڕوخانی ژیاری ئیسلامی دەکات وێڕای کۆمەڵێك خاڵی تری گرنگ و جێ‌سەرنج.

نوسەر پێی وایە لاڕێبونی چەمکەکانی تری وەکو چەمکی (لا الـه الا الله) و پەرستن و ئەوانی تر، بونەتە هۆی لاڕێبونی چەمکی ژیار.. دەڵێ:

کاتێ ئەم هەمو لاڕێبونانە لە ژیانی ئوممەتدا رویدا، کەواتە سەیر نیە ئەگەر تێگەیشتن لە چەمکی ژیاریش لاسەنگ بێ.

ئەو ژیارەی کە ئیسلام هێنایە ئاراوە بە بەراورد لەگەڵ گشت ژیارەکانی تر ناوازەیە، چونکە ژیارەکانی پێشین و پاشین یا ئەوەتە لەسەر واتا روحیەکان و دژایەتیکردنی ژیانی دنیا بینا کراون، یا ئەوەتە لەسەر بنەما ماددیەکان و فەرامۆشکردنی جیهانی روح و ئاخیرەت هاتونەتە ئاراوە. بەڵام ئیسلام وا نیە، چونکە هیچ لایەنێکی فەرامۆش نەکردوە و مافی هیچ لایەکی لەسەر حیسابی

لایەکەی تـر پێشـێل نـەکردوە و بینـای ژیارەکـەی خـۆی لەسـەر هـەردوولا و بـە تەواوکەری یەکتریەوە بینا کردوە.

نوسەر لەم بارەوە دەڵێ:

...ئیسلام ئەو بەرنامە گشتگیر و تەواوەیە کە هیچ لایـەك لەلایـەکانی مـرۆڤ پشتگوێ ناخا و، لایەنێك لەسەر حیسابی لایەنێکی دیکە تێر ناکا...

ئەو ژیارەی کە ئیسلام دەیهێنێتە دی زۆر جیاوازە لەو ژیارانـەی کـە هاتونەتـە ئاراوە، چونکە ژیـاری ئیسـلامی دەیـەوێ چەمکـە راسـتەقینە و بەرفرەوانەکـەی پەرستن کە مەبەستی وەدیهاتنی مرۆڤە بێنێتە دی.

بەڵام ژیارەکانی تر لەوەدا جیادەبنەوە کە ئەوان تێڕوانینیان بەرامبەر بە وجودی مرۆڤ جیاوازە.

نوسەر لەم بارەوە دەڵێ:

چەمکی ئیسلامی بۆ ژیار بریتیە لە چـەمکی پەرسـتن، بریتیـە لـە هێنانـەدی مەبەستی بونی مرۆڤ... کاتێك تێروانینیش بۆ مەبەستی بونی مـرۆڤ دەگـورێ، تێڕوانین بۆ ژیاریش دەگۆڕێ، هەروەها تێڕوانین بۆ مێژوش دەگۆڕێ.

نوسەر ئەوەش رون دەکاتەوە کە جموجۆل و چالاکیەکان ئەوکاتـە ژیـار دروسـت دەکەن یان دەبن بە بەشێك لە ژیار کـە ئامـانجدار بـن و هـەوڵدەن ئامـانجی بونـی مرۆڤ بێننە دی، دەڵێ:

هەمو چالاکیەکانی جەستە یـا عـەقڵ یـا گیـان ژیـار پێکنـاهێنن، یـا نابنـە بەشێك لە ژیـار-ئـەم مەسـەلەیەش بەڵگەنەویسـتێکی ئاشـکرایە- بـەڵکو تـەنیا چالاکی ئامانجدارە کە دەبێتە ئـەو جـۆرە پێکهێنـەرە، کـە ئامـانجی وەدیـهێنانی مەبەستی بونی مرۆڤە.

جا هەر جموجۆل و چالاکیەك ئەگەر لەپێناو ئـەم ئامانجـەدا کـار نـەکات، ئـەوا ئەگەرچی ژیاریش بێننە ئاراوە، بەڵام ژیاری راستەقینەیان نەهێناوەتـە ئـاراوە، بـا ئەم ژیارە لە هـــەندێ لایـەندا سەرکەوتنیشـی وەدەسـت هێنابـێ، وەك ژیارەکـەی ئەوروپا.

نوسەر لەم بارەوە دەڵێ:

جا لێرەوە دەتوانین-بەمتمانەوە- بڵێین ئەو دەسکەوتە مـاددی یـا عـەقڵی (یـا هەندێ جار روحی)انەی کە جاهیلیەتەکان بەرهـەمیان دێنـا ژیـارێکی راستـەقینە نیە، ئەگەر چی هەندێ جار ناوازە و گەورە دێنـــە بـەرچاو، یـان لەیەکـەم چرکـەدا چاومان لە مۆلەقە رادەگرن، چونکە ئەم مەرجە بنچینەییەی ونکردوە کـە چـالاکی مرۆڤ و دەسکەوتەکانی مرۆڤ دەکەنە ژیار کە ئەویش بریتیە لەوەی ئامانجـەکانی روە و وەدیهێنانی مەبەسـتی بونـی مـرۆڤ ئاراسـتەکرابن، نـەك پێچەوانـەی ئـەو ئاراستەیە.

نوسەر دوای ئەو رونکردنەوانە باسی ئەوە دەکات کـە ژیـاری ئیسـلامی لەبـەر ئـەوە ژیـارێکی راسـتەقینەیە، چونکـە هـەمو جموجـۆل و چالاکیـەکانی لـەپێناو وەدیـهێنانی مەبەسـتی بونـــی مـــرۆڤ لـــە جولـــەدان. کەواتـــە نوێـــژ و رۆژو، جێبەجێکردنی شەرعی خوا، بـــەرپاکردنی دادگـەری خودایـی لەسـەر زەوی، ژیـان بەگشتی و بەهەمو وردەکاریەکانیەوە، سیاســـەتی خـاوەن رەوشـتی لەخواترسـانە، ئابوری پابەند بە حەرام و حەڵاڵەکان، پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان کـــە بنـەماکانیان خورەوشتێ، پەیوەندیە خێزانیەکان، ئەمەکداری بـــۆ پەیمانـەکان، فـێربونی زانسـت، هێنانەکایەی هونەرێکی پاك و خاوێن، هەمو ئەمانە بەشێکن لە چـــەمکی ژیـاری ئیسلامی.

نوسەر لەبارەی ئەمانەی سەرەوەدا دەڵێ:

ئەمە هەموی هەر شتێکیش هەمان ئەم ئاراستەیەی هەبێ، بریتین لە لایەنی مەعنەوی ژیار لە چەمکە ئیسلامیەکەیدا.

بۆ لایەنە ماددیەکەش دەڵێ:

ئینجا ژیاری مرۆڤایەتی لایەنێکی مادیشی هەیە کە چەمکە ئیسلامیەکە دەیگرێتە خۆ، ئەمەشیان لایەنێکی گەورە و مەزنە. ئەگەر مرۆڤ بۆ پەرستنی خودا وەدیهێنرابێ، ئەوا ئاوەدانکردنەوەی زەوی لایەکە لە چەمکی فراوان و سەرتاپاگیری پەرستن، کە جێنشینی مرۆڤ لەسەر زەوی دێنێتە دی.

پێشکەوتنە ماددی و زانستیەکان-کە ئەوروپا لە لوتکەدایە- دەبێ بەپێی بەرنامەی خواییەوە بەڕێوە بچن، تا لە تێڕوانینی ئیسلامیدا بە ژیار لەقەڵەم بدرێن.

نوسەر لەم بارەوە دەڵێ:

جا کاتێك جاهیلیەتی هاوچەرخ ئەم لایەنە بەژیار دادەنێ یان بە گرنگترین شتێك لە ژیار و بە بەرجەستەترین دەسکەوتەکانی مرۆڤی دادەنێ، ئیسلام یەك مەرج دادەنێ بۆ ئەوەی ئەم دەسکەوتانە بخاتە نێو مەدلولی ژیارەوە، ئەویش ئەمەیە کە دەبێ هەموی بەپێی بەرنامەی پەروەردگار راوەستابێ و، لە داخوازیەکانی لانەدا..

پاشان نوسەر پرسیارێك دێنێتە پێشەوە کە هەردو جۆرە ژیار-کە یەکیان تەنها خاوەنی پێشکەوتنی ماددی بێت، ئەوی تریش خاوەنی بەها و روح بێ و پێی نەکرابێ پێشکەوتنە ماددیەکە بێنێتە دی- روبەڕوی یەکتر دەکاتەوە و دەڵێ کامیان لایەنەکەی تر پڕ دەکاتەوە.. دەڵێ:

ئەزمونە ئیسلامیە ناوازەکە-لە بەرامبەر جاهیلیەتی هاوچەرخدا- وەرامێکی گردەبڕی ئەم پرسیارە دەداتەوە، شەپۆلی مەزنی بەهاکان توانی قەرەبوی دواکەوتنە ماددیەکە بکاتەوە و، باشترین نەوە دەربخا کە مرۆڤایەتی بەخۆیەوە دیوە، بەشایەدی خوا و شایەدی پێغەمبەرەکەی ﷺ، لە کاتێکدا لە جاهیلیەتی هاوچەرخ شەپۆلی مەزنی بەرهەمی ماددی و زانستی و تەکنەلۆجی نەیتوانی قەرەبوی پاشکەوتنی روحی و مەعنەوی و ئاکاری بکاتەوە و، خراپترین جاهیلیەتی لە مێژودا هێناوەتە ئاراوە.

پاشان نوسەر هەردوو دەردی روخێنەری ژیاری ئیسلامی دیاری دەکات کە یەکەمیان خەریکبونی لە سنوربەدەر بو بە خۆشی و چێژەکانی دنیاوە، دوەمیشیان: پشت هەڵکردن بو لە دەستگرتن بە هۆکارەکان و ئاوەدانکردنەوەی زەمین..

نوسەر دەڵێ:

جا لەلایەکەوە خۆشڕابواردنێکی بکوژ، لەگەڵ-یا بەشوێنکەوتنی- کاردانەوەیەکی ترسناك لەلایەکەی دیکەوە، کە بریتی بو لە خۆماتکردن و پشتکردنە ئاوەدانکردنەوەی مادی زەوی و وەرگرتنی هۆکارەکانی هێزی مادی، بەهەنجەتی ئەوەی کە دونیا نەفرەتلێکراوە چونکە خەڵك لە ئاخیرەت دور دەخاتەوە.

بەم شێوەیە ژیارەکە لەیەکاتدا لە هەردو لاوە دادەڕوخا:

لایەنی روحی و مەعنەوی-لایەنی بەها و ئاکار و مەبدەئەکان- کە خۆشڕابواردنی نابەجێ گەندەڵی دەکرد، لایەنی مادی بەرهەمستیش کە سۆفیگەری گەندەڵی دەکرد کاتێك پشتی کردبوە ئاوەدانکردنەوەی زەوی..

* * *

## چەند رۆشناییەك بەروی ئایندەدا:

ئوممەتی ئیسلامی کە لەم بارە ناهەموار و تێکشیواو و بێدەسەلات و هەرەمەکییەی ئەمڕۆ تێیدا دەژی کە جۆرەها نەخۆشی کوشندەی لەنێودا تەنیوەتەوە، هەر لە چەمکەکانەوە بگرە تا رەفتار و هەڵوێست و بیرکردنەوەکان.. هەمویان مۆرکێکی نەفامێتیان بەسەرەوەیە و لە کانگای بیروباوەڕە پاکەکەی ئەم پەیامە پیرۆزەوە دورە. ئایا لە رەوشێکی ئاوا شپرزەدا چی بکەین؟!

بێگومان پەیامەکەی ئێمە هیچ کەموکورتیەکی تێدا نیە و بێبەش و بێمایە و بێبەخشین نیە، بەڵکو خاوەنی پرۆژەیەکی تەواو و هەمەلایەنە و دەتوانێ لە هەمو سەردەم و شوێنێکدا مێژوی مرۆڤایەتی بنیات بنێتەوە و بیخاتەوە نێو ژیارێکی راستەقینەوە کە بەختەوەری بۆ دابین بکات.

گرفتی ئوممەتی ئیسلام لە پەیامەکەدا نیە، بەڵکو لە تەفعیلکردنەوەی پەیامەکەدایە. لێرەدا نوسەر پێیوایە (رابونی ئیسلامی) وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە کە ئایا ئەم رەوشە بەکوێ بگات و چی بۆ بکرێ؟ دەڵێ: پرسیارێکی سروشتیش لەپاش ئەم خستنە ڕوە دێتە ئاراوە.. ئەدی پاشان؟! ئەدی پاشئەوەی مەسەلەکان گەیشتنە ئەم شێوەیە و، ئوممەت بەمجۆرە لە حەقیقەتی ئیسلام دورکەوتەوە؟! قەدەری خوا وەڵامی ئەم پرسیارەی خستە ئەستۆ کە (رابونی ئیسلامی) هێنایە بون... رابونی ئیسلامیش قەدەری باڵا دەستی خودایە، کە خودا بۆ ئەوە تەقدیری کردوە هەتا ئەم ئوممەتەی لەو حاڵەتە وێڵی و سەرگەردانیەوە پێ بێنێتەدەر کەتێی کەوتوە.

جا کە رابونی ئیسلامی ئەم ئەرکە گەورەی گرتۆتە ئەستۆ تا بتوانێ جارێکیتر ژیارێکی مرۆڤانەیی بنیات بنێتەوە، ئەوا هەڵبەت پێویستی بە کار و هەوڵدان و

ماندوبونێکی زۆر هەیە وێڕای ئەم هەمو کۆسـپ و تەگـەره و دڕك و دالـەی دێتـە سەر ڕێی، کە دەبێ زۆر لێزانانە تەختیان بکات. هەروەها لەسـەری پێویسـتە دڕك بە گەڵیٚ مەسەلەی سەرەکی بکات و بەرچاوی رون بێ. نوسەر لەم بـارەوە پێیوایـە کە یەکەم شت ئەم رابونە ئیسلامیە بیزانێ ئەوەیـە کـە شـەڕەکە شـەڕی ئومـەتی ئیسلامیە لەگەڵ تەواوی دوژمنانی خوا و دەبێ سـەرجەمی ئومـەت لـەم شـەڕەدا بەشدار بن بە نوێنەرایەتی کۆمەڵێکی هەڵبژاردە کە وەك بنکەی پۆڵایینن.

نوسەر دەڵێ:

بـەڵکو جـەنگی سـەرجەم ئومـەتی ئیسـلامیە لەگـەڵ تێکـڕای دوژمنـانی. دوژمنداریەکە هەر لەبنەڕەتدا لە نێـوان دوژمنـانی خـوا و ئیسـلامدا بەرپایـە... کـاتێکیش دەڵێـن ئومـەت بەبەرفراوانیەکـەی هـەندێك خـەڵك وا گومـان دەبـەن مەبەست هەمو تاکێکە لە تاکەکانی، کە ئەمەش مەحالـە!... بـەڵام مەبەسـتمان ئەوەیە کە بنکەیەکی پۆڵایین[1]-وەك ئەو بنکەیەی لـە کۆمەڵگـەی پێغەمبـەرﷺ دا هەبو- دروستبێ کە هێز و خۆراگری ئەوەندە هەبێ کە بـڕوا لاوازەکـان و، تەگـەره پەیداکەران و، لەسەرخۆکان و لەشگرانەکان و، دوڕوەکان لەگـەڵ خـۆی هـەڵگرێ و هەمویان بەرەو ئامانجی خۆی ببا.

نوسەر لە دیاریکرنی خالێکی تردا دەستنیشانی ئەوە دەکات کە شەڕەکە شەڕی بیروباوەڕێکە لەگەڵ بیروبـاوەڕێکی تـر و بەرنامەیەکـە لەگـەڵ بەرنامەیـەکی تـری ژیاندا، دەڵێ:

بەڵکو لە پێش هـەمو ئەمانـە-لـە هـەموانیش گرنگـتر- جەنگـە لـە نێـوان بیروباوەڕێك و بیروباوەڕێکی دیکە و، بەرنامیەکی ژیـان و بەرنامەیـەکی دیکـە...

---

[1] بنکەی پۆڵایین: قاعدة صلبة.

بـەڵام كرۆكـی جەنگەكـە وەك خۆیـەتی و نـەگۆڕاوە. جـــەنگی یەكتاپەرســتی و هاوبەشپەرستی. جەنگی ئیسلام و جاهیلیەت.

هەروەها لە دەستنیشان كردنی خاڵێكی تردا دەڵێ:

مەســەلەی سـێیەم كـە دەبـێ رابـون چـاك پـەی پـێ ببـا.. ئەوەیـە كـە ئـەم جاهیلیەتەی ئەمڕۆ روبەڕوی ئیسلام دەبێتەوە لە ترۆپكی ژیــاری مادیدایـە و، لـە لوتكەی سەراسیمە بونیــەتی بـەو ژیـارەوە و، موسـڵمانانیش لـەم بـوارە یـەكجار دواكەوتون.. داخوازی ئەمەش ئەوەیە كە موسڵمانان روبـەروی ئـەو ژیـارە ببنـەوە بەهەمانشێوەی كە موسڵمانانی یەكەم روبەڕوی ژیاری فارسـی و بـێزەنتی بونـەوە، كە لەلوتكەی باڵا دەستی مادی دابون.. واتە بەو بەها ژیاریانەی تەواو پێچەوانە و بەرامبەرن لەگەڵ ژیاری جاهیلی.

پاشـان نوسـەر بـاس لـەوە دەكـات كـە سـەركەوتنی خوایـی بـــەپێی چـەند رێوشوێنێكەوە دێتە دی كە خوا بڕیاری لەسەر داوە، ئەم خاڵانەی باسكران بەشێكن لە داخوازیەكانی وەدیهێنانی ئەم رێوشوێنە، هەروەها بەندێكی تـر لـەم رێوشـوێنە ئەوەیە كە هەق و رەوا سەربازی دڵسۆز و بڕوادار و یەكانگیری پشـت بـەخوا قـایمی هەبێ. نوسەر دەڵێ:

لە سونەتی خوادایە كاتێك حەق بزر بێ، ناحەق با دەخوا و فشوفۆڵ دەبـێ، كـە حەقیش هات ناحەق پوچ دەبێتەوە... لەسونەتە ئاساییەكانی خوداش وایە كە حەق و ناحەق پاڵپاڵانێ بكەن بۆ ئەوەی زەوی لەگەندەڵی قوتار بكرێ... هەر لە سونەتی خودا دایە كە حەق ســـەربازانێكی هـەبێ بڕوایـان پێهـەبێ، چونكـە ئـەو حەقـەی سەربازی نەبێ سەرناكەوێ و، دەبێ ئەوسەربازانەش بۆ خودا دڵڕاست بن و، لەسەر بیروباوڕیش پەیوەســت بـن و، دڵیـان لەسـەری هۆگـر و كـۆك بـێ... دەبێ ئـەو

سەربازانەش لە پشت بەخوا بەستندا راستگۆ بن... دەبێ لەپێناو خـودا موجـاهید بن و، ئەگەر جیهاد هاتە گۆرێ بەئارامەوە بجەنگن و چاویان لە پاداشی خوا بێ.

گەلێ جار کە بیر لەم روبەڕوبونەوەیەی ئیسلام و ئەو ژیـارەی ئـەمڕۆی ئـەوروپا دەکەینەوە کە خـاوەنی ئەوپـەڕی پێشـکەوتنی تـەکنۆلۆجی و ماددییـە و رەوشـە باڵادەستەکەی ئەو و رەوشە لاوازەکەی ئەم بەراورد دەکەین. لـە یەکـەم تـێڕوانینەدا خەریك دەبێ بێهیوایی دڵمان داگرێ و توشی دڵساردی ببین، بـەڵام نوسـەر لـێرەدا خاڵێکی ئێجگار بەهێزی ژیاری ئیسلام دێنێتـەوە بـەرچاو کـە بریتیـە لـە لایەنـە مەعنەوی و بەهابەرزەکان، تەنانەت نمونە بە روبەڕوبونەوەکەی پێشانیش دێنێتـەوە کە رۆم و فارسەکان بـە بـەراورد لەگـەڵ ئـەوکات هـەمان جیـاوازی و باڵادەسـتی ماددیان هەبوە بەسەر موسڵماناندا.

نوسەر دەڵێ:

موسڵمانان لە پێشکەوتنی زانستی و مـادی و تەکنـەلۆجی و رێکخراوەیـی لـە مکاتەدا بەپێش جاهیلیەتی هاوچەرخ ناکەون. بەڵام-لەگـەڵ ئەوەشـدا- شـتێکیان هەیە کە نەجاهیلیەتی ئـەمڕۆ و نـە هـی سبەی و نـەهی هیـچ کـاتێك نیـەتی.. بیروباوەڕی راست و بەرنامەی راستیان هەیە.

هەروەها دەڵێ: بێگومان هەریەك لە جاهیلیەتی فارسی و جاهیلیـەتی رۆمـانی دەسکەوت و داهێنانی مادی و رێکخراوەیی گەورە و بەسـودیان هـەبو، گومـانیش لەوەدا نیە کە هەندێك بەها و هـەندێك هـزری بەسـود لەهـەردو جاهیلیەتـەکاندا هەبون.. بەڵام ئەمە هەموی ئەو دو جاهیلیەتەی نەپاراسـت لـەوەی کـە بەرامبـەر ئیسلام دابڕوخێن، ئەو ئیسلامەی هـەموی لەسـەر بنچینەیـەکی دروسـت و سـاغ دامەزراوە، مەبەستی راستەقینەی بونی مـرۆڤ وەدیدێنـێ کـە پەرسـتنی خوایـە،

بەواتا فراوان و گشتگیرەکەی پەرستن کە پێشتر رونمانکردەوە[1]، لەگەڵ کەمی ژمارە و کەمی کەرەستەی موسڵمانان لەو رۆژیدا و، سەرەڕای بێبەشی لە دەسکەوتە مادی ورێکخراوەییەکان، بێجگە لە بڕێکی کەم کە هەر ئەوەتە باسدەکرێ.

پاشان باسی ئەوە دەکات کە ئەم کارە کارێکی جیددی و ترسناکە، کاری توێژ و گروپ و لایەنێك نیە، بەڵکو کاری تەواوی ئوممەتی ئیسلامییە، کارێکە دەبێ رابونی ئیسلامی تەواو ئەندازەی بزانێ و سەرلەبەری وزەکانی خۆی بۆ کۆکاتەوە.

نوسەر دەڵێ:

مەسەلەکە بەراستیە.. توانای پەراوێزی پەرتەوازە بەشی ناکەن و، هەولێکی بەش ناکا کە تەنیا بۆ مومارەسەکردنی ئیسلام بێ لەهەر ئاستێك لە ئاستەکان. مەسەلەیەکە پێویستی بەهەمو وزەکان هەیە پێکەوە و.. موحتاجی هەولی هەڵکشان بەرەو ئەو لوتکەیە کە موسڵمانان یەکەمجار سەریکەوتن، کاتێك بەهابەرزەکان و، مومارەسە کردنی بەرزی ئەو بەهایانە، قەرەبوی هەمو جیاوازیە مادیەکانی کردەوە لە نێوان موسڵمانان و دوژمنەکانیان.

دوای هەمو ئەمانە، نوسەر -خوا تەمەنی درێژتر و بەهرەوەرتر بکات- لەسەر ئەوە دوپات دەکاتەوە کە پێویستە لە هەمو وڵاتێکی ئیسلامیدا بنکەی پۆلایین و تۆکمە پەروەردە بکرێ کە ئەوانیش پێویستە کۆمەڵێ سیفەت و تایبەتمەندی دیاریکراویان لێ بێتە دی تا بتوانن ببنە هەوێنی هەڵنانی ئوممەتی ئیسلامی و لەوانەوەڕا رابونەوەی ژیاری ئیسلامی بێتەوە دی و بەسەر تەواوی دوژمنان زاڵ بێتەوە.

---

١ بگەڕیوە بۆ (چەمکی پەرستن).

نوسەر لە پەرتوکێکی تریدا بە درێژی چۆنیەتی بانگەوازی ئیسلامی و سیفەت و چۆنیەتی دروستبونی ئەم بنکە پۆلاییینە دەکات بەناوی (كيف ندعوا الناس) کە بەراستی گەلیّ مەسەلەی گرنگی مەنهەجی تێدا رون دەکاتەوە. ئیتر بۆ دواجار ئەوە دوپات دەکاتەوە کە ئەگەر چەمکەکان راست نەکرێنەوە و بەشێوە راستەقینەکەی خۆیانەوە تەفعیل نەکرێنەوە، ئەوا نە بنکەی پۆلایین دێتەوە دی و نە سەرکەوتنیش بەدی دەکرێ.

نوسەر دەڵێ:

لەهەمو بارەکاندا هەر دەبێ چەمکەکان راستبکرێنەوە. کە بەراستی چەمکەکانیش راستدەکرێنەوە و، بنکەیەکی پۆلایین لەسەر ئەو چەمکە راستودروستانە پەروەردە دەبن، جەماوەری بڕواداری هۆشیاریش پاڵپشتیان دەبێ کە لەجیهانی واقیعدا مومارسەی ئیسلام دەکەن.. ئەو کاتە ئەو بەڵێنە دێتە دی کە پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی پێداوە... جا لەو کاتەدا روی زەوی دەگۆڕێ.. ئیسلامیش خولێکی تازەی بۆ دێتە دی، خەڵکی تیایدا لە تاریکی بۆ روناکی دێنەوە دەرێ و، لە پەرستنی بەندان بۆ پەرستنی خودا و، لە بەرتەسکی دنیا بۆ بەرفراوانی دنیا و ئاخیرەت.

❊ ❊ ❊

ئارامی گەلالی

# ناوەڕۆك

ئەم کتێبە هەوڵێکی بچوکە بۆ راستکردنەوەی هەندێک لە چەمکە ئیسلامی‌یەکان، بە گێڕانەوەیان بۆ وێنەی یەکەم، کە لە کتێبی خوا و سونەتی پێغەمبەرەکەی هەڵێنجراوە، لەگەڵ لابردنی ئەو لارێبونانەی لەمیانەی کاروانی مێژویی ئومەتی ئیسلامی پێیەوە لکاون.

لەم کتێبەدا باسم لە پێنج چەمکی سەرەکی لە چەمکەکانی ئیسلام کردوە: چەمکی الا الە الا اللە، چەمکی پەرستن، چەمکی قەزاوقەدەر، چەمکی دنیا و قیامەت، چەمکی ژیار و ئاوەدانکردنەوەی زەوی.

خوێنەریش دەبینێ کە باسی چەمکی لا الە الا اللە بەشی هەرەگەورەی کتێبەکەی داگرتوە، پاشان چەمکێ پەرستن دێ، ئەمەش شتێکی سەیر نیە، چونکە لا الە الا اللە پایەی یەکەمە و گەورەترین پایەکانی ئیسلامە، لارێبونی هەرەگەورەو-هەرە ترسناکیش- لە ژیانی موسڵماناندا ئەوەیە کە لە چەمکی لا الە الا اللە رویداوە! هەروەها چەمکی پەرستنیش، پێشتر لەو واتا فراوان و گشتگیرەی کە هەیبو، سەدای لە مەزنێتی ئەم ئوممەتە و مەزنێتی دەسکەوتەکانیدا هەبوّ، هەروەک لە واتا بەرتەسک و لاوازەکەی کە پێی گەیشت سەدایەکی هەبو لەو واقیعە تەسکەی کە ئەمرۆ موسڵمانان لەدەستی دەناڵێنن..

کاتێک ئەم چەمکانەش راستدەکرێنەوەو، لە دەرونی موسڵماناندا وێنە راستەقینە و زیندو و کاریگەرەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، ڕێگاکە-بەیاریدەی خوا-ئاسان دەبێ بۆ راستکردنەوەی هەمو ئەو خواروخێچی و لارێبونانەی توشی موسڵمانان هاتون و، هەمو ئەو کاریگەریانەی لە ژیانی موسڵماناندا پەیدایان کردوە.

جا ئەگەر خوا سەرکەوتنێکی لەم هەوڵە بچوکە دەست خستبم ئەوا من سوپاسگوزاری نیعمەتەکانیم و، سەرکەوتنیشم هەموی هەر لە خواوەیە.

محمد قطب